# أزمة الإرادة والوجدان المسلم

## البعد الغائب في مشروع إصلاح الأمة

في إصلاح الثقافة والتربية

رؤية إسلامية معاصرة

أ. د. عبد الحميد أبو سليمان

ترجمة:

د. كاوة فرج سعدون　　عمر توفيق الخطاط

قەیرانی ویست و ویژدانی مسوڵمان

د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان




پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(5)

# قەیرانی ویست و ویژدانی مسوڵمان

## رەهەندی ونبووی پرۆژەی چاکسازیی ئوممەت

تێڕوانینێکی ئیسلامیی سەردەمیانە بۆ

چاکسازیی لە پەروەردە و رۆشنبیرییدا

نووسینی:

د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان

وەرگێرانی:

د. کاوە فەرەج سەعدون　　عومەر تۆفیق خەتتات

# قەیرانی ویست و ویژدانی مسوڵمان

## ڕەهەندی ونبووی پڕۆژەی چاکسازیی ئوممەت

تێڕوانینێکی ئیسلامیی سەردەمیانە بۆ

چاکسازیی لە پەروەردە و ڕۆشنبیرییدا

نووسینی:

پ. د. عەبدولحەمید ئەبوسلێمان

وەرگێڕانی:

د. کاوە فەرەج سەعدون

عومەر تۆفیق خەتتات

٢٠٠٨ زایینی ١٤٢٩ کۆچی




**ناوی کتێب:** قەیرانی ویست و ویژدانی مسوڵمان، رەهەندی ونبووی پڕۆژەی چاکسازیی ئوممەت

**نووسینی:** پ. د. عەبدولحەمید ئەبوسلێمان

**وەرگێڕانی:** د. کاوە فەرەج سەعدون

عومەر تۆفیق خەتتات

**بابەت:** لێکۆڵینەوەی ئیسلامیی

**نەخشەسازی:** ئیدریس سیوەیلی

**ژمارەی لاپەڕە:** ٣٨٠

**پێوانەی لاپەڕە:** ١٦,٥×٢٣

**تیراژ:** ٥٠٠

**ژمارەی سپاردن:** ( ٢٣٧١) ساڵی ٢٠٠٨

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**شوێنی چاپ:**

**ئیمەیلی پرۆژە:** iiitkurdistan@yahoo.com

**بسم الله الرحمن الرحيم**

## چەند پرشنگێك

﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ (سورة الرعد:١١).

﴿النَّاسُ مَعَادِنُ خِيَارُهُمْ فِى الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِى الإِسْلاَمِ إِذَا فَقِهُوا﴾ (رواه البخاري).

((أطلبوا العلمَ من المهدِ الى اللَّحد))

((مَن شَبَّ على شَيْءٍ شابَ عليه))

((كَما تَكونون يُوَلَّى عَليكم))

ئەو كەسەی كە بێزار بووە لە ژیان بە (دەروونی بەندایەتی)یەوە، با فێری ئەوە ببێت، كە چۆن لە نێو ماڵی خۆیدا ئیمانداریێكی بەتوانای، سەربەرزی، پێشدەستی، دەروونبەرز و بەخشندەی، دڵئازا، دروست بكات، ئەگینا با بە بەندەیی بژی و رازیی بێت، كە رۆڵەكانی بە بەندەیی بژین.

# پێشەکیی نووسەر

دانانی ئەم کتێبە و ئەم لێکۆڵینەوەیە لە زاخاوی مێشکەوە نەبووە، بەڵکو دەرەنجامی بڕێکی زۆر لە تێڕوانین و لێکۆڵینەوە و خوێندن و تاقیکردنەوەیە، کە لە پاڵ کتێبی (قەیرانی عەقڵی موسوڵمان: أزمة العقل المسلم)دا، هەوڵێکە بۆ زانین و تێگەیشتنی ئەو هۆکارانەی، تا ئەمڕۆ بوونەتە هۆی سەرنەکەوتنی پڕۆژەی چاکسازیی شارستانیی ئیسلامیی، رروونەدانی گۆڕانکاریی خوازراویش لە ئوممەتدا، سەرەڕای تێپەڕبوونی زیاتر لە ٩ سەدە بە سەر هاواری (أبو حامد الغزالي) لە کتێبەکانی (تهافت الفلاسفة) و (إحياء علوم الدين)دا، هەروەها سەرەڕای تێپەڕبوونی زیاتر لە سەدەیەك بە سەر تێڕوانینی (الكواكبي) بۆ بەرزیی بنەما راستەکانی ئیسلام و مەبەستەکانی و ئامانجە بەنرخەکانی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (أم القرى)، هەروەها هاواری تاوانبارکردن و تووڕەیی دەربارەی (بنەچەی دەرد و بنچینەی بەڵا) لە کتێبە هەرە بەناوبانگەکەیدا (طبائع الإستبداد)، لەگەڵ ئەم هەوڵانەشدا، نە خەونەکان هاتنەدی و نە زوڵم و ستەمەکانیش رەوینەوە، تا رۆژگاری ئەمڕۆمان.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەوە روون دەکاتەوە، کە تا ئێستا دوورییەکی ونبوو هەیە لە پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامییدا، کە بەبێ ئەمە خودی پڕۆژە شارستانییەکە ناتوانێت گۆڕانکاریی ویستراو: کە وزەی ئوممەت دەتەقێنێتەوە، دروست بکات و وزە ویژدانییە (الطاقات الوجدانية) شاراوەکانی بجووڵێنێت، ئەم دوورییە بریتییە لە منداڵ، ئەو تۆوەیە، کە جۆری درەختەکە و تامی میوەکەی دیاریی دەکات.

ئەم کتێبە، بریتییە لە هەوڵێك بۆ تێگەیشتنی نەبوونی لایەنی دەروونیی و ویژدانی لە وتاری پەروەردەی ئیسلامییدا بۆ منداڵ، بۆ ئەوەی ئەم تێگەیشتنە بناغەیەك بێت بۆ دامەزراندنی وزەکانی بەڕێوەبردن و توانا و دەستپێشخەریی و داهێنان لە بینای دەروونیی و ویژدانیدا، هەروەها بریتییە لە هەوڵێك بۆ زانینی ئەو دوورییە رۆشنبیریی و فیکرییانەی بوونەتە هۆی ئەم شێواوی و نەبوونە، زانینی ئەو بۆچوون و سەرەتایانەشی، کە وا لە ئوممەت دەکات ئەم

کەموکورتییە پڕ بکاتەوە، کە بەدەستهێنانەوەی ئەم فاکتەرە شتێکی گرنگە لە کرداری گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و شارستانییدا، لە ڕێگەی بەدەستهێنانەوەی یەکێتی مەعریفی و دەروونیی و ویژدانیی لە بینای دەروونی منداڵدا و بەهێزکردنی وزەکانی ویست و توانا و دەستپێشخەریی و گیانی زانستی و داهێنان لە بنچینەی سروشت (خۆڕسك) و پێکهاتەی منداڵیی مرۆڤی موسوڵمان و پێکهاتە دەروونیی و ویژدانییەکەیدا، ئەویش لەبەر ئەوەیە بەهێزکردن و تواندن لە بنچینەی سروشتدا بریتییە لە بناغەی ویست و ئیرادە و کارکردن و خستنەکاری هەڵوێستەکاندا.

بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە، ئەم کتێبە ئەو ئامرازە مەنهەجی و ڕۆشنبیرییە پێویستانە روون دەکاتەوە، کە پێویستن بۆ چاکسازیی پەروەردەیی، گرنگترین بنەماکانی ئەم چاکسازییەش و سەرەتاکانی ڕۆشن دەکاتەوە، هەروەها سەرنجمان رادەکێشێت بۆ دەزگای خێزان و ڕۆڵە میحوەرییە فیترییەکەی (خۆڕسکەکەی) کە وەك کاری سویچی ئیشپێکردن وایە، لە پرۆسەی بەدیهێنانی چاکسازیی پەروەردەیی و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و شارستانییدا، ئەمە وا لە خێزان دەکات (سینا)ی[1] ئەم سەردەمە بێت، بەو مەرجەی کە بیریاران و پەروەردەکاران و دەزگا پەروەردەییەکانی تری کۆمەڵگا، هەستن بە ڕۆڵی خۆیان لە ڕۆشنبیرکردن و ئامادەکردنی ئەدەبیاتە پێویستەکان بۆی، هەروەها دەستپێشخەریی لە دامەزراندنی بناغەکانی گۆڕانکارییدا بخەنە ناو دەستی ئوممەت خۆی و ڕۆڵەکانی بە پیاوان و ئافرەتانییەوە، ئەویش بە چوون بە ئاڕاستەی بنچینەی دەروونی باوکان و دایکان لە پاڵنەرەکانی باوکایەتی و دایکایەتی فیترییان (خۆڕسکیان) کە تەرخان کراوە بۆ هێنان و ئامادەکردنی هەموو شتێك کە خێر و خۆشیی ڕۆڵەکانیان و بەدیهێنانی بەرژەوەندییە روحی و ماددییەکانیانی تێدایە، کە بریتییە لە بناغەی بیناکردنی ئوممەتێکی بەتوانای سەربەرزی بەڕێز لە پشتیانەوە.

---

[1] ئەمە ئاماژەیە بۆ ڕۆڵی لایەنی پەروەردەیی بۆ ئامادەکردنەوە و پەروەردەکردنەوەی نەوەکانی ئیسرائیل (بنو إسرائيل) لەسەر دەستی پێشەوامان (موسا) لە ونبوونی (سینا)دا، وەك قورئانی پیرۆزە لە دەقەکانیدا باسی کردووە.

ئەوەی ئەم کتێبە بانگەشەی بۆ دەکات لە هەوڵە چاکسازییە مەنهەجی و ڕۆشنبیریی و پەروەردەییەکان، گرنگیی هیچ هەوڵێکی تر لە هەوڵەکانی پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی ناسڕێتەوە، یان کەم ناکاتەوە لە کۆمەڵگا موسوڵمانەکاندا لە بوارەکانی ئابووریی و رامیاریی و بانگەوازی ئیسلامیی و غەیری ئەمانەشدا، بەڵکو لەگەڵیاندا یەکتری تەواو دەکەن و پشتگیریی یەکتری دەکەن بۆ تەواوکردنی مەرجە پێویستەکان بۆ خستنەگەڕی وزەی گۆڕانکاریی لە ئوممەتدا و ئامادەکردنی تۆوە باشە راستەکان بۆ بەرهەم هێنانی بەرە شیرینە باش پێگەیشتووە خوازراوەکان.

ئەو تێڕوانینە رەخنەگرانەی سیفەتی ئەم کتێبەیە، ئینکاری کردنی شایەتیی مێژوو نییە بۆ ئەو شارستانییەتە ئیسلامییە پایەبەرزە بەهابڵندەی، کە بۆ چەندین سەدە فەرمانڕەوایی جیهانی دەکرد. تەنهاش بوو لە چاکە بەخشیندا پێش ئەوەی ئوممەت لە رێڕەوەکەی لابدات، کە بەهۆیەوە پارچەکانی زەوی وشکیان کرد و تاریکیی دایپۆشین، چونکە شارستانیی ئیسلامیی مرۆڤی بەرز کردەوە بۆ ئاسۆیەکی بڵندی فراوان، کە بنچینە بوو بۆ هەموو بەرێکی زانستیی چاك لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا، بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەم کتێبە، تێڕوانینێکی لێکۆڵینەوەیی و خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەیە، کە مەبەست پێی زانینی هۆکارەکانی ساردبوونەوەی گیانی ئەو شارستانییەتە و روودانی کەمتەرخەمییە لە هەوڵەکانیدا، هەربۆیە، ئەم کتێبە لە ناوکرۆکیدا گەشتێکی گەڕانە بە دوای هۆکارەکانی لاوازیی و کەمتەرخەمیی، کە بوونە هۆی بەدەستەوەدانی ئوممەت بۆ ئەو لاوازیی و بێتواناییەی لەمڕۆدا دەیبینین، چونکە بەکارهێنانی دەرمان پێویستە، ئەگەر تاڵ و ناخۆشیش بێت.

ئەگەر ئێمە بزانین، کە گرفتی مەنهەجییەت و تاکڕەویی لە مەعریفەدا و بەش بەشییەکەی، کە بوونە هۆی شێواندنی بیرکردنەوە و رۆشنبیریی بریتین لە ناوکرۆکی قەیرانی عەقڵی موسوڵمان، دەبێت بشزانین کە نەزانیی دەربارەی منداڵیی و پشتگوێخستنی بریتییە لە ناوکرۆکی قەیرانی ئیرادە و بوونی موسوڵمان (أزمة الإرادة والوجدان المسلم)، کە ئەم لەمپەڕانە و ئەو دەردانەی لێیانەوە پەیدا دەبن بریتین لە گرنگترین خاوکەرەوەکانی وزەی بەخشین و

بەجێهێنان و داهێنان لە بنچینەی بینای گەشەی موسوڵمانانە و کۆمەڵگای موسوڵماندا.

لەبەر ئەوە، ئەوەی داواکراوە، بریتییە لە هەڵسوکەوت و سەوداگەریی جیددییانە لەگەڵ ئەم سێ قەیرانەدا: قەیرانی عەقڵ و مەنهەج، قەیرانی بیرکردنەوە و رۆشنبیریی، قەیرانی ویژدان و پەروەردەکردن، کە هیچ رێگایەك نییە بۆ جێبەجێکردن و گەیشتن بە توانای ئوممەت بۆ دەرپەڕاندنی ویستەکانی و وزەکانی و نوێکردنەوەی بیناکەی و گەیشتن بە ئامانجە بڵندەکانی، تەنها بە هەڵسوکەوت و سەوداگەریی جیددییانە نەبێت لەگەڵ ئەو سێ قەیرانەدا، لە سەر بنەمای هاوسەنگیی لە نێوان لایەنەکانی رامیاریی و فیکریی و پەروەردەیی لە هەوڵەکانی بزووتنەوەکانی چاکسازییدا، بە مەبەستی هێنانەدی تواناکان و ئازادکردنی دەروونی موسوڵمان و بەگەڕخستنی ویژدانی: ئەوەی دەیڵێین جێبەجێی دەکەین (يَقُولُونَ مَا يَفْعَلُون).

ئەوانەی بەرپرسن لەم بابەتە بریتین لە بیریارەکان و پەروەردەکاران، کلیلی گرنگی جووڵانەوەی گۆڕانکاریی ئاشتییانەی ویژدانیش بریتییە لە پاڵنەری فیتریی لە دڵی باوکان و دایکاندا، کە خۆڕسکانە سوورن لەسەر ئامادەکردن و بەدەست هێنانی هەموو شتێك، کە بەرژەوەندیی رۆڵەکانیانی تێدایە، کە ئامێری سبەینێ و ماددەی کۆمەڵگا و نەوەی دوارۆژن، هەرکاتێکیش تاکەکان چاك بن کۆمەڵگاش چاك دەبێت و دەزگاکانیشی بەرەو لای دەچن.

من ئومێدم وایە، کە ئەم کتێبە دەرگایەکی گفتوگۆی جیددیی بیناکەر بکاتەوە، کە خاوەنی گیانێکی دڵسۆزانە و بوێرانە بێت، بەبێ ترسان لە نەزانیی نەفامان و مەزادەکانی خاوەنانی دەرد و مەبەستە تایبەتییەکان، گفتوگۆیەك بێت، کە بڕوانێتە قووڵایی کیانی فیکریی و رۆشنبیریی و پەروەردەیی ئوممەتمان، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی بیریاران و ژیرانی ئوممەتمان جێگەکانی دەرد و نوقسانی بدۆزنەوە و بتوانن سەرکردەکان و رۆڵەکانی ئوممەت چاوڕۆشن بکەنەوە لە راستیی دەردەکانی دەروون، شێواوییەکانی فیکر، ولادانەکانی هەڵسوکەوتەکانیش، هەروەها بتوانن وێنەی مەشخەڵەکانی پرۆگرامی زانستی و فیکریی و پەروەردەیی راست بۆ ئوممەتمان تەواو بکەن، کە دەبێتە هۆی ئەوەی

تواناکان و پێشدەستی بخاتەوە دەست ڕۆڵەکانی و بیریارەکانی و ڕۆشنبیرەکانی، هەروەها پشت بەستن بە جێگە شاراوەکانی وزەکانی فیترەت و بەخشین و ئاوەدان کردنەوە لە دەروونیاندا وەك بناغەیەك بۆ ڕاپەڕین و دەرپەڕینیان، ئەویش لەبەر ئەوەی نیازە باشەکان و مانا بەنرخەکان هیچ مانایەك و بوونیان نییە، ئەگەر بێت و ڕەنگ نەدەنەوە و نەبنە ماددە و بەخشین و ئاوەدانکردنەوە (واتە شارستانییەت).

ئەمە بریتییە لە نامەی ئەم کتێبە و ئەمەیە ئامانجی باڵا بۆ ئەو بابەت و تێڕوانینانەی تێیدا هاتوون، کە ئومێد وایە، ئەگەر بە بڕێکی کەمیش بێت، ڕۆڵی هەبێت لە بەڕێوەبردنی گفتوگۆکان و تەواوکردنی ئامڕازەکانی سەرکەوتنی پڕۆژەی چاکسازیی شارستانی ئیسلامیی و هەستانەوە و ڕاپەڕینی ئوممەت، کە زۆر دەمێکە چاوەڕوان دەکرێت، لەگەڵ گەورەبوونی ستەمەکانی عەولەمەی ماددیی و لووتبەرزییەکەیدا پێویستی مرۆڤایەتی بۆیان گەورەتر و مەزنتر بووە.

داواکارم لە پەروەردگار ئوممەتمان تەوفیق بدات و تەوفیقی بیریاران و چاکسازان و کارکەران بدات و پشتئەستووریان بکات، ئێمە و ئەوانیش ڕێنومایی بکات بۆ ڕاستەشەقامی ئیسلام.

عليه توكلنا، وإليه أنبنا، وإليه المصير..

والعاقبة للمتقين..

والحمد لله رب العالمين..

# بەشی یەکەم

## کێشە: ویست

ئەگەر کێشەی ئەم کتێبە بریتی بێت لە زانینی هۆکارەکانی داڕوخانی باری ئوممەت و کەمتەرخەمی لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیدا، ئەمە دەبێتە هۆی ناسینی ئەو ڕێگایانەی دەبنە هۆی بەرەوپێشبردن و هەستانەوەی و بەدەست هێنانەوەی تواناکانی و گەڕان بەدوای سەرکەوتن لە پرۆژەی چاکسازییدا (کە ڕۆڵی تەوەرەیی سەردەمی منداڵیی لە بنیاتنانی ویست و بووندا دەکاتە خاڵی دەستپێك)، لابردن و گوێپێنەدانی ڕۆڵی منداڵیی و تێنەگەیشتنی و حاڵی نەبوون لە ڕۆڵەکەی، بە گرنگترین هۆکارەکانی ئەم کێشەیەی ئوممەت و کەمتەرخەمی لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیدا و نەتوانایی لە جووڵاندنو دەرپەڕاندنی ویستو وزە شارراوەکانی دادەنرێت، ئەم لێکۆڵینەوەیە هۆکارەکانی لابردن و گوێپێنەدانی تەمەنی منداڵیی لە پرۆژەی چاکسازییدا دەگرێڕێتەوە بۆ ئەم دوو خاڵە:

خاڵی یەکەم: ئەو خەلەلەی تووشی پڕۆگرامی بیری ئیسلامیی بووە و بووەتە هۆی دوورخستنەوەی دووریی مەعریفی شیکاریی هەمەلایەنە، کە پەیوەستە بە زانینی سوننەتە خوداییەکان (السنن الإلهية)[1]، ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا ئاماژەی پێدەدات: ﴿فَخِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلاَمِ إِذَا فَقِهُوا﴾ (صحيح البخاري: ٣١٢٣) واتە: چاکترینتان لە نەفامیدا دەبنە چاکترینتان لە ئیسلامیشدا ئەگەر بێتو لە ئیسلام تێبگەن و تێیدا شارەزا بن، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە پەروەردە و پێگەیاندن بناغەیەکی دەروونییان هەیە و بریتین لە چەند یاسا و سوننەتێکی خودایی، کە شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا جۆری بینای دەروونی تاك دیاریی دەکات و لەسەر ئەم

---

[1] مەبەست لە سوننەتە خوداییەکان لە سروشتی زیندەوەر و نازیندووەکاندا ئەوەیە، کە لە فیکری ماددیی ڕۆژئاوادا بە یاسا سروشتییەکان (القوانين الطبيعية) ناودەبرێت.

بناغەیە جۆری تاکەکان گەڵاڵە دەبن‌و وزەکانی و توخمەکانی پێکدێن وەك: ئازایەتی و ترسنۆکی، دەستپاکی و خیانەت، بەهێزیی ئیرادە و لاوازیی و...... غەیری ئەمانیش، ئەوانەن کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بەکاردێن بە ئاراستەیەك یان بە پێچەوانەیەوە، ئەویش بەپێی تێڕوانینی گەردوونیی کۆمەڵایەتی هەر نەتەوە و کۆمەڵگایەك، بۆ نموونە سەربازی سوپا و پیاوی باندەکانیش زۆر گرنگە کە هەردووکیان ئازایەتیی و دڵسۆزییان تێدابێت بۆ ئەوەی لە رۆڵەکانیاندا سەرکەوتووبن، بەڵام ئەوەیە کە سەرباز بۆ بەرگریی کردن لە ئوممەت بەکاریدێنێت و پیاوی باندەکانی تاوانیش بۆ زەرەر و ئەزیەتدانی خەڵکیی بەکاریدێنن.

لە ئەنجامی خەلەل لە پرۆگرامی بیرکردنەوەداو لاوازیی لە هۆشیاری دەربارەی لێکۆڵینەوەی تیۆری و پراکتیکی پێکهاتەی دەروونی مرۆڤ روویداوە و رۆڵی گرنگی منداڵیی تێیدا و شێوازی وتاری دەروونیی پەروەردەیی گونجاو بۆ هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ئەو منداڵییە ونبووە، کە شوێنەواری ئەمە لە پێکهاتنی بینای دەروونیی پێویست بۆ تاکی موسوڵماندا دەرکەوتووە، ئەمە راستکردنەوەیەش لە پێناوی بەدەست هێنانی پاڵنەرە ویژدانی و دەروونییە پێویستەکانە بۆی، بۆ ئەوەی تازە پێگەیشتووەکان ئامڕازێکی کاریگەر بن لە لە چاکسازیی و گۆڕانکارییدا و لە راستکردنەوەی تێڕوانینی گەردوونیی کۆمەڵایەتیی گشتگیردا، هەروەها نەهێشتنی ئەو لادانانەی لەم خەلەلانەوە دروست بوون و بەدەست هێنانەوەی ویست و توانای جێبەجێ کردنی ورد و تەواو و بەرەنگاربوونەوەی تەحەدیاتەکان بە شێوەیەکی پۆزەتیڤانەی کاریگەر.

خاڵی دووەم: نەمانی وتاری دەروونیی زانستیی پەروەردەیی راست، کە پێویستە بۆ دروستکردنی نەفسییەتی منداڵی موسوڵمان، کە ئەم نەمانە بووەتە هۆی دروست بوونی نوقسانی لە پێکهاتەی دووریی دەروونی و ویژدانی ئیسلامیی راست و دروست لای منداڵی موسوڵمان، کە ئەمە وای لێکردووە گەشە بکات بۆ مرۆڤێکی پێگەیشتوو بەبێ بوونی پاڵنەری دووریی ویژدانیی کاریگەر کە بۆ جووڵاندنی وزەکان پێویستە، هەروەها بۆ سەرف کردنی هەوڵەکان و کۆکردنەوەی هەوڵ و کرداری ئیجابی (واتە ویست) کە بە مەرجێکی گرنگ

دادەنرێت بۆ بەدەستهێنانی توانای رووبەڕووبوونەوەی ئەو تەحەددیاتانەی کە لە بەردەم ئوممەت و کۆمەڵگادایە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو و کاریگەر وتاری دەروونیی زانستیی پەروەردەیی راست بەهەمان شێوە گرنگە بۆ راست کردنەوەی لادانەکانی ناو خود و کۆمەڵگاش، ئەمە خەلەلێکە لە پرۆگرامی فیکریدا، کە سەرەنجام ئەم ونبوون و نەبوونەیە کە تەفسیری ئەو نەتوانینەی مرۆڤی موسوڵمان و ئوممەتی موسوڵمان تا ئەمڕۆمان دەکات بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی پرۆژەی چاکسازیی شارستانیی ئیسلامیی و راستکردنەوەی لادانەکان و پێکەوە گرێدانی ریزەکان و چاککردنی ئەنجامدانەکان، لەگەڵ ساغی و دروستی ئامانجەکانی ئەم پرۆژەیە و بەرزییەکەی و بوونی هۆشیاریی مەعریفی بە مەبەستەکان و ئامانجەکانی و زۆربەی پێویستییەکانی لە لایەن پێگەیشتووان لە رۆڵەکانی ئوممەتمان.

لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە بزانین هۆکاری دووەمی هۆکارەکانی نەتوانینی ئوممەت بۆ چاکسازیکردنی ئەو خەلەلەی تووشی بووە لە بەدەستهێنانەوەی تەندروستی و تواناکانی کە بریتییە لە (خەلەلی گوتاری پەروەردەیی) لە ئەنجامی بەشی یەکەمەوە روویداوە، کە بریتییە لە کەمتەرخەمی و شێواوی مەنهەجییانەی فیکری ئیسلامیی، کە ئەمەش خۆی لەخویدا بووەتە هۆی دابڕینی پیاوانی قوتابخانەی پەیامەکە و سەرکردەکانی فیکر لە ئوممەتدا و کەنارگیربوونیان لە مومارەسەکردنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی گشتیی و شارەزابوون تێیدا و زانینی هۆکارەکانی و نهێنییە شارراوەکانی و لێکۆڵینەوەیان و پشکنینیان و توێژینەوەی زانستیی لە بابەتەکانیدا، ئەمەشە بووە بە هۆکاری شێوانی تێڕوانینی گشتیی ئیسلامیی و بووەتە هۆی پووکانەوەی رۆڵی سەرچاوەی دووەمی مەعریفەی ئیسلامیی و دیارنەمانی، کە بریتییە لە مەعریفەی مرۆیی بۆ درکپێکردنی سوننەتەکان و تەبیعەتە گەردوونی و مرۆییەکان و رووداوە زەمانی و مەکانییەکان و تەسخیر کردنیان بە شێوەیەکی کرداریی کاریگەر بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئوممەت و ئیدارە کردنی کاروبارەکانی، بە مەبەستی بەجێگەیاندنی مەبەستەکانی رێنومایی خودایی گشتیی بۆ مرۆڤەکان لەسەر بنەمای هیدایەت و زانین و چاوکراوەیی.

ئەمانە هەمووی وایان کردووە کە دیارنەمانی سەرچاوەی مەعریفەی مرۆیی لە سوننەتەکان و تەبیعەتەکاندا لە کۆتاییدا ببێتە هۆی پەیدابوونی عەقڵییەتی چاولێکەریی باووباپیران و هەروەها روودانی بێتوانایی لە درك کردنی سروشتی گۆڕانکارییەکان و کارلێکی هۆکارەکانیدا و لەدەستدانی توانای مامەڵە کردن لەگەڵیدا لە پێکهاتەی دەروونیی مرۆییدا و گەشەکردنی و ئامادەکردنی لە قۆناغە جیاوازەکانی منداڵییدا، کە تێیاندا جۆری پاڵنەرە دەروونی و ویژدانییەکان دروست دەبن و پێکدێن، لەگەڵ مەفهومە مەعریفییە مەنهەجییەکان، کە دەبنە هۆی دروستکردنی عەقڵییەتی ئەندامانی کۆمەڵگا و نەفسییەت و بوونیان و دەبێتە تەبعێکی بنچینەیی (یان ویستێك) تێیاندا کە لێیەوە تێگەیشتنیان و وەڵامیان سەرچاوە دەگرێت بۆ ئەوەی لە دەوروبەریاندایە لە رووداوەکان و ئەو تەحەددییاتانەی رووبەڕووی دەبنەوە.

## هاندەرەکانی لێکۆڵینەوەکە:

هاندەرەکانی لێکۆڵینەوە لەم مەسەلە مەعریفی و پەروەردەییە بریتییە لە هەستکردن بە لەپێشی پێویستیمان بۆ بنیاتنانەوەی دەروونی موسوڵمان و بەدەستهێنانەوەی تواناکانی و هێزە رەووشتییە شارستانییە داهێنەرەکانی، بە مەبەستی سەرخستنی پرۆژەی شارستانیی ئیسلامی و بەجێ گەیاندنی ئامانجە بەرزەکانی، کە چەند دوورییەکانی هەمەلایەنن، هەیانە پەیوەندیی بە ئیسلامەوەیە وەك پەیامێکی خودایی بەرز و هەیانە پەیوەندیی هەیە بە مرۆڤایەتی ئەشکەنجەدراو و سەرلێشێواو و خاوەنی ململانێ لە نێوان یەکتریدا، هەشیانە پەیوەندیی بە موسوڵمانانەوە هەیە کە لە کۆمەڵیاندا لاواز و یەکتری خۆر و ژێردەستە و چەوساوە و کۆیلەن.

زیانەکانی دواکەوتنی ئوممەتی ئیسلامی و لاوازیی و پارچە پارچەییەکەی و بێتوانایی و کەمتەرخەمی لە کاروبارەکانیدا تەنها بە ئوممەت خۆیەوە ناوەستێت، هەروەها ئەو زیانانە تەنها لەو کارەساتانەدا خۆیان نابیننەوە کە تووشی ئوممەت هاتن و ئەو کێشە و ستەمانەی، کە تووشی هاتن و بەردەوام

تووشی دێن، بەڵکو شوێنەواری ئەمە پەل دەکێشێت بۆ داپۆشینی ڕووناکیی پەیامی جیهانیی ئیسلام و ڕێنومابییە گشتییە ڕۆحییە ڕەووشتییەکانی، لە یەکتاپەرستی و جێنشینایەتی و برایەتی و ئاشتی و دادپەروەریی و بەزەیی بۆ مرۆڤەکان، کە ئەمە دەبێتە هۆی ڕێگرتن و کۆسپدانان لە بەردەم پەیامی ئیسلامدا، بۆ ئەوەی ببێتە مناڵدانی شارستانییەتێکی ڕاستەقینە و خۆشییەکی ڕۆحی و ماددیی و خێر و چاکە بۆ مرۆڤەکان لە دونیا و پاشەڕۆژدا.

داپۆشینی پەیامی موحەممەدی ئیسلامیی شارستانیی گەردوونیی لە سەردەمی تەواوبوونی پێکهاتەکانی جیهانیی دونیای مرۆڤەکان و تواناکانیدا و لە کاتێکدا کە لە هەموو کات زیاتر پێویستی بە ڕێنومایی پەیامی جیهانگیریی یەکتاپەرستیی جێنشینایەتی هەیە کە لەسەر بنەمای برایەتیی و دادپەروەریی و چاکەخوازی و بەزەیی و بەزەیی هاتنەوە بە یەکتردا دامەزراوە، ئەو پەیامەی کە هیچ جۆرە جیاکردنەوەیەکی تێدا نییە و پاك و بێگەردە لە خۆبەزلزانین و ستەمکردن لەیەکتری: ﴿الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ﴾ (النساء:١) واتە: ئەو پەروەردگارەی هەمووتانی لە یەك نەفسەوە دروست کردووە (کە ئادەمە)، ﴿ألا إِنَّ رَبَّكُم وَاحِد وَإِنَّ أباكُم واحد﴾ حديث شريف (مسند أحمد: ٢٢٣٩١) واتە: بەدڵنیاییەوە بزانن کە پەروەردگارتان یەکێکە و هەروەها باوکی هەمووشتان یەکێکە، ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾ (النحل:٩٠) واتە: خوای گەورە فەرمان بە دادپەروەریی و چاکەخوازیی دەکات، ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ﴾ (العصر:٣) واتە: ئامۆژگاریی و فەرمانی یەکتری دەکەن بە ڕاستی و چاکە، ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ﴾ (البلد:١٧) واتە: فەرمان و ئامۆژگاریی یەکتری دەکەن بە بەزەیی و ڕەحمەت، ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات:١٣) واتە: بەڕێزترینتان لای پەروەردگارتان ئەوانەن کە پارێزکارن، داپۆشینی ئەم پەیامە و ئەم هیدایەت و ڕێنوماییە خۆی لەخۆیدا تاوانێکی هەرە گەورەیە، کە خەتاکەی دەکەوێتە سەر ئوممەتی ئیسلامیی بە گشتیی و ڕۆشنبیر و سەرکردەکانی فیکر تێیدا بەتایبەتی پێش هەموو کەسێکی تر لە جیهاندا.

ئەوەی کە تووشی مرۆڤایەتی هات بە هۆی خۆبەبەرززانینی تێڕوانینی گەردوونیی ماددیی جاهیلی ڕەگەزپەرست، لە جەنگە جیهانییەکان و ململانێکان

و ستەمکردنەکان و کارەساتەکانی ئیستیعمار، بەرەو ئەوە دەچێت کە توندتر و سەختتر بێت و ستەمکارتر و دڵڕەقتر بێت، کە ئەم تاوان و ستەمانە بەرەو زیادبوون و گەورەبوون دەچن لەگەڵ بەهێزتربوونی هۆکارەکانی زلهێزەکان و ئامرازەکانیان، لە جیهانی دەرونە جیاوازبووەکان و چڵێسی بۆ مادده و دڵڕەقیی لە بەرامبەرکێدا و خۆبەزلزانینی زلهێزەکاندا.

لەو شتانەی کە دەروونی ڕێزداران و سروشتی پیاوچاکان دەهەژێنێت و چاوەکان و گوێکانیان دەپووکێنێتەوە بە ڕۆژ و شەو لە کارەساتەکانی ستەمەکان و ململانێکان کە ئاگری بڵێسەیان خۆشتر دەکرێت بەهۆی کەڵبەی چڵێسی زلهێزەکان کە چەقێنراوەتە جەستەی لاوازان و بێدەسەڵاتەکان، لە ملیۆنەها جەرگسووتاو و برسی و ڕەش و ڕووت و نەخۆش و نەبووە سادەکان، بە پیاو و ئافرەت و پیر و گەنجی نەدار و منداڵی پارچەکراو و ئەو شیرەخۆرانەی کە هیچیان دەست ناکەوێت کە تینوێتییان بشکێنێت و ئازاری برسێتی خۆیان و دایکانیان کپ بکات، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەوەی کە بەربەرەکانێت چنگی زلهێزەکان دەیشارێتەوە لە سەرپێچی و سنوور بەزاندنەکانی ستەمکاریی و دڵڕەقی زۆرداریی، شتێکە سنوورێك نییە بۆ شوێنەوارەکانی لە کاولکاریی و خراپەکارییدا، چونکە ڕێگرێك نییە لەبەردەم نەفامییەکەی و سنووربەزاندنەکانیدا، ئوممەت و مرۆڤایەتیی ناتوانن کە بەرامبەری بوەستن، تەنها بە کاری چاوکراوانەی بێووچان نەبێت، ئەویش بۆ جێگیرکردن و چەسپاندنی بۆچوونە ڕاستەکان لەناو دەروونە ئازاد و بەرزەکاندا هەروەها جێگیرکردنی ڕەووشتەکان و بنەماکانی ڕاپەرین و بەرپرسیارێتی لە ئەرکەکاندا و مەبەستەکان لە بووندا و ڕۆحانییەتی چارەنووس.

دۆڕاندنی ئوممەتی ئیسلامیی و کەنارگیربوونی ڕۆڵە شارستانییەکەی، کە خۆی پێنج یەکی مرۆڤایەتی بە گشتی پێکدەهێنێت بریتییە لە خەسارەتێکی هەرە گەورە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لەبەر ئەوەی میراتگری شارستانییەتێکی مەزنە، کە منداڵانی هەموو چاکەیەکە و بناغەی هەموو پێشکەوتنێکی شارستانیی ئەم سەردەمەمانە و لەبەر ئەوەی هەڵگری مەزنترین پەیامی ئاسمانی (چاکەخوازی) سەلمێنراو و (باوەڕپێکراوە) لە مێژووی جیهان و مرۆڤەکاندا، کە

هەستا بە پێکهێنانەوەی ئاراستەکەی وزەکانی بەو تێڕوانین و بنەما و بەها خوداییە رۆحییە رەووشتییانەی پێشکەشی کرد، هەروەها ئەوانەی کە ئەم رێنموییکەر و دروستکەری بوو لە داهێنراوە ناوازە زانستییەکان و بنەماکان و سەرەتاکانی شارستانییەت، هەربۆیە ژێریی قبوڵی ئەوە ناکات و نە لە دادپەروەری و داناییە و هیچ خێر نییە کە نەوەکان و رۆڵەکانی ئەم ئوممەتە بەرزە ببنە هەژارترین و نەدارترین و خاوەن پێویستی و زووخاوترین و چەوساوەترین رۆڵەکانی مرۆڤایەتی بن!! و گەلەکانی ببنە نێچیری تاریکییەکانی هەژاری و نەفامی و نەخۆشی و چەوساندنەوە و ستەم.

هەر بۆیە رزگار کردنی جیهانی ئیسلامیی و ئوممەتی ئیسلامیی، تەنها رزگارکردنی پێنج یەکی گرنگی پێکهاتەی کیانی مرۆڤایەتی و مێژووەکەی نییە بە تەنها، بەڵکو رزگار کردنی پاشەرۆژی مرۆڤەکانە بە هەمان شێوە و هەروەها شارستانێتی مرۆڤایەتیش کە لە لایەن وەحشیگەریی دارستانەوە و بۆگەنیی رەگەزپەرستی و گەورەبوونی هێزەکانی کاولکاریی و وێرانکارییەوە هەڕەشەی لێدەکرێت، مایەی داخە کە رزگارکردنی ئوممەتی ئیسلامیی تەنها مەسەلەیەکی هەست ویست و خوازراوەکان نییە، بەڵکو هەروەها بریتییە لە مەسەلەیەکی کارکردن و هەوڵدانێکی کرداریی مەنهەجی رێکخراو و بنەما بۆدانراو، کە دەبێتە هۆی پاککردنەوەی ئیسلام لە هەموو ئەو خڵتانەی لە بۆچوون و تێگەیشتن و رۆشنبیرییەکەیدا تێکەڵاوی بووە بەدرێژایی مێژووی گەلانی موسوڵمان لە پاشماوەی بیروبۆچوونە کۆن و بەسەرچووەکان و تەقالیدە رزیوەکان و لادانەکان لە هەڵس و کەوتدا و ستەمەکانی لە سنووردەرچوونیان و ئەوانەی پێوەیان گرێدا لە خورافات و ئەفسانەی باوباپیرانیان و جادووگەریی کاهینە پێشینەکانیان و درۆو دەلەسەکانی خاوەن مەبەستەکانیان.

هەر بە مەبەستی پاککردنەوەی ئیسلام و رۆشنبیریی ئیسلامیی و بۆچوونە سەرەکییەکانی، پێویستە کە تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز بەو شێوەیەی کە هاتۆتە خوارەوە بەدەست بێنینەوە و لە رێڕەو و کاروانەکەی لە مێژووی ئوممەتدا حاڵی ببین و ئەو هۆکارانە و وەستان و وەرچەرخانانە بزانین کە رێڕەو و مەسیرەی ئوممەتی پێکهێنا و رێڕۆشتنی فیکر و رۆشنبیریی ئیسلامیشی تێدا

پێکهێنا، بەم شێوەیە ئوممەت ڕێنموویی دەکرێت بۆ هۆکارەکانی پیسبوونی ڕۆشنبیریی و لادانە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاپۆرە و ڕێڕۆشتنیدا، هەروەها ڕێڕەوەکان و سەرچاوەکانی ئەم پیسبوون و لادانانە دەناسێت، ئەویش بە مەبەستی پاککردنەوەی ڕێڕەوەکە و چارەسەر کردنی هۆکارە سەرەکییەکانی.

بە دەرخستنی رووخساری روون و بێگەردی ئیسلام و ئەنجامدانە کاریگەر و باشەکانی موسوڵمانان، بە تاك و کۆمەڵگاوە بە دەستخستنی ئەو توانایانەی کە بەهۆیەوە بەرەنگاری تەحەددیاتەکان دەبین لە بواری هێز و جێبەجێکردندا، دەتوانرێت رووخساری راستەقینەی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی دەربخرێت و نیشانەکان و ڕێنومایییەکانی هیدایەتی لە دەروونەکان و ئاسۆکاندا بزانرێت، مرۆڤایەتی ئەو کاتە دەتوانێت بگاتە شەوقەکانی دەروونە بەرز و بەنرخەکان و فیترەتە راستەکان، ئەمەش بۆ ئەوەی بۆ مرۆڤایەتی دەربکەوێت لە ئاکامی تێڕوانین‌و وردبوونەوەی لە گەردوون دەروونەکان، کە ئیسلام و ڕێنومایی ئیسلام بریتییە لە ڕێگای راست و ئاینی راست کە لە لایەن داهێنەری بوونەوەرەکان و دروستکەری ئاسمانەکان و زەوییەوە نێردراوە.

## پرۆگرام: ڕێبەر و ڕێنماییکەر

زۆر گرنگە، لە سەرەتاوە ئەو مەنهەجییەتە زانستییە روون بکەینەوە کە بەنیازین لەم لێکۆڵینەوەیەدا پەیڕەوی بکەین، بۆ ئەوەی دوورییەکانی ئەم مەسەلەیەی بەردەستمان تێبگەین و چۆنێتی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا و هۆکارەکانی ئەم هەڵسوکەوتە بزانین، چونکە زۆر جار تێگەیشتن و گفتوگۆ گران دەبێت بۆ گفتوگۆکەران، بە هۆی کەمیی بەرچاوڕوونی لێکۆڵەرەوان و گفتوگۆکەران بە جیاوازیی پرۆگرامەکانیانەوە و ئەو جیاوازییانەشی کە لەنێوانیاندا هەیە لە بیردۆزەکان و سەلمێنراوەکاندا، ئەویش لەبەر ئەوەی بەبێ ئەم بەرچاوڕوونییە لێکۆڵینەوە قورس و گران دەبێت و بەیەك گەشتن و گفتوگۆ مەحاڵ دەبێت.

## هەمەلایەنیی و تاکلایەنی لە پرۆگرامدا

پرۆگرامی ئەم لێکۆڵینەوەیە پرۆگرامێکی زانستییە، بە هۆی ئەوەی کە ئامرازێکی لێکۆڵینەوەی بابەتییانەیە لە سوننەتە خوداییەکان لە گەردوون و دروستکراوەکاندا، هەروەها پرۆگرامێکی ئیسلامییانەیە لە ئامانجە گشتییە رۆحی و رەووشتییەکانی‌دا، کەواتە پرۆگرامێکی هەمەلایەنە و کامڵ و شیکەرەوە و رێکخراوە کە پابەندی ئامانجە جێنشینایەتییە خاوەن چاکە ئیسلامییەکانە، هەمەلایەنیش لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا کارێکی گرنگە لەبەر ئەوەی ئامانجی بریتییە لە تێگەیشتنی دیاردەکان و حاڵیبوونی هۆکارە سەرەکییە شاراوەکانی، هەر لەبەر ئەمە تێڕوانینی جوزئی لەم بوارە پێکهاتە ئاڵۆزانە و چەندە هۆکاردا زۆرجار دەبێتە هۆی چەواشە کردنی لێکۆڵەرەوە و دەبێتە هۆی خەلەل دروستکردن لە کێشی دیاردەکان و شوێنیان و شوێنەوارەکانیان، بەشێوەیەکی نوقسان سادەی دەکاتەوە کە دەبێتە هۆی دروستکردنی چەند بۆچوونێك کە هیچ بنەمایەکی واقیعییان نییە و زۆر نزیکی دەکاتەوە لە خەیاڵات و ئەندێشە.

لەوانەیە پەیوەندیی نێوان تێڕوانینی جوزئی و تێڕوانینی تەواوی هەمەلایەن لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا، وەك ئەو کەسە وابێت کە پارچەیەك کاغەز دێنێت و هەندێك مرەکەبی دەکات بە سەردا و لەبەردەمیدا دەوەستێت و بە چاوی ئەندێشەی خۆی خەیاڵ دەکاتەوە، کە لەبەردەم چەند وێنەیەك و شکڵێك و پێکهاتەیەکدایە کە لە راستیدا بوونیان نییە و بەهۆی ئەوەی کە بە خەیاڵیدا دێت لە بەرامبەریدا لە بۆچوون و ئەندێشە دەریدەبڕێت، ئەمەش ئاساییە بۆی لەبەرئەوەی کە لێی ورد دەبێتەوە بەشێوەیەك تێدەگات ئەمانە تەنها خەیاڵات و ئەندێشەیە و لە راستی‌دا بریتی نین لە وێنە و کاری هونەری و بە شێوەیەکی گشتیی و بە تەواوی تەنها بریتین لە حیبرێکی رژێنراو بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی لەسەر کاغەزێکی ئامادەکراو، زۆر جاریش پرۆگرامی جوزئی لە تێڕوانینەکانی وردبوونەوەکانی و خەیاڵاتەکانی –بۆ کەسێك کە بە باشی ناتوانێت بەکاری بهێنێت و سنوورەکانی کاریگەرییەکانی نازانێت– دەبێتە هۆی دروست بوونی

بۆچوونی وەهمی و ئەنجامی نادروست کە هیچ پەیوەندییەکی بە راستیی واقیعەوە نییە، لەوانەشە خاوەنەکەی کارلێکی هەبێت و بە سەرسوڕمانێکی نارەزایئامێزەوە بڕوانێتە پشت هەڵکردنی گوێگران لەوەی بۆیان روون دەکرێتەوە و زۆر ناڕازییە لەوەی کە ئەوان گومانەکانی ئەو بە شێوەی پێویست —بە بۆچوونی خۆی— لە جیددییەت لەوەی کە مەبەستی بووە وەرناگرن، کە خۆی زۆر بە راستیان دەزانێت.

ئەم جیاوازیی و لێك دووركەوتنەوەیە لە نێوان تێڕوانینی هەمەلایەن و تێڕوانینی جوزئیدا، لەو حوکمدانە دەچێت بەسەر ئەرك و فرمانەکاندا بەبێ ئیعتیباری باردۆخە زەمانی و مەکانییەکانەوە و وەرگرتنیان لەسەر بنەمایەکی جوزئی و بە ئینتیباعاتێکی زاتییەوە کە تێڕوانینێکی هەمەلایەن و تەواو پشتی ناگرێت و تێگەیشتنێکی راستیش دەربارەی رێژەیی دیلالاتەکان پشتی ناگرێت لە بارودۆخەکانی و تێکەڵاوبوونی لەگەڵ ئەو فاکتەرانەی تر کە کارلێکیان لەگەڵیدا هەیە.

نموونەی ئەمەش وەك وتەی ئەوانەیە کە لە خۆیانەوە دەڵێن بڕی یەك ملیۆن درهەم مەبلەغێکی کەم یان زۆرە، کە لەمەدا راستیی یاوەری نەبووە ئەگەر لە مەبەستی ئەم بڕە پارەیە تێنەگات، چونکە ئەگەر ئەم بڕە، مووچەی مانگانەی تاکەکانی خەڵك بێت لەراستی‌دا شتێکی گەورە و زۆرە، بەڵام ئەگەر مەبەست لێی بودجەی دەزگایەك یان وڵاتێك بێت، ئەوا سەرسوڕمانی ناوێت ئەگەر بڵێین بڕێکی زۆر کەمە لەم حاڵەتانەدا.

هەربۆیە چارەسەرەکانی کێشەی بوون وجودی ئوممەت و هۆکارەکانی کەموکورتی بەجێهێنانەکانی و لاوازیی کارەکان و بەجێهێنانی گەل و تاکەکانی و نەتوانایی پرۆژە شارستانییەکەی بۆ بەجێهێنان و بەرپا کردنی ئامانجە بەرزەکانی بۆ ماوەی چەندین سەدە وا لە لێکۆڵەرەوە دەکات کە پشت بە بڕێکی زۆر زیاتر لە هەمەلایەنە شیکار لە لێکۆڵینەوەکەی‌دا ببەستێت دەربارەی هەموو شتێك کە پەیوەندیی بەو دیاردەی پەرتبوون و نەتوانایی و دواکەوتووییەوە هەیە کە ئوممەتمان پێوەی دەناڵێنێت.

لەپاڵ تێڕوانینی هەمەلایەنە، پێویستە لەسەر لێکۆڵەرەوە، کە خاوەنی ئازایەتی ئەدەبیی و تێڕوانینی رەخنەگرانە بێت، دوودڵ نەبێت لە تاووتوێکردنی

هەر بابەتێك تا ئەوەی کە رووە راستەکەی دەردەکەوێت، هەربۆیە لاوازیی ئازایەتی ئەدەبیی و تێڕوانینی رەخنەگرانە و بەتوانابوونی خاوکەرەوەکانی وەك ترس و تۆقین لەناو دەروونی رۆڵەکانی ئوممەتدا، توانیوێتی زوربەی چارەسەرەکانی رەنگ بکات بە رووکەشیی و بەرپەرچدانەوە و ساختەکردنەوە، رێگریش بووە لە تێڕوانینی پشکنینانە و شیکردنەوەی جیدی، بەشێوەیەك کە فیکر و بیریاری ئیسلامیی هاوچەرخ وەك ئاژەڵە دڕندەکانی نمایشە بەهلەوانییەکانیان لێهاتووە، کە ترس و تۆقین بەشێوەیەك دایگرتوون لە ئەنجامی دەستەمۆ کردنەوە کە بووەتە هۆی ئەوەی خۆی داماڵێت لە سروشتە خۆڕسکەکانی و نەتوانێت ئەو کارانە ئەنجامبدات کە فیترەتە خۆڕسکە وەحشییە پەلاماردەرەکەی پاڵنەرێتی، دەبینیت بیریارەکان کە ترس و تۆقینی دەروونیی مێشك و لۆجیکی داگیر کردوون و بێتوانا بوون لە قووڵبوونەوە لە لێکۆڵینەوە و تێڕوانین و حوکمدانی رەخنەگرانە لەسەر شتەکان تەنها لە سنووری ئەو رووکەشەدا نەبێت کە رێی پێدراوە، ئەمەش بەهۆی ئەو خاوکەرەوانەی کە لەناو دەروونەکاندا جێگیر بوون و کارێکی وایان کردووە کە عەقڵی موسوڵمان و فیکری موسوڵمان –بە حوکمی ئەم خاوکەرەوە رۆشنبیرییانە– خۆی بۆ خۆی بۆتە پاسەوانی زیندانەکەی و زێوانی پەرستگای دواکەوتوویی و نەتواناییەکەی، لەوانەیە خاوکەرەوە رۆشنبیریی و عەقیدەییە هیندۆسییەکان و ئەوەی ئەم بیروباوەڕانە لە دەروونی هەڵگرانیدا دروستی کردووە لە ترس و تۆقینی دەروونی بە درێژایی سەدەکان ئەم دیاردە دەروونییەمان بۆ روون بکاتەوە، کە دەبینین خاوکەرەوە رۆشنبیرییە هیندۆسییەکان وای لە سەدان ملیۆن لە چینی خوارەوەی دوورخراو لە هیند کردووە کە خۆیان پاسەوانی ناڕەحەتی و نەگبەتی و بەدبەختیی خۆیان بن و ئەمینی زیندانی لاوازیی و شوورەیی خۆیان بن.

چەندێك دەروونەکان تەنگی و ناخۆشی و ئازار دایدەگرێت کاتێك زۆرێك لە پیاوانی فیکری ئیسلامی دەبینێت، کە زۆرجار سڵ دەکەنەوە لە دەربڕینی ڕاکانیان تەنها لە سنووری خوازراو و عادەتی و بۆماوەدا نەبێت، ئەویش بەهۆی زاڵبوونی خاوکەرەوە رۆشنبیرییەکان بەسەر دەروونیاندا و لە ترسان و تۆقین لە کاردانەوە نەفسییە ناژیرییەکان کە ئەوەندە دووبارە بوونەتەوە کە بە تێپەڕبوونی رۆژگار کۆنترۆڵی عەقڵییەتی جەماوەری ئوممەتەکەیانی کردووە و

ڕێگە نادات بە گفتوگۆی تۆکمە کە بوار دەکاتەوە بۆ تێڕوانینی ئیجتیهادیی نوێگەریی تر کە پشت دەبەستێت بە بنەماکان و جێگیرە بنچینەیییەکان لە عەقیدە و مەبەستەکاندا، نەك بۆماوەکانی سەردەمەکانی پێشتر کە زۆریان ناپوخت بوون بە لایەنگریی و کۆمەڵەگیرییە بەسەرچووەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە چەند بارودۆخێك و حاڵێکی تایبەتیی سەپاندیان، کە تا ئێستاش —بەهۆی نیشتووە ڕۆشنبیرییە بۆگەنە دووبارە و پەیدابووەکان لە نەزانیی مەنهەجییەوە— دەروونەکانی ئوممەت و ڕۆشنبیرەکانی داخ دەکات و دەبێتە هۆی ورووژاندنی ترس و تۆقین و ملکەچیی کوێرانە لە ناخیاندا، کە بەکاریگەریی ئەمەوەو لە واقیعی ئوممەتدا تەنها پەرتەوازەیی و رق و کین و بوغزاندن و نەتوانایی لە بیرکردنەوە و تێڕوانین و ئیجتیهاد و نوێگەریی کۆمەڵایەتی و شارستانیی ماوەتەوە، کە ئەمانە خولانەوەی چەرخەی زەمەن لە بواری فیکر و تێڕوانین و جێبەجێکردن و کارکردندا پێویستی کردوون، پێویستە لەسەر بیریاری موسوڵمان، کە خۆی پرچەك بکات بە ئازایەتی لە رادەربڕین و نوێگەریی لە فیکر و تێڕوانیندا، بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر واقیعی ژیاندا دێن و ئەو ئیمکانییەتانەی کە کەڵەکە بوونی زانیاریی و شارەزاییەکان دەیخەنە بەردەست و ئەو شتانەی کە ڕووبەڕووبوونەوەکان دەیورووژێنن و ئەوانەی کە گۆڕانکارییەکان پێویستی دەکەن، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانێت بنەما و بەهاکان بە شێوەیەکی کرداریی کاریگەر دابەزێنێتە سەر واقیعی ژیانی مرۆڤەکان و چنراوی پەیوەندییەکانیان و موعامەلاتیان و دروستکردنی دامودەزگاکانیاندا.

## هەمەلایەنی و بنیاتنانی لەپێشەکان (ئەولەویات)

لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنیی شیکاریی بە سروشتی خۆی —بەبێ بەڵگە— تاکلایەنی فاکتەرە کاریگەرەکان وەرناگرێت لە هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییدا، بەڵکو وادەبینێت کە بنچینە لە شیکردنەوەدا بریتییە لە فرەیی فاکتەرە کاریگەرەکان لە دروستکردنی هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گشتییدا و بریتییە لە ئاسانکارییەکی خەلەل دروستکەر —بەهۆی هۆکارە ڕۆشنبیریی و عاتیفی و تێڕوانینە هەڵبژاردەکان و هەڵبژاردنە هەڕەمەکییەکان— کە ئەگەر تەنها

ئیعتیمادی جوزئی بکرێتە سەر یەك فاکتەری دیاریکراو، یان گرووپێك لە فاکتەر و هۆکارەکان و پشتگوێخستنی غەیری ئەمانە لە هۆکارە بابەتییە گرنگەکان کە پەیوەندییان بە هەموو لایەنەکانی ئەو دیاردەیەوە هەیە و پشت بەستن بە ئاکامەکانی تێڕوانینە جوزئییەکان کە زۆرجار شەحن دەکرێن بە هێما عاتیفییە بۆماوەکان بەهۆی بەزینی عەقڵی دوێنراوەکان و بوونیان، کە ئەمە تاریکیی حاڵەتەکە زیاتردەکات و کۆسپە پرۆگرامییەکان دادەنێت و رێگر دەبێت لەبەردەم تێڕوانینی رەخنەگرانەی جیددی و گفتوگۆی هێمنانەی دامەزراو کە مەبەستێتی شاراوەی بابەتەکان تێبگات و مێشکەکان رووناك بکاتەوە و کۆسپەکان ببڕێت و کێشەکان چارەسەر بکات و رووبەڕووی تەحەددییاتەکان ببێتەوە.

زانینی فاکتەرە گرنگە کاریگەرەکان لە هەر مەسەلەیەکدا یان لە هەر بوارێکدا و ناسینی تێکەڵاوبوونە ئاسۆیی و ستوونییەکانی کارێکە کە گرنگییەکی هەرە گەورەی هەیە لە تێگەیشتنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکەدا و شوێنکەوتنی شوێنەوارەکانی و دانانی چارەسەرە کاریگەرەکان بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵیدا، بەڵام ئەمە رێگر نییە لە بەردەم رێکخستنی لەپێشەکان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم فاکتەرانەدا و روونکردنەوەی شوێنەکان و پلەکانیان لە گرنگیدا لە دروستکردنی دیاردەکەداو لە رێکخستنی چارەسەری گرفتەکانیدا.

ئەوە گرنگە، لە لێکۆڵینەوەی هەر مەسەلەیەك، یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییدا، کە نەك تەنها بڕوانینە کۆمەڵە فاکتەرە کاریگەرەکە تێیدا و زانینی جۆری کارلێك لە نێوانیاندا، بەڵکو ئەوەش گرنگە لەم بوارەدا کە هۆکارە سەرەکییەکان و ئەو کاریگەرییە لاوەکییانەی لێی دەکەونەوە لێك جیا بکەینەوە، چونکە زۆرێك لە بیریارەکان ئەوەیان لەسەر تۆمار کراوە کە تەنها کاریگەرییە لاوەکییەکان وەردەگرن و گرنگیی پێویست نادەن بە شتە سەرەکییەکان و رەوڕەوەی هەوڵەکانیان لە بازنەیەکی ناکۆتادا لە چارەسەرە رووکەشییە ناتەواوە نەزۆکە دووبارەکاندا دەسووڕێتەوە، کە ئەمان لەمەدا وەك ئەو کەسانە وان کە هەوڵو وزەکانیان دوایی دێنن و خۆیان تەواو هیلاك دەکەن لە چارەسەری نەخۆشەکانی (بەلهارزیا)دا بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە سەرچاوەی نەخۆشییەکە و چۆنێتی دروستبوونی و قەلاچۆکردنی ئەو پاشەرۆکانەی کە فڕێ

دەدرێنە ناو سەرچاوەکانی ئاوەوە و پیسیان دەکەن و دەیانکەن بە سەرچاوەیەکی تازەوەبوو و نەبڕاوە بۆ تووشبوون بە نەخۆشییەکە و تەنینەوەی درمەکە.

ڕووبەڕووبوونەوەی کاریگەرییە لاوەکییەکان بە تەنها جێگرەوەی ڕووبەڕوو بوونەوەی فاکتەرە سەرەکییەکان نییە، هەربۆیە ڕووبەڕووبوونەوەی ئیستیعمار و جیهانگیریی (عەولەمە) و ئەوەی پێیانەوە بەندە لە کۆنترۆڵ کردن و خۆسەپاندنی جیهانیی ستەمکارانە، نابێت بە هیچ جۆرێك ئەوە بگەیەنێت لای ئێمەوە کە کەمتەرخەمیی بکەین لە ڕووبەڕووبوونەوەی —بە پلەی یەکەمیش— ئەو هۆکارانەی کە ئامادە و لاوازمان دەکات بۆ داگیر کردن و ئیستیعماربوون و پێویستە بوێرانە ڕووبەڕووی هۆکارەکانی لاوازی و کەمتەرخەمیی خۆیی ببینەوە بۆ ئەو دواکەوتوویی و بێتوانایی و پاشکۆیەتییەی لە کیانی ئوممەتماندا هەیە.

هەر بۆیە زۆر گرنگە بۆمان لەم لێکۆڵینەوەیەدا کە تێبگەین لە تابلۆ هەمەلایەنەکە و زانینی فاکتەرە سەرەکییە کاریگەرەکان لە قەیرانی دواکەوتوویی ئوممەت و پارچەپارچەیی و بێتواناییەکەی‌دا، هەروەها دەبێت لە یەکتربڕین و چوونە ناویەکی ئەم فاکتەرانە تێبگەین و لە پێکهاتەکانی گۆڕینەوەی کارتێکردن و کارکردنە سەر یەکتری فاکتەرەکان بە ئاسۆیی و ستوونی و لە زەمان و شوێندا حاڵی ببین و سنووردارکردنی کاریگەرییە لاوەکییە ناوخۆیی و دەرەکییەکان کە لێوەی کەوتوونەتەوە و بوونەتە هۆی زیاتر کردنی توندوتیژییەکەی و شوێنەوارەکانی چەندجارە کردۆتەوە.

تێگەیشتنی هەمەلایەنەی دروست بۆ هەموو ئەم فاکتەرانە مانا و کارتێکەریی پەراوێزانەی ڕاستەقینەی کارتێکەرە کاتییەکان ئەخاتە حیساباتی خۆیەوە، کە لە لەرەلەری هێڵی بەیانی سەرکەوتوو یان دابەزیو دەچێت، کە نابێتە هۆی گۆڕینی ئاراستەی سەرەکی هێڵەکە ئەگەر بەرەو سەر یان خوارەوە بێت، چونکە ئەم لەرەلەرە کاتییانە —لە زۆر کاتدا— چاوپۆشیی لێدەکرێت لە تۆمارکردنی جووڵەی گشتیی هێڵە بەیانییەکەدا و لە زانینی ئاڕاستەی جووڵە گشتییەکەیدا، باس کردنی ئەم لەرەلەرانە و گرنگی پێدانیان بابەتی خۆی هەیە لە بواری جێبەجێکرنە مەیدانییە کتوپڕەکاندا، کە پەیوەندیی نییە بەم جۆرە توێژینەوە و

لێکۆڵینەوانەوە، کە تۆماری ئاراستەکانی جووڵەکانی شارستانییەتەکان دەکات لە دابەزین و رووخاندنیاندا، هەربۆیە قووڵبوونەوە لە درێژەی ئەم لەرەلەرانەدا بەرچاو تاریك دەکات و تێگەیشتن چەواشە دەکات و فیکر نوقم دەکات لە لمە جووڵاوەکاندا (رمال متحركة) و لە جووڵە خەیاڵاوییەکاندا.

پرۆگرامی هەمەلایەنەی راست بریتییە لەو پرۆگرامەی کە قووڵ دەبێتەوە و گرنگی دەدات بە شیکار کردنی فاکتەرە سەرەکییەکان و سروشتی کارلێك لە نێوانیاندا تێدەگات، هەروەها گرنگیی دەدات بە زانینی کاریگەرییە لاوەکییەکان کە لێوەی دروست دەبێت، لە هەمان کاتدا هەڵدەستێت بە رێکخستنی ئەم فاکتەرانە بەپێی پەیژەی لەپێشەکان لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئیشکالییەتەکانی بەردەست و بەپێی ئەو کاریگەرییە لاوەکییانەی کە لێوەی دەکەونەوە، ئەمانە هەمووی لەژێر تیشکی باردودۆخەکان و ئیمکانییاتەکانی بەردەست دەبێت.

ئەگەر فاکتەرە کاریگەرەکان و کاریگەرییە لاوەکییەکانی پاشتر فرەبوون و ئەولەویاتەکان و کارتێکەرەکان جیاواز بوون، ئەوا پێویستە ئەو هۆکارانە و رێوشوێنانەی کە پێویستە بگیرێنەبەر بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیاندا بەشێوەیەکی زیندوو و تازەوەبوو، فرە و چەند جۆر بن، بە شێوەیەك کە هەموو لاشەی ئوممەت وزەکانی هێزەکانی بگرێتەوە، هەروەها دەبێت تەجنید بکرێن – بەپێی توانا– بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ دیاردەکەدا و چارەسەری گرفتەکانیدا، پەڕاندنی کۆسپەکانی و رووبەڕووبوونەوەی تەحەددییاتەکانی و سووربوون لەسەر هەمەلایەنی و تەواویی چارەسەرەکاندا و بەردەوامبوونی لێکۆڵینەوەکان و بەدواداچوونی ورد، ئەمەش بە مەبەستی کێشانی پلانەکان و پڕکردنەوەی بۆشاییەکان و توندوتۆڵکردنی لەپێشەکان و گرتنەخۆی پێشهاتەکان و بەدواداچوونی قۆناغ و گۆڕانکارییەکان.

ئەگەر بەشێوەیەکی مەنهەجییانە بڕوانینە دیاردەی هاتنە دواوەی بارودۆخەکانی ئوممەتی ئیسلامی و پارچە پارچە بوونی ریزەکانی و دواکەوتنی و نەتوانینی بۆ بەجێگەیاندنی پرۆژە چاکسازییە شارستانییەکەی بە درێژایی زیاتر لە ١٠٠٠ ساڵ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئوممەت لەم ماوە دوورودرێژەدا زۆرێك

چارەسەری وەرگرتووە بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ قەیرانی هاتنەدواوە و پارچە پارچەیی و دواکەوتنیدا، بۆ بەدەستهێنانەوەی تەندروستییەکەی و پلەوپایە شارستانییەکەی (کە شایەتە لەسەر هەموو جیهان)، بەڵام دەبینین تا ئەمڕۆش نەیتوانیوە کە ئەم ئامانجە بەدەست بێنێت لەگەڵ هەموو ئەو دڵسۆزی و قوربانیدانەی کە لە لایەن زۆرێك لە رۆڵەکانی ئوممەتمان و پیاوەکانییەوە دراوە، بەڵکو ئێمە لە راستی دوور ناکەوینەوە کە ئەگەر بڵێین: دەلاقە و بۆشایی نێو (توانای شارستانی) و (پێهەستانی سەرکەوتوو) –لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژەکان– فراوانتر دەبێت لە نێوان ئوممەتی موسوڵمان و ئوممەتانی پێشکەوتوودا، ئەویش بەهۆی زیادبوونی توانا زانستییەکان و تەکنەلۆجیا نوێکان لەلای ئەو ئوممەتانی تر، کە ئەمە وایان لێدەکات رۆژ لە دوای رۆژ چنگی کۆنترۆڵکەر و چەوسێنەر و دواخەریان لە کیانی ئوممەت و چارەنووسیدا زیاتر گیر بکەن، بەهۆی ئەمەوە بەشی کۆمەڵانێکی زۆری رۆڵەکانی لە برسێتی و نەزانیی و نەخۆشی و دواکەوتوویی زیاد دەبێت، تەنانەت لەوانەیە رۆژێك بێتە پێشەوە –خوانەخواستە– کە زۆربەی زۆری ئوممەت تەنها ئەوەندە بزانن –بە پێوەری سەردەم– کە مرۆڤەکانی چاخە بەردینەکان دەیانزانی.

لە سەردەمی تەحەددای رۆژئاواو و هاتنە دواوەی دەوڵەتی عوسمانی کە کۆتایین دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی بوو، دەبینین کە هەوڵەکانی چاکسازی و راپەرین لە جیهانی ئیسلامییدا زۆر و هەمەڕەنگ بوون بەدرێژایی نزیکەی (٣) سەدە، لە هەموو بۆچوونە جیاوازەکان و لایەنەکاندا، کە سەرەتا لە بزوتنەوەی چاکسازی ئایینی لە سەردەستی ئیمام (محمدی کوڕی عبدالوهاب) (١٧٩٢ز مردووە) لە دورگەی عەرەبییەوە دەستی پێکرد، هەروەها شەهید (شاە ولی اللە) (١٧٣٦ز مردووە) لە هیندستان و سوڵتان (سەلیمی سێیەم) (١٨٠٧ز مردووە) و ئەوەی دوای ئەمان هاتن لە بزوتنەوەکانی چاکسازی ئایینی لەسەر دەستی (محمدی کوڕی عەلی سنوسی) (١٨٥٩ز مردووە) لە لیبیا و (محمدی مەهدی) لە سودان (١٨٨٥ز مردووە) و خدێوی میسر (محمد عەلی پاشا) (١٨٤٩ز مردووە) و وەزیری عوسمانی (خەیرەدین پاشای تونسی) (١٨٩٠ز مردووە) و ژیاننامەی (سەید ئەحمەد خان) لە هیندستان (١٨٩٨ز مردووە) و (جەمالەدینی ئەفغانی)

(١٨٧٩ز مردووه) و شێخی ئیمام (محمد عەبدە) (١٩٠٥ز مردووه)، شێخ (عبدالرحمن کەواکیبی) (١٩٠٢ز مردووه)، سەید (محمد رەشید رەزا) (١٩٣٠ز مردووه)، شەهید (حەسەن بەننا) (١٩٤٩ز مردووه)، ئەوانەی تریش، کە هاتن دوای ئەمانە لە دەستپێکردنی بزووتنەوەی سەربەخۆیی زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامییەکانەوە لەگەڵ سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا هەتا ئەمڕۆمان، لە هەوڵە ئاوەدانکەرەوە مەدەنییەکان و بزوتنەوە نەتەوەییە عەلمانییەکان، لە زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامییدا و ئەوەی لەم بیر و بزوتنەوە و هەوڵانەوە هاتنە ئەنجام لە گۆڕانکاریی زۆری فیکریی و رۆشنبیریی و ئاوەدانیی، بەڵام هەموو ئەمانە لە سەرەنجامدا نەیانتوانی —لەوەی کە لەبەردەستدایە— سەرکەوتوو بن لە ناسینی تەنگوچەڵەمەی ئوممەت و دەستنیشان کردنی هەموو هۆکارەکانی نەخۆشییە گرنگ و کاریگەرەکانی و وەسف کردنی چارەسەرە پێویستەکان بۆ دەرهێنانی لە زۆنگاوی دواکەوتن و پاڵپێوەنانی بۆ ئەوەی بتوانێت ئەنجام بدات و بەرهەمهێنەر بێت، هەروەها هێنانەدی ئامانجەکانی پرۆژەی شارستانیی ئوممەت و سەرکەوتن لە رووبەڕووبوونەوەی تەحەددیاتە تۆقێنەر و زیادبووەکانی سەردەم.

لەم بوارەدا، کە ئومێد زۆرە بە توانای فیکریی ئیسلامی و بزووتنەوە چاکخوازەکان بۆ دانانی بنەما کاریگەرەکان بۆ بەرپابوونی رابوونەوەی ئیسلامیی و تێپەڕکردنی قەیرانی ئوممەت، پێویستە لەسەرمان —بۆ بەجێگەیاندنی ئەمە— کە بنەما و دەستپێکەکانی ئەم فیکرە لەمڕۆماندا بزانین، بۆ ئەوەی لە رووەکانی هێز و لاوازییەکانی تێبگەین بۆ ئەوەی کە لێکۆڵینەوەکە مەبەستی تەواوکاریی لەگەڵ ئەو دەستپێکانەدا بەجێبگەیەنێت و ئەو کەلێنانەی تێیدایە پڕی بکاتەوە کە تا ئەمڕۆمان رێگر بوون لە بەردەم ئوممەتماندا کە ئەو ئامانجانەی لێی رادەبینرێت بەجێی بگەیەنێت.

زۆر ئاسانە، کە ناوکرۆکی ئەو مونتەلەق و دەستپێکانە دیاریی بکەین کە تاقمەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی —بە جیاوازییەوە— تەبەنناى دەکەن، کە ئەم دەستپێکانە لە بنەڕەتە فیکرییە راستەوخۆکەیدا دەگەڕێنەوە بۆ مونتەلەقەکانی شێخ (عبدالرحمن الکواکبی) و فیکرەکەی لە هەردوو کتێبی (أم القرى) و (طبائع

الإستبداد)دا، کە لە یەکەمیاندا (أم القرى) کۆمەڵێك لە بنەما هەرە گەورەکانی ئیسلام و بەها سەرەکییە بەرزەکانی باس دەکات، کە لە پێشەوەیاندا بنەمای یەکتاپەرستی (التوحید)و بەهاکانی دادپەروەریی و هاریکاریکردن و شورایە، لە دووەمیشیاندا (طبائع الإستبداد) تاوانی ئەو دواکەوتوویی و دابەزینەی ئوممەتمان تێی کەوتووە، دەخاتە ملی حکومەتەکان و ئەو سیفەتانەی، کە فەرمانڕەواکان هەیانە لە خۆسەپاندن و بەفیڕۆدان و گەندەڵیی.

زۆر گرنگە بەشێوەیەکی مەنهەجیی تێبینی ئەوە بکەین، کە لەگەڵ تێپەڕبوونی زیاتر لە (١٠٠) ساڵ بەسەر بۆچوونەکانی ئەم دوو کتێبەدا و تێپەڕبوونی زیاتر لە سێ چارەکە سەدەیەك بەسەر دروستبوونی بزووتنەوە جەماوەرییە چاکخوازە سیاسییە ئیسلامییەکان کە پشت بەم وتانە دەبەستن و هەروەها لەگەڵ بەدوای یەکدا هاتنی هەوڵەکانی حکومەتە مەدەنی و بزوتنەوە عەلمانییەکان، بەڵام نەمانتوانی –بە پێوانی زەمەن– ئوممەت ببینین کە نزیکتر بێت لە ئامانجەکانی لە ئێستادا لەگەڵ ئەوەی کە هەبووە پێش ئەم دەستپێك و راپەڕینانە.

پرسیاری مەنهەجیش، کە بریتییە لەوەی: بۆ ئەم دەستپێکانە سەرکەوتوو نەبوون و بۆچی ئەو هەموو هەوڵانەش سەرکەوتوو نەبوون بە درێژایی هەموو ئەو زەمەنە، لەوەی کە بتوانن زۆربەی ئەو ئامانجانەی لێیان رادەبینرا بەجێبگەیەنن؟ خەلەل لەکوێدایە؟ لە کوێدا تێڕوانینەکان راستییان نەپێکاوە؟ رووەکانی نوقسانی لە هەموو ئەمانەدا لەچیدایە؟ و چۆن بتوانین کە دەستمان بخەینە سەر شوێنی کەلەبەرەکان و ئەوەی کە ماوەتەوە لە هەڵکەوتنەکان؟ شکستهێنانی دۆزینەوە بەزۆری ئەوە ناگەیەنێت، کە دەستپێکەکان هەڵەن، بەڵکو بە زۆریی ئەوە دەگەیەنێت کە دۆزینەوە و پشکنین وردبوونەوە کامڵ نەبووە، هەر بۆیە لێکۆڵینەوەی زانستی رێکخراو (Systematic) بەدڵنیاییەوە –بە فەرمانی خودا– دەبێتە هۆی کامڵبوونی چارەسەرەکان و پاڵپشتیی ئەو هەوڵانەی کە دەدرێن بۆ رووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکە و تێپەڕاندنی کۆسپەکان بۆ بەجێهێنانی ئەوەی داوا کراوە و چاککردنەوەی خەلەلەکان، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو ئەوانەی تا ئەمڕۆ جێبەجێ کراون

زۆربەیان هەڵە بوون، بەڵکو بەدڵنیاییەوە کافی نەبوون بە تەنیا بۆ ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریی و چاکسازییەی کە داوا کراوە.

ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە و پرۆگرامە هەمەلایەنەکەی، نابێتە هۆی سڕینەوەی هەر هەوڵێکی تری دروستکەر، کە دەدرێت لە ڕێگای چاکسازیی خوازراودا و دەبێت بگاتە ئەوەی، کە هەر هەوڵێکی جیددی دڵسۆز، کە دەدرێت لە هەر بوارێك لە بوارەکانی کارکردندا، کە مەبەستی چاکسازیی کیانی ئوممەتە، بەدڵنیاییەوە یارمەتییەکی داوا کراوە کە شوێن و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە و هیوای بەردەوامی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازرێت، کە ئەمە لەهەمان کاتدا دژ نییە لەگەڵ ئەوەی کە بزانین هەموو ئەوانەی تا ئێستا ئەنجامدراون کافی نەبوون و زۆر کەلێن هەیە کە هێشتا پڕنەکراونەتەوە و زۆر سەرچاوە هەیە کە نەچووینەتە سەری و زۆر فاکتەر هەیە کە تا ئێستا چارەسەر نەکراون، هەروەها لێکۆڵینەوە و تێڕوانین و پشکنینی فیکریی مەنهەجیی پێویستە بەردەوام بێت لە ئەنجامدانی ڕۆڵی خۆیدا و بە قووڵییەکی زۆرتر و هەوڵێکی گەورەتر و ئازایەتییەکی زیاتر، کە ترسی درۆینە و پروپاگەندەی بەسەرچوو و پیرۆزییە پووچەڵەکان نابێت ڕێی پێبگرن، ئەویش بەبێ ئەوەی کە زیادڕەوی بکات لە بنەمای مەنهەجی ژیریی زانستی ئیسلامیی ڕەخنەگرانە، بۆ ئەوەی کە لێکۆڵەرەوە شوێنەکانی جێگیرەکان و شوێنەکانی گۆڕاوەکان بزانێت، دوور لە پروپاگەندەی وەهمیی یان هەلپەرست، یان نەیارەکان و بۆ ئەوەی بگاتە تەرازووی ڕاستیی و ڕێنومایی بکرێت بۆ چارەسەرە کاریگەرەکان، کە ئەوەی داوا دەکرێت بەجێدەگەیەنێت و بەهۆشیەوە کردار و گوتار یەکتری پشتڕاست دەکەن و چوونیەك دەبن.

ئەمەش بەشێوەیەکی مەنهەجی ئەوە دەگەیەنێت دەربارەی ئەو قەزییەی کە ئێمە لێی دەکۆڵینەوە –کە بریتییە لە قەیرانی لاوازیی ئوممەت و دواکەوتوویی و پارچەپارچە بوونی و نەتوانایی هەوڵەکانی ڕۆڵەکانی– کە فاکتەرێك، یان چەندین فاکتەر هەیە کە تا ئێستا نەزانراون و –ئەگەر ڕاست بێت– کاراکردنی هەوڵەکانی تر و کاریگەریی فاکتەرەکانی تریان لەسەر وەستاوە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە هەوڵە فیکرییەکان سەربەستیی تەواویان بدرێتێ بۆ دۆزینەوە و لێکۆڵینەوە دەربارەی و پێویستە کە ئەولەوییەتی گونجاو بۆی

بدرێتێ لە هەوڵەکانی بیریارەکان و کارکەرەکان لەم قۆناغە گرنگ و شلۆقەی ژیانی ئوممەتماندا.

## گرنگیی زانینی خاسییەتەکانی هۆنراوەی خودیی عەقیدەیی و فیکریی

یەکەم شتێك، کە لێکۆڵەرەوە تێبینی دەکات، دەربارەی زۆرێك لە دەستپێکەکانی راپەرین و پرۆژەکانی چاکسازیی ئەم دواییانەی ئوممەت —بەبێ گوێدانە هۆکار و پاڵنەرەکان— ئەوەیە کە لە سەرەتاوە بە ئاراستەی تەقلید و دووبارە کردنەوە دەرپەڕیوە، کە ئەم تەقلید و دووبارەکردنەوەیە یان بە ئاراستەی مێژوو بووە لەگەڵ بوونی گوتارێکی پڕکراو لە هێما عاتیفییەکان، یان بە ئاڕاستەی تەقلیدی بێگانەی زاڵ و دووبارەکردنەوەی بووە لە رێی گوتارێکی پڕکراو لە بەڵێن و هیوای تەماوی، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە کە فیکری تەقلید و پینەکردن و دووبارەکردنەوە وزەکانی کارا نەکردووە و پاڵنەرەکانی نەجووڵاندووە و ناشتوانێت، کە وزەکان کارا بکات یان پاڵنەرەکان بجووڵێنێت، بە بەردەوامیش هەوڵەکان و کارەکانی موسوڵمان —هەرواش دەمێنێتەوە ئەگەر حاڵ هەر بەم شێوەیە بێت— کەموکورت دەبێت و کیانی موسوڵمان بە لاوازیی و بێتوانایی و مافخوراویی و چەوساوەیی دەمێنێتەوە، ئەگەربێتو حاڵی ئوممەت، ئاراستەی پرۆژەکانی رابوونەوە و راپەڕینی سەرچاوەی لە بنەماکانی تەقلید و پینەکردن و دووبارەکردنەوەی مێژوو یان بێگانەوە وەرگرتبێت، ئەویش لەبەر ئەوەیە، کە تەقلید و دووبارەکردنەوە لاپەڕەکانی مێژوو ناگێڕنەوە دواوە و وزە شاراوەکان ناجووڵێنن.

هەربۆیە، پێویستە لەسەر لێکۆڵەرەوە و موفەکیر کە تێڕوانینێکی هەمەلایەنەی شیکاریی زانستیی رێکخراوی هەبێت بۆ ئەوەی کە بتوانێت لە دیاردەی دواکەوتوویی و دابەزینی ئوممەت تێبگات لە هەموو لایەنەکانەوە، هەروەها بۆ ئەوەی هۆکارە زانستییە کاریگەرەکان بزانێت بۆ هەڵسوکەوتی زانستیی کاریگەر لەگەڵیدا، لە دەستپێکە ئەصڵییەکانی خۆیەوە و لە تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی عەقڵیی و ویژدانیی خۆیەوە، لە چوارچێوەی واقیعی ژیانی و تواناکانی و رووبەڕووبوونە تایبەتییەکانی زەمانی و مەکانییەوە.

## هەڵەکانی پیتاندنی فیکریی لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا

ئەگەر ئوممەت لە مێژووی پێشتریدا ناچار بووە بەهۆی نەتوانایی —لە سەرەتای گەشەکردنیدا— لە دابینکردنی ئەو هەوڵە مەزنەی، کە پێویستە بۆ تەواوکردنی توانەوەی ڕۆشنبیریی و پەروەردەیی ئەو گەلانەی هاتنە ناو کیانی ئوممەتمانەوە، ئەویش بەهۆی ئەندازە زۆرەکەی و خێراییە بەرزەکەی و پاڵنانی کاریگەریی ڕووداوەکان، کە بەدوای یەکدا هاتن بەهۆی فراوان بوونی ڕووبەرەکەی وە ئەگەر فیکری ئوممەت —لە زۆر حاڵەتدا— هەڵەی کرد، یان تەقدیری لەپێشەکان (الأولويات)ی نەکرد ئەوەشی پێویست بوو لەو قۆناغە زووەدا دابینی نەکرد، لە کاتی هەڵسوکەوت لەگەڵ پاشماوە و میراتییەکانی گەلەکانی ئوممەت لە تایەفەگەری و گەلپەرستی و ئەفسانەکان و فەلسەفەی ئیلاهییات، ئەمانە وایان کرد کە لە کۆتاییدا خراپترین سەرەنجامیان لێبکەوێتەوە و بوونە هۆی بەفیڕۆدانی وزەکانی ئوممەت و شێواندنی تێڕوانینی و مانەوە و بەجێمانی سۆفستایی و حلولییەت و پارچە پارچەیی و ئاژاوەکان و لادانی دامودەزگاکان، کە لە کۆتاییدا بوونە هۆی لاواز کردنی هێزی عەقیدی و فیکریی ئوممەت و لەدەستدانی بەڵگە عەقیدەییەکان و چوارچێوەی فیکریی مەنهەجی، کە پێشتر جیاوازیی و تەنهایی و توانای پێبەخشیبوو بۆ نوێبوونەوە و ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی بزووتنەوەی کۆمەڵگا و بەرەوپێش بردنی دامودەزگاکانی.

بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوونە تایبەتمەندییەکانی ئوممەتان و دوورییە شارستانییەکانیان، زۆر گرنگە لەوە تێبگەین، کە هەموو شتێك لە بوونەوەردا بریتییە لە سیستەمێکی ڕێکخراو (System)، هەر لە خانەیەکەوە بۆ گەردیلەکان و بۆ گەردوونیش، هەموو سیستەمێکیش تایبەتمەندیی خۆی، یاسای کارکردنی خۆی و سنووری وزەکانی خۆی هەیە، کە ئەگەر ئەو تایبەتمەندیی و یاسا و سنوورانە چاودێریی نەکرێن ئەوا ئەو سیستەمە تێکدەشکێت و دەڕووخێت، نموونەی نزیکی هەستپێکراو بریتییە لە لەشی مرۆڤ، کە سیستەمێکە تایبەتمەندیی و یاسای خۆی و سنووری وزەی خۆی هەیە، بۆ نموونە وەرگرتنی لەش بڕێك لە ئۆکسجین لە ڕێی لووتەوە سوودمەندە بۆ لەش، بەڵام ئەگەر بێتو بڕێکی کەم —

تەنانەت ئەگەر ١ سم سێجاش بێت– لە هەوا لەڕێی خوێنهێنەرەوە وەربگرێت ئەوا یەکسەری دەیکوژێت، کەواتە پەند و مەبەست لەوانەدا نییە کە ئەم سیستمە وەریدەگرێت یان وازی لێدێنێت، بەڵکو پەند و مەبەست لە شێواز و ڕێگەی وەرگرتنی شتەکانیشدایە، بەهەمان شێوەشە لە نێوان ڕۆشنبیریی و شارستانییەتەکاندا، چونکە پێویستە تێبینیی تایبەتمەندیی و بەهاکان و مەبەستەکان بکرێت، لە هەموو شتێکدا، کە وەردەگیرێت، یان ڕەتدەکرێتەوە و هەروەها بە چ شێواز و ڕێگەیەك وەردەگیرێت، یان ڕەتدەکرێتەوە، کە ئەمە کارێکە بیریارە موسوڵمانەکان نهێنی، شارراوەکانیان هەڵنەداوەتەوە بە ڕێگەی زانستییانەی پشکنەرانەی وردو گرنگی پێویستی خۆیان نەداوەتێ و ڕوونکردنەوەی داواکراویان نەکردووە.

ئوممەتمان لەمڕۆدا، لەگەڵ بەیەکگەیشتنی فیکرە پووکاوەکەی و سیستمە رزیوەکەی بە فیکری بێگانە کە بەرامبەرکێی لەگەڵ دەکات بە دامودەزگا پێشکەوتووە نوێبووەکانی –کە تا ڕاددەیەکی زۆریش بەشێوەیەکی زانستیی بابەتییانە لە سروشتی سیستمی فیکر و تایبەتمەندیی کیانەکەی تێنەگەیشتووە[1]– ئەمە بووە هۆی سەرسوڕمانی بە توانای بەرامبەرەکانی و زاڵبوون بەسەریدا و هەروەها داپۆشینی چاوەکانی بە پەردەیەك و بێهۆش بوونی وەعیەکەی، کە ئەمە ڕێگر بووە –لە کارلێکە هەرەمەکییەکانیدا– لەبەردەم زانین و ناسینی سروشتی سیستمی فیکری ئەم بێگانەیە و تایبەتمەندییەکانی بوونی، وەك دوێنێ‌و ئەمڕۆش خستوویەتییە هەمان هەڵەوە، کە بریتییە لە بەیەکگەشتن لەگەڵ فیکری ئوممەتانی تر و فەلسەفەیان و پاشماوەکانیان بەبێ ئاگاداری و پرۆگرامێك، هەر بۆیە لەمڕۆدا دەیبینین کەوتووەتە ناو هەڵەی تەقلیدیی ماددییەتی ڕۆژئاوا، وەرگرتنی ژیان و ماددە بەوەی کە دارستانە و مەبەستیشە، لە ئەنجامی ئەمەش پێناسەی ئوممەت لەقەلەقی تێکەوت بەهۆی

[1] بڕوانە (عبدالحميد أبو سليمان) بابەتی (الأمـة بـين شـريعتين)، گۆڤـاری (إسـلامية المعرفـة) ژمـارە (٢٨) لاپـەڕە (١٣٣-١٤٨)، پـەیمانگای جیهـانیی فکـری ئیسـلامی (هرنـدن، ڤێرجینیـا ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا).

حاڵەتی سەرسوڕمان و دووبارە کردنەوە و وەرگرتنی دەستپێك و فیکر و بەهای پێچەوانە بۆ دەستپێك و فیکر و بەهای تایبەتی خۆی، ئیتر هیچ نامۆ نییە کە ئوممەت پێشوازیی لەوانە نەکات کە پێشکەشی دەکرێت بە حەماسەت و جیددییەتەوە کە ببێتە هۆی جووڵاندنی وزە و گۆڕانکارییە شارراوەکانی و بەردەوام وەك قوتابییەکی تەممەڵ بمێنێتەوە کە ئەرکێك بێت بەسەر شانی شارستانییەتی ڕۆژئاواوە، لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵە زۆرانەی بەدرێژایی دوو سەدە دراون و تەنها بەوەندە رازی بێت کە ببێتە هۆی مانەوەی، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ژیان و مادده لە ویژدانی ئوممەتی ئیسلامی و لە سیستمی کیانە ویژدانییەکەیدا هەرگیز ژیان ناکات بە دارستان و هەرگیز مادده —لەگەڵ بوونی پێویستیی زۆر بۆی— ناکاتە مەبەست خۆی لەخۆیدا، چونکە ژیان لە ویژدانی موسوڵماندا پێویستە هۆکارێك بێت بۆ مەبەستێکی مرۆییانەی خێرخواز و لەسەر بنەمای شەریعەتی دادپەروەریی بێت، نەك شەریعەتی دارستان: لە لێکهەڵوەشان و ڕەگەزپەرستیی و خۆسەپاندن، کە تێیدا حەق و راستیی تەنها بۆ هێز بێت، نەك هێز بۆ حەق و راستی بێت.

چوونییەکی و هاوئاهەنگیی نێوان ویژدانی ئوممەتی ئیسلامیی و بوونیدا لەلایەك و سروشتی فیکر و مەبەستەکانی جووڵەکانی و دەلیلی سیستمەکەی لەلایەکی ترەوە، شتێکی زۆر پێویستە بۆ تەقاندنەوەی وزە ئیمانیی و ئاوەدانکارییەکەی و ورووژاندنی حەماسەت و هێزی ئیرادە لە دەروونی ڕۆڵەکانیدا، کە سەردەمی پەیامبەر و سەرەتای خیلافەتی راشیدیی، نموونەیەکی پرشنگدار و ڕێنموونیکەرێکە لە مێژووی ئوممەتماندا، بەپێچەوانەی باری فیکری ئیسلامیی هاوچەرخ، کە دەلیلی تێڕوانینی ونکردووە و خۆی دەگەوزێنێت لە چڵپاوەکانی کارلێکە هەڕەمەکییەکاندا بەبێ بناغەیەکی مەنهەجیی لە کارلێکیدا لەگەڵ شارستانییەتی ڕۆژئاوادا، ئەمەش بە هاوشێوەی ئەو کارلێکە هەڕەمەکییە بێ بناغە مەنهەجییەی کە لە سەردەمەکانی ئومەوی‌و عەبباسیدا روویدا لەنێوان سیستمی فیکر و شارستانیی ئیسلامیی و سیستمی فیکر و شارستانیی ئیغریقیدا، کە ئیفلاسی کردبوو و بە ڕۆڵی خۆی، کە پێشتر پێی هەستابوو، ئەو کارلێکە لەگەڵ ئەوەدا کە سوودی بە شارستانییەتی ئیسلامیی گەیاند لە

فێربوونی پاشماوەی پیشەسازییە کۆنەکان و پوختەی زانستە فیزیاییەکانیان، بەڵام لەلایەکی ترەوە زەرەری گەیاند بە گیانی شارستانییەتی ئیسلامیی لەلایەنی رۆحی و عەقیدەی یەکتاپەرستی جێنشینگەرانەی ئاوەدانکەرەوە، هەروەها لە پرۆگرامگەرایی نێگەتیڤانە و هێواشیی جووڵەی و لە کۆتاییدا بووە هۆی تەماوی بوونی تێڕوانینی گەردوونیی ئیسلامیی و سەفسەتەی ئیلاهییات و مەنتیقی رووکەشییانە ونبوونی پرۆگرامی ئیسلامیی زانستیی تاقیکاریی و زاڵبوونی پاشماوەی ئیسرائیلیات و فیکری خورافە و ئەفسانە و جادووگەریی بەسەر ئوممەتدا، کە پاڵی پێوەدەنێت بەرەو مردن و خامۆش بوونەوە، ئەمەش ئەو بارەیە کە لەمڕۆشدا دووبارە دەبێتەوە لە شێوازێکی تردا لەنێوان سیستمی فیکر و شارستانییەتی ئیسلامیی و سیستمی فیکر و شارستانییەتی ماددیی رۆژئاوادا، بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەو هەڵە مەنهەجییە گەورەیە بین، کە پێشتر کەوتینە ناوی و بەبێ ئەوەی کە لەو دەرسەوە ئەوەش شایەنێتی، لە پەند و عیبرەت وەربگرین.

## پەیوەندیی نێوان مەعریفی و ویژدانی

لە گرنگترین ئەو شوێنەوارانەی لە قەیرانی پرۆگرامگەراییەوە تووشی بیری ئیسلامی و زانایانی ئوممەت و بیریارەکانی هاتووە بە هۆکاری تەنهایی و جیابوونەوە و عەزلەوە، بریتییە لەوەی لێوەی سەریهەڵدا لە پشتگوێ خستنی لایەنی مەعریفەی مرۆیی و پشتگوێ خستنی لێکۆڵینەوەی زانستی کۆمەڵایەتی و کەوتنە ناو کۆیلایەتی پرۆگرامی جوزئی دەقییانەی زمانەوانی، کە لە ئەنجامەکانی ئەمەشەوە پشتگوێ خستنی رۆڵی ئافرەت و منداڵی لێکەوتەوە لە چاکسازیی و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییدا، کە لەمەوە دیارنەمانی دووریی زانستیی پەروەردەیی روویدا کە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە منداڵیی دەکات و لەو قۆناغانەی پێیدا تێدەپەڕێت و گرنگیی لە پێکهێنان و دروست کردنی عەقڵی تازەپێگەیشتووان و بوونیاندا (ویجدانیان) و ئەوەی بۆیان دەگونجێت لەو وتارانەی ئاراستەیان دەکرێت و لە دیاریکردنی سروشتی نەوەکانی داهاتوو و

توانا مەعریفی و ویژدانییەکانیان لە رووبەڕووبوونەوەی تەحەددییەکان و پێشهاتەکاندا.

## فیکری پەروەردەیی و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی

مەبەست لەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لەوەی، کە مەسەلەی منداڵیی و ڕۆڵی فیکری پەروەردەیی لەبارەیەوە –لەبەر ئەوەی کە دەسپێکێکی سەرەکییە لە ئەنجامدانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییدا– بخرێتە سەر خوانی لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە و تێڕامان، ئەوەی پێوەی بەندە لە مەسەلەکانی پاککردنەوەی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی و پاککردنەوەی مەدخەلە پەروەردەییەکانی و تەواوکردنی فیکری ئیسلامی بۆ ئامرازە پڕۆگرامگەراییەکانی لە لێکۆڵینەوەی سوننەتەکان و سروشتەکان و واقیع لە شوێن و کاتدا، هەروەها لە تێگەیشتنی دەق و مێژوو و حاڵیبوون لەوانەی پێشکەشی دەکەن لە ڕێنومایی و وانە و پەندەکان، بەشێوەیەکی راست کە گونجاوبێت لەگەڵ کات و شوێندا، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوانە بە شێوەیەکی ئیجابییانەی کاریگەر ڕۆڵیان هەبێت لە پێکهێنانی عەقڵییەتی منداڵی موسوڵماندا و بنیاتنانی کیانە دەروونی و ویژدانییەکەی، ئیتر ئەو کاتە پاك دەبێت لە شێواوی و لادانەکان و جادوگەرییەکان کە تێڕوانینی گەردوونی موسوڵمان تێك دەدەن و دەبنە هۆی لاوازکردنی گیانی زانستی وزە داهێنەرەکان تێیدا و سەرەنجام ماناکانی عیززەت و سەربەرزی و کەرامەت و برایەتی و سەرخستن لە بینای نەفسییەت و عەقڵییەتیدا لەناو دەبات.

منداڵیی و تێگەیشتن لە دیلالاتە زانستی و نەفسییەکانی لە ئەنجامدانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییدا بریتییە لەو دوورییە سەرەکییە ونبووە لە ئەنجامدانی گۆڕانکاریی دەروونیی بەکۆمەڵ، کە زۆر گرنگە بۆ دەستخستنەوەی تێڕوانین و جووڵاندنی وزە ویژدانییەکان و رووبەڕووبوونەوەی تەحەددییەکاندا.

ئەرکی سەرشانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە تیشك خستنەسەر ئەم دوورییە ونبووە و روونکردنەوەی دوورییەکانی و کارلێکەکانی لەگەڵ فاکتەرەکانی ترداو زانینی ڕێگا زانستییە پراکتیکییەکان بۆ تەواوکردنی ئەم کەموکورتییەو پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە، بە مەبەستی تەواوکاریی لەگەڵ ئەو

هەوڵانەی کە دەدرێن بۆ بیناکردنی پرۆژەی چاکسازیی ئوممەت و بەرەوپێشچوونی و تەواوکردنی ئامڕازەکانی، کە خزمەتێکە بۆ ئوممەتمان و بۆ مرۆڤایەتیش و دەرخستنی رێنومایی و هیدایەتی پەیامی ئیسلامە لەم سیستمی لادێ جیهانییەی سەردەمماندا.

لەبەر ئەوەش، کە لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانەیە بە پلەی یەکەم هەر بۆیە تەرکیز دەخاتە سەر رووەکانی نوقسانی و کەموکورتی لە هەوڵەکانی پێشتردا، هەر لەبەر ئەمە تەرخان دەبێت —لەگەڵ ئەوەشدا، کە شتێکی ناخۆش و بەئازارە— بۆ گەڕان بەدوای رووەکانی کەم وکورتی کە بوونەتە هۆی دروستکردنی ئەو لاوازیی و پەرتەوازەیی و دواکەوتنەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا روویداوە، دوایخستووین لەوەی کە ئیسلام دەیتوانی بمانگەیەنێ و بۆمان بەجێبگەیەنێت لە ژیانمان و مێژووماندا، بەشێوەیەك کە فاکتەرەکانی کەموکورتیی زاڵبوون بەسەر دەروونەکانماندا وایان لێکردووین، کە لەمڕۆماندا ئێمە لە کۆتایی کاروانەکەدا بین، هەر بۆیە ئومێدەوارم کە خوێنەر بە باشیی لە مەبەستی رەخنەکان تێبگات و تەرکیزیش بخاتە سەر مەبەستەکەی لە زانینی رووەکانی نوقسانی و کەموکورتی، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوەکە بەتەنها مەبەستێتی کە نوقسانییەکان پڕ بکاتەوە و تەواوکاریی لە هەوڵەکاندا بکات، پێویستە ئەوەش بزانین کە تەقدیر و بەرز راگرتنمان بۆ ئەوەی پێش خۆمان نابێت رێگر بێت لەبەردەم زانینی رووەکانی کەموکورتیی و کەمتەرخەمیی تێیدا، ئەویش بۆ ئەوەی لە کەوتنەکە هەستینەوە و کەلێنەکە پڕ بکرێتەوە و ئەوەی ئومێدی لێدەکرێت بەجێبگەیەنرێت، بە ویستی پەروەردگار.

زۆر هەڵەیە، کە رابووردوو دادگایی بکرێت بە واقیعی ئەمڕۆمان و دەرەنجامەکانی، بەڵکو پێویستە دادگایی بکرێت بە واقیعی کاتی رووداوەکانی خۆی، بۆ ئەوەی تەقدیر کردنی راست و هاوسەنگ بێت، بۆشمان هەیە زۆر بە گەورەیی و سەربەرزییەوە تەقدیر و شانازیی بکەین بە دەستکەوتەکانی شارستانییەتی ئیسلامیی و ئەوانەی پێشکەشی کردوون لە رێڕەوی مێژووی مرۆڤایەتییدا، لەگەڵ ئەوەشدا، کەموکورتە لەوەی کە ئێمە لەمڕۆدا دەمانەوێت و لەوەی کە دەیتوانی پێشکەشی مرۆڤایەتیی بکات لە دەستکەوتەکانی، ئەگەر

بارودۆخەکە بیهێڵایە و بوار بکرایەتەوە لەبەردەم پاڵنانی گیانی ئیسلام و ئاستەنگ و تەنگەبەر و لادانەکانیش کەمتر بوونایە، شارستانییەتی ئیسلامیی بە هەموو پێوەرێك بریتی بوو لە ماوەیەکی رۆشن و پرشنگدار و بازدانێکی مەزن و ئەنجامدانێکی بلیمەتانە لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، شوێنەوارەکانی ئەم شارستانییەتە و ئەوەی کە ئەنجامدانی لە ژیانی گەلە موسوڵمانەکاندا لە گۆڕانکاریی شایەتیی بۆ دەدەن، ئەوەی کە خستیە سەر کەلەپووری شارستانییەتی مرۆڤایەتی نوێ لە بنەماکان و پرۆگرام و دەستپێکەکانیش، بەڵکو درزەکانی لاوازیی و بێتوانایی لە بینای شارستانییەتی ئیسلامییدا چاوی تێبینەر و پشکنەر ئەساسەکەی ون ناکات، کە بەهۆی پشتهەڵکردنی ئەم شارستانییەتە لە دەستپێکەکانی رێنومایی ئیسلامیی لە کاروبارەکانی روح و رەووشت و کۆمەڵناسییدا روویاندا، کە ئەمە ئەوەیە، ئێمە دەمانەوێت لەمڕۆدا پێی بگەینەوە و دەستمان بکەوێتەوە بۆ چاکسازیی بیناکە و نوێبوونەوەی وزەکان و بەرداربوونی درەختەکە.

## رەگەکانی ئەم قەیرانە

ئەگەر دان بەوەدا بنێین کە ئوممەتمان لە قەیراندایە و ئەم —لە زەریاوە بۆ زەریا— هیچی کەم نییە لە سەرچاوە ماددییەکان و سەرچاوە مرۆییەکانی، کە دەگاتە ١ملیار و ٢٠٠ ملیۆن کەس، یان بڵێین نزیکەی پێنجیەکی دانیشتووانی زەوی، هەروەها هیچی کەم نییە لە بەهاکان و بنەماکان مەبەست و ئامانجە بەرزەکان، کە ئیسلام دەوڵەمەندە پێیان زیاتر لە هەموو ئایین و رۆشنبیرییەك و شارستانییەتێکی تر، کە مرۆڤایەتی ناسیبێتی، لەبەر ئەوەی پەیامێکە کە پەیامە ئاسمانییەکان بەهۆی ئەمەوە کۆتاییان پێهات و بوو بە ئەوپەڕی تەواوکاری لە هیدایەت و رێنموویی بۆ خێر و چاکە و حەق و دادپەروەریی و برایەتییو پەیامێك بوو بە یەکسانی بۆ سەرجەم مرۆڤەکان.

ئەگەر دان بە هەموو ئەمانەدا بنێین و دان بەوەشدا بنێین کە هەموو ئەو چارەسەر و مونتەلەق و هەوڵانەی کە تێڕوانینی چاکسازە موسوڵمانەکان و بزوتنەوەکانی چاکسازیی ئیسلامیی پێشکەشیان کرد، سەرکەوتوو نەبوون لە

چارەسەری قەیرانەکە و بەدەستهێنانەوەی تەندروستی ئوممەتمان و پڕکردنەوەی کەلێنەکانی و پتەوکردنی ریزەکانی و تەقاندنەوەی وزەکانی، هەروەها لەو راستییە دوور ناکەوینەوە، ئەگەر بە زمانی رێژەیی بڵێین: کەلێن و نشێوی شارستانیی نێوان ئوممەتە پێشکەوتووەکان و ئوممەتی ئیسلامیی لە فراونبوونی خێرادایە لە جیهانی هێز و تواناو وزەکانی شۆڕشی باڵای تەکنەلۆجیادا.

ئەگەر دان بە هەموو ئەمانەدا بنێین، کە چاریشمان نییە تەنها تەسلیم بوون نەبێت، لێرەدا ئەو پرسیارەی کە بەڵگەنەویستانە خۆی لێمان دێنێتە پێشەوە ئەوەیە: ئایا چی تووشی ئوممەت هاتووە؟ چۆن بەو شێوەیە کاروانەکەی لە رێڕەوی خۆی لایدا؟ چۆن کرداری پاڵنەری رۆحی ئیسلام بەو شێوەیە بەربەستی بۆ دروست بوو، بەشێوەیەك گەیشتە ئەو سەرەنجامە لە بێتوانایی و دواکەوتوویی و لاوازیی؟ بۆچی بەدرێژایی سەدەکان، هەوڵەکانی چاکسازیی و پرۆژەکانی گۆڕانکاریی بۆ بەدەستهێنانەوەی تەندروستی و لەشساغیی ئوممەت و رێککردنەوەی رێڕەوەکەی سەرکەوتوو نەبوون؟

وەڵامی ئەمانەش ئەوەیە، کە مەحاڵە ئەمانە روویاندابن، بەهۆی نەبوونی ویست و ئیرادە بۆ چاکیی و چاکسازیی، بەڵکو هەوڵی زۆر دراون و بە بەردەوامیی دەدرێن، بەڵام ئاشکرایە کە فاکتەرەکانی لەمپەر دروستکردن و لادان زۆر بوون و رەگیان قووڵ بووە و بەدوای یەکداهاتنی رووداوەکان خێرابووە وزەیەکی زیاتری هەبووە لەو وزەیەی لەبەردەستدا بووە بۆ شوێنکەوتنی، بەڵکو ئەمیان پێشیاندایەوە و رێڕەوەکەی ئەویشیان دیاریی کرد، هەربۆیە ئەنجامدانەکان نزیکتر بوون لە چەند کاردانەوەیەك کە بوار نادەن بە کۆنترۆڵ کردنی بارودۆخەکان، تێڕامان لە مەسەلەکان و تێگەیشتنی سروشتەکانیان و پێویستییەکانی رووبەڕووبوونەوەیان، ئەم بارودۆخانە و بەربەستەکانیش وامان لێدەکەن کە پاساو بێنینەوە و لەوە تێبگەین کە بۆ هەوڵەکان کەموکورت بوون —لەگەڵ هەموو ئەو بەخشین و جوامێرییەی کە ئەو هەوڵانە لە خۆیان گرتبوو— لە پاڵپێوەنانی زۆرێك لە بەسەرداهاتنەکانی رووداوەکانی مێژوو و لە قەرەبوو کردنەوەی زۆرێك لە چارەسەری قەیرانەکان و ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانەی

کە ڕێڕەوەکە ڕاست دەکەنەوە و بوار دەکەنەوە بۆ بەردەوامبوونی پاڵپێوەنانی ڕۆحی ئیسلام و پتەوکردنی تێڕوانینە گەردوونییە ئاوەدانکارییەکەی و لابردنی کۆسپەکان لەبەردەمیدا و دوورخستنەوەی بەربەستەکان لەبەردەم زرێی چەرخەکانی پاڵپێوەنانی و کاروانەکەیدا.

ئەگەر ڕێنموویی ئیسلام، تەنها بۆ قەومێك نەبێت بە تایبەتیی، یان بۆ زمانێك بە تایبەتی، بەڵکو ڕێنماییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە گشتیی بە درێژایی سەدەکان، ئەوا پێویست دەبێت لەسەر هەموو تاکێك و هەموو گەلێك و هەموو نەوەیەك و بۆ هەموو کەسێك لە هەر شوێنێکدا بن یان لەهەر کاتێکدا بن، کە بەپێی توانای لێی هەڵبگۆزێت و بەو ئەندازەیەی کە دەروونی ڕێی پێدەدات سوودی لێوە وەرگرێت، چونکە ڕووبارێکی دەوڵەمەندی هەمیشە خێر و ڕێنمایی لێڕۆشتووە، ئاینێکە کە مەشمولە بە پارێزگاریی و تێکنەدان بە بەردەوام بوونی بوون و درێژایی مێژوو، سەرچاوەیەکە کە هەرگیز خێر و چاکەکەی وشك ناکات هەرچەندێك کە خەڵکیی لێوەی هەڵگۆزن، کە بۆ هەموو یەکێکیان بەشی خۆی هەیە لەوەی هەڵیدەگۆزێت، شتێکی سروشتیشە کە ئاوی ئەم ڕووبارە خوڕتر و زیاتر ببێت بە تێپەڕبوونی کات و دووبارەبوونەوەی ئامۆژگاریی و پێگەیشتنی تاقیکردنەوەکە و فراوان بوونی زانیاریی و بەیەکگەشتنی جیهانەکان و گەورە بوونی ئوممەتەکان، کە دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی کەنارەکانی و گەورە بوونی سوود و بەخشینی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ (فصلت:٥٣).

کەواتە سەردەمی پەیامبەر بریتییە لە بەرجەستە بوونی پەیامەکە و جێبەجێبوونی بنەماکان و بەهاکانی لە واقیعی ژیانی مرۆڤەکاندا و بەڵگە هێنانەوە لەسەر هەموو خەڵکیی بە ئیمکانیەتی جێبەجێکردنی و بەرپاکردنی بنەماکانی و بەهاکانی لە برایەتی و حەق و ڕاستی و دادپەروەریی و هاریکاریکردن لە ژیانی هەموو مرۆڤەکاندا و تەنها چەند بیروبۆچوون و فەلسەفە و خەون و بینین و خەیاڵاتێك نین، بە هاوشێوەی ئەوەی کە فەیلەسوفەکان و دانا میسالییەکان دەیهێنن، بەڵکو پەیامێکی حەق و هیدایەتێکی گشتیی خوداییە بۆ مرۆڤایەتی، کە شتە گشتییەکان ڕوون دەکاتەوە و ئەو بەها و

بنەمایانەی بۆ دەستەبەر دەكات كە هەوڵەكانی ڕێنومایی دەكات و ڕێگەكەی بۆ ڕۆشن دەكاتەوە و كردارەكانی جێگیر و دامەزراو دەكات و بوونی بە ویستی خێر و چاكە ڕەنگ دەكات، كە ئیتر دوای سەردەمی پەیامەكە هەموو مرۆڤ و نەوەو قەومو تاكەكان تێیدا یەكسان دەبن، بە ئەندازەی ئەوەی وەریدەگرن و وازی لێدێنن و هەموو بەرەیەك و هەموو تاكێكی مرۆڤایەتی –كە هەر شوێنێكی هەبێت لە مێژوودا– بە ئەندازەی وزەكەی و هەوڵەكەی لە هیدایەتی ئەم پەیامە جیهانییە پارێزراوەی دەست دەكەوێت ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات: ١٣)، بەڵكو لەگەڵ فراوان بوونی بواری تێڕوانین بە تێپەڕبوونی كات و زیادبوونی ئاسۆكانی مەعریفە، بە تایبەتیی ئەو نەوەو بەرانەی كە لە دوای ئەو جیلانەوە هاتن كە هاوسەردەم و تێكەڵاوی كەسانی نەوەی پەیامەكە بوون و ناسیانن، هەر بۆیە پێویستیی بۆ پەیامی ئیسلام گەورەتر بوو و بەرپرسیارێتی جێبەجێكردن و گەیاندنی فراوانتر و گەورەتر بوو و توانای سوودلێوەرگرتنیشی مەزنتر بووە.

## وزەی پاڵنەری ئیمانیی شارستانیی و كەڵەكەبوونی ماددیی ئاوەدانكاریی

كاتێك دەڕوانینە كاروانی پاڵنەری یەكەمی ئیسلامیی و ئەوەی كە تێڕوانینی ئیسلامی و نەوەی پەیامەكە تەقاندیانەوە لە كیانی ئوممەتی ئیسلامی و شارستانێتی ئیسلامیی لە مێژوودا، چۆن لەدواییدا و تا ئەمڕۆش كاروانی پەیامەكە تووشی كۆسپ و لەنگەر هات لە واقیعی ژیانی ئوممەتدا، لێرەدا وا دەردەكەوێت، كە بەها و تێڕوانینو گیانی پەیامەكە، لە جێنشینایەتیی بە برایەتی و دادپەروەریی و بەخشین و چاككردن لە جێبەجێكردندا دەبێت لە جووڵە كەوتبن لە واقیعی ئەمڕۆی ئوممەتی ئیسلامییدا، یان نزیكە لەوە؟ لێرەدا پێویستە كە تێكەڵاوی نەكەین لە تێگەیشتنی مێژووماندا لە نێوان هێزی پاڵنەری دیاریكراو لەلایەك و كەڵەكەبووەكانی بینا و ئاوەدانكاریی و دروستكراوە ماددییەكان لەلایەكی ترەوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە هێزی پاڵنەر لەوانەیە لە كەمبووندا بێت، بەڵام كەڵەكە بووەكانی ئاوەدانكاریی و پیشەسازی –لەوانەیە بۆ

ماوەیەکی درێژ– بەدڵنیاییەوە زۆربەی جار لە زیادبووندایە بەهۆی کاریگەریی کات و هەوڵەکان و بۆماوەکان، ئیتر ئەم وێنە لەخشتەبەرەی تێگەیشتنی مێژوو بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی کە لاوازیی و ستەم و لادان و گەندەڵیی لە کیانی ئوممەتدا دەگاتە ئاستێك کە بنی سەرچاوەکان وشك دەکاتەوە و هاندەرەکانی گیانی پێشدەستی و داهێنان و نوێکردنەوە لەناو دەبات، ئیتر بیناکە دەڕووخێت و پەیوەندییەکان درز دەبەن و دەزگاکان هەرەس دێنن و شوێنەوارەکان کوێر دەبنەوە، تەنها لەوێشدا بۆ بینەر ڕووندەبێتەوە –بە بێ خۆهیلاك کردن– تێڕوانینی پەیوەندیی نێوان لاوازیی گیانی پاڵنان و بەرەوپێشبردن و نوێبوونەوە لە لایەك و لادانی کاروانەکە و گەندەڵیی هەڵسوکەوت و دابەزینی شارستانییەت، لە لایەکی ترەوە.

ئەگەر لادانی کاروانی ئوممەتی ئیسلامیی لە هێڵی کارکردن و ئەنجامدانی نموونەیی، کە جێبەجێکردنی پەیامی ئیسلام کێشای، هەرزوو دەستی پێکرد، ئەویش لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) و تەواو بوونی سەردەمی سەرەتای پەیامی ئیسلام و دەوڵەتی سەرەتای سەردەمی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان، ئەوا هۆکاری ئەمە، ئەوە بووە، کە خەڵکیی و هەموو نەوەکانی دوای نەوەی پێغەمبەرایەتی و پەیام لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان وازیان لێهێنرا بۆ هەوڵەکانی خۆیان لە جێبەجێکردنی پەیامەکە و بۆ ئیجتیهادی خۆیان لە وەرگرتن لێوەی، کە هەموو نەوەیەك و ڕاددەی پابەندبوونی بە پەیامەکەوە یان لادانی لێی بەستراوەتەوە بە وزەی تاکەکانییەوە، بە پێی ئەنجامەکانی کات و شوێن و ئیمکاناتی خۆیان و گۆڕانکارییەکانی بارودۆخیان و ڕووبەڕووبوونەوەکانی سەردەمەکانیان.

ئەم شتەش ئاشکرا و زانراو بووە لە کاروانی مێژوویی پەیامی ئیسلامدا، چونکە گونجاندن لە مێژووی ئوممەتی ئیسلامییدا پێچەوانە بووە لە نێوان هێزی پاڵنەری پەیامەکە و جۆرێتی ئەنجامدانەکان لەلایەك و کەڵەکە بوونی هێماکانی ئاوەدانکاریی ئوممەت و کەلەپوورەکەی و ڕووەکانی شارستانییەت تێیدا لەلایەکی ترەوە.

ئەوەی مەبەستیشمانە لە گونجانی پێچەوانە ئەوەیە، کە بەهێزیی هەرلایەك لە لاکان و گەشە کردنی مانای لاوازیی لاکەی بەرامبەر و پووکانەوەی بووە واتە

لەوکاتەدا کە رۆحی ئیسلام لاواز دەبێت فراوانبوونی دەسەڵات و گەشەکردنی پیشەسازی و ئاوەدانکاریی زیاد دەبێت، پەیامی ئیسلام بۆ سەر عەرەب هاتە خوارەوە کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیاندا دەشتەکیی بوون لە بارودۆخێکی بیاباننشینی و نەزانییدا بوون، کە ئەمە وای کرد زۆربەی تیرەکانیان لە حاڵەتی بیدائییەوە نزیکتر بن، کە نە دەوڵەت و نە یاسا و رێسا و نە ئاوەدانیی و نە زانست و نە پیشەسازییان نەبووە، بەپێچەوانەی ئەوانەی کە هاوسێی دورگەی عەرەب بوون لە شارستانییەتەکانی فارس و رۆم و هیندستان و شارستانییەتە کۆنەکانی وڵاتانی دووروبار و میسر و شام، لە هەمان کاتیشدا وڵاتانی فارس و رۆم و هیندستان شارستانییەتەکانیان ئیفلاسی دەکرد و نوقم دەبوو لە گەندەڵیی و ستەمو لێکهەڵوەشان و دابەزین، پاشان پەیامی ئیسلام هات بۆ جیهان، بە تێڕوانینە گەردوونییە یەکتاپەرستییە پاکە بەرزەکەی و بە بەهاکانی و بنەماکانی و بۆچوونە بەرز و مەرد و خێرخواز و شارستانییەکانی، ئەوە بوو چەند ئاسۆیەکی فراوانی هێنایە کایەوە و چەند پرۆگرامێکی زانستیی رێڕەوییانەی دامەزراوی پێکهێنا، هەموویان بەکۆمەڵ چەند بنەمایەکی پتەو و بەهێزن بۆ پاڵپێوەنانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی و شارستانێتی مرۆیی و نوێکردنەوەیان و کردنەوەی چەند دەرگایەکی نوێی داهێنەرانە لە بوارەکانی زانست و زانیارییە مرۆیی و گەردوونییەکاندا، ئەوە بوو ئوممەتی عەرەبی و لەگەڵیشیاندا هەموو مرۆڤایەتی دەرهێنا لە زۆنگاوی نەفامی و سەرەتایی و لە گەندەڵیی و ستەمەوە بۆ چەند ئاستێکی بەرز لە تێڕوانین و بۆچوون و بنەما گەردوونییە بەرزەکان و هەموویانی خستەسەر چەند رێڕەوێکی فراوان لە پرۆگرامە شارستانییەکان و پاڵینا بە خەڵکانی دورگەی عەرەب و دەوروبەری بۆ قۆناغێکی نوێ لە شارستانییەت لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، شارستانییەتێك کە — بەوپەڕی هاوئاهەنگییەوە— رۆح و ماددە و عەقڵ و ویژدان و زانست و شارراوە و ئاشکراکان بەیەك دەگەن.

شتێکی زۆر ئاساییش بوو کە بەردەوامیی و هێزی پاڵنەری گیانی پەیامی ئیسلام لە سەرچاوە و سەرەتاکانیدا لە سەردەمی پەیامبەر و جیلی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیاندا زۆر بەگوڕ و بەهێز و رامالەر بووبێت، کە وایکرد لە دەوڵەتی سەردەمی پەیامەکە کە بتوانێت رووبەری مەدەنیی جیهان لەوکاتەدا بگرێت لە

کەمتر لە سێ دەیەدا لە کات و بووە هۆی گۆڕینی حاڵەتی عەرەب و نەتەوە شارستانییەکانی دەوروبەریان لەو سەردەمەدا لە رووی ئایین و رۆشنبیریی و سیستمەکانیاندا، بەڵکو بە شێوەیەك حاڵەتی ئەو میللەتانەی گۆڕی کە نەوەی پەیامەکە حوکمڕانیان دەکردن بە شێوەیەکی وا قووڵ کە گەیشتە ئاستێك کە پێشتر وێنەی نەبووە لە کاریگەریی و سەرسامبوون پێی، تەنانەت بووە هۆی گۆڕینی زمانەکانیان لە باکووری نیوەدورگەی عەرەب و باکوری ئەفریقا و رۆژهەڵاتەکەی بۆ ئەوەی کە زمانی عەرەبیی قورەیشیی ببێتە زمانی دایکیان، ئەگەر پاڵنان و گۆڕانکاریی ئیسلامیی بۆ رۆح و عەقڵ و ویژدان زۆر گەورە بێت، ئەوا شتێکی زۆر سروشتیی بووە لە جیهانی سەرەتایی دورگەی عەرەبییدا، کە کاریگەرییە ئاوەدانکارییەکەی لە سەرەتادا سنووردار بووبێت و لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا کەڵەکە ببێت بە تایبەتی لەگەڵ هاتنە ناوەوەی رۆڵەی گەلانی ئیمپراتۆرییەت و شارستانییەتە لەناوچووەکان بۆ ناو ئیسلام و فراوان بوونی رووبەری دەسەڵات و گەشەکردنی پیشەسازییەکان و ئاوەدانکاریی، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا و بەهۆی ئەوەی کە میللەتانی تر کە هاتنە ناو ئیسلامەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنایان لە شوێنەوارەکانی کەلەپوور و عادەتەکان و فەلسەفە و ئاینەکانی پێشتریان، شتێکی ئاسایی بوو کە گیانی ئیسلامەتی لاواز ببێت و خلّتە و پیسیی تێکەڵاوی پاکێتی بیروباوەڕ و تێڕوانینە گەردوونی و رۆشنبیرییەکەی و پرۆگرامەکانی کارکردن و سیستمەکانی حوکمڕانی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ببێت و زۆرێك لە هەڵسوکەوتە کیسرەوی و قەیسەرییەکان لە زوڵم و ستەم و خۆسەپاندن و ئەفسانە و خورافە و گومڕاییەکان پێوەی نیشتنەوە، ئەویش بەهۆی نیشتنی ئەم خلّتە و پیسییانە لە رۆشنبیریی ئەو میللەتانەی کە هاتنە ناو ئیسلامەوە، کە زەمەن و تواناکان یارمەتی گۆڕانکاریی هەموویانیان نەدا، بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی ئەو میللەتانە و پەروەردەکردنیان لەسەر بیروباوەڕەکانی ئیسلام و بۆچوونەکانی و بەهاکانی و پرۆگرامەکانی فیکر و بنەما پاکەکانی، ئیتر لە راستیدا فیکری میللەتەکانی ئوممەت و سیستمەکانیان و هەڵسوکەوتەکانیان بریتی بوو لە تێکەڵەیەك لە بنەماکانی ئیسلام و ئەوەی کە لەگەڵ خۆیاندا هەڵیانگرتبوو لە رۆشنبیرییەك کە

بریتی بووە لە پاشماوەی هەڵسوکەوت و کەلەپوور و عادەت و رەگەزپەرستیی پێشوویان.

هەربۆیە زۆر ئاساییە، کە ببینین مێژووی ئوممەت بۆ ماوەیەکی زۆر گونجانێکی پێچەوانەی نیشان دەدا لە نێوان هێزی پاڵنەری ئیسلام لە سەرەتای سەردەمەکەیدا و فراوانبوونی دەسەڵاتەکەی و و کەڵەکەبوونی ئاوەدانکاریی و پیشەسازیی لە سەردەمەکانی دواتریدا، ئەویش بۆ ئەوەی سەرەنجام ئوممەت تووشی کارەسات ببێت کاتێك کە لاوازیی و گەندەڵیی و دیکتاتۆریەت گەیشتنە ئەوپەڕی و بوونە هۆی کزبوونی گیانەکەی و زیادبوونی لێڵیی بینینەکەی و پیسبوونی رۆشنبیرییەکەی و بڵاوبوونەوەی ستەمەکان و گەندەڵییەکان و کاولبوونی ئاوەدانکارییەکان و رووخانی بیناکە و توانەوەی پیشەسازییەکانو وشکبوونی بەخشین و دواتر نوقمبوونی ئوممەت لە تاریکاییەکانی نەزانیی و ئەفسانە و چەوسانەوە و ستەمدا و تێکشکانی لەبەردەم بەهێزەکاندا و پشت سووتاندنی لە لایەن دوژمنانەوە و بوونی بە نێچیرێکی ئاسان بۆ هەموو دەستدرێژکەرێکی خاوەن چڵێسی و چاوبرسی.

## چۆن لاوازیی وزەی ئیمانیی و رەوشتیی دەستی پێکرد؟

مێژوو بۆمان باس دەکات، بەشێوەیەك کە بواری گومانی تێدا نەماوە کە سەرەتاکانی لادان لە سەردەمی دوای سەردەمی سەرەتای پەیامەکەوە دەستیپێکرد، ئەویش پاش ئەوەی دەستی نەوەی هاوەڵان لاواز بوو و ئیتر ئەو هاوەڵانەی کە ناخ و کانزایان پوختە بوو و ئاواتەکانیان بەرز بوو و نیازەکانیان پاك بوو وەك نوێنەر و زۆرینەی سوپای دەوڵەتی خیلافەت و پارێزەری سیستمەکەی و بەردی بناغە سیاسییەکەی نەمان و ئەم گۆڕانکارییە بنەڕەتییەی کە تێیدا دەشتەکییەکان بوونە سوپای خیلافەت و بناغە سیاسییەکەی، ئەوەبوو کە وایکرد خیلافەت لەدوای سەردەمی راشیدیی ببێتە (پاشایەتییەکی نەخوازراو) کە لە زۆرێك لە لاکانیدا لەسەر بناغەکانی رووتانەوە و چەوسانەوەکانی دەمارگیرییە تیرەییەکان دامەزرابوو و ئەوەی کە قوڕەکەی خەستتر کردەوە ئەو میللەتگەرایی و فەلسەفە و ئەفسانانە بوون کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات

نووسان بە ئوممەتەوە، هەربۆیە شتێکی زۆر ئاسایی بوو کە نەوەکانی دوای سەردەمی پەیامەکە بە درێژایی سەدەکان جیاوازی زۆریان هەبێت لە راددەی پابەندبوونیان بە رۆحی پەیامەکەوە و ئەو وزەیەی کە پێویستە بۆ هەڵگرتنی و سوود وەرگرتن لێی بەپێی حاڵەتی خۆیان و ئەو بارودۆخانەی کە پێیدا تێدەپەڕین و بەپێی توانای خۆیان بۆ گۆڕانکاریی و خۆگونجاندن و ئیجتیهاد و نوێگەرایی، بەو شێوەیەی کە وەڵامدانەوە بێت بۆ پێویستییەکانی هیدایەتی پەیامی ئیسلام و بنەماکانی و بەها بەرزەکانی و لەژێر تیشکی ئەو تەحەددییانەی کە ئوممەتمان رووبەڕووی دەبێتەوە لە قۆناغە جیاوازەکاندا.

لە گرنگترین هۆکارەکانی خێرایی دەرکەوتنی لادانەکان لە تێڕوانینی گەردوونی ئیسلام و بەها و بنەما بەرزەکانی، کە سەرەنجام بوونە هۆی رووخاندنی سیستمی خیلافەتی راشیدیی، بریتی بوو لە کەمتەرخەمی هەوڵە پەروەردەیییەکان بۆ سەرلەنوێ پەروەردەکردنەوەی رۆڵەکانی تیرە بەدەوییەکان کە بوونە پێکهێنەری سوپای فەتح کردن کاتێك کە نەوەی پەیامەکە و هاوەڵان کەم بوون و لاواز بوون و کۆنترۆڵیان بەسەر سوپای دەوڵەتدا هەڵوەشایەوە و ئەوەی هاوپێچی ئەمە بوو لە رووداو و گۆڕانکاریی گەورە کە خۆی لە هاتنە ناوەوەی زۆرێك لە میللەتان و تیرەکان بۆ ناو ئیسلام بینییەوە، بە گوڕ و خێراییەکی ئێجگار زۆر کە زیاتر بوو لەوزە و توانای دەوڵەت و نەوەی هاوەڵان بۆ رێکخستنیان و رووبەڕووبوونەوەی پێویستییەکانیان لە پەروەردە کردن و گۆڕانکارییدا، بەشێوەیەك کە سەرەنجام ئوممەت و دەوڵەت —لەگەڵ ئاوابوونی نەوەی هاوەڵان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) و مردنیان بەهۆی جەنگەکان یان تێپەڕبوونی کاتەوە— ئاسۆکانی فراوان بوون و رووبەرەکەی ئێجگار گەورە بوو کە دەریایەکی بە شەپۆلی لە میللەتان و رۆشنبیرییەکان لەخۆ گرت، لەگەڵ ئەوەشدا کە سوپای سەربازانی تیرەکان و دەشتەکییەکان ئەوەندە بەهێز و ئازا بوون لە جیهاد و پاراستنی پیرۆزییەکانی ئوممەتدا، بەڵام ئەو سەربازانە لە رۆڵەکانی تیرەکان هەلیان بۆ هەڵنەکەوت بۆ دووبارە پەروەردەکردنەوەیان و گیانی ئیسلام و برایەتی ئیسلام نەیتوانبوونەوە وەك نەوەی هاوەڵان و سەربازانی سەردەمی پەیامەکە و سەرەتای خیلافەتی

راشیدیی، هەربۆیە بەهۆی ئەمانەوە سروشتی سوپاکە و سروشتی میللەت و سروشتی بناغە سیاسییەکە گۆڕا، بۆ ئەوەی کە رۆژگارەکان چەند رووداوێکی کودەتایی خێرا بێننە کایەوە کە سەرەنجام بوونە هۆی کۆتایی هێنانی سەردەمی خیلافەتی راشیدیی و کۆتایی هێنانی شێوازی حوکمڕانی و سیستمەکەی و لە کۆتاییدا بارودۆخ جێگیر ببێت بۆ چەند سەرکردەیەکی نوێ، کە —لە چوارچێوەی هەیکەلی بینای کۆمەڵگەی ئیسلامی و دامودەزگاکانیدا— هەڵدەستان بە مومارەسە کردنی زۆرێك لە بۆماوەکانی بۆچوون و تەقالید و تاریکییەکان و دەمارگیریی و رەگەزپەرستیی تیرەیی و گەلپەرستیی کە بۆیان مابووەوە لە پاشماوەی ئەو نەفامییانەی کە تێیدا گەورە بووبوون و لەسەری پێگەیشتبوون، ئەمانە بوونە هۆی رووخانی خیلافەتی راشیدیی و پووکانەوەی میراتگرانی قوتابخانەی پەیامەکە و کەسە دیارەکانی و سەرکردەکانی، وەك (حەسەن و حوسەین)ی کوڕانی (عەلی) و (عبدالله و مصعب)ی کوڕانی (الزبیر) و ئەوانەش کە لەدوای ئەمان هاتن و لەسەر رێڕەوی ئەمان بوون لە پیاوانی ئەو قوتابخانەیە، پاشان دەسەڵات و پاشایەتی جێگیر بوو بۆ پاشایانی نەوەی (ئومەییە) بەهۆی گۆڕانی بناغەی سیاسیی و سەربازییەوە، نەك بەهۆی ئەوانەی دەووتران لە لادان و هەڵە کە درابوونە پاڵ خەلیفەی راشیدیی (عوسمانی کوڕی عەففان) یان خەلیفەی راشیدیی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) رەزای خوایان لێبێت، چونکە ئەو هەڵانەی کە پرۆگرامی موعاویە و سیستمی حوکمڕانییەکەی هەیبوو چەندین جار بەرامبەر بوو لەوانەی وانیشان دەدران کە درابوونە پاڵ خەلیفەکانی راشیدین، بەڵکو زمانی حاڵ بۆمان روون دەکاتەوە کە ئەو هەڵانە —ئەگەر ئەوانەی دراونەتە پاڵ راشیدییەکان راست بن، کە شتێکی سەلمێنراویش نییە— بەو ئەندازەیە زۆر نەبوون کە ببنە هۆی دەرکەوتنی ئەو بناغە سیاسییە فراوانە نوێیەی کە بوونە هۆی دەسەڵاتداریی سوپای فەتح لە دەشتەکییەکان و کۆمەڵی تیرەییەکان.

ئیتر ئەو رووداوە مێژووییەی کە خۆی لە رووخانی سیستمی جێنشینایەتی راشیدیدا دەبینێتەوە، بریتی بوو لە دروستکەری یەکەمین درز لە دەوڵەتی ئیسلامیی و لە سیستمەکەیدا، بە هەموو ئەوانەی کە ئەم رووداوە هەڵیگرت لە

شوێنەوارە عەقیدیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکان کە تووشی گیانی ئیسلامەتیی و تێڕوانینەکەی بوون و بوونە هۆی لێڵکردنی روونیی بەها و بنەماکانی و تووشی تەماوی بوونی کرد بەهۆی ئەو رۆح و خوو و هەڵسوکەوت و لایەنگیرییە تیرەیی و گەلپەرستییەی پێوە نووسان و تێکەڵاوی بوون، بەهۆی ئەمانەوە لاوازیی پاڵنانی گیانی ئیسلامیی دەستی پێکرد لەو کاتەدا کە دەسەڵات و رووبەری دەوڵەتی موسوڵمانان لە زیادبووندا بوو بەهۆی فەتح کردنەکانەوە و جەنگە رزگارکەرەکان زیادی دەکرد و ژمارەی ئەوانەی لەژێر سایەیدا بوون لە زیادبووندا بوون بەتایبەتی خاوەن پیشەکان و رابەرانی هونەرەکانی شارستانییەت و ئیمپراتۆریەتە لەناوچووەکان لە باکوری جەزیرەو وڵاتی فارس و هیند و رۆم.

## سیاسەت و رەوشت و ئایین: دووکەرتبوونی سەرکردایەتی و پەیدابوونی قوتابخانەی تیۆریی

کاتێك بە دوای کاروانی رێڕەو و بۆچوونی فیکریی و عەقیدیی ئوممەتدا دەڕۆین لەگەڵ گەشەکردنی ئەم رووداوانەدا، دەبینین کە جیل و نەوەی یەکەم نەوەیەك بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئەرکی پەروەردە و پاڵفتەکردنی گرتە ئەستۆ و هەروەها نیگای خودایی رێنموویی و راستی دەکردەوە، هەربۆیە خاوەنی تێڕوانین و گیان و توانای شارستانیی بەرزبوو تێکەڵاوی ئەو سروشتانە بوو کە تیرەکانی عەرەب لەسەری پەروەردە دەبوون لە ئازایەتی و بەهێزیی و پیاوەتی و کەرامەت، ئەوەبوو نەوەیەکی شارستانیی کاریگەری لێهاتە دەرەوە، کە گەورەیی دەستکەوت و ئەنجامەکانی بە ئەندازەی هێزی پێکهێنانی سروشتە پەروەردەییە ئیسلامییەکەی و بەرزیی بۆچوونە عەقیدی و سیاسی و رەووشتییەکانی بوو.

لەگەڵ رووخاندنی خیلافەتی راشیدی و زاڵبوونی سەرکردەکانی هێزە تیرەییەکاندا رۆڵی سەرکردایەتی پیاوانی قوتابخانەی پەیامەکە لە کەمبوونەوەدا دەبوو و دەسەڵاتیان سنووردار دەبوو هەروەها قەڵاکانیان دەرووخێنرا و تێکدەشکێنرا، ئیتر وردە وردە، لە دوای (١٠٠) ساڵ لە رووبەڕووبوونەوەی

خوێناوییانە بەدرێژایی سەردەمی ئومەوییەکان کار گەیشتە وەلانانی ڕۆڵی سیاسییان و پەراوێزکردنیان، بۆ ئەوەی بە هێواشی ببنە کۆمەڵێکی تیۆری قوتابخانەیی کەنارگیرکراو و خۆدوورخەرەوە لە مزگەوت و تەکیّ و قوتابخانەکاندا، کە خاوەنی پاکێتی و زوهد بوون، لە کاتێکدا کە هەڵسوکەوت و عادەتە تیرەیی و میللەتپەرستییەکان لە زیادبووندا بوون و هەستیاریی و دووبەرەکییە ڕەگەزپەرستییەکانیش لە گەورەبووندا بوون و بەهۆیانەوە گیانی خۆسەپاندن و زاڵبوون بەهێز دەبوو و بوارەکانی بەفیڕۆدان و گەندەڵیی لە فراوانبووندا بوون.

لەگەڵ زیادبوونی کەنارگیریی زانایان کە میراتگرانی قوتابخانەی پەیامەکە بوون زۆر سروشتیی بوو کە پەیوەندییان بە واقیعی کۆمەڵگا و گۆڕانکارییەکانییەوە لاواز بێت و توانای کاریگەریی کردنە سەر ڕێڕەوی سیاسەتەکانی و هەڵسوکەوتەکانی و نوێکردنەوەی دامودەزگاکانی زۆر کەم بێت و شوێنەواری ئەمە لەسەر فیکر و پرۆگرام و ڕۆشنبیرییان دەرکەوێت و ببێتە هۆی لاوازبوونی توانای نوێگەریی و ئیجتیهاد لەناویاندا و قوتابخانەکانی شارەزایی و کارکردن بوونە قوتابخانەی راو بۆچوونەکان و پاشانیش قوتابخانەکانی راو بۆچوونەکان بوونە قوتابخانەی دەقەکان و لە کۆتاییدا قوتابخانەی دەقەکانیش بوونە قوتابخانەی دەقگرتن و بەستن و چاولێکەریی.

بەهۆی کەنارگیریی زانایان و ڕۆشنبیران و نەیارییان و عەزل کردنیان لە لایەن هەڵبژاردەی چینی سیاسییەکانەوە، هەربۆیە چەند کۆمەڵێك لەو هەڵبژاردە زانستییە قوتابخانەییانە (فەیلەسوفەکان) هەستان بە تەبەننا کردنی بەدیلە فەلسەفییە وەرگیراوەکان لە ڕۆشنبیرییە هاوردەکانەوە، بەڵام بەبیّ پڕۆگرامێکی هەمەلایەنەی راست و دروست کە درك بکات بە تایبەتمەندییەکانی ئوممەت و پێکهاتەکانی تێڕوانینەکەی و عەقڵییەتی و دەروونە عەقیدی و شارستانییەکەی، ئیتر بووە هۆی نوقمبوونیان و لەگەڵیاندا لایەکی گرنگ لە فیکر و لە جەماوەری ئیسلامیی لەرێی فەلسەفە و زانستی کەلام و فیرقەکان و صۆفیگەریی بێگانەوە نوقم بوون لە مەتاهەی ئیلاهییاتی میتافیزیکی ئیغریقی و گومڕاییەکانی و لادان و پرسیارەکانی و سەرلێشێواوییەکانی و مەنتیقە

رووکەشییەکەی‌دا، لە هەمان کاتیشدا زانایان و ئەمینانی کەلەپووری پەیامەکە گەیشتبوونە بەستوویی لە دەقگیریی زانست و زانیارییە فیقهی و شەرعییەکاندا و سێیەم گورزی جەرگبڕ لە دەستڕۆیی و گەندەڵیی دەستەی کاربەدەست و نەزانییان و خۆسەپاندنیاندا خۆی دەبینییەوە، بە هۆی ئەمەوە هەڵبژاردەی سیاسیی —بە هۆی جیاکردنەوە و کەنارگیریی پیاوانی زانست و شەریعەت— پاڵپشتیی خۆیان و بناغەکەیان لەدەستدا و هیچ کۆڵەیەکی فیکریی و رۆشنبیرییان نەما کە پشتیان بگرێت و بەرچاوڕوونیان بکات، ئەوەبوو ئوممەت نوقم بوو لە دواکەوتوویی و بەستوویی و دیکتاتۆرییەتدا و لەگەڵیشیدا زۆربەی زۆری کۆمەڵی ئوممەت خۆیاندایە دەست صۆفیگەریی فەلسەفیی حلولی ئەفسانەیی، کە بووە هۆی کوژاندنەوەی زوربەی ئەو وزە شارستانییەی کە پێی مابوو و دایەدەست لەهۆشچوون و سەرکزیی و سەلبییەت، هەروەها تۆقاندنی ماددی دروستبوو لە خۆسەپاندنی سەرکردەکانی ئوممەت و هەڵبژاردە سیاسییە کاربەدەستەکەیەوە، کە نەتوانایی ئوممەت لە رووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکارییەکان و نەتوانایی لە بەرپەرچدانەوەی پێشهاتەکاندا دروستیکرد، ئەوەندەی تر بارەکەی قووڵ کردەوە، ئیتر تۆقاندنی سنووربەزاندن و فەوتاندن و لەناوبردنی هەموو نەیارێك تاکە رێگای هەڵبژاردە کاربەدەستەکان بوو بۆ پارێزگاریکردنی حوکمڕانی و جێبەجێکردنی رێکخستن و مانەوەیان، بەڵام هەڵبژاردەی رۆشنبیر و شەرعیی بە هۆی دواکەوتنی توانا زانستییەکانیان و لاوازیی هەڵسوکەوتە زانستییەکانیان و وازهێنانیان لە ناسینی سوننەت و سروشت و رووداوەکان، بەتەواوەتی وەك قوتابخانەیەکی تایبەتمەندی پەراوێزکراویان لێهات، کە لە زۆربەی کاتەکاندا هیچ رۆڵێکیان لە کۆمەڵگادا نەمابوو، تەنها لە رێنومایی کردنی کاروبارەکانی ژیانی تاکەکاندا نەبێت هەروەها لە جێبەجێکردنی ئەو کار و وەزیفانەی هەیانبووە لە فەتوادان و دادگایی کردن و ئیمامەتیی مزگەوتەکان، کە زۆرجار بۆ جێبەجێکردنی رۆڵەکانیان ناچار دەبوون بۆ پشتبەستن بە تۆقاندن و ئیرهابی رۆحی و کردنەبەری بەرگی پیرۆزی بەسەروتراوەکاندا و پڕکردنیان بە هێماکان و دەقە لابەلاکان، بەشێوەیەك کە لە تواناداد نەبوو پەنجەیەك بەرز بکرێتەوە یان هەنگاوێك بهێنرێتەوە تەنها بە بوونی بەڵگەیەك نەبێت لە دەقێك، یان پێشینەیەك. یان فەتوایەك، یان ئیجازەیەك.

## شوێنەوارەکانی پەرتبوون و رووخانی دامودەزگاکان و وەلانانی رەهەندی کۆمەڵانە

ئیتر بەم شێوەیە، حاڵی ئوممەت گەیشتە باری رووخانی دام و دەزگاکان و تاکڕەویی هەڵبژاردەکان و مرۆڤی موسوڵمانان بوو بە تاکێك، کە تۆقاندنی خۆسەپاندنی سیاسیی و گوتاری تۆقێنەری ئایینی –لە لایەنی دەروونیی و ماددیی و هەموو لایەنێکی تریشەوە– پەلاماری دەدات، ئەمەش بۆ ئەوەی پاڵی پێوەبنرێت و لەگەڵیشیدا ئوممەت بە گشتیی پاڵی پێوەبنرێت بۆ کەنارگیربوون و سەلبییەت و لە دەروونی ئەو و لە ئەندێشەی ئوممەتیش ئەوانەی هەیانبووە لە پاڵنەرەکانی وردەکاریی و ئاوەدانکاریی و شارستانییەت دەربهێنرێن.

ئەوەی قووڕەکەی خەستتر کردەوە، ئەوەبوو کە هەڵبژاردەکانی فیکر لە ئوممەتدا، بەشێوەیەکی راستەقینەی زانستیی کاریگەر، ئاگاداری ئەوە نەبوون کە رێگەی سەرکەوتوو بۆ چاکسازیی و گۆڕانکاریی یەکەم جار تەنها لە ناخی ئوممەت و کۆمەڵگەوە سەرچاوە دەگرێت و لە ناوکرۆکی زات و سەرچاوەی بیر و ویژدانەوە دەست پێدەکات، کە بریتییە لە پەروەردەکردن و پەروەردەکردنەوە، بەم شێوەیە رێگەیان ون کرد کاتێك وایانزانی کە رێگەی چاکسازیی بریتییە لە رێگەی بەربەرەکانێ و کێشمەکێش و توندوتیژی، کە بووە هۆی شلۆق کردنی باری جێگیری ئوممەت و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی لەتوپەت کرد، زاڵبوونی هۆکارەکانی ستەمەکان و چەوسانەوە و خۆسەپاندن و پارچە پارچەیی زیاد کرد[1].

ئەمە بریتییە لە وێنەی گەورەی رێڕەوی مێژووی ئوممەت و پەیوەندییە پێچەوانەکانی، کە سەرەنجام گەیاندییە ئەو بارەی ئێستای لە لاوازیی و خاویی و سەلبییەت و پارچەپارچە بوون و ژێردەستەیی.

لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە لەبیرمان نەچێت کە حاڵی ئوممەت لە زۆرێك لە ساتەکانی مێژووەکەیدا –و حاڵی زۆرێك لە وڵاتەکانی و هەموو کاتێکیش نا– لە

---

[1] (عبدالحميد أبو سليمان) (العنف وإدارة الصراع السياسي في الفكر السياسي الإسلامي بين المبدأ والخيار: رؤية إسلامية)، دمشق: المعهد العالمي للفكر الإسلامي و دار الفكر ٢٠٠٢م.

خراپیدا وەك یەك بوو‌بێت، ئەوەیە كە ئەگەر ناوچەیەك لە ناوچەكان باری بەرەو خراپی چووبێت ئەوا لە ناوچەیەكی تر هەندێك باشتر بووە، لەكاتێكدا كە مەشخەڵی گیانی عەرەبەكان بەرەو كزبوون و هێزی موسوڵمانان بەرەو كوژانەوە دەچوو لە ئەندەلوس، ئەوا هێزو وزەی ئیسلام نوێ دەبووەوە لەسەر دەستی ئەو تیرە توركانەی كە هاتنە ناو ئیسلامەوە بە پتەوییان و ئازایەتییەكان و لە هەمان كاتدا چەكداربوون بە گیانی سەربەستی و سەربەرزیی، ئەوەبوو ئیسلام جێگیر و چەسپاو بوو لە وڵاتی ئەنادۆڵ و لەمانەوە خونچەكانی دەوڵەتی عوسمانی چەكەرەی كرد.

ئەگەر هێزی بیر و داهێنانیش لە ئوممەتدا هاتبێتە دواوە بە هاتنە دواوەی رۆحی شارستانییەت تێیدا، ئەوا ئەمە رێگر نەبووە —تەنانەت لە سەردەمەكانی قووڵبوونەوەی ناكۆكییەكان و پەرتەوازەیی و دواكەوتن، یان لەوانەیە ئەمانە خۆیان هۆكار بووبێتن بەهۆی ئەو تەحەددییەی دروستی دەكەن— لە پەیدابوونی هەڵكەوتووە فیكریی و زانستیی و چاكخوازە ناسراوەكان وەك: غەزالی و ئیبن حەزم و ئیبن روشد و ئیبن تەیمییە و ئیبن خەلدون، لە بوارەكانی زانستەكانی ئایین و شەریعەت و كۆمەڵناسیدا، زۆرێكی تر بێجگە لەمان لە بوارەكانی زانستە فەلسەفی و فیزیایی و دروستكراوەكاندا و غەیری ئەمانەش، ئەمەش —ئەگەر بەشێوەیەكی جوزئیش بێت— بریتییە لە شوێنەواری ماوەی بنەڕەتی هێزە پاڵنەرەكە، لە لایەنە ئیجابییەكانی وەڵامدانەوەی تەحەددییاتەكان و بەرەنگاربوونەوەی بەڵاكان و نەخۆشییەكانو هەروەها ئەوەی كە دەرروونی لەسەر دروست بووە لە پاڵنەرەكانی چاكسازیی و ئاوەدانكاریی، كە بریتین لە چەند دیاردەیەك كە تا ئەمڕۆشمان شوێنەواری بوونیان هەست پێدەكەین لە گیانی ئوممەتدا و لە ئاواتە خوازراوەكانیدا، لە تەقینەوەی تووڕەییەكەیدا و لە هەوڵەكانی چاكسازیی تێیدا.

بەڵام ئەمە نابێتە هۆی گۆڕانكاریی سروشتی وێنەی گەورەی مێژووی ئوممەت و كاروانە شارستانییەكەی، كە پاڵیدەنا بە مێژووەوە لە چەند لایەكەوە و بووە هۆی سستبوونی پاڵنانی گیانی ئیسلامەتی و كوژاندنەوەی وزەكەی و لێڵبوونی روونیی تێڕوانینە گەردوونییە شارستانییەكەی و هەمەلایەنییەكەی، كە بووە

هۆی پارچە پارچەکردنی ریزەکانی ئوممەت و بوار دەکاتەوە بۆ گەندەڵیی و خۆسەپاندن لە کیانیدا، میللەتەکانیشی نیشانە دەکات بە خاویی و سەلبییەت، هەروەها دەبێتە هۆی داکەندنی -ئەگەر زۆر بە هێواشیش بێت- پۆشاکی عیززەت و کەرامەتی و وا لە کۆمەڵی رۆڵەکانی دەکات، کە ببن بە رانە ئاژەڵ و دەروونیان بە بەندە و ترس و ملکەچیی زاڵ دەبێت بەسەریاندا و گیانی پێشدەستییان تێدا نامێنێت و تەنیا بە ئومێدی بەدەست هێنانی پاروە نانەوە دەبن و ئاواتی لەشساغییان دەبێت.

شتێکی پێویست بوو، کە دەبوایە ئوممەت لەم بێهۆشییەی هەستێتەوە و عەیبەکانی خۆی بۆ دەرکەوێت و ئەوەی کە تووشی رۆحی هاتووە لە داڕووخان، لەگەڵ ئەو بەرەنگاربوونەوەی، کە بە درێژایی چەندین سەدە رۆحی ئیسلام دەیکرد، ئەمەش بە تەواوەتی روویدا، کاتێك دوژمنە سەرسەختەکان بەرەنگاری بوونەوە و میللەتانێك بەرامبەری وەستان، کە خاوەنی توانا شارستانییەکان و لێزانینە ماددیی و تەکنیکییەکان بوون و پاڵپشت دەکران لە لایەن مەنهەجییەتێکی زانستیی و وزەیەکی دەروونیی داهێنەر، بە شێوەیەکی نائاسایی لە سەردەمەکانی دواکەوتندا، کە ئەمان تەحەددای ئوممەتیان پێکرد و بەرامبەری وەستانەوەو بوونە هۆی شکاندنی کۆمەڵەکەی، بەهۆی لاوازیی و دواکەوتنی فیکرەکەی و ملکەچبوونی دەروونی و پارچە پارچە بوونی ریزەکانی و رووخانی دامودەزگاکانی، ئیتر بووە نێچیرێکی ژێردەستەی ئاسان بۆ دوژمنەکانی، ئەوەبوو داگیرکەران و موستەعمیرەکان و سەرکردەکانی ئوممەتیش تالآوی چەوسانەوە و ستەم و لووتشکاندیان دەکرد بە قوڕگی ئوممەت و میللەتەکانیدا، کە هیچ یارمەتیدەر و رزگارکەرێکی نییە دوای پەروەردگار، تەنها ئەوە نەبێت، کە ئوممەت و بیریارەکانی و سەرکردەکانی چاکسازیی تێیدا -بە سەبر و خۆڕاگریی- هۆکارە راستەقینەکانی خاوبوونەوەی وزەکانی و کەمتەرخەمیی جێبەجێکردنی کارەکانی بناسن بۆ ئەوەی، کە تەندروستیی خۆی وەرگرێتەوە و وزەکانی نوێ ببنەوە، هۆکارەکانی خاوبوونەوە و لاوازیی و پارچەبوون و دواکەوتوویی لە کیانیدا بە ویستی پەروەردگار لەناو ببەن.




**هێزی پاڵنەری ئیمانیی شارستانیی و کەمبوونەوەی بە تێپەڕبوونی زەمەن،**
**و تێکچوونی تێڕوانینی کوللی گەردوونی ئیسلامی**
**و کاریگەریی گیانی رەگەزیی تیرەیی و گەلپەرستی.**

**شێوەی (١)**




کەمیی تەواوی ئاوەدانکاریی و پیشەسازییەکان لە دووڕگەی عەرەبیدا لە سەردەمی
دەستپێکردنی پەیامەکە و سەردەمی سەرەتای ئیسلام و فراوانبوونی
و کەڵەکەبوونی بە پێیەڕبوونی کات، سەرەڕای لاوازیی رۆحی ئیمانیی شارستانیی ئیسلامی
و شێواندنی تێڕوانینی گشتیی گەردوونیی و پیسبوونی رۆشنبیریی.

شێوەی (٢)




گونجانی پێچەوانە لەنێوان هێزی پاڵنەری ئیمانیی شارستانییانە کە لە سەردەمی پەیامەکەدا بەهێزبووە، لەگەڵ توانا ئاوەدانکارییە لاوازەکانی ئەو سەردەمەدا و فراوانبوونی ئاوەدانکاریی و پیشەسازی لەگەڵ بەرەوپێش چوونی کات و لەگەڵ کپبوونەوەی هێزی ئیمانیی شارستانییانە و کەمبوونەوەی.

شێوەی (٣)




گەشەكردنی بناغەی سیاسی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و
سەردەمی خیلافەتی راشیدیی و لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا.

شێوەی (٤)

# بەشی دووەم
# دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە

ئەگەر لە لاپەڕەکانی پێشوودا، وێنەیەکی گەورەمان خستبێتەڕوو، دەربارەی ڕێڕەوی پاشەکشەکردن لە پاڵنەری گیانی ئیسلامیی شارستانیی لە ئوممەتدا، سەرباری ئەو دەستکەوتانەی، کە ئەو گیانە ئیسلامییە لە چەرخەکانی ڕابردوودا بەدەستی هێناوە لە گەشەداریی‌و ئاوەدانیدا، ئەوەی ئەمڕۆ داوا دەکرێت بریتییە لە زانینی ئەوەی، کە تەواوکراوە، بە تایبەتی گۆڕان‌و لادانەکان لە بیری ئوممەتدا، هەروەها لە دەروونیی ویژدانیدا، کاریگەریی لە مسوڵمانان‌و بە تاك‌و کۆو زانینی لایەنەکانی کەمتەرخەمیی کە بووەتە هۆی بەربەستی هەوڵەکانی چاکسازیی لە بەدیهێنانی ئامانجەکاندا، تا ئەم لێکۆڵینەوەیە بگاتە هەوڵی بەشداربوون لە چارەسەرو تەواوکردنی ئامێرەکانداو گرتنی هەندێ لەو قوژبن‌و کەلەبەرانەی کە ماوە، تا ئەم ئوممەتە مرۆڤایەتیی ڕێزی لێبگیرێت‌و گوێی بۆ بگیرێت لەو فیکرەیەی، کە لە لایەنی ڕەفتاری بڵندو گیان‌و ڕەوشتەوە دەیخاتە ڕوو.

## تێکچوون‌و لادان لە بیری ڕۆشنبیریی ئوممەتدا

پرسیاری گرنگ لە ئێستاوە ئەوەیە، کامەیە گرنگترین ئەو تێکچوون‌و لادانە بیریی‌و ڕۆشنبیرییانەی، کە بووەتە هۆی تێکدان‌و لاوازکردنی بنیاتنانی دەروونی ئوممەت، بەربەستیشە لە بەردەم گەڕانەوەی ساغ‌و سەلامەتی ئوممەتدا، هەروەها ڕێگرە لە بەردەم پڕۆژەی شارستانییەتی ئوممەت، کە ئامانجەکانی بهێنێتەدی‌و بگاتە مەبەست؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، دەتوانین شەش جۆر لەو تێکچوونانە ڕوون بکەینەوە، کە بە شێوەیەکی ڕۆشن لەم چەند لاپەڕەدا ڕوونی دەکەینەوە:

## تێکچوونی یەکەم: تێکچوونی تێڕوانینی گشتیی

یەکەم تێکچوونو ترسناکترین تێکچوونە لە تێڕوانینی گشتیی ئیسلامییدا، کە چوارچێوەی بیرو ڕۆشنبیریی ئوممەتەکە دەگرێتەوە، بەجۆرێك تێڕوانینێکی یەکپارچەیی‌و گشتیی‌و فراوانو ئەرێیی (إجابی) بەتوانا نییە، تا بەڵگەی ڕێنوێنی گشتیی دەربارەی بیرو ویژدانو پەیوەندییەکانو ڕژێمەکەی بخاتە ڕوو.

تێڕوانینی گشتیی قورئانی– هەروەکو بەرەی کارای ئەم پەیامە جێبەجێی دەکرد– فراوانو ڕۆشنو ئەرێیی‌و خۆبەخۆو فیتری بوو، باوەڕ بوون بە خوای بەدیهێنەری حەق‌و دادپەروەریی، کە هاوشێوەی نییە لەهیچ شتێکدا، ئەو باوەڕەیە، کە مرۆڤی جێنشین لە تاکە کەسێك دروست کراوە، تا کۆششەکانی لەسەر بنەڕەتی دادپەروەریی‌و هاوکاریی‌و ڕاوێژ بێت، بە مەبەستی خەیرو چاکسازیی‌و ئاوەدانکردنەوە، بۆ بەرژەوەندیی هەموو دروستکراوەکان، ڕێزیش بێت بۆ جۆرەکەی، ژێرباریش بکرێت بۆ پێویستییەکانی، پاککردنەوە بێت بۆ کانزاکەی، ئەوەش ئەو دروستکراوەیە، کە پارێزەرو دڵسۆزیی‌و کارو هەوڵەکانی، شوێنێکی هەمیشەیی بۆ بڕیار دەدرێت، ئەگەر چاکەی کرد شوێنی چاكو ئەگەر خراپەی کرد، شوێنی خراپی بۆ ئامادەکراوە (وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى* وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى* ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاء الْأَوْفَى* وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنتَهَى) (النجم: ٣٩– ٤٢ )

لەمەوە دەردەکەوێ تێڕوانینی گشتیی ئیسلام، بۆ مرۆڤ لە سێ باسی بنەڕەتیی گشتییدا کورت دەبێتەوە، کە بریتییە لە:

١ـ باوەڕ بە نادیار: باوەڕ بە خوا بەدیهێنەری تاكو تەنیاو بێ هاوەڵ.

٢ـ لە ژیان: هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی، کردنی کاری چاكو دادپەروەریی، هەوڵدان بۆ چاکسازیی‌و ئاوەدانکردنەوە بۆ بەدیهێنانو سەلماندنی ڕەوشتی چاکەو دادپەروەردیی.

٣ـ لە ڕۆژی دوایی گەڕانەوەدا: ڕووبەڕووبوونەوەی سەرئەنجامو دەستکەوتی کارکردنەکە –بە بەزەیی خوا– بە گوێرەی پاداشتی دادپەروەرانە دەبێت، ئەگەر چاکی کردبوو جێگای چاکە، ئەگەر خراپیش کردبوو، جێگاکەی خراپە.

لەبەر ئەوە دەبینین، باوەڕهێنانو کاری چاکە –لە تێڕوانینی گشتیی قورئاندا– لە یەکتر جیا ناکرێنەوە، مەبەستیش لە باوەڕهێنان کاری چاکەکردنە، کاری چاکەش هەموو کاری ئەندامەکانی لەش دەگرێتەوە، هەتا ئەگەر قورسایی گەردیلەیەکیش بێت، جۆرەکەشی بڕیار دەداتو لایەنی گیانییش لەسەر بنەمای مەبەستی چاکەکردن لێیو هەوڵی جوانکردن لەو کارە، نەك هەر مەبەست، بەڵکو چاك بەجێهێنان کە مانای کۆششکردنە لە گەڕان بە شوێن یاساو دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، کە خوا لە ناو شتەکاندا دایناوە لەسەری دروستی کردووە، هەروەها کارکردن بە گوێرەی ئەو یاسایە، ئەو هەوڵە دەروون پێی خۆش بێت، یان قوربانیی بدات لە جێبەجێکردندا لە ئەركو بەرپرسیارییەتییدا، هەر لەبەر ئەوەیە، بەڵێنی خوا بۆ باوەڕدارەکان، کە دەسەڵاتیان پێبدات باوەڕ بەخوا تیایدا کراوە بە مەرج، چونکە ڕێگاکە ڕێنوونیی دەکات، دڵ دەبەستێتەوەو قاچ دامەزراو دەکات، باوەڕەکەش دەبێ کرداری چاكو گەیاندنی لەگەڵ بێت، چونکە باوەڕ ئامێری بەجێهێنانی مەبەستە، بەبێ باوەڕ، هەرگیز مەبەستەکان بوونو مانایان نییە، دەبێ کارەکە چاكو گیانی چاکەو جوانکاریی تیا بێت، ئەوەش دەبێت بە هەوڵو دڵسۆزیی بێت، لە کاتی گەیشتنی بە پرۆگرامو یاسای خواییو ئەو فیترەتەی، کە یاساکانی حەقو ڕاستیی دەنوێنێ، ئەو کاتە کارەکە جوانو چاك دەبێ، نیازەکانیش بە تەنها بەس نییە بۆ بەدەستخستنی جێنشینایەتییو دەسەڵات پەیداکردن لە زەویدا، ئەوە پاداشتی ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام جێنشینایەتییو دەسەڵات لە زەویداو سەرکەوتن لە کارو کردەوەی ئەم دونیایەدا، ئەوە بە مەرج دانراوە، کە چاك بێت، واتە بە چاکییو جوانکارییو تێکۆشان بێت لە کارو کردەوەدا، ئەو پرۆگرامە، پرۆگرامی تێکۆشانو جوانکاریی لە کاروکردەوەدا، ئەوە ڕێنوێنی دەکات –بە یارمەتیو دانایی خوا– بۆ یاساکانی بوونو ژیان، بۆ لایەنەکانی حەقو ڕاستییش لە گەیاندندا، هەروەها بۆ ڕێنموونی لە کارو سەرکەوتن لە کاردا (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (النور: ٥٥ ).

ئەم تێڕوانینە گشتییە فراوانە ڕوونە پاکە لە یەکتاپەرستییدا، مەبەستی دروستکراوەکاندا، جێنشینی مرۆڤدا، مەبەستی چاکەو جوانکاریی‌و چاکەکارییدا، بەرپرسیاربوونی دووچاریی –کە دەرەنجامێکی سروشتییە– تێکچوونێکی ترسناك بووە لە لایەن کۆمەڵی بیریارە قوتابخانەییەکان ئەوانەی، کە کەنارگیرو دابڕاون لە لێکۆڵینەوەو تێڕامان‌و لێکۆڵینەوە تیۆرییەکان، کە تەنها دەربارەی باری تاکەکانی کۆمەڵگەو پێداویستییەکانیان جەخت دەکەنەوە.

بەشداریی کردووە –بە نیازی چاك‌و مەودایەکی درێژدا– لە زەردبوون‌و وشك هەڵاتنی گیانی ئیسلام‌و هێزی پاڵنەری لە تێڕوانینی ئوممەتدا، هۆکارەکانی دواکەوتنی تیادا جێگیر کرد، وزەی تازەبوونەوەی کوژاندەوە، ئوممەتی خستە بەردەم باری خراپیی‌و بێ قورسایی، بووە هۆی کوشتنی ویستی لێکۆڵینەوەو گەڕان‌و نوێگەریی، خۆی تەسلیم کرد بە لێژایی لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە، مانای کارو دەستپێشخەریی‌و جوانکاریی، مانای کۆمەڵ‌و ئوممەت‌و هاوکاریی دەڕوخێنێت‌و یەکێتی دەزگاکانی‌و پەیوەندییەکانی دەدڕێنێت.

ئەمە بەڕوونیی لەو تێڕوانینەی، کە پەرتووکەکانی زانستی باوەڕو فیقه تۆماریان کردووە دەبینرێت، بەم شێوەیە بناغەی دەروونیی‌و پەروەردەیی تاکی مسوڵمان دروست دەکەن، ئەمە –لە ناوەرۆکدا– تێڕوانینێکی تاکییە، نەك تێڕوانینێکی کۆمەڵیی، تێڕوانینێکە، کە لە پەیوەندیی سروشتی نێوان زاناکان‌و خەڵکدا هەڵدەقوڵێت، پەیوەندیی بە کاروباری کەسێتییەوە، نەك کاروباری گشتیی، پەیوەندیشی نییە بە ڕژێم‌و ڕێبازەکانی سروشت‌و پێکهاتەو پەیوەندییەکانی، لەم بیرو تێڕوانینەدا بوار نییە –بە شێوەیەکی گورج‌و جەماوەرییانە– بۆ پەروەردەکردن‌و بەشداریی ڕامیاریی‌و پەیوەندیی کۆمەڵی‌و کاروباری دەسەڵات‌و تەرازووەکانی برایەتی‌و دادپەروەریی‌و هاوکاریی‌و ڕاوێژ، لە بەڕێوەبردنی ژیانی گشتیی ئوممەتدا، ئەمە لە کۆتایی سوڕانەوەکەدا تێڕوانینێکی خراپەو کاریگەریی نابێت لەگەڵ لایەنەکانی ژیان، شوێن گۆڕانەکان‌و ڕووداوەکان ناکەوێت، پاڵنەریش نییە لە گەیاندنە شارستانییەتەکەیدا، ئەو کەسەی لە مزگەوت دەمێنێتەوە، هەموو کارو خەمێکی بریتییە لە پەرستش (عبادة) بە شێوەیەك، کە لەگەڵ زانستی فیقهدا بگونجێ‌و ڕۆدەچێ لە باسکردنی

به وردترین شێوەو لە بارەی جوڵانو نەجوڵانەوە، هەروەها چەند قوتابخانەو ڕێبازی لێ دابەش بووە، لەم بارەوە دابەش دەبن بە چەندین کۆڕو کۆمەڵەوە، بەڵام کاروباری ژیانو کارو جێنشینایەتیی، لە ناوەڕۆکدا پەیوەندیی بە کاروباری ژیانی تاکەوەیە، نەك کاروباری ژیانی گشتیی، یان ڕامیاریی زاراوەی (المعاملات) کە لە پەرتووکە فیقهییەکاندا بەم شێوەیە هاتووە بەسەردا دەسەپێنن مەبەست لە (المعاملات) کۆی چارەسەرەکانو ئەو زەوابتە فیقهیو یاساییانەیە کە بۆ کاروباری هەڵسوکەوتی ژیانی تاکی مسوڵمانو ئەوەی پەیوەندیی بە ڕێساکانو گرێبەستەکانەوە هەیە، کە دەخوازێ دادوەریی تیا بکرێ، خەریکە دابڕنرێت لەو لایەنە گیانییو ڕوحیەی، کە تایبەت کراوە بە عیبادەت، گوایە (معاملات) هەروەکو هەندێ لە فەقیهەکان وای دەردەبڕن، کە ئەرکێکە ڕێکدەخرێتو تەواو دەبێت بە گوێرەی ڕێساکانی شەرع، بەڵام لە هەمان کاتدا، کارێکی دونیاییو ئارەزوومەندانە (إختیاری)یە، پەیوەندی نییە بە پاداشتەوە، کەسێکیش نەیکات گوناهو تۆڵەی لەسەر نییە.

ئەم تێڕوانینە فیقهیەو ئەم گرنگیپێدانەی بە شێوەیەکی گشتیی، جیاوازە لە تێڕوانینی قورئانی، کە تەماشای مرۆڤ دەکات بە شێوەیەکی فراوانو جیاوازیی ناکات لە نێوان بەرپرسیارییەتی تاك لە پاراستنی گیانو بەرپرسیارییەتی کۆمەڵ لە پاراستنی کۆمەڵو ئوممەتدا، لایەنی گیانیی (روحی) هەموو کردەوەی مرۆڤ دەگرێتەوە، هەمووشی بە عیبادەت دادەنرێت بە بێ جیاوازیی، بە گوێرەی مەبەستو نیازەکان، هەتا ئەگەر لە کاری سەرجێییو ئارەزووە دەروونییەکانیشدا بێت، کەواتە ژیانی مرۆڤی مسوڵمان لە تێڕوانینی قورئانەوە هەمووی یادکردنی خواو خەباتکردنە، هەمووی پەرستشو خواپەرستییە.

ژیانی مسوڵمان لە نوێژدا، لە نزاو ڕووژو و زەکاتو بەخشیندا، لە قورئانخوێندنو بە گەورەدانانی درووشمەکاندا، لە بەجێهێنانی فەرمانو ئەرکەکاندا، لە ڕوانگەی قورئانەوە، یادی خوایەو بیرخستنەوەیەو ویژدانی مسوڵمان زیندوو دەکاتەوە، یارمەتی دەدات لەسەر بەجێهێنانی ئەركو وەفابوون بەو ئەرکانەی لەسەریەتی:

(إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي) (طه: ١٤ ).
(فَاذْكُرُواْ اللّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّآلِّينَ) (البقرة: ١٩٨).
(وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ) (البقرة: ٢٠٣ ).
(قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى* وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى) (الأعلى:١٤– ١٥ ).
(فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ) (البقرة: ٢٣٩ ).
(إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ) (العنكبوت: ٤٥ ).
(وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُواْ أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُواْ اللّهَ فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَى مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) (آل عمران: ١٣٥ ).

ژیانی مسوڵمان کارو کۆششە، لە هەموو کاروباری ژیاندا، لەتایبەتیو گشتیدا، بەگوێرەی تێڕوانینی قورئانیی، هەموو کارەکانی خەباتو تێکۆشانە، خەباتە لە گەڕان بە دوای زانستدا، لە گەڕان بە دوای ڕۆزیدا، لە پاککردنەوەی دەرووندا، لە بەجێهێنانی ئەرکی دادپەروەرییو پاراستنی لاوازەکاندا، لە کۆششکردن بۆ پێویستییەکانی ئوممەت، بەرگرییکردن لە خاکی مسوڵمانان، لە گەیاندنی بانگی حەقو دیندا، بەڵکو خەباتو تێکۆشان لە کاروباری ژیانی ئیسلامییدا، دادەنرێت بە گرنگترین مەبەستەکانی یادکردنی خوا لە ژیانی مسوڵماندا، چونکە ژیانی مسوڵمان گشتییەو بەش بەش ناکرێ لە مەبەستی چاکەکردندا، ئەمەش گوێڕایەڵیو شوێنکەوتنی بەرنامەی خوای گەورەیە (قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِيناً قِيَماً مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ* قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ* لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ) (الأنعام:١٦١– ١٦٣) بە ئەندازەی ئەوەندەی، کە تێڕوانینی ئیسلامیی پاکو چالاکو گشتییو ئەرێیییە، تێڕوانینی چەرخی دوورەپەرێزییو قوتابخانەیی —لە ڕووی بیرەوە– تێڕوانینێکی کورتو بەرتەسکە لە زۆربەی کارەکانیدا، لە زۆر ڕووشەوە کەمبەشیو خراپ بووە.

هەروەها لە ڕووی کردارییەوە لە ژیانی مرۆڤدا کارێکی هۆزایەتیو دەمارگیریی‌و تاکییو خۆبەخۆیی بووە، وە لە دواییدا دەیبینین شوێنەواری ئەم

تێکچوونی ترسناکە تەواویی هەیە لە چەمکەکانی (مفاهیم) ڕۆشنبیریی ئوممەتدا، لە ڕووی بنیاتی دەروونییو گەیاندنی شارستانییەتەکەیەوە، تاوای لێهات ئەمڕۆ ئەم ئوممەتە پەککەوتەو دواکەوتوو سەرشۆڕە.

## تێکچوونی دووەم: تێکچوونی پڕۆگرامیی

ئەمە لە ئەنجامی گۆشەگیریی زاناکانو بڕیارەکاندا، کە دوورکەوتنەوەو کەنارگیریان —لەچاکترین بارەکانیدا— تێکچوونێکی زانستییو پڕۆگرامییە، بیری ئیسلامیی گۆڕیی بۆ بیرێکی تیۆری، کە ڕۆچووبێت لە تێڕامان بە تیۆرێکی قوتابخانەیی، کە ئەمە ڕێگا نییە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی ئوممەتو دەرهێنانو چاودێریی تاقیکاریی، چونکە ئەم شێوازە پێویستی بە پراکتیزەکردن هەیە، ئەم تێکچوونە بووە مایەی نەزۆکییەکی بەرنامەیی ترسناك، کە ئەمە زانستی کردە کردارێکی دەرخستنو لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە، کە تیایدا بەشێوەیەکی گشتیی کاریگەریی کاتو شوێنی تیایدا ون دەبێت، هەروەها زانستی یاساکانی ڕەفتار لە دروستکراوو بوونەکاندا، ئەمەش —جگە لە لایەنی کەنارگیریی— سروشتی تیۆری نادیارو پیتۆڵو بێژەی ئیغریق هۆکار بووە لەم تێکچوونەدا، کە کاریگەریی هەبووە لە ئاوو هەوای بیری ئەم ئوممەتەدا، لە لاوازکردنی بیرو کرداری تاقیکاریی، حەزی زانستییو حەزی گەڕان بۆ زانست، کە لە چەمکە ئیسلامییەکاندا داوا دەکات، هەروەها گەڕان لە زەویدا، لەبیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەدا، لە پێوانەو بەراورد کردندا، ئەمە بووە هۆی پەککەوتنی بیرو پیاوانی زانست خۆیان دا بەدەست شوێنکەوتنی کوێرانەو لاسایی کردنەوەوە، لەگەڵ تێپەڕاندنی کاتدا، داوا لەسەر دەقەکان فراوان بوو تا ڕای پیرۆزی بەسەردا درا، ئەمەش بۆ خۆگونجاندن بوو لەگەڵ ئەو بارە پەککەوتە بیرییەی، کە تێی کەوتبوون، هەروەها ئامێرەکانی کۆششو هۆکارە پێویستەکان بۆ بەرهەمهێنانی زانستی مرۆڤایەتیی لاواز بوو، کە لەگەڵ زانستەکانی پەیامی خواییو ڕێنموونییەکانیدا تەواوکەری یەکن، هەروەها لاوازیی بەرهەمهێنانی زانستی پێویست بۆ گەشەی ئوممەت لەو بیرەی کە توانای بەرەنگاربوونەوەی هەبێت بکات و گۆڕانکارییەکان بوەستێنرێتو سوود لە تواناکان وەربگرێت لاواز بوو.

بەهۆی ئەم تێکچوونە زانستییە بەرنامەییەوە، سەرەتاکانی دەستپێکردنی زانستی کۆمەڵایەتی لە بیری ئیسلامیدا لە شێوەی دەستەیەك لە ناونیشانو ڕێباز بە ڕووتیی مایەوە، لە شێوەی چەند سەرچاوەیەکی لاوەکیش لە گۆڕەپانی زانستەکانی فیقهو بنەماکانی (الفقه وأصوله) بەگشتیی بواری تیۆریی ژیانی تاکی دەگرتەوە، هەتا کاتێ دەرفەت ڕەخسا بۆ ئیبن خەلدون، کە زانایەکی ڕێبازی مالیکییە کە کاتی خۆی کاری سیاسەتی کردبوو لە ژیانی گشتییدا، کە دەرگا بکاتەوە لە بەردەم بیری ئیسلامیی، دەرگای زانستی مرۆڤایەتیی کۆمەڵایەتی –لێزانانە– کردەوەو زۆر نهێنیی بەنرخی دۆزییەوەو چەندین دەرگای داخراوی کردەوە کە لە پەرتووکی (المقدمة)[1] باس کراوە، ئیتر زاناکان ئەم بیرەی (ئیبن خەلدون)یان پەراوێز کرد –بە هۆی عەقڵییەتی گۆشەگیریی– هەروەکو چۆن بیری زۆر زانای تریش، جگە لە ئەو پەراوێز کرا، پەرتوکەکەی لە بەرنامەی خوێندنی زاناکاندا بوو، باسەکانی جێگای گرنگیپێدانیان نەبوو، ئیتر پڕۆژەی لێکۆڵینەوە لە نیشانەکانی زانستو زانیاریی بەشێوەیەکی زیندوو بوو بە پڕۆژەیەکی پەکخراو –لەگەڵ قاتو قڕیی ژیانی زانستی قوتابخانەی تیۆری دەقی– شوێنی نەبوویەوە، تا ئەم ئوممەتە بەئاگا هات لە گەنجینەی زانستی کۆمەڵایەتی، کە بە سەر خۆرئاوادا کرایەوە –لەسەر بنەمای بیری ئیبن خەلدونو بەرنامەکەی لە بوارەکانی زانستی کۆمەڵایەتیی لە مێژوو و فەلسەفەی مێژوو و زانستی کۆمەڵناسییو ئابورییو پەروەردە– دەرگاو ئاسۆی فراوانی کردەوە بۆ نەتەوەکانی خۆرئاوای زەوی، تا تازەپێگەیشتووەکانیان گیانی داهێنانو ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی هاندەریان بێت، توانای جێبەجێکردنی پێبەخشینو لەگەڵ گۆڕانکارییەکانو ڕووبەڕووبوونەوەکاندا وەستانەوە.

خراپیی تێڕوانینی گشتیی تێکچوونی بەرنامەیی، کە تاك زانستی ئاینییو شارستانیی، هەروەها لاوازیی بیرییو نادیاربوونی تێڕوانینی یاسایی بووە مایەی ئەوەی کە ئوممەت بێبەش بێت، لە گەشەی زانستی کۆمەڵایەتیی کە تەواوکەرە لەگەڵ گشتییەتی نیگاو ڕێنمونی لە ڕۆشنبیرکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیی

---

[1] باوکی زەید عەبدوڕڕەحمان کوڕی خەلدون (٧٣٢-٨٠٨ ك، ١٣٣٢- ١٤٠٦ ز) خاوەنیەتی.

ئیسلامییداو تازەکردنەوەی، پێشکەوتنی چەمكو دەزگاکانو وزەو تواناکانیش لەگەڵ گەشەی زانستییو تواناکانو بەرەنگاربوونەوەکاندا.

وشکیی وێژە ئایینییەکان، پشتگوێخستنی نوێگەریی لە چەسپاندنی کردە کۆمەڵایەتییەکانداو تازەکردنەوەو نوێ کردنەوەی دەزگاکاندا، فەرمانێکی ڕوونەو لەبەرچاوەو پێویستی بە بەڵگە نییە.

لێرەدا جێی خۆیەتی نمونەیەك باس بکەین، کە چۆن تێکچوونی بەرنامەیی کاریگەریی هەیە لەسەر قوتابیانی زانستو گرنگیدانو شێوازی چارەسەریان بۆ بابەتە کۆمەڵایەتییەکان، کە گۆشەگیرییان دەردەخات لە گۆشەکانی لەبەرکردنو خۆدەرخستن، لە یەکێ لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، زانایەك وتاری هەینی دەخوێندەوە، باسی پاکوخاوێنی (طهارة) کرد، مرۆڤ حەقە بڵێ، باسەکەی بە شێوازێکی باشو کاریگەرو ڕوون بوو لە گوێی گوێگرەکانیدا، باسی پاکوخاوێنی ئایینییو یاساکانی بوو، چ شتێك پیسیی لادەباتو چی شتێك لاینابات، باسەکەی بە گوێرەی پەرتوکە فیقهییەکانو حوکمەکانی بوو.

دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی –هەروەکو دابو نەریتێکی جوانی زاناکان لە نووسینگەکەی پێشوازیی لە خەڵك کرد – سڵاوم لێکردو لای دانیشتم، پێم وت: بە شێوازێکی جوان، کە وتارەکەی زۆر ڕەوانو فراوانو هەموو لایەنە فیقهییەکانی تێدابوو، یادم خستەوە، کە وتارەکەی بە ڕای من، باسی پاکوخاوێنیو خۆپاراستنی تەندروستییانەی تیادانەبوو بە شێوەیەکی تێرو تەواو، ڕوونیشم کردەوە، ئەگەر ئەم یاسایە جوان ڕوون نەکرێتەوە، خەڵکی گاڵتە دەکات بە پاکوخاوێنیو گرنگی پێنادات، وا تەماشای دەکەن، کە باسێکی لاوەکییەو باری سەرشانیان قورستر دەکات، بەڵکو هەندێ باسی ئەم مەسەلە ئاماژەی تیابوو، کە هەندێ پیسیی گرفت نییە، وەکو چڵم، کە بە هۆیەوە نەخۆشیی درمیی دروست دەبێت، هەندێ لەو پیسیانەش، کە بە جلوبەرگەوەیە، کە بە پێی یاساکانی فیقهی دەستنوێژ ناشکێنن، بەم شێوەیە ئێمە –کە خەڵك فێری تەهارەت دەکەین– هانیان دەدەین لەسەر گوێ پێنەدانو بە سووك سەیرکردنی پاکوخاوێنیو پاراستنی تەندروستی گشتیی، گفتوگۆیەکی زانستییو دۆستانە بوو، ئەم زانایە بە سنگێکی فراوانەوە وەریدەگرت، ئەمەش بەڵگەیەکە،

کە پێویستمان بە ئاڵوگۆڕی ڕاوبۆچوون هەیە، تا بازنەی زانست فراوان بێت، تێبگەین لە شتە شاراوەکانی ژیانو ڕۆشنبیریمان، بەرنامەمان چاك بکەین، دوورەپەرێزیی لادەینو دووربکەوینەوە لە تاکزانستیی.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە، کە هەتا باسی پاکوخاوێنی لەم جۆرە هەڵوێستانەدا، تەنها بۆچوون بۆ مزگەوتو کۆڕو کۆمەڵە، هۆشیارکردنەوە بە کاروباری پاکوخاوێنیو خۆپاراستن، لەڕاستیدا بەشێکی گرنگە لە نیازو مەبەستی بەدیهێنانی ئامانج لە پاکوخاوێنی، کە پێغەمبەر (ﷺ) بەڕەفتارەکانی دەریبڕیو فەرمانی دەکرد بە دەوروبەرەکەی، کە پاكو خاوێن بنو گرنگیی پێبدەن، دەیترساندن، تا تەمەڵی تیا نەکەن، جارێك دیتی لە سێبەری دیواری مسوڵمانێك پشێوییو نارێكو پێکیی هەیە، فەرمانیدا، تا خاوێنی بکەنەوەو گرنگیی پێبدەن، وەك جولەکەکان نەکەن، کە گرنگییان بە پاکوخاوێنی نەدەدا، بەڵام وا دیارە، ئەمڕۆ ئوممەتی ئیسلام تووشی ئەو نەخۆشییە بووە، کە جاران تووشی جولەکە بووبوو، لە نەخۆشییە دەروونییو کۆمەڵایەتییەکان، کە لە ناویاندا باو بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)[1].

بەهۆی تێکچوونی بەرنامەوە، زانست بووە بە دەقێکی پیتی بەشی، کە لەسەر شوێنکەوتنو تاقیکردنەوەی کوێرانە بنیات نراوەو دامەزراوە، هەروەها نوقم بووە لە ئاڵۆزکاوییو پەراوێزو کورتکراوەکانداو زانست بەش بەشکراوە، نێوانی باوەڕو کاروباری ژیان دوور کەوتووەتەوە، واش لێهاتووە زانستی یەکتاپەرستیی تایبەتمەندە بە بیروباوەڕێکی ڕووتو بەس، یان ناودەبرێت بە

---

[1] لە فەرموودەدا هاتووە کە محمدی کوڕی بەششار لە ابو عامر القعدی و ئەویش لە خالیدی کوڕی ایاس و ئەو لە صالحی کوری ئەبی حەسسان دەگێڕێتەوە کە بیستم لە سەعیدی کوڕی موسەییەب کە فەرمووی: خوا باشە و باشی خۆش دەوێت پاکەو پاکی خۆش دەوێت، بەخشندەیە و بەخشندەیی خۆش دەوێت، دەهندەیە و دەهندەی خۆش دەوێت، دەسا (وابزانم وتی: حەوشەکانتان) پاك بکەنەوە و لە جوولەکە مەچن. وتی: ئەمەم بۆ موهاجیری کوڕی مسمار باس کرد ئەویش وتی: عامر کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە باوکیەوە و ئەویش لە پێغەمبەرەوە شتێکی وای بۆ گێڕاومەتەوە، بەڵام ئەو وتی: حەوشەکانتان پاك بکەنەوە. سنن الترمذي ٢٧٢٣.

زانستی وته (علم الكلام)، كه زۆربەی لایەنەكانی قسەی وشكو باسی لاهوتە، زانستی فیقه لە زانستی باوەڕ جیا بووەتەوەو بە تەنها كاروباری تاكو باسەكانی ژیانی تاك دەردەخات، كە پشت دەبەستێت بە لێكۆڵینەوە لەسەر بنەمایەكی بەش بەشكراو و لەسەر پێوانەی بەش بەش لە ئەوەی كە زووتر كراوە دەربارەی بارە جۆراوجۆرەكان بێئەوەی وێنەی گشتیی ڕەچاو بكرێت، تا وای لێهات لای زانایانی ئەم سەردەمە، گرنگیدانیان تەنها بە لایەنی زمانەوانییە لە دەقەكاندا، هەوڵی زۆر دەبەخشرێت بۆ ئەم لایەنە، ئەگەر چاویش بنووقێنرێت لە هەندێك لە لایەنە لاوازەكانیو لایەنە نامۆكانی لەناو گێڕراوەكاندا، (الروایات)، تا وای لێهات ناسینی دەقەكان لە چەرخی دەستەوسانییو وشكییو لاساییكردنەوەدا مەبەستێكە، كە بەهۆیەوە هێزی پیرۆزییەكەی، دەستەوسانییە زانستییەكەی دادەپۆشێت، لە هەمان كاتیشدا، مێشكی قوتابیانی پێدەئاخنرێت، بەبێ گوێپێدانی زانستییو ئاسەواری ئەو جۆرە زانستەو بواری گونجانی لەگەڵ قوتابیداو ڕۆڵی لە بنیاتنانی ژیرییەتی قوتابییەكەدا، هەروەها لە بنیاتنانی دەروونیدا[1]، ئێمە سەرسام دەبین لەوە، كە هەندێكیان شانازیی پێوە دەكەن، لە

[1] سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندو گرنگە، لێیەوە هەموو نموونە پراكتیكییەكان دەردەكەوێت لە ژیانی كۆمەڵگای مرۆڤایەتییدا، كە پێغەمبەر لە سەردەمی خۆیدا كردوویەتی، دەیسەلمێنێ، كە لە ژیانی مرۆڤەكاندا دەتوانرێ بكرێ، بەڵام دەبێ بارودۆخو كاتو شوێنەكەی بزانرێ، هەتا هەست بە ناوەرۆكەكەی بكەین، هەروەها دەبێ تەنها لەسەر فەرموودەی (صحیح) سوور بین، هەموو شێوازێكی زانستیی دەخەینە كار بۆ زانینی ئەو فەرموودە ڕاستانە، لە ڕووی ڕەخنەی سەنەدو ڕەخنەی دەقەكەوە، گرنگترینیان بریتییە لە گونجاوی ماناكانی دەقەكان لەگەڵ ڕێبازەكانی قورئانو چەمكو مەبەستەكانیدا، هەر دەقێ متمانە بە كەسەكەی گێڕاویەتییەوە ناكرێ، یان مەبەستو ڕێبازەكانی قورئانی تیا نەبێ، نابێت وەربگیرێت، چونكە ناتەواوە، ئەگەر وەریبگرین، ژیریی خۆمان ناهێڵین، بەرنامەمان پەكدەخەین، مەبەستەكانی قورئانیش نازانینو خراپ تەئویلی دەكەین، بەڵام ئەگەر ماناكان لە دەقەكاندا دروست بوو، كە گێڕەرەوەكەی متمانەبێ لە بەشی ئەسار كاری پێدەكەین، سوود لە ماناكەی وەردەگیرێ، بەبێ ئەوەی تارای پیرۆزیی بدەین بەسەریدا، چونكە وەرگرتنی ئەم جۆرە فەرموودانە، پەیوەندیی بە چاكیی ماناكەیەوەیە، ئەمەش بە تەنها بەسە.

پلەو پایەی، کە دایدەنێن بۆ هەندێك لە پێشەواکان، گوایە دەیەها هەزار دەقی درۆیان پیشانی کوڕەکانیان داوە، تا فەرموودەی ڕاست لە فەرموودەی درۆ جیا بکەنەوە، ئەو گێڕەرەوانە ئەوەندە سوور بوون لەسەر ئەو دەقانە، گێڕانەوەو دروستکردنو زیادەڕەوییی تیایدا، هەموو هەوڵێکیان بەخشیوە، بە بێ ئەوەی هەست بە خراپیی ئەم جۆرە زانستانە بکەن لەسەر دەروونی ئەو کەسەی کە لەبەری دەکات، بە ئاگا نەبوون —کاتێ شانازییان دەکرد بە پلەو پایەی ئەفسوناوییەوە— کە لەبەرکردنی فەرموودەی هەڵبەستراوو درۆ، کاریگەریی خراپی دەبێت لەسەر خوێنەرو قوتابی، چاك وایە خوێنەر هەوڵی بۆ ناسینی ڕیوایەتە ڕاستەکان بخاتە کار، نەك ڕیوایەتە ناڕاستو درۆکان، جگە لە فەرموودە ڕاستەکانیش، ئەوانی تر ڕاست نین، ئەگەر لەناو خەڵکدا بووترێت، ئەوە لەو ڕووەوەیە، کە قسەیەکی چاکە، بەڵام هەڵبەستراوو درۆ کۆتایی نییە، زۆربوونیشی سنووری نییە، تەنها ئەوەندە بەسە لەو بارەوە هەست بە مەرامو مەبەستەکانی ئەم جۆرە درۆیانە بکرێو ڕێگوزەرو هۆکارەکانی پیشان بدرێت، ئەوەشی کە بڵاو دەکرێتەوە بەرەنگاری بکرێتەوە.

هەروەها لە بارەی بێئاگایی لە ئاسەواری دەروونیی زانست لە بیری ئوممەتداو ڕۆچوون لە گرنگیدان بەبڕێکی زۆر لە زانست، کە ئەمڕۆ لەبواری فێرکردنی ئایینییدا تیایدا دەژین، کە مێشکی منداڵانی پێ پڕ دەکرێتو ناگونجێت لەگەڵ ژیریی منداڵو بنیاتی دەروونیدا، نەك هەر نەگونجاوە، بەڵکو —بەم شێوازە— دەرفەتی وەرگرتنی زانستێك، کە سوودی دەروونیی هەبێت، کەم دەکاتەوەو بێبەشی دەکاتەوە —لە ئەنجامی بەکارهێنانی کاتی منداڵەکەو وزەی بەفیڕۆ دەڕوات بەو زانستە وشکە— لە هەموو زانستێك، کە پێویستییەتی، بێ بەشیشی دەکات لە شێوازەکانی فێربوون، کە لە قۆناغی نەرمو ناسکیدا دەبێتە هۆی بنیاتنانی دەروونی منداڵەکە، بە فەوتاندنی ئەم دەرفەتە پەروەردەییە ویژدانییەش —کە تەمەنی منداڵییە— تێپەڕبوونی بەبێ گوێپێدان پێیو ئامادە نەکردنی پێویستییە پەروەردەییەکانی، ئیتر دەرفەتی چاککردنەوەی بۆ هەتا هەتایی، لەدەست دەچێو ناگەڕێتەوە، بۆشاییەکیش بەجێدەهێڵێو درزێك لە بنیاتنانی دەروونی ئەو تاکە تازە پێگەیشتووە دروست دەکات، دوای

لەدەستدانی، ئیتر ڕێگا نییە بۆ چاککردنەوەی، کاتێ ئەم منالە نەرمو ناسکە لەسەر ئەم وەرگرتنو دروستکردنە گەورە ببێت.

نموونەیەکی تر، کە مێشکی منالی پێ پڕدەکرێت -سوودی کەمە- ئەوەیە، کە منال فێری دەبێت لە قۆناغی سەرەتاییدا دەربارەی بڕی زەکاتی حوشترو مانگاو مەڕو کشتوکال، زۆر لەو منالانە حوشتریان نەدیووە، لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان نەبێتە خاوەنی مانگا، یان کشتوکال، یان مەڕ، ئیتر بۆچی مێشکی پڕ دەکرێت لەو وردەکارییە فیقهییە وشکانە، کارێکیشە پەیوەندیی نییە بە ژیانی منالەکەوە، ئەگەر ناچاریی بکەیت، زەکاتی مالی بازرگانییو بەشەکانو بیناو پیشەسازیی بزانێت، باشە چەند لەو منالانە دەبنە کۆکەرەوەی زەکات؟ ئەگەر ببنە خاوەنی سامانیش، کە گەورە بوون، ئایا ئەوەی بە منالی لەبەریان کردووە، ئێستا دەیزانن؟ ئایا زانینی ئەو بڕو ڕێژانە سوودی دەبێت بۆیان؟ یان دەگەڕێن بە دوای کەسێکی پسپۆڕ لەو بارەیەوە؟

خۆزگە زیانەکە لەم سنوورەدا بوەستایە، کە پڕکردنی مێشکی منالانە لە شتی بێسوود، بەلام خراپتر ئەوەیە، کە قۆناغی منالیی کە بنیاتی دەروونییو ویژدانی تیا گەشە دەکاتو سۆزو بۆچوونو چەمکەکان تیادا دەردەکەوێت، لەبەرئەوە باش وایە، لە قۆناغی گەشەی منالدا، بەو زانستە پەروەردە بکرێت، کە گونجاوە لەگەل وزەو هۆشو سروشتیدا، چاك وایە لەبواری زەکاتدا، ماناکانی هاوکارییو بەزەییو قوربانیدانو بەخشینو برایەتی هاوبەشیی لاوازو پەککەوتەو دەستکورتەکان باس بکرێت، هەر بە لەبەرکردنو باسکردنیش نەبێت، بەلکو هۆکارەکانی خوێنراوو بینراوو بیستراو بەکاربهێنرێت، بە شێوازێکی پەروەدەیی کردارییی کاریگەر، لەوانە تێکەل بوون لەگەل هەژارو پەککەوتەو کەمئەندامەکانو خزمەتکردنیانو پێشکەشکردنی یارمەتیی بۆیان، هەروەها هەستکردن بە پێویستییەکانیانو نارەحەتییەکانیان، تا بەزەییو بەخشین ببێتە بەشێك لە پێکهاتەی دەروونی ئەو منالانە، ئیتر کە گەورە بوون، ڕاناکەن لە بەخشینو قوربانیدان، دلیان ڕەق نابێتو یارمەتیی لێقەوماوانو بێبەشەکان دەدەن.

پێویستی زانستی یاسایی فیقهی لە تەمەنی منالیدا -لەو بارەوە، کە ڕۆشنبیریی گشتیی بێت- تێگەیشتنێکی گشتیی لە ڕووەکانی زەکات بەسە،

لەگەڵ ڕێژە گشتییەکەیدا، کە فەرزە لە سامانو ماڵ بۆ ئەو تاقمانەی، کە خاوەنی پێویستین، ئەمەش یەك بەشە لە ئەرکەکانی بەزەییو هاوکارییو برایەتییو بەخشینو پێدانی چاکەو یارمەتییو هاوکاریی.

لەدەستدانی هەلی پێکهێنانی دەروونیی بە خۆشویستنو ئارەزوومەندانە کە ترسو تۆقاندن جێگەی بگرێتەوە، ئەم پڕکردنە زانستییەش خۆی لەخۆیدا، دەبێتە ئامانجو ئاگاداری ئەو ڕۆڵە نابین، کە بەو جۆرە زانیارییانە پێشکەش دەکرێت، ئاگا نەبوون لە چاودێریی خراپیو کاریگەریی لە پێکهێنانی عەقڵو پەروەدەی منالدا، بێئاگابوونە لە سروشتی منالو پەیوەندیی زانستیی بە پەیوەندیی ویژدانییو دەروونییەوە لە بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤایەتییو گەشەکردنی، ئەمەش یەکێکە لە بۆماوەکانی تێکچوونی بەرنامەیی، کە تووشی بیرو شارستانییەتیی ئیسلامیی بووە لە چەرخەکانی دواییدا.

## تێکچوونی سێیەم: تێکچوونی چەمکەکان

سێیەم تێکچوونی ترسناك، کە تووشی بیری ئیسلامییو عەقڵی مسوڵمان بووە، تێکچوونی چەمکەکانە، لە ئەنجامی کەنارگیریی زاناکان بوو، ئینجا بەهۆیەوە دەستەوسانی بیرییو وشکییو دانانی وتارەکان بۆ ترساندن، بۆ کوژاندنەوەی گیانی دادگاییکردنو ڕەخنەگرتنو ناچارکردنی خەڵك –بەهۆی پەککەوتەیی بیرییەوە– بۆ خۆ تەسلیم کردنو شوێنکەوتنو وەرگرتن، چونکە گیانی دادگاییکردنو داوای قەناعەتپێکردن نەدەکوژایەوە، ئەگەر زۆرێك لە چەمکە ئیسلامییەکان، کە بنەڕەتیین، تێك نەچوایە، بۆ ئاسانکردنی کارەکانو ئامادەکردنی عەقڵەکانو دەروونەکان بۆ گەردنکەچبوون بۆ شوێنکەوتنو تەسلیمبوون.

## تێکچوونی چەمکی بەندایەتیی

چەمکی (بەندایەتیی) یەکێکە لە چەمکە گرنگو بنەڕەتییەکان لە ئیسلامدا، تێکچوونەکەی زۆرێك لە چەمکە ئیسلامییەکانی تری تێکدا، چەمکە تێکچووەکان بوونە هاوکاریی یەکترو دەسەڵاتێکی دەروونیان سەپاندو عەقڵی ڕەخنەگرتنیان

هەڵوەشاندەوەو بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای ڕاستییدا، پەردەی بەسەردا درا، تەنها لافلێدانو جولانی خەونەکان، بە بێ ئەوەی داوای ئەنجامو گەڕان بە دوای شوێنەواردا بکرێت.

مسوڵمان –وەك ئەوەی ئیسلام داوای لێدەکات– بەڕێزە، جێنشینی ڕێزلێگیراوە، بەندایەتیکردنی بۆ خوا مایەی سەربەرزییو ڕێزە، چونکە ڕەنگدانەوەی ویستێکی ئازادە لە ناسینی حەقو شوێنکەوتنی ڕێگای ڕاستو دروست، مسوڵمانە باوەڕدارەکان بەندەی دڵسۆزی پەروەردگارنو هەرگیز بەڕێکەوت نییە، کە هەمیشە خوای گەورە گفتی بۆ مرۆڤەکان لە قورئاندا بە وشەی (عِباد) دەردەبڕێت، هەروەها (عُبَاد)، وشەی (عباد) لە وشەی (التعبید) هاتووە، نەك لە (الاستبعاد)، بەڵام وشەی (عبید) بەمجۆرە لە پێنج جێگادا لە قورئاندا هاتووە، کە خوای گەورە هەرگیز (وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ) (الحج: ١٠ ) چونکە مرۆڤ کاتێ سەرگەردان دەبێتو هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەکات، ئیتر دروستکراوەکان بێت، یان ئارەزووە ئاژەڵییەکان ئەوە –لەم بارەدا– ستەمی لە خۆی کردووەو کردوویەتی بە کۆیلە، بەڵام بەندە کاتێ گوێڕایەڵیی خوا دەکات، دەروونی بە عەبد دەکات، بەڵام بەندە کاتێ لە ڕێڕەوی حەقو هیدایەت لادەدات، ئەوە خۆی کردووە بە کۆیلە، لەبەرئەوە دەبینین وشەی (عبودیە)، کە بەندایەتیکردنی مسوڵمانە بۆ خوا، لە وشەی عەبیدەوە وەرگیراوە، نەك لە وشەی (الاستعباد)، مرۆڤی ساغ، ئەو کەسەیە، کە لە سەر فیترەتی ساغە، بووەتە بەندە بۆ خوا، نەك بە کۆیلە، چونکە خوا دروستکەریەتی، ئەگەر مرۆڤ گوێڕایەڵی تاغوتو ئارەزووەکان بێت نەبووە بە عەبد، بەڵکو بووە بە کۆیلە.

ئەمە هاوشێوەی وشەی (الذل)ە لە قورئانی پیرۆزدا، بۆ نموونە گەردنکەچیی مرۆڤ، بۆ دایكو باوکی، بەگوێرەی سروشتی پەیوەندیی مرۆڤ بە دایكو باوکییەوە، لە قورئانی پیرۆزدا وەرگیراوە لە وشەی (التذلیل) کە ئاسانکارییو سۆزو بەزەیی دەگەیەنێ بە دایكو باوكو لە وشەی (المذلة) نەهاتووە، کە مانای سووکێتییە، ئەمەش نیشانەی باوکایەتییو کوڕو ڕۆڵەیە، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً) (الإسراء: ٢٤ )

بەڵام، تێکەڵکردنی وتاری خوا بەرامبەر بێباوەڕی ملهوڕی لوتبەرز، لەگەڵ وتاری خوا بەرامبەر باوەڕدار، بەندەی ڕوو لە خوا لە وشەی (عبودیة)، کە گوایە لە (الاستعباد) سەرشۆڕییو هەڕەشە دەگەیەنێت، هەرگیز وشەی (عبید) لە (الاستعباد)وە وەرنەگیراوە، چونکە مرۆڤ دروستکراوێکی دیاریکراوەو خوا خۆی دەسەڵاتداری یەکەمەو هەرگیز بوار نییە بەراورد بکرێت لە نێوانی خواو مرۆڤدا، مانای نییە، ئەو جۆرە داوا بەتاڵانە بەراورد بکرێ لە جێگای خۆیدا نەبێتو نابێ ڕووبەڕووی مسوڵمانی باوەڕدار بکرێتەوە، چونکە ئەو کارانە کۆیلەکردنی عەقڵییو ویژدانی مسوڵمانە، زاڵ بوونیش بەسەر عەقڵی مسوڵماندا، تێکدانی چەمکی (بەندایەتی)یەو برەودانە بەم بەراوردانە لە شکۆمەندی عەقڵ کەم دەکاتەوە، ئەو کاتە پرسیارو پشکنینەکانی جێگای تۆمەتبارکردن دەبێت، بە سەرپێچیکردنو پێداگرتن لەسەری، ئەم ناشیرینکردنە بەشداریی کردووە لە ملکەچکردنی ویژدانی مسوڵمانو مافەکانی زەوتکراوە لە بیرکردنەوەو ڕەخنەگرتنو ئەندازەگرتندا، لەوەی، کە پەیوەندیی بەرێڕەوی ئەم هەڵوێستە لوتبەرزییە بووە هۆی —لەلایەن زۆر کەس لە شاگردانی زانستی ئایینی، کە کەلوپەلی کەمیان پێیە لە زانستە مرۆڤایەتییەکانداو زانیارییان نییە لە ڕێگاکانی دابەزینی زانستی هاتنە خوارەوەی نیگا بەسەر واقیعی ژیانی خەڵکدا — لاکردنەوەی زۆر لە بیریارەکان بەلای فەلسەفە نامۆو بۆماوەییەکاندا لە شارستانییەتو ڕۆشنبیریی نەتەوەکانی تر، کە هاتنە ناو ئاینی ئیسلام، بە بێ بەرنامەیەك، کە ڕێنمونیان بکات لەو بوارەدا، ئەوەی ڕاستی بێ، زۆربەی ئەو فەلسەفەو بۆماوانە (الموروثات) دەگەڕێتەوە بۆ شتی بێماناو نادیارو دوور لە هەموو هیدایەتێکی خوایی، ئەمەش بووە هۆی کێشەو بەربەرەکانی بێمانا لە بیری ئیسلامییداو لە نێوان ژیرییو گواستنەوە (العقل والنقل)، بەمەش ئوممەت زیاتر لاوازبوو، بیرو تواناکانی پەرتو بڵاوبوونو ئەم کێشەیە چەمکەکانی ئیسلامی ناشیرین کرد بۆ داپۆشینی بێدەسەڵاتیی بیرو ژێرბارکردنی ژیریی بیریاری ڕەخنەگرو کەمکردنەوەی پلەوپایەی، چەمکی بەندایەتی (عبودیة) لە گرنگترین چەمکەکان بوو کە شێوێنرا تا ئەم شێواندنە ببێتە بناغەی ڕۆشنبیرییو بیری لە پێکهاتەی (دەروونی بەندەکاندا) لە بنیاتنانی دەروونی ڕۆڵەو گەلەکانی

ئوممەتدا، هەروەها شێوازەکانی ترساندنو وتاردان یەکیان گرت دژی ئەم ئوممەتە، بۆ ژێربارکردنی عەقڵی مسوڵمان، هەڵبژاردە سیاسییەکانیش بێ دەسەڵات بوون، چونکە لەو بیرۆکەیەدا بیرو هەڵبژاردە بیرییەکان دەستەوسان بوون، چونکە هەردووکیان دابڕابوون لە کارکردن، توندوتیژیی‌و ترساندنو هەردووکیان -تا ئێستاش- هۆکارو ئامێری مرۆڤی بێدەسەڵاتو لاوازە.

گومانی تیانییە، کە ناشیرینکردنی چەمکی (عبودیة) -کە سەرچاوەی شانازییە بۆ مسوڵمانو چاوگی متمانە بە دەروونە، چونکە دەروونی مسوڵمان ژێربارەو هەقی بەلاوە قبوڵە- نەفامکردنو لغاوکردنو بەسووك کردن، سەرچاوەی هەستەکانی سەرشۆڕی‌و پەککەوتەیی‌و لاوازیی‌و بێڕێزیی‌و ژێرییە، بەم جۆرە لاساییکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە بووە لە بری بیرکردنەوەو وردبوونەوە، ملشۆڕی بووە لە بری جێدار(البدیل) قەناعەت پێکردن، زۆرداریی بووە لە بری ویستو هەڵبژاردن[1].

ئەوەی گرنگە، ئەوەیە هەست بە پەیوەندیی نێوان چەمکە بنەڕەتییە ئیسلامییەکان، کە چەمکی یەکتاپەرستیی‌و چەمکی ویست، چەمکی بەندایەتیی، چەمکی جێنشینکردن، چەمکی پاککردنەوەو چەمکی ئاوەدانکردنەوەن.

چەمکی یەکتاپەرستیی باسێکی کهنوتی نییە، تەنها وەسفی زاتی خوایی بێت، کۆمەڵەکە سێ باسی ئەو سیفەتانە بکەن بە نوێنەرایەتی، بەڵکو ڕێبازێکی ئاینییەو چەمکێکی ئیسلامییە، مانای هەیە لە ژیانی مرۆڤ لەتێگەیشتن لە مانای ئەم ژیانەو تێگەیشتنی مەبەست لەم ژیانە.

## ناوەندییەتی چەمکی یەکتاپەرستیی‌و ماناکانی لە ژیاندا

گرنگیی ڕێبازی یەکتاپەرستیی لە ئیسلامدا، کە چوارچێوەیەك پێك دەهێنێت بۆ تێگەیشتن لە ژیانو بوونەوەر، ڕێبازو بناغەی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانیش

---

[1] ابوسليمان، عبدالحميد احمد، تەرجەمەی ناصر احمد المرشد البريك: النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الإسلامية ١٩٩٣، هەروەها بڕوانە: ابوسليمان، عبدالحميد احمد: ازمة العقل المسلم. ١٩٩٤.

دەچەسپێنێت، هەر تێکچوونێك لەم ڕێبازو چەمکە شوێنەواری ترسناکی دەبێت لە مانای ژیانو جۆرو مەبەستی مسوڵمانیەتییدا.

ڕێبازی یەکتاپەرستیی مانای تاکییەتی دروستکەرە، ئەمەش ڕاستییەکەیەتی: بوونەوەرو یەکێتی ژیانو مرۆڤو مەبەست لە دروستکردنو بوونەوەرو تەواویەتی دەردەخات، هەرگیز پێچەوانەی نییەو مانای مەبەستی چاکەیە لە دروستکردنداو بوار نییە بۆ لوتبەرزیی، یان ستەمکردن، یان دەستبەسەراگرتن لە نێوان مرۆڤدا، بەمجۆرە ڕێبازی یەکتاپەرستیی پابەندبوونی تیایە بەڕێبازەکانی دادپەروەرییو ڕاوێژو یەکسانی لە مافەکانداو لە ڕێزی مرۆڤایەتییو لە ئازادیی ویستو بەرپرسیارییەتی مرۆڤایەتییدا، ڕێبازی یەکتاپەرستیی –لەسەر بنەمای ڕێبازی یەکێتیی دروستبوونو مەبەستی چاکە لێی– مرۆڤ پابەند دەکات بەڕێبازی جێنشینایەتی مرۆڤ لەوە، کە خوا پێی بەخشیوە لە ویستو ژیریو توانای بۆ ژێربارکردنی شتەکان، بەمەش کۆششکردن دەکەوێتە ئەستۆی لەڕووی تاكو کۆمەڵەوە بۆ چاکسازیی لەم بوونەوەرەدا، بێ ستەمو خۆبەگەورەزانینو بێ وێرانکردنو ڕۆچوون لە خراپەدا.

مەبەستی چاکەکردنو سەربەستیی ویستو لێپرسراوێتی مرۆڤایەتیی، خۆی لە ڕێبازی یەکتاپەرستییو جێنشینایەتییدا دەنوێنێت، کە ئەمەش پابەندبوونی چەمکی خۆپاککردنەوەو چەمکی ئاوەدانکردنەوەی لەسەر بنیات دەنرێت، چونکە مرۆڤ تاك بێت، یان کۆمەڵ، دەبێ هەوڵی بەدیهێنانی مەبەستە چاکەکانی دروستکراوەکان بدات، ئیتر هەوڵ دەدات بۆ تەواوکارییو کارلێکردنی بنیاتنەرانە لەگەڵ بوونەوەرو دەورووبەری بە گوێرەی ئەو یاسایانەی، کە خوا دایناوە لە دەروونو بوونەوەردا.

بەرپاکردنی کارلێکی بنیاتنەر لە دەرووندا لە نێوان مانا گیانییەکانو حەزە چاکەکان لە نێوان غەریزەو پێویستییە ماددییو ژێربارکراوەکان بۆ مرۆڤ ئەوەیە، پاك بکرێتەوە، پاککردنەوەی دەروونو دەستگرتن بە ڕێبازەکانی حەقو یەکسانیو چاکە، بە گوێرەی پەیامی خوا کە هیدایەتو ناسینی تیایە، هەروەها بە گوێرەی ئەو یاسایانەی، کە لە بوونەوەرو ماددەدا دایناوە، ئەو هۆکارو

جێبەجێکردنو دەربڕینە لە کارلێکی حەزە گیانییە ویژدانییە چاکەکانو غەریزەو ئارەزووەکانو پێویستییە ماددییە مۆرڤایەتییەکانو بەدیهێنانی ئاوەدانیی چاكو جوانکاریيو چاکەخوازیی، بەپێی ئەوەی کە خوا بە نیگا ناردوویەتی لە هیدایەتو ناسینی خوا، بە گوێرەی ئەو شتانەش، کە دایناوە لە بوونەوەرو وزەو یاساکاندا.

پاککردنەوەی دەروونو هەوڵدان بۆ چاکەکاری لەزەویو بوونەوەردا، لەسەر بنەمای هیدایەتی پەیامو یاساکانی فیترەت، کە خوا لەزیندەوەردا دایناوە، ئەمە کاکڵەی چەمکی بەندایەتییە، کە مانای: مسوڵمان خۆی پەروەردە بکاتو خۆی ڕابهێنێتو خۆی پاك بکاتەوە بەوەی کە ڕاستو دادپەروەریيو حەقە.

ئەوە (بەندەکردنی) دەروونە بۆ حەق، کە سیفەتو ناوی خوایە، ئەوە ڕێگاشە بۆ باوەڕو کاری چاکەو ئامادەیە بۆ جێنشینایەتییو پێشەوایەتییو چاکەی هەردوو ماڵی دونیاو دواڕۆژ.

بەم تێگەیشتنە ڕێكوپێکە لە نێوان ڕێبازەکانو چەمکەکانو تێڕوانینی گشتیی ئیسلامیی، چەمکی (بەندایەتیی) هەروەکو قورئان دەریبڕیوە– دەبێتە چاوگی سەربەرزییو شانازییو هێزو متمانە لە ویژدانی مسوڵماندا، لە بنیاتنانی دەروونيو ویژدانیدا، ئەمەش کۆیلایەتی دەروونی مرۆڤ نییە، سەرچاوەش نییە بۆ سەرشۆڕيو ڕیسوایی ملکەچی خراپ لە دەروونی مسوڵماندا، لە بنیاتنانی ویژدانيو دەرونیدا، کە هەرگیز مەبەستەکانی ئیسلام لە چاکسازيو ئاوەدانیدا وانەبووە، هەر کەسیش دەروونی لەسەر سەرشۆڕيو ڕیسوایی بنیات بنێت بە هەر ئاڕاستەیەك بێت، هەرگیز ناتوانێ ماناکانی سەربەرزییو کەرامەتو لێپرسراویەتی بناسێت بە هیچ ئاڕاستەیەکدا.

هەتا ڕێبازەکانی ئیسلامو چەمکە بنەڕەتییەکانی نەبنە بناغەی بنیاتنانی عەقڵی مسوڵمانو بەرنامەی ڕۆشنبیرییو کاکڵەی ویژدانی، نەبنە چاوساغیی ڕێڕەوو مەبەستەکانی، هەروەها چەند بەرەیەك لەم ئوممەتە پەروەردە نەبێت لەسەر ئەوماناو بنیاتە کاریگەرانە، هەرگیز حاڵی ئەم ئوممەتە ناگۆڕێت، وزەو پلەو پایەکەی ناگەڕێتەوە، ئەوە یاسای خوایە لە دروستکراوەکانیدا، یاساکانی

خوا ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت، ئەگەرچی لە لایەن دەوژمنو ستەمکارو خراپەکارو تەماعکارەکانەوە خراپەی زۆر بکرێت بەرامبەر بە ئیسلامو مسوڵمانان.

ئەوەی سوودمەند بێت لەم مەقامەدا ئەوەیە، هەندێك لە دەقەکانی قورئان بهێنن، کە خوێنەری بەڕێز دەبەستێتەوە بە سەرچاوە بنەڕەتییەکەوە لە ڕێبازەکانی ئیسلامو چەمکەکانی لە یەکتاپەرستییو بەندایەتییو خۆپاککردنەوە، لە جێنشینایەتیو چاکسازییو ئاوەدانیی بەم شێوەیە:

## لە یەکتاپەرستییو بەندایەتییو خۆخاوێنکردنەوەدا

ئایەتەکانی قورئان، ڕێبازی یەکتاپەرستی دەکاتە بنەمایەکی تەواو بۆ بەرپابوونی بوونەوەرو چاکییو پاراستنی، خوای گەورە تاكو تەنیایەو دروستکەرە، ئەگەر وانەبوایە چارەنووسی ئەم بوونەوەرە، وێرانبوون بوو، خوا سەرچاوەی زانیارییە بە حاڵی بوونەوەر، کە تیایدا هیدایەتی مرۆڤەکانو دروستکراوەکان دەدات لەهاتوچۆو ڕێگوزەرەکانیاندا، هەر ئەوش مافی ئاڕاستەکردنو گوێڕایەڵیی لە فەرمانی ئەم بوونەوەرەدا هەیە، لەسەر بنەمای باوەڕ بە خواو جێبەجێکردنی چاکە، چاکە دروست دەبێتو سەربەرزییو پاداشتی دواڕۆژیش دەست دەکەوێت.

خوای گەورە لە قورئاندا دەربارەی بڕیاردانی ڕێبازی یەکتاپەرستیی، دەفەرموێت:

(ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ) (الأنعام: ١٠٢ ).

(لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ) (الأنبياء: ٢٢ ).

خوای گەورە چاکەو بەندایەتیکردنی نەفس بۆ خوا دەکاتە مایەی باشیەتی (إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ* إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ) (الصافات:٨٠– ٨١ ).

(فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) (الكهف: ١١٠ ).

(وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ) (المنافقون: ٨ ).

هەروەها چاکەکردن، ڕێگای سەربەرزیی هەردوو دونیایە، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ) (صـ: ٢٨ ).

(يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ* ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً* فَادْخُلِي فِي عِبَادِي* وَادْخُلِي جَنَّتِي) (الفجر:٢٧– ٣٠ ).

(إِلَّا الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ) (الانشقاق: ٢٥ ).

## لە جێنشینایەتی‌و چاکەکاریی‌و ئاوەدانکردنەوەدا

سوودمەند دەبین، ئەگەر هەندێ لەو ئایەتانە، کە باسی چاکەکاریی‌و ڕێگاکانی هیدایەت دەکات‌و سەرەنجامی ئەو جێنشینە باوەڕدارە کردەوە چاکەکە هەوڵی چاکە دەدات بخەینە ڕوو، هەروەها قورئان بەدرێژیی باسی ڕێگای سەرپێچی‌و گومڕایی‌و پاشەڕۆژی گومڕاکان دەکات، لەوەدا ڕێبازەکانی حەق‌و بەرنامەکانی سەربەرزی‌و چاکسازی‌و ئاوەدانکردنەوە ڕوون دەبێتەوەو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ) (النور: ٥٥ ).

(ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلاَئِفَ فِي الأَرْضِ مِن بَعْدِهِم لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ) (يونس: ١٤).

(وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ) (هود: ٦١ ).

(وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (القصص: ٥٠ ).

(الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى* وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى) (الأعلى:٢– ٣ ).

(إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْراً) (الطلاق: ٣ ).

(فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ) (المرسلات: ٢٣ ).

(إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) (القمر: ٤٩ ).

(الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ) (الأنعام: ٨٢ ).

(مَنْ عَملَ صَالحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حيَاةً طَيِّبَةً ولَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ) (النحل: ٩٧ ).

(إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً) (الكهف: ٣٠ ).

(وَمَنْ يَأْته مُؤْمناً قَدْ عَملَ الصَّالحَات فَأُوْلَئكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَى) (طه: ٧٥ ).

(وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَلَا الْمُسِيءُ قَلِيلاً مَّا تَتَذَكَّرُونَ) (غافر: ٥٨ ).

(وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ) (الأعراف: ٨٥).

(وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ) (القصص: ٧٧ ).

(وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ* وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ) (البقرة:٢٠٥– ٢٠٦ ).

(وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ) (القصص: ٥٩ ).

(وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ) (هود: ١١٧ ).

(فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) (الكهف: ١١٠ ).

له قورئاندا زیاتر لەم ئایەتانە هەیە بۆ ئەو کەسەی داوای زیاتر بکات، هەروەها ڕاستەکانی سوننەتدا چەندین گەنجینە هەیە لە هیدایەتو ئاڕاستەکارییی، کە هەندێکی زۆری، چاوەڕێی هەوڵی زانستیانە بۆ سوودوەرگرتنی لە پەروەردەکردنی تازەپێگەیشتووەکاندا، بۆ چاککردنی بەرنامەی بیریانو پوختکردنی ڕۆشنبیرییانو چاك ئاڕاستەکردنیان.

ئەوەی گرنگە، ئەوەیە، کە تێگەیشتن لە ڕێبازە چەمکە بنەڕەتییە ئیسلامییەکان سەلامەت بێت، چاك بخرێتە ڕوو، پوختە بکرێت، ڕاڤەی ڕاستەقینەی ماناکانی بکرێت لە ژیانی مرۆڤی مسوڵماندا بە تاکو کۆمەڵەوە، هەرچی بۆیاخو شتێکی ناشیرین هەیە لە کهنوتی لاببرێت، هەرچی شتێکیش پەیوەندیی بە تێڕوانینی گشتیی ئیسلامیی ناشیرین کردووە لاببرێت، تا بیپارێزن چالاك بێتو ئەو سیفاتانەی لە گیانی چاکەو چاکەسازییو ئاوەدانییەوە ڕەنگ بداتەوەو ئیسلام لە سەر ڕەوشتی دادپەروەرییو هاوکارییو بەرپرسیاریەتیو ڕێزداری دەربکەوێت.

## تێکچوونی چوارەم: تێکچوونی وتار

چوارەم تێکچوونی ترسناك، کە زیان بە عەقڵو ویژدانو دەروونی مسوڵمان دەگەیەنێت، تێکچوونی وتاری ئیسلامییە، لە سەردەمی جیابوونەوەی نێوان ئەو کۆمەڵە کەسەی، کە بیریاری ئیسلامیینو ئەوانەی، کە سیاسەتمەدارن، ئەم سەردەمە تیایدا کەنارگیرییو بیری دوورەپەرێزیی بووە هۆی ئەوەی، کە بیری جێبەجێکردنو هەوڵو تازەگەرایەتیو داهێنان بچێتە قاڵبی قوتابخانەی دەقی داخراو —لە چەرخەکانی دواییدا– ئیتر ئیجتیهاد بە تەواوی نامێنێ، دەقی لاواز لە ڕاوبۆچوون لەپێشتر دەبێت، لەکاتێکدا ڕا وەردەگیرێت لە کەلەبەری (الاستحسان) کاتێ کە پێویسیش بێت لەسەر بنەمای گیانی شەریعەت، هەموو ئەوانە دەبێ دەربخرێ لە جۆری وتارو ئامانجەکانی، لەو شوێنەوارانەی کە لێی دەکەوێتەوە، لە بنیاتی عەقڵو ویژدانو کەسایەتیی مسوڵماندا.

تێکچوونی وتار لەو بارودۆخەدا دەرئەنجامێکی سروشتیی بوو، چونکە بیری کەنارگیریو جیابوونەوە لە نێوان سەرکردایەتی فیکرییو سەرکردایەتی ڕامیاری پەیدابوو بوو، هیچ پەیوەندییەکی —بەگشتی– نییە بەنیازەکانەوە، وتار لەوتاری بیرو تێڕوانینو وردبوونەوەو قایلکردنو توانای هەوڵو تازەکردنەوەو لەخۆگرتنی گۆڕانکارییەکانی کاتو شوێنو شتە تازەکانیان گۆڕا بۆ وتاری ترساندنو بەزۆر سەپاندنو سەرکوتکردن کە پشتی بەستبوو —لەو کاتەدا– لە زۆر شتیدا– بە کۆمەڵێکی زۆر لە ڕیوایەتی تاك خاوەن "الغفلة"و "المدلسین"و "الحكواتیة"و

خاوەن مەبەستەکان، خراپ ڕاڤەکردن بۆ هەندێ دەقی وتار کە مەبەستی وتارەکە ئەو کەسانە بوو کە کافرو خۆبەگەورەزان‌و دوژمنەکان بوو تا ئاڕاستەی خەڵکی مسوڵمان کە چەقییوە لە نەفامیی‌و هەژاریی‌و نەخۆشییدا، باری شانی قورسە بە ترساندن لەلایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە، ئەم وتارە ترسێنەرە ئاینییە ئەمەی خستەسەر –ئەو لەم شێوەدا– تا قوڕی ژیانیان‌و سەرشۆڕی دەروونیان خەستتر بکاتەوە، یارمەتیدەر بوو بۆ زیاتر سەرشۆڕکردن‌و لێخوڕینیان.

لاوازی کردن‌و مافەکانیان لەدەستدا. هاوبەش کردن لە کاروبارو پاراستنی دەزگاو نەخشەکردنی ڕامیاریی کۆمەڵگەو کارکردن بە گیانی یارمەتیی‌و چاکسازیی لە دەرامەت‌و سامان‌و نیشتماندا، وتەکەی (أبو ذر) بەرامبەر بە (معاوية) کە دامەزرێنەری دەوڵەتی پشتاوپشتە، کاتێ معاویە وتاری خوێندەوە دەربارەی دەرامەتی ئوممەت‌و بەیتولمالی مسوڵمانان‌و ناوینا (مال الله) ئەبو زەر بەرەنگاری بووەوەو بۆی ڕاست کردەوەو یادیخستەوە کە مافی جێنشینایەتی ئوممەتە لەو دەرامەت‌و سامانەی کە هەیەتی دەبێ پرسیار لە دەسەڵاتدارو بەرپرسەکان بکرێت دەربارەی ئەو سامانەو چۆنییەتی گەیاندنی بە خاوەنەکانی‌و وتی "بەڵکو ئەوەماڵی مسوڵمانانە".

هەرگیز سەرسوڕهێنەر نییە کە ئوممەت پارچە پارچەو دواکەوتوو بێت، ئەگەر تێڕوانینی مسوڵمان بۆ کۆمەڵگە داپۆشرێت بە کراسی هەستی لاوازی تاک‌و نەبوونی هەستکردن بە ئاسایش‌و هاوکاریی کۆمەڵ، تێڕوانینی بۆ کارو کۆشش لە ژیاندا نەریتی (سلبی) بەتاڵ بێت لە لایەنی شارستانی‌و ئاوەدانی‌و مانا گیانییەکەی، کاتێ چەمکەکانی مسوڵمان تێك دەچێ ئەو کاتە ئەو چەمکانە دەبنە ئامێری کەمکردنەوەی نرخی عەقڵی، دەبنە هۆکاری ڕووخاندنی متمانەی مرۆڤ بە خۆی، سەیر نییە کە ئوممەت بگاتە ئەو نەرێیی‌و دواکەوتوویییە لە کاتێکدا دەناڵێنێ بەدەست ترس لە دەسەڵاتی سیاسیی کە هیچ هۆکارێك نازانێت بۆ سەرکوتکردنی بەرامبەرەکەی جگە لە سیاسەتی بەرەنگاربوونەوەو تۆقاندن، قامچی‌و شمشێرو تێڵای هەیە، دەرگای بەندیخانەکانی کردۆتەوە بۆ مسوڵمانەکان، ئەمەش لە ئەنجامی لاوازیی لەخۆگرتنی گۆڕانەکان بوو، نەبوونی بنەمایەکی فیکریی کە یارمەتیدەری بێت لەو گۆڕان‌و گەیاندن‌و لەخۆگرتنەدا،

ئەگەر ترساندنی سیاسیی‌و کۆت‌و زنجیرو بەندیخانە، ترساندنی وتاری ئایینیشی بخرێتە سەر کە بریتییە لە دۆزەخ‌و ئاگرو بلێسەو سزای گۆڕو ڕۆژی زیندووکردنەوە، کە سزایەکەو هەمیشە چاوەڕێی دەکەن لە جوڵەو هەڵسوکەوتیاندا، لە پۆشاك لەبەرکردن‌و خواردن‌و خواردنەوەدا، پێوەی بتلێنەوە، ئەوسا دەزانین هۆکارەکانی کوژانەوەی گیانی ئوممەت‌و بێدەسەڵاتیی دەرنەکەوتنی چییە، هۆکارەکانی تەقینەوەی ڕووداوەکان، کە زۆربەیان تەقینەوەی کۆیلەو هەژارو بێدەسەڵاتەکانن.

لە نموونەی ڕاستەوخۆ بۆ خوێنەر، کە چۆن وتاری ئیسلامیی تێکچووە، ئەوە بوو، کە خۆم لە یەکێك لە کۆنگرە ئیسلامییە جیهانییەکاندا بەدیم کرد، کە دەربارەی (الوحدة الإسلامية) بوو، وتارەکە گشتیی‌و هۆڵەکە پڕ بوو لە ئامادەبووان‌و بەشداربووان، کاتێ باسەکە —وا دیاربوو— لە زانست‌و توانای قسەکەرەدا نەبوو، دانیشتوانی هۆڵەکەو ئامادەبووان بێتاقەت بوون، وتارخوێنەکە، کە خێرا گۆڕی بۆ بابەتی ترساندن‌و بە بێ بۆنەیەکی گونجاو، باسی مردنی کرد، کە چۆن هەموو مرۆڤێك دووچاری دەبێت، ئیتر وێنەیەکی سەرسوڕهێنەرم هاتە بەرچاو، کە چۆن وتاری یادخستنەوە بە خراپیی بەکاردەهێنرێت‌و دەگۆڕدرێت بۆ وتاری ترساندن‌و هەڕەشە، وتارخوێنەکە عەقڵی دوانراوەکە (المخاطب) هەڵدەوەشێنێتەوە وەك هەوڵێك بۆ کۆنترۆڵکردنی هۆڵەکەو ئامادەبووان، بە جۆرێك ڕەخنەیان گۆج‌و ئیفلیج بکات‌و دادگاییەکی هۆشیارانەیان بکات، بە هۆی ئەو وتارەی کە ئاڕاستەی کردن.

نموونەیەکی تر بۆ شێوازی بەکارهێنانی ترساندنی فیکری خراپ‌و بەکارهێنانی هێماکانی پیرۆزیی، ئەو شێوازە بوو، کە یەکێك لە وتارخوێنەکان پەنای بۆبرد لە وتارێکی هەینییدا، دەربارەی کارێك لە کارەکانی شێوە (هيئة) کە باسی ڕیشهێڵانەوە بوو، بەڵام ئەو وتارخوێنە شتی پێنەبوو، کە حیکمەتی ڕیشهێڵانەوە بۆ خەڵکەکە ڕوون بکاتەوە، هەوڵی قایلکردنی گوێگرەکانیدا، لە کاتێکدا کە زۆربەی نوێژخوێنەکان ئەوانە بوون، کە ڕیشیان تاشرابوو، ئەوان وای بۆ دەچوون، کە کارێکە پەیوەندیی بە شێوەوە هەیە، ئەمەش جێگای بۆچوونی جیاوازو لێکۆڵینەوەیە، بەڵام وتارخوێنەکە دەستی کرد بە ترساندنی

گوێگرەکانو گۆڕینی ئەم باسە پەراوێزییە، کە باسی شێوەیەکە، هەر وەکو مووی سەر وایە، یان جلوبەرگ، بۆ باسێکی باوەڕییو ئیمانیی، بێباوەڕیو سەرپێچیکردن، وتی: ئەوانەی ڕیش دەتاشن، ئەوانە ئینکاریی سوننەت دەکەن، ئینکاریی فەرمانی پێغەمبەریش (ﷺ) ئینکاریکردنی ئایینە، کەسێکیش ئینکاریی ئایین بکات، کافرە.

شێوەیەکی تری ترساندنی ناشارەزاییانە، دەبیستینو هەستی پێدەکەین لە خوێندنەوەی هەندێ لە پێشەواو وتارخوێنەکان بەرزکردنەوەی دەنگیان لە کاتی خوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی کە باسی هەڕەشە دەکەن، وەکو قورئانخوێنەکە پۆشاکی زاتی خوایی پۆشیبێتو داواکە تەنها بۆ ئەو کەسانە بێت کە لە دوای ئەوەوە نوێژ دەکەن، وا هەست ناکات، کە ئەم ئایەتە وتاری خوایەو ئاڕاستەی مرۆڤ کراوە، قورئانخوێن بێت، یان گوێگر، پێشنوێژ بێت، یان نوێژخوێن، هەموویان وەك یەکن لەبەردەم ئەم ئایەتانەدا، دەبێ هەموویان گەردنکەچ بن بۆی، شێوازی بانگکردنو ئامۆژگاریی ڕاست، ئەوەیە کە وتارخوێن بۆ خۆی بدات، ئەوەی دەیڵێ لە پێشدا بۆ خۆی بێت، ئەو کاتە وتارەکە کاریگەر دەبێت لە ڕوانگەی خۆشەویستیو ئارەزووەوە، بە هاوبەشکردن لە کاری چاکە پێش هەر شتێکی تر.

ئەوەی گرفتە، ئەوەیە کە فیکرو بەرنامە تا ئێستاش ڕێگا دەدا —بەمجۆرە وتارانە لە فێرکردندا— بە بەکارهێنانی دەقەکانو بەپیرۆزدانانیان بە شێوەیەکی کوێرانەو بێ لێکۆڵینەوەی زانستیی بەرنامەیی فراوان، کە تیایدا سەرچاوەکانی زانیاریی تێرو تەواو بێتو بە بێ پەروەردەو فێرکردنێکی وا کە عەقڵێکی بە ئاگا دروست بکاتو دەروونێکی گەیشتوو هەست بە لایەنەکانی ئەم باسەی خراوەتە بەردەست لە ژیانی کۆمەڵگەدا بکات، کە توانای هەبێت هەست بە لایەنەکانیو شتە لە پێشەکانی (أولويات) شوێنە گۆڕاوەکان هەست پێبکات.

کاتێ پەروەردەو فێرکردنی بیروباوەڕو ئایینو ڕۆشنبیریی بەمجۆرە وتار بوو، کە بەکاردەهێنرا لە پێکهێنانی عەقڵییەتی مسوڵمانو بنیاتنانی دەروونیدا، کاریگەریی ئایین —لە زۆر کاتدا— لاوازو خراپ بوو، دەتوانین لە ئەنجامی سەرژمێرییو چاودێریشەوە، لاوازیی وەڵامدانەوەی خەڵك ببینین، لە کاتێکدا

ئامۆژگارییان دەکرێت، هەروەها دەتوانی لە سۆزی منالآنیشدا هەست بەو زانیارییو شێوازانە بکەین، کە پێغەمبەر (ﷺ) باوكو باپیرو پەروەردەکارێکی سەرکەوتوو بوو، هەرگیز لە منالّی نەداوە، چونکە نەرمو بە ئارام بووە بۆ منالآنو لاوەکان، هەستی دەکرد دەربارەی سروشتیانو دەروونیانو قۆناغەکانی گەشەیانو چ شتێ گونجاوە بۆ عەقلّو دەروونیان، بەو جۆرە وتاری بۆ دەدان، لەبەرئەوە هەرگیز پێویستی بەوە نەکردووە -لە بەرنامەو پەروەردەییە هۆشیارکەیدا چۆنییەتی هەلّسوکەوتی لەگەلّ منالآن- هەرگیز لە ژیانیدا لە هیچ منالّێك بدات.

لە نموونەی نەرموونیانیی وتاری پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەلّ لاوەکانو هەستکردن بە باری دەروونیان، ئەو گفتوگۆیەیە، کە لە نێوان گەنجێكو پێغەمبەردا (ﷺ) ئەنجام درا، هاتە خزمەت پێغەمبەرو داوای لێکرد، کە ڕێگای پێبدات زینا بکات، ئەو کەسانەی لەگەلّ پێغەمبەر بوون (ﷺ) ئەمەیان بە بێڕێزیی دانا بەرامبەر بە زاتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ)، بەلآم پێغەمبەر (ﷺ) هێوری کردنەوەو فەرمانیدا ڕێی پێبدەنو لە خۆی نزیك کردەوە، ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە، لایەنی پەروەردەیی بوو، کە بە نەرمونیانیی قسەی لەگەلّ گەنجەکە کردو وتاری هەڕەشەو ترساندنی ئاڕاستە نەکرد، وتاری حەرامییو دۆزەخی بۆ باس نەکرد، چونکە ئەم گەنجە نەهاتووە داوای زانینی حوکمی زیناکردن بکات بۆی ڕوون بکاتەوە، بەلّکو هاتبوو، داوای دەکرد، تا دەروویەکی لێبکاتەوە لەو بارەی کە تیادایە، ئەوەی ئاشکرایە، کە زانینی حوکمەکان چییەو چۆنە، ڕێگرنییە لەبەردەم ئارەزووە دەروونییەکاندا لە شەوو ڕۆژ، دەترسا، کە لە ساتەکانی ناکاودا، بینینی لێلّ ببێتو بەرگریی کەمبێتەوەو ئاگای لە خۆی نەبێ، لەبەرئەوە، بینیمان پێغەمبەر (ﷺ) -کە تێگەیشتبوو لە سروشتی دەروون- چووە قولآیی دەروونو سروشتی گەنجەکەوەو لەدەروونیدا پاسەوانێکی دانا، کاتێ ڕێزی خۆیو پیاوەتییو ناموسی وروژاند، پرسیاری لێکرد: ڕازیی دەبیت خەلّك زینا لەگەلّ دایکتدا بکات؟ وەلآمی دایەوە: هەرگیز نابێت، ڕازیی دەبێت زینا لەگەلّ خوشکیدا بکرێت؟ بە ئەوپەڕی دەروونبەرزییو گەورەییەوە، وەلآمی دایەوە: هەرگیز ڕازیی نابێت، دووبارەی کردەوە ئەگەر

**ڕازیی بێت خەڵك زینا لەگەڵ خوشکی باوكو خوشکی دایکی بکات؟ بەڵام دەروونی بەرزی بەمە ڕازیی نەبوو، چونکە ئابڕووچوونە، پێغەمبەر (ﷺ) سەرنجی گەنجەکەی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە هەرگیز نابێت دەروونێکی بەرز بەو شتە ڕازیی بێت لە بیری بکات، کاتێ دەروونی بۆ خۆی پێی خۆش بێتو بۆ دایكو خوشکی خۆی ناڕازیی بێت، بە هەموو خۆشەویستییو ڕێزێکەوە پێی وت: ئەوانە هەموویان دایكو خوشكو پوورن[1]، دوعای بۆ لاوەکە کرد، ئیتر ئەو دوعایە، هێزێکی دەروونیی پێبەخشیو ڕێگرێکی گەورە بوو بۆ لاوەکە.**

**پێویستە لەگەڵ لایەنی بەرنامەیی فراوانی شیکارییو تەواوکاریی سەرچاوەکانی زانیاریی لە فێرکردنی ئیسلامیدا، دۆزینەوەی ڕێگاچارەی ڕاوێژکاریی هەڵبژێردراوو ئامادەکراو لە ڕووی زانستییەوە، تا ڕاوبۆچوونەکانو کۆششەکان جیا بکاتەوە، ئەو ڕایە هەڵبژێرێ بۆ ئوممەت، کە خەڵکی ڕاوێژپێکراو هەڵیانبژاردووە –لە سەر بنەمای زانست دەربارەی چەسپاوەکانی شەریعەتو مەبەستەکانیو باری خەڵکی– کە چاکەی خەڵکی تیایە، وەڵامی خەڵکیی**

[1] ئەحمەد لە موسنەددا دەگێڕێتەوە: ٢١١٨٥ لە ئەبوئومامە کە کوڕێکی گەنج هاتە خزمەتی پێغەمبەر و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێم پێبدە با زینا بکەم، خەڵك ڕوویان تێکرد بە سەرزەنشتەوە، وتیان: بەسە بەس، پێغەمبەر فەرمووی: نزیك بەرەوە، ئەویش لێی نزیك بووەوەو دانیشت، پێغەمبەر فەرمووی: بۆ دایکت پێت خۆشە زینا بکات؟ گوتی: نەخێر خوا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ دایکیان، ئینجا فەرمووی: پێت خۆشە بۆ کچەکەت؟ وتی: نە بە خوا، خوا بمکات بە قوربانت. فەرمووی: خەڵکیش بۆ کچەکانیان پێیان ناخۆشە. ئینجا فەرمووی: پێت خۆشە بۆ خوشکەکەت؟ وتی: نەبە خوا، خوا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ خوشکەکانیان. ئینجا فەرمووی: پێت خۆشە بۆ پوورت (خوشکی باوکت)؟ وتی: نە بە خوا، خوا بمکات بە قوربانت. فەرمووی: خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ پووریان، فەرمووی: بۆ خوشکی دایکت پێت خۆشە؟ وتی: نە بە خوا خوا بمکا بە قوربانت. فەرمووی: خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ خوشکی دایکیان. ئینجا دەستی خستە سەر سەری و فەرمووی: خودایا لە گوناهی خۆش بەو دڵی پاك کەرەوە و داوێنی بپارێزە. ئیتر لەو ساتەوە ئەو کوڕە گەنجە لای نەدەکردەوە بۆ هیچ شتێك.

دەداتەوە لە بارە دەروونییو سروشتییەکاندا، ئەوەی پێویستەو ئەوەی لە تواناادا هەیە، ئەوەی کە گونجاوە لەگەڵ بارودۆخو گۆڕانەکان، بە پشتبەستن بە زانستو زانیاریو بەرنامەی ئیسلامیی تێرو تەواو، ئەوکاتە وتاری ڕاوێژی دەبێتو لەپێشی دەبێت، وتاری هەستیار بەجێگەی هەنگاوەکان لە سەرکردایەتی کۆمەڵگەو ئاڕاستەکردنی ڕێڕەوەکەیو ڕژێمی ژیانی، بە توانا شەرعیو ڕامیارییەکانی گەل قایل دەکاتو ڕیزەکانی پتەو دەکاتو وزەکانی دەتەقێنێتەوە، چنراوی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگا بەهێزتر دەکات.

ئەمە ڕەنگە لە بەرنامەی زانستییو زانیاریی ئیسلامیی کاتێ لەگەڵ ڕێگەچارەی ڕاوێژیدا تەواوکەری یەکتر بن، کەشوهەوایەك ساز دەبێت، کە بوار دەڕەخسێنێ بۆ لێکۆڵینەوەو تازەکردنەوە، بێ ئەو ئاسەوارە خراپانەی کە لێکۆڵینەوە زۆرەکان هۆکارن بۆ پەرتبوونی شوێنکەوتن، ئامێرێك دەبێت بۆ زیاتر دڕاندنی ڕیز، تێکدانی دەروون، خراپیی وەڵامدانەوە، ئەمەش بەهۆی نادیاریی بەرنامەی ناسینی زانستیی دروستو نەبوونی فکری تەواوکاری ئیسلامیی زانستیی مرۆڤایەتییو بوونەوەریی، هەروەها نەبوونی ڕێگەچارەی ڕاوێژ، کە یارمەتیی پاککردنەوەی فکرو لێکۆڵینەوەکان دەدات، بواری سەربەستیو بیرکردنەوەو ڕادەربڕینیش دەشۆرێتەوە، یاسای ئیسلامییانە دادەنرێت بۆ ئوممەت، دوای گەڕان بە دوای هەموو ڕاوبۆچوونو داوایەکدا، ئەو کاتە یاسادانانەکە بیروباوەڕییو سیاسی دەبێت —بە متمانەو پوختە دەبێت— دەبێتە چاوساغی جوڵەی گەشەی ئوممەتو گۆڕانەکان لە بارەکانیدا، لەسەر بنەمای ڕێگاچەسپاوەکان لە دینو سروشتو خەڵكو پێویستییەکانی کۆمەڵگە.

پریشکی ترساندن، کە دووچاری وتاری ئیسلامیی بووە، تەنها کاریگەریی لەسەر پێگەیشتووەکان نەبوو، بەڵکو کاریگەرییەکەی هەموو جۆرەکانی وتاری گرتەوە، بەتایبەت وتاری منداڵانو فێرکردنیان، کە بۆیاخ کرا بە بەرنامەی نووسینو لەبەرکردنو چاودێریکردنو دەسەڵاتی توندوتیژی ماددییو مانایی‌و هێماکانی پیرۆزیی سەپێنرا بەسەریدا بۆ پەکخستنی گیانی ڕەخنەگرتنو پشکنینو جیاکردنەوەو ملشۆڕکردن بۆ چەمکی ئەو وتەیەی کە دەڵێ: (هەر کەس پیتێکم فێر بکات بەندەی دەبم).

## تێکچوونی پێنجەم: عەقڵیەتی پڕوپوچ و چەواشەکاریی

تێکچوونی پێنجەم و ترسناك، کە تووشی ژیریی ئوممەت بووەو ئاسەوارە وێرانکارییەکانی لە بنیاتی دەروونیی دەردەکەوێت و بەشدارە لە ڕووخاندنیدا، هەروەها لەدیارنەمانی ڕۆڵی ئەم ئوممەتە لەئاوەدانیی و شارستانییەتیدا، بریتییە لە پێکهێنانی عەقڵیەتی پڕوپوچ و بێهودە لای خەڵکی ئەم ئوممەتی ئیسلامییە.

عەقڵییەتی پڕوپوچ لەماناو مەبەستە مرۆڤایەتی و شارستانییەکەیدا، بریتییە لە تێکدانی عەقڵیەتی یاسایی و وێران کردنی لای ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتی ئیسلامییە.

دەزانین گەورەترین ئاستەنگ کە ڕووبەڕووی ئەم ئوممەتە بووەتەوە، لەم چەرخەدا، بریتییە لە دواکەوتنی زانستی و تەکنیکی لە هەموو بوارەکانی ڕامیاری و ئابووری و ئاوەدانی و توانا بۆ پێشخستنی چەکی جەنگیی و جەنگ.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، کە عەقڵییەتی خورافەت و پڕوپوچ بڵاوبێتەوە لەناو ئوممەتی قورئاندا، کە هەمووی داوایە بۆ هەوڵدان و بیرکردنەوەو تێڕوانین و وردبوونەوەو قوڵ لێهەڵماڵین و جوانکاریی و چاکەکاریی و هەوڵدان و خەباتکردن و شوێنی یاساکانی بوونەوەر کەوتن و دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە لە گەڕان بەدوای کارەکاندا.

ئەوەی سەرسوڕهێنەرە بەڕاستیی ئەوەیە، عەقڵییەتی ئەفسوناویی پڕوپوچ لە ئوممەتی ئایینی خواو پەیامی هەق و لای شوێنکەوتوانی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ﷺ)، کە ژیانی ئەو پێغەمبەرەو کاروکردارەکانی، هیچ بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ گومان، کە چەند چالاك بووەو چۆن هەمیشە هۆکاری گرتووەتەبەرو کارەکانی بە وردیی ئەنجامداوە، بەڵکو ژیان و گەیاندنی پەیامەکەی مرۆڤێك بووە هۆکاری بەکارهێناوە، قورئان سروشتی مرۆڤایەتیی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕوونیی پیشان دەدات، کە ئەو مرۆڤە پێویستی بەهەوڵ و کۆششە، مەگەر لەو ڕووەوە، کە خوا خۆی چاودێریی کردبێت و ئامادەی کردبێت، ئەویش وەك هەموو کەسێکی دڵسۆز هەوڵ و خەباتی بووەو دوژمن زۆری بۆ هێناوەو ئەویش زۆری هێناوە بۆ دوژمن، سەرکەوتن و شکانی هەبووە لە جەنگدا، تەندروستیی و نەخۆشیی بووە، برسیی و تینوو بووە، بۆچوونەکانی —

جگە لە فەرمانی گەیاندنی پەیام– ڕاستو هەڵەی تیا بووە، زۆر کارامە بووە لە پرسو ڕاو نەخشەدانانو بەڕێوەبردنی ئاشتیو جەنگ:

(قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلاَ ضَرّاً إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) (الأعراف: ١٨٨ ).

(قُل لاَّ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ) (الأنعام: ٥٠).

(قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) (الكهف: ١١٠ ).

(وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ) (آل عمران: ١٤٤).

(وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) (القلم: ٤ ).

(إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) (التوبة: ١١١ ).

ئوممەتێك ژیانی پێغەمبەرەکەیو هاوەڵەکانی، هەمووی هەوڵو خەباتو ماندووبوونو کارو تێکۆشان بووبێت، بە دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، لە باوەڕو پشت بە خوا بەستنو متمانە بەخوا، چۆن دەبێ هەڵگرانی ئەم پەیامەو خوێنەرانی قورئانو شوێنکەوتوانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە، تەمەڵو تەوەزەل بنو ئەفسوناوییانە عەقڵو خورپەیان داگیر بکرێت، شتی پڕوپوچو گیانەکانو مردووەکانو جنۆکەو دێوو درنجو ویستو تواناکانیان پەرتو بڵاو بکاتو ببنە نێچیری ئەو کەسە پڕوپووچانەو نەفامییو شتی پڕوپوچو بێمانا، وایان لێبکات، نەگەڕێن بە شوێن ڕێگاکانی زانستو لێکۆڵینەوەو دەرهێنان لە بوونەوەری خواو یاساکانی لە بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانو جێگیرکردنو جێنشینکردنیان لەسەر بنەماکانی زانست، کە هەرکەسو مرۆڤێك دەستی پێوەگرت ڕەشۆی دەسەڵات ژێربارکردنی ئەم جیهانەی کە تیایدا دەژین دەگرێتە دەست.

ـ داوای یاساکانی بوونەوەر مەرجی پێویستەو بەتەنها پشت بەستن (التوكل)، یان کارنەکردنو بە تەمای بەرهەم (التواكل) بەس نییە:

ئەگەر وتارەکانی قورئان، لە هەزاران ئایەتیدا ئاڕاستەی دڵو عەقڵ بکرێتو بەڵگە بهێنێتەوەو داوای کارکردن بکاتو بەرپرسیارییەتی بخاتە ئەستۆ، فەرمان بدات، کە ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) قۆڵ هەڵماڵنو کۆششو خەبات بکەنو هۆکار بگرنەبەر، (إقلها وتوكل)[1] خوای مەزن ئەوەیە:

(الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى* وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى) (الأعلى:٢– ٣ ).

(فَأَتْبَعَ سَبَباً) (الكهف: ٨٥ ).

(وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى) (النجم: ٣٩ ).

بە هۆی کارو هەوڵو دەستگرتن بە هۆکارەکانی دروستکردنو فیترەتی سروشتەکانو گەڕان بە دوای یاسا خواییە بوونەوەرییەکاندا، شایانیەتی بەدەستخستنی بەر دێتەدیو بەرپرسیاریی دەبێت، ئەمە مەرجی پێویستە، بەبێ ئەمە هەرگیز هیچ مافێك بۆ کەس نییە، دەستەوسانییو دانیشتنو نەگەڕانیش بە دوای هۆکارەکانداو بەردەوام بە دوای شتی پڕوپوچی ئەفسوناوییو درۆو دەلەسەوە، هیچ بەرێکی نابێت لە ژیانی مرۆڤدا، ئەو شتە پڕوپوچانە هیچ مانایەکی پشتبەستن بە خواو هەوڵو شوێنکەوتنی یاسا خواییە بوونەوەرییەکان، کە هەرگیز لە کاروباری ژیاندا، هیچ جێگرەوەو هیچ مانایەکی نییە، ڕاستییەتی پشتبەستن بە خواو نزاو سوودەکانیان، کاتێ دروستە، کە کارو تێکۆشان هەبێت، مەبەست لێیان داوای کۆمەکی خوایە، دەربارەی فەرمانە گشتییەکانی بوونەوەر، کە ئێمە نایزانینو زانستی ئێمە پەی پێنەبردووەو دەسەڵاتمان نییە بە سەریدا، کە تەنها خوا خۆی زانستی پێی هەیەو دەیبات بەڕێوە، پاشان ڕووکردنە خواو داوای هیدایەتو یارمەتیدان، ئەوە پێی دەوترێت پشت بەستن بە خوا (توكل)، بەڵام دەستەوسانو تەمەڵییو دانیشتنو نەگەڕان، بەدوای یاساکانو هۆکارەکاندا، پاشان پاڵدانەوەو نزاکردن، ئەمە پێیدەوترێ (تواكل)و لادانە لە ڕێگەی ئیسلامو ڕێگای یاسا خواییەکان، بەڵام ئەگەر ئەو کەسە پەنا

---

[1] سنن الترمذي ١٤٤١

بباتە بەر فاڵو چاوبەستنو شتی پڕوپوچو ئەفسوناویی، ئەوە گوناهو لادانو گومڕاییو چوونە ناو بێباوەڕیو هاوەڵ بۆ خودا پەیداکردنە.

ئەوەی سەرسوڕهێنەرەو ژیریی سەرگەردان دەکات، ئەوەیە، چۆن بیروباوەڕی پووچەڵو ئەفسوناویی هاتە ناو ئەم باوەڕە پاکو خاوێنەو چۆن کارنەکردنو پەکخستنی عەقڵو نەگەڕان بە دوای یاساو چەمکەکاندا، کەوتە ناو عەقڵو ڕۆشنبیریی مسوڵمانان، کە خاوەنی قورئاننو داوایان لێدەکرێ بیخوێننەوەو کاری پێبکەن، بۆچی ئەم بیروباوەڕو تێڕوانینە ئیسلامییە عەقڵو ڕۆشنبیرییو چەمکو زانستەکانیان پاك نەکردەوە لە هەموو ئاسەواری ئەو شتە پڕوپووچانە نەگەڕان بە دوای هۆکارەکان لە ژێربارکردنی ئەوەی لەم بوونەوەرەدایە.

پێش ئەوەی باس لەو خورافاتانە بکەین، کە لە بەردەستماندایە، گرنگە نموونەیەك باس بکەین کە پەیوەندیی ئیسلامی لە نێوان هەوڵدانو گەڕان بە دوای هۆکاردا، لەگەڵ نزاو پشتبەستن بە خوا ڕوون بکاتەوە، ئەمە وەك قوتابییەك وایە کە وانەیەکی پێدەوترێتو لەسەریەتی بیخوێنێتەوەو لێی تێبگاتو هەمیشە لەبیریدا بێت، ئەگەرنا بە پێی سروشتی یاسای هۆکار سەرکەوتوو نابێتو دەرناچێت، چونکە ئەوە یاسای خوایە، هیچ کارێك بە بێ هەوڵو ماندووبوون، بەروبوومی نابێت، بەڵام بە تەنها لەبەرکردنو گورجو گۆڵیی لە وانە ئامادەکردنەکەدا بەس نییە، ئەگەرچی مەرجێکی پێویستە بۆ دەرچوون لە تاقیکردنەوەدا، چونکە دەرچوون پەیوەندیی بەهۆکارە ڕاستەوخۆکانەوە نییە لە خوێندنەوەو لەبەرکردن، بەڵکو هۆکاری گشتگیرتر هەیە، بۆ دەرچوونو وەرگرتنی بەروبوومەکەی، جاری وادەبێت، ڕووداوێك دەبێتە ڕێگرو ناتوانێ بڕوات بۆ قوتابخانەو تاقیکردنەوەت، جاری وادەبێت، چووەتە هۆڵی تاقیکردنەوەکەو هاتووەتە دەرەوە، پاشان یادی دەکەوێتەوە کە پرسیارێکی لە بیر چووەو وەڵامی نەداوەتەوە، جاری وا هەیە، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی داوەتەوە، بەڵام وەڵامی یەکێکیانی هەڵەیە، بەڵام پاش ئەوەی کاغەزی تاقیکردنەوەی داوەتە مامۆستای چاودێر، بیری دەکەوێتەوە، بێئەوەی بزانێ بۆچی لە هۆڵەکەدا نەهاتەوە بیریو بینوسێت؟ هەموو ئەم کارە گشتیانە پێشتر ڕەچاو نەکراوە،

مرۆڤ هیچ هۆکارێکی بەدەستەوە نییە، لەم جۆرە شتانەدا، جگە لە پشتبەستن بەخواو پاڕانەوەو داوای هیدایەتکردن، ئەمەیە بەرنامەی ئیسلام لە ژیاندا، ئەمە مانای پشتبەستن بە خوایە (توکل)، نەك تەمەڵییو کارنەکردنو دەستەوسانیو جێبەجێنەکردنی ئەرکەکان.

گەڕان بەدوای هۆکارو کارکردن لەسەر بنەڕەتی یاساکان، کە خوا لەناو دروستکراوەکانیدا دایناوە، مەرجە بۆ گەیشتن بە ئامانجو بەدەستهێنانی بەروبووم، بەڵام وەفاکردن بە مەرجی کارکردنو تێکۆشان، تەنها بەس نییە بۆ سەرکەوتن، هەرگیز هۆکاری تەنهاو تاك نییە لە وەرگرتنی بەروبوومدا، ئەگەر یارمەتیی خوای گەورەی لەگەڵ نەبێت، پاڕانەوەو نزاو ڕووکردنە خوا، هۆکاری ڕاستەوخۆی مسوڵمانی لە یارمەتییو هیدایەتیی خواییدا، ئەم شێوەیە ڕۆحو گیان تیژ دەکاتو عەزم بەهێز دەکاتو یارمەتیی ئارامیی دەداتو هەنگاو دەنێ، بەردەوام دەبێت لە کارو هەوڵو هیمەتی تازەدا، هەر شتێك جگە لەمە —لە ڕووی ئیسلامییەوە— نەزانینو خورافەتو شتی پڕوپووچە، ئەندێشەو سەرگەردانییو خراپ ماناکردنە، هەروەها زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێتو گیلێو فەوتاندنو ناڕەحەتییو قورسکردنی باری سەرشانە.

## تۆقاندنو ستەمو دواکەوتوویی خاکی ئەفسانەو پڕوپووچە

گومانی تیادا نییە، ئەو تێکچوونانەی باسمان کرد لە عەقڵی مرۆڤی مسوڵماندا، زەمینەی ساز کرد بۆ فیکری خورافەتو ئەفسونایی، ئەمەش پاش ئەوە، مسوڵمانان بوونە نێچیری ستەمو تۆقاندنی ڕامیارییو ترساندنی فیکریی، ئیتر بێدەنگو سەرشۆڕبوو، وردە وردە ڕووی وەرگێڕا لە لێکۆڵینەوەو گەڕان بە دوای زانستو بنیاتنانو داهێنان، ئیتر نوقم بوو لە گەرداوی هەژارییو خورافەتو دەسەڵاتو تواناکانی لەکیس خۆیدا.

ئەوە شتێکی سروشتییە، لە وەها بارودۆخێکی بێدەسەڵاتییو پەککەوتەییدا ڕوو بکاتە ئەو شتە بێ ماناو خورافاتانە، کە برەویان پێدەدرێ، لە چیرۆكو شتی ئەفسوناویی گوێیان بۆ بگرێتو ئەم شمەکە لە لای بە برەو بێت، لە نەزانی خۆیەوە پەنا بباتە بەر ئەو شتە بێماناو هەرزانو بێنرخانە، کە وەك سرکەر وایە

بۆ بەرەنگاربوونەوەی ناڕەحەتییەکان لێی کۆبووەتەوە، کە بە هۆی نەزانینەوە، هۆکارەکانی نازانێ‌و ناتوانێ ئەو بەڵاو خراپانە بە هۆی بێدەسەڵاتییەوە لە خۆی دووربخاتەوە، چونکە ڕۆشنبیریی‌و دەروون‌و توانای هەموویان پەکیان کەوتووە، لە هێزی عەقڵ‌و یاسا خواییەکان بێبەش بووە، داهێنان‌و هەوڵ‌و لێکۆڵینەوەو گەڕان بۆ ڕاستییەکان لای نەماوە، هیچ ئوممەتێك وەك ئوممەتی قورئان شیاوی ئەوە نییە، کە خاوەنی تواناو ڕۆشنبیریی‌و ژیریی‌و داهێنان‌و هەوڵ‌و گەڕان بێت.

## کارەساتەکە لەوەدایە ئایین‌و پیرۆزییەکەی لە خزمەتی خورافەتدایە

نەخۆشییەکە بوو بە پەتا، تا بوو بە تاعون، دوومەڵ بوو بە شێرپەنجە، نەخۆشیی ڕەگی داکوتا، چارەسەر گران‌و سەختبوو، لەبەردەم ڕووداوو کارەساتەکان، کە بەسەر ئوممەتدا هات، زانستی تیا نەڕوا، داهێنان بێ بەرووبووم، جوانکاریی نەما لە کاردا، ئەمەش بە هۆی ئەوەی پەردەی پیرۆزیی درا بەسەر خورافەتدا، ئەمەش بە برەودان بە زۆرێك لە باس‌و شوێنەوارو ئەفسانەو ئیسرائیلیات، ئەمەش بە هۆی خراپ لێکدانەوەی هەندێك ئاماژەی قورئانیی‌و ڕاڤەکردنی لە ژێر تیشکی باری ڕابوردووی مرۆڤایەتیی لە سەرەتای چەرخەکانی پێش پەیامی ئیسلام، ئەو پەیامەی کە خوا ئوممەتەکەی بە قورئان‌و گەڕان بە دوای زانست‌و ڕێزگرتنی عەقڵ وەسفکردووە، مرۆڤیشی ڕزگار کرد لە هەموو دەسەڵاتێك، جگە لە دەسەڵات‌و ویستی خۆی‌و هەوڵ‌و کۆششی: (وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَّصَداً* وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَداً) (الجن:٩– ١٠ ).

هەموو ئەو ئاماژە کەمانەی، کە لە قورئاندا هاتووە، دەربارەی هەڵسوکەوتی گەلانی ڕابوردوو ئەوەی کە لەگەڵ ئەوەدا کراوە لە شتی عادەتیی، ئەوە ئاماژەیە بە مێژوویەك‌و تێپەڕ بووە، قۆناغەکانی ڕابوردووی پێشکەوتنی گەلان بووە، ژیریی‌و پەیوەندییەکانی، بەڵام کە مرۆڤایەتی گەیشتە قۆناغی کامڵ بوون، ئایینی کامڵی هەبوو لەگەڵ بەرنامەی فیکریی، بەڵگەی ژیان‌و پەیامی قورئان دابەزی‌و ڕێگای ڕووناك کردەوە بۆ عەقڵی مرۆڤەکان، ئەوەی خوای گەورە دایناوە لە هۆکارو نهێنییەکان، ئیتر ئەو بارە گۆڕا، ئەو چەرخە کۆتایی هات،

چونکە قورئان هەرچی باسەکان هەیە، بە درێژیی ڕوونی کردووەتەوە، ئیتر پلەوپایەی مرۆڤیش گۆڕا، تا بە هۆی عەقڵو زانیارییەوە دەسەڵات پەیدا بکات بەسەر جیهاندا، هیچ دەسەڵاتێکی تر نییە هەوڵی ئەوە بدات، کە خۆی بهاوێتە ناویەوە: (وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَّصَداً) (الجن: ٩)، بەڵکو قورئانی پیرۆز، ئەوەی ڕوونکردووەتە، کە ئەو بارەی فاڵچییەکان لە ڕابردوودا تیایدا بوون، هەمووی درۆو فێڵکردن بووە لە دەروونەکان: (قَالَ أَلْقُوْاْ فَلَمَّا أَلْقَوْاْ سَحَرُواْ أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ) (الأعراف: ١١٦). (قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى) (طه: ٦٦).

(وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى) (طه: ٦٩)، هەرگیز توانای سوودو زیانیان نەبووە، بە ویستی خوا نەبووبێ، زیانەکانیان بە هۆی ئەو فێڵو تەڵەکانەوەیە، کەپەنای پێدەبەن، بەهۆی ئەو خواردنو خواردنەوانەوەش بە هەموو شێوەکانیەوە کە چەندین هاڕاوەو ماددەی تێدەکەنو کاریگەریی دەبێت لەسەر ئەو کەسانەی، کە گێلو گەلحۆن، دەزانین کە بڕێکی کەم لەو ماددانە، ئاسەواری دەروونیی زیان بەخشی دەبێت، گەر بکرێتە هەر جۆرە خواردنو خواردنەوەیەك، بەڵام خەڵکی چۆنییەتی کاریگەرییەکەی لەسەر لاشەو دەروون هەست پێناکەن، یان بەهۆی قەدەری خواوە کە پێشتر بۆی نووسراوە، ئەوەی کە خەڵك بە ناوی ڕێکەوت، ناوی دەبات، زۆر کەس ئەمەی لەبیر دەچێتەوەو باسی پەککەوتەیی فاڵچییەکان ناکات، کە لە بێ سنوور پەککەوتەن، بەڵام زۆر بە شەوقو زەوقو شانازییەوە، باسی شتێکی ڕێکەوت یان ئەو درۆیانە دەکەن: (وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ) (البقرة: ١٠٢ )، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ)، کە پەیامەکەی بۆ هەردوو گرۆی مرۆڤەکانو جنۆکەکانە، جنۆکە جیهانێکی نەبینراوە لەم بوونەوەرەدا، بەو شێوەیەی، کە هەر خوا خۆی دەزانێت چۆنە، بە پێی قورئانیش پێغەمبەر (ﷺ) شێوەی نەدیون، بەڵکو خوا هەواڵی پێداوە، کە جنۆکە گوێ دەگرن بۆ قورئان، هەرگیز جیهانی مرۆڤ پەیوەندیی بە جیهانی جنۆکەوە نییە: (قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً) (الجن: ١ ) هەروەها شەیتان —

**وەك قورئان باسیكردووەو ئێمەش هەستی پێدەكەین– دەتوانێت وەسوەسە بخاتە دڵی مرۆڤەكانەوە، بەڵام توانای نییە بەسەریدا، دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤدا نییە، مەگەر مرۆڤ گوێ بگرێ بۆ وەسوەسەكانیو بە ئارەزووی خۆی لە دەروونیدا جێگیر بێت (إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ) (الحجر: ٤٢ ) واتە: بە سەرلێشێواندنو شوێنكەوتنی وەسوەسەكانی (إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ) (النحل: ٩٩ )[١].**

---

[١] یەكێك لەو چەواشەكارییانەی هەندێك توێـژەر تێـی دەكـەون و فێڵبازەكـان تیـای ڕۆدەچـن، بابـەتی دەستلێوەشانی جنۆكەیە، قورئان باسی دەستوەشاندنی خودی شەیتان دەكات نەك هی جنۆكە كاتێـك وەسفی ریباخۆران دەكات: (الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُـومُ الَّـذِي يَتَخَبَّطُـهُ الشَّـيْطَانُ مِـنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا) (البقرة /٢٧٥). واتە ئەوانـەی ریبـا دەخـۆن (لـە كـاتی زیندووبوونەوەیان) رانـابن مەگـەر وەك ئـەو كەسـە نـەبێت كـە شـەیتان دەسـتی لێوەشـاندبێ كاتێـك بەملاولادا دەكەوێ، چونكە دەیانگوت مامەڵەش وەك ریبا وایە.

دیارە ئەمە بۆ خۆی وێنەیەكی ڕەوانبێژانەیە باس لە گومڕایی ریبـاخۆری نافـەرمان دەكـات چـۆن لـە گومڕایی و لادان لە حەقدا پـەل و پـۆی كوێرانـە دەهاوێـت و هـیچ پەیوەنـدیی بـە نەخۆشـی هـۆش و دەروونەوە نیە، بە بەڵگەی ئەوەی ریباخۆران لەم دنیایەدا با لادەر و گومڕاش بن بەڵام هەموویان ژێـر و بەرپرسیارن، كەواتە سەرلێشێواوی بڕواییی ئەوان ڕەبتی بە نەخۆشیە جەستەییە ژیری و دەمـاریی و دەروونیەكانەوە نیە. دیسان قورئان بۆ خۆی گومانی نەهێشتووەتەوە كـە شـەیتان هـیچ دەسـەڵاتێكی بەسەر مرۆڤدا نیە و كاریگەری ئەو لەسەر مرۆڤ لەوەدێت كە گوێ لە ختوورەكـان بگرێـت و پـەیڕەوی لـە لادان و گـومڕاكردنی بكـات بـە شـێوەیەك كـە ڕاسـتیی دووریـی بخاتـەوە. لـە ڕووی گیـانی و مەعنەوییەوە لابدات و ڕێگەی ڕاستی خوای لێ ون ببێت، كەواتە شوبهاندن و وێنە ڕەوانبێژییەكە لە وێنـا كردنـی ئـەم سەرلێشـێواوی و گومڕاییـە ڕووحییەدایـە كـە ریبـاخۆران و هـەموو كەسـێكی شوێنكەوتەی ختوورەی شەیتان و گومڕای تێدەكەون، بە چاوپۆشـی لـەوەی ئـەم وێناكردنـە بـۆ حـاڵی گومڕایی دنیا یان چارەنووسی لەو دنیـا بێـت، ئەمـەش جـارێكی تـر ڕوون دەبێتـەوە لـە شـوبهاندنی بەرومیوەی جەهەننم بە بیچم وكەللەسەری شەیتان لە زیان و ناشیرینی قیزەونـی دیمەنیانـدا: (طَلْعُهَـا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ) (الصافات ٦٥). دیارە پێشوبهێنراو دەبێت شتێك بێت كە بیسـەر بیناسـێت و لەسەری ڕاهاتبێت، بەڵام دەشزانین كـە بیچـم و كەللەسـەری شـەیتان خـەڵك نایناسـن و نەشـیاندیوە، كەواتە ئەمە شوبهاندنێكی ڕەوانبێژانەیە بۆ باسكردنی ئەو ناشیرینی و زیان و قێزەی لە نـاو خەڵكـدا

**خوای گەورە لە چەرخی پەیامی کۆتاییدا -کە ئیسلامە- ویستی خەیری بە مرۆڤەکان هەیە، جیهانی بۆ پاککردووەتەوە-بە ویستی خۆی- لە هەموو دەسەلاتێك، جگە لە دەسەلاتی خواو دەسەلاتی جێنشینایەتیی مرۆڤ، تایبەتی کردووە بە مرۆڤ، کە جیهان بخاتە ژێر بارو خۆی ئاوەدانی بکاتەوەو ویستی خۆی تیا دەربخات، کانزاکەی بە هۆیەوە پاك بێت، کە ئەویش تەنها بە کارکردنو هەوڵدان دەبێت، هیچ جیهانو هیچ خێوێك (شبح) نییە دەسەلاتدار بێ بەسەریدا، یان ویستی نەهێڵێ، یان ڕۆڵی وێران کات، یان بەرپرسیارییەتی لایات، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێتو هیچ شتێ ویستو بەرپرسیارییەتی مرۆڤ لانایاتو پەکی ناخات، کار کاری خۆیەتی، هەر خۆی لە خۆی بەرپرسە: (فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ* وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ) (الزلزلة:٧- ٨).**

---

سەبارەت بە شەیتان جێگیر بووە، جا ئەگەر سەرلێشێواوی ریباخۆر بە دەستوەشاندنی شەیتان شوبهێندرابێت ئەمە چواندنێکی بەلاغییە و رەبتی بە دەستوەشاندنی جنۆکەوە نییە وەك ئەوەی فاڵچییەکان وەسفی هەندێك نەخۆشی عەقڵی و ڕەوانی و دەرونی پێدەکەن، پشتبەستوو بە قورئانی پیرۆز کاتێك باس لە مەسسی شەیتان و بەملاولاکەوتنیو دەستلێوەشاوی شەیتان دەکات. ئەمە لای دڵسۆزەکان خراپحاڵیبوون و خراپ لێکدانەوەیە، بەلام فاڵچییەکان خراپ بەکارهێنان و ڕێگای خورافات و فێڵبازییە، کە دێن هەندێك لەو نەخۆشییە عەقلی و رەوانی و دەروونییانە بە دەستوەشاندنی جنۆکەناوزەد دەکەن بە بێ هیچ بەڵگەیەکی وانستی و تەنها بە درۆو بە قسەی خۆیان کە گوایا دەتوانن جنۆکە وەهمییەکان لە لەشی ئەو نەگبەتانە دەربهێنن کە پشت بە لاوازترین هۆ دەبەستن بۆ چارەسەری خۆشەویستە نەخۆشەکانیان لە رووی هۆش و رەوان و دەروونەوە، ئەوسا دەبنە نێچیری داوی ئەو درۆزنانە وفریوی داستانە هەڵبەستراوەکانیان دەخۆن کە وەستایانە بلاوی دەکەنەوە گوایە زۆر بەتوانان لە چارەسەردا، زۆرجاریش لە کردەوەی ئەم جەجاڵانە کارەساتی گەورە دەکەوێتەوە کە زۆرترین ئەشکەنجەی ئەو نەخۆشانەش دەدات. جا ئەگەر هەندێك لەو نەخۆشییانە چارەسەریان ئاسان نەبێت تا بە ئەمرۆش چارەسەر نەکرابێت ئەوا بۆ نەخۆشییە جەستەییەکانیش ئەم قسەیە راستە، بەلام لە گەورەیی خوداوە رۆژانە چارەسەر بۆ نەخۆشییە زەحمەتەکان دەدۆزرێتەوە. بۆیە بە هەر نەخۆشییەك بگوترێت دەستوەشاندنی جنۆکە ئەوە تەنها قسە و درۆو چاوبەستە و هیچ بەڵگە و بنەمایەکی نییە.

(وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) (الأنعام: ١٦٤ ).

(الْيَوْمَ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ) (غافر: ١٧ ).

(وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ) (الشورى: ٣٠).

چاك وابوو، ئەوانەی باسی جیهانی نادیار (جنۆكە) دەكەن، كە بوار نییە بۆ هەستەكانی مرۆڤ پەی پێبەرێت، كە دادگایەكی ڕاستیی هەواڵەكان بكەنو ڕاستو درۆكان جیا بكەنەوەو پابەندبن بە سنووری ئاماژە قورئانییەكان لەو بارەیەوە، بەو ئەندازەو مەبەستانەش ڕازیی ببنو پابەند بن بە پڕۆگرامی تێڕوانینی دروست، كە پشت دەبەستێت بە بەرنامەی گشتییو مەبەستەكانی شەریعەتو پاشماوەكانی كاتو شوێنو ئەو شتانەی، كە ئوممەتی ئیسلام تووشی بووە لە گرفتی زۆر.

لە گرنگترین یاسا بەرنامەییەكانیش، كە پێویستە –بە ڕای ئێمە– پابەندبین پێی لە كاروباری شتی نادیار، بریتییە لە یاسای كۆدەنگیی (المتواتر)، كە هەرگیز درۆی لەگەڵ نابێت، چونكە ئەو شتانەی نادیارن، عەقڵو شارەزاییو ئەزموون، ناتوانێ بیزانێ، لەبەرئەوە، دەبێت لە سەرچاوەی كۆدەنگ (المتواتر) وەربگیرێت، كە درۆ تیایدا بەدی ناكرێت، ئەگەر ئەوانەی لێكۆڵینەوە دەكەن لە مەبەستو ڕێبازەكان، لە تێگەیشتنی دەقو ڕەخنەگرتندا، بە وردیی پابەندبوونایە بە پوختەكردنەوە لە پشت بەستن بە دەقو ڕەخەگرتن لەو كەسەی گێڕاویەتییەوە، ئەگەر ئەو هەموو پابەندبوونە ببوایە، ئوممەتیان دەپاراست لەو هەموو هەڵاوێرو گلانە كوشندەیە، دووریان دەخستنەوە لە پیرۆزیی زۆر لەو دەقانە، كە ئیسرائیلیاتو لادانو زیادەیان پیانراوە، لە ڕاڤەكردنی خراپو هەڵوەشانەوەی عەقڵو ستەمی خورافەت، كە بازاڕی ئوممەتیان گران كردبوو، بووەنە هۆی سواربوونی دواكەوتنو سەرشۆڕییو بێدەسەڵاتی لە ژێر سێبەری ترسو تۆقاندندا.

## هەردوو پەناپێگیراوەکە (المعوذتان) کۆتایی‌و بەربەستە، نەك ڕێگوزەر بۆ فکری خورافەت

باوەڕ بە خواو پشت بەستن پێی، لەخوێندنی هەردوو سورەتی (فلق‌و ناس) پەردەیەکی ڕێگرەو ئارامیی دەروونی مسوڵمانە، کۆتایی ناڕەحەتییەکانییەتی، کە دەروون دەپارێزێ دژی هەر لاوازیی‌و لافلێدانێك، کە لەو فاڵچیانەوە دەردەچێت، کە هەرگیز نکوڵیی ناکەن —لەبارودۆخی لاوازیی مرۆڤدا— بە هەموو هۆکارێك لە درۆکردن‌و فڕوفێڵکردن تا بچنە ناو عەقڵ‌و دەروونی مسوڵمان، خوێندنی ئەو دوو سورەتە زۆر کورتە، پەناگرتنە بە خواو خۆپاراستنە بە ویستی خوا، هەرگیز ڕێگوزەر نییە بۆ بەرچاوبەستن‌و خورافەت، ئەم دوو سورەتە کورتە کۆتایی سوڕخوارنەکەیە (المطاف)و قفڵە بۆ داخستنی دەرگای ئەو باوەڕەی کە وا دەزانێ جیهانەکانی تر دەتوانن کاریگەر بن لەسەر مرۆڤ و بەرپرسیاریەتی‌و جێنشینایەتییەکەی، چەند جێگای داخە، کە ئەم دوو سورەتە کورتە —بە ڕاڤەی هەڵەو هەستنەکردن بە بارودۆخ لای هەندێ لە بێئاگاکان— ببنە کلیلی دەرگای فاڵچییەکان‌و دەروون ترسێنەرەکان، ئەوانەی کە لەو ڕێگەیەوە نان پەیدا دەکەن‌و خاوەنی مەبەستی خۆیانن.

## نزاو نووسین پەیوەندییەکی ویژدانییە نەك پیشەیەك‌و بدرێتە پاڵ خوا

هەروەها ئەوەی جێی داخە، ئەوەیە، کە نزاکردن‌و دۆعا نووسین بە ئایەتەکانی قورئان دەرگا بکاتەوە لەسەر هەندێ کەس‌و باوەڕ بە خورافەت بهێنێ، دوعانووسین ببێتە پیشەو هۆکار بۆ پەیداکردنی سامان‌و پلەوپایە، کە هەندێ کەس تایبەتیان کردووە بە خۆیانەوە، یان خەڵك —بە کردار— بە ئاگایی بێ، یان بێئاگایی، تایبەتیان کردوون بە فەرمان‌و توانای خواو کردوونی بە واسیتە لە نێوان خواو بەندەکاندا، لە چاککردنەوەی نەخۆشییەکان‌و جێبەجێکردنی پێویستییکاندا، خەڵکیش بەمجۆرە ئەم دەسەڵاتەی پێداون —لە لایەن خۆیانەوە بەرامبەر بە خوا—، کە چاك‌و نزیك لە خوا، هەروەها تایبەتیان

کردوون بۆ پەنا بۆیردن لە جێبەجێکردنی پێویستییەکاندا، ئەمانە بە کردار ئەوە دەسەلمێنن –ئەگەر هەر شتێکی تریش بڵێن– کە دەسەڵاتی ڕەحمی خوایان هەیەو پلەو پایەیان هەیە بە لای خواوە، ئیتر بەمشێوەیە دەبنە پیشەوەرو خاوەن پلەو دەسەڵات لەناو خەڵکدا، خوای گەورەش دەفەرموێت (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ) (البقرة: ١٨٦ ).

گومانی تێدا نییە، خوا پاڕانەوەو نزای بەندەکانی دەبیستێ، خوا ئاگاداری نهێنییەکانیانە بەدانایی خۆی ئەوەی شیاویان بێت، بۆیان دەکات، ئەو کەسانەی، کە نارەحەتن لە پێشترن لە ناو خەڵکدا (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ) (ق: ١٦).

(وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ) (غافر: ٦٠ ).

بەڵام داوای دایكو باوكو ئەو کەسانەی خواناسنو دراوسێو پیاوباشن، ئەوە سوننەتە، کە داوا لە خوا بکەن بۆیان، ئەگەر ڕاستەوخۆو بە گیانی خۆشویستنو چاکەوە بێت، نەك ئەو گیانەی گوایە ئەمان لە خواوە نزیکنو دەتوانن ڕەحمی خوا بۆ خۆیان قۆرخ بکەنو تەنها وەڵامی نزاکانی ئەوان بدرێتەوە، لەبەر ئەوەی دۆعاکردن بۆیان مانای هاوبەشی ویژدانییو سۆزییە لەگەڵ ئەو کەسەی ناسراوە –لە چوارچێوەی لێقەوماوەکەدا– بە چاکەکارییو دڵسۆزییو خۆشەویستیی چاکە بۆ خەڵکی، لەمەدا پشووی دەروونیی تیادایەو ئومێد دەبەخشێت بە دەروون، ئەمە جێگەی خۆشەویستی خوایەو خۆشەویستی کەسێکە کە خوای خۆشدەوێت، هەرگیز لافی توانا لێنادات، هەرگیز هەوڵ بۆ پلەوپایە نادات و دەرگا ناکاتەوە بۆ بازرگانیی کردنو دەسەڵاتی مانایی (معنوی)، چونکە هەرکەس لەم جۆرە دەرگایانە بکاتەوەو هەوڵ بۆ ئەو مەبەستانە بداتو بەردەوام بێت لەسەری، ئەوە ئیتر کردوویەتی بە پیشەو لافلێدان بە دەم خواوە، کارەکەش دەچێتە خانەی فاڵچێتییو نان پەیداکردنەوە، نەك دڵسۆزییو هەوڵدان بۆ چاکەو خۆشەویستیی خوا.

گرنگ ئەوەیە، داوای دوعابۆکردن لە کەسێك وای لێنەکات، وا بزانێ مادام خەڵك داوای لێدەکەن دۆعایان بۆ بکات، ئیتر خۆی بەخشراوەو نزیکە لە خواوەو خۆی پێویستی بە تۆبەکردن نییە، نابێت ئەو کەسە ببێتە نوێنەری خوا لەو بارەوە، نابێ خۆشمان واز لە نزاو پاڕانەوە بهێنین، کاتێ داوا لە پیاوچاکێك دەکەین دۆعامان بۆ بکات، دەبێ خۆشمان هەوڵبدەینو دەروونی خۆمان چاك بکەین، ئەو کاتە نزای پیاوچاکەکە دەبێتە هۆی نزیکبوونەوەمان لە خوا، نەك پاڵی لێبدەینەوەو بێئاگابین.

بەمجۆرە، داوای نزاکردن لەلایەن لێقەوماوەوە لە دایكو باوكو پیاوچاك، ئامانج ناهێنێتەدی، ئەگەر پەیوەندیی ویژدانیی لەگەڵ نەبێت، ئەوکاتە ئەمە جێگای ئەوەیە کە دۆعا وەربگیرێت، پەیوەندیی خۆشەویستیو هاوکارییو یارمەتی لە نێوان ڕۆڵەکانی کۆمەڵگادا بەهێز دەکات (ادْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ) (الأعراف: ٥٥ ).

بەڵام ئەگەر دۆعانووسین ببێتە پیشەو تایبەتمەندێتییو قۆرخکردنی لە لایەن هەندێ کەسەوە، خەڵکیش لەبەر دەرگای ڕیز بگرنو داوای سوودو قازانجی لێبکەن، ئەوە هاوبەش پەیداکردنە بۆ خوا، بناغەی یەکتاپەرستییو تەقواو یاسا خواییەکان لە کارکردنو هەوڵدانو پشتبەستن بە خوا دەردەهێنێ، ئەم دیاردەیە لە زۆر وڵاتدا باوە، کە خەڵکیی دەرگایان کردووەتەوەو خەریکی ئەم جۆرە کارەن، ئەم کارە خەڵك باوەڕی پێی هەیە، هەتا هەندێ لەزاناکانیش بە نیازپاکیی– بە هۆی خراپ تێگەیشتنو خراپ ڕاڤەکردنەوە، ئەو دەقانەی، کە پشتی پێدەبەستن لەو بوارەدا چیرۆکی لاوازو درۆو ئەو شتانە کە بیروباوەڕی بۆ ماوەو ئیسرائیلیاتن، بە هەڵە ڕاڤە دەکرێنو ئەوانەی، کە ناتوانن جیاوازیی نێوان هەقو بەتاڵو هەڵەو ڕاستێك بدەنەوە، باوەڕی پێدەهێنن، کە ئەم جۆرە کارەش پشت نابەستێ بە مەبەستەکانی شەریعەتو یاسا جێگیرەکانیو لایەنە گشتگیرییەکانیو ئەوانەی لەپێشترن، پشت نابەستێ بە ئاگاییو دەرككردنی گرفتەکانی ئوممەتو ڕۆشنبیرییو ئەوانەی کە بەرەنگاری ئەم ئوممەتە بوونەتەوە، ئەگەر فکری مسوڵمان پابەندبوایە بە بەرنامەی ئیسلامو زانستی دروستەوە، هەرگیز خورافەت ڕێگای نەدەبوویەوە لە ناو ڕۆشنبیری ئەم

ئوممەتەدا، هەرگیزیش ئەو چەمك‌و ڕاڤە هەڵانە كە ئەمڕۆ باون لە ناو ڕۆڵەكانی ئەم ئوممەتەدا، جێگایان نەدەبووەوە.

## بەردەوامبوونی هەوڵەكان بۆ پوختەكردنی دەق‌و چەمك‌و ڕاڤەكان

ئەوەی ئەمڕۆ هەیە ئەوەیە، بەرنامەی فیكری زاڵ لەناو ئوممەتدا، لە ڕووی زمانەوە پەرتەو دەقەكان پیشەیی‌و لاسایی‌كارییەو لە تێڕوانینی بارودۆخێكی مێژووییدا، كە پەیوەندیی بە یاساكەوەو بە ژیانی ئەمڕۆی ئێمەوە نییە، هەروەها بەو گرفتانەی كە ئوممەت هەیەتی، وای لێكردووە چۆن ئامێرێك كاغەز پارچە دەكات‌و وێنەكان دەدڕێنێ، دوایی كەس ناتوانێ ئەو وێنانە وەك خۆی لێبكاتەوە، چونكە وێنەكان دڕاوەو شێوەو هەموو پارچەكانی لەت‌و پەتبووە، هیچ پارچەیەك بە تەنها وێنە ئەسڵییەكە نانوێنێ، ئەم شێوازەش لە ناو فیكری مسوڵماندا دەیبینین، لە هەموو ڕوویەكەوە دەنگ بەرز دەبێتەوە بەبێ ژمارەو بەتێڕوانینی زۆر جیاوازو دوور لە یەكتر، كە كەس نازانێ ڕاستیی لە كامیاندایە، هەركەسە قسەی خۆی هەیەو پشتی پێدەبەستێت‌و قسەی ترو دەقی تری پێپووچەڵ دەكاتەوە، بەڵكو هەندێكیان هەموو كارێك لە شێوەیەكدا دادەڕێژێت كە پێچەوانەی شێوەی پێشووە، بە مەبەستی خراپ نا، بەڵكو لە ئەنجامی پارچەپارچە بوونی دەقەكانە، ئەگەر فیكر بەرنامەی گشتگیرو دروست‌و یەكپارچەی هەبوایە لە شێوەو ناوەڕۆكدا، ئەو كاتە خاوەن فیكرو زانستەكان تێگەیشتنی هاوبەش لە لێكۆڵینەوەو گفتوگۆداو هێڵی هاوبەشیان دەبوو، بەڵام لە وردەكاریی‌و جێبەجێكردنەكەیدا شتی لە پێش‌و لە بارودۆخ‌و كات‌و شوێنیان جیاواز دەبوو، بەپێی ئەو گۆشانەی كە كاری لێدەكەن، ئەوەش دەبووە مایەی دەوڵەمەندكردنی فیكرو تەواوكاریی شارەزایی‌و ئەزموونەكان.

بەرنامەیی دروست (المنهجیة السلیمة) بوار نادات، كە ڕووداوو جێبەجێكارییەكان‌و بارودۆخی كات‌و شوێن زاڵ بێت بەسەر مەبەستەكان‌و لایەنە گشتییەكان‌و بنەما دامەزراوەكانی شەریعەتدا، ئەو هەوڵانەی كە دراوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتەكان، هەروا بە فیڕۆ بدرێت، ئیتر ڕاڤەو چەمكی هەڵەو دەقە تێكدراوەكان‌و باس‌و چیرۆكە ئەفسوناوییەكان كە ئیسرائیلیاتن ڕێگەیان

نییە بێنە ناو فیکری ئوممەت، یان ببنە جێگرو گشتگیرو ڕۆشنبیری ئوممەتو کاری زانایان تێك بدەن.

هەروەها بە بێ بەرنامەیەکی دروستی بنیاتنراو لەسەر مەبەستەکانو بنەما جێگیرەکان، زۆربەی دەقەکان لە ژێر سێبەری وێنەکانو بارودۆخی ڕاڤە بۆ ماوەییە لاسایی کراوەکان، دەبێتە جێگای تێڕامانو مەرەکەبی پەرتو بڵاو دەبێت لەسەر کاغەز، یان دەبێتە ئەو سندوقانەی کە داخراون بە کۆمەڵێ ژمارەی ئاڵۆز، کە نازانرێ کامانەن، هەوڵەکانو زانیارییەکان بەفیڕۆ دەدرێت لە کردنەوەیدا، فەرمانی سەرکەوتن لە کردنەوەیدا بدرێتە ڕێکەوت، کە لەئاستی ئەم جۆرە کارەدا فیکر پەرت دەبێتو هەوڵ بەفیڕۆ دەڕوات، شارستانیی نەتەوەکانیشی لەسەر بنیات نانرێ.

## برەودانی فیکری خورافەتو پەرتووکەکانی، تاوانێکی ئایینییە

لەو تاوانەی کە دەرهەق بە ئوممەتی قورئانو جێنشینایەتیی مرۆڤ، لە ڕووی ئایینییو فیکرییو کۆمەڵایەتییەوە دەکرێت، برەودانە —لەم چەرخەو لەبەردەم ئەو شتانەی، کە ڕووبەڕووی ئەم ئوممەتە بووەتەوە— بە ڕێگرەکانی گیانی زانستکاریی هەوڵو دەستگرتن بە هۆکارو بەرپرسیاریەتییەکانەوە.

هەروەها لەو تاوانانەی تر، بڵاوکردنەوەی هەندێ لە پەرتووکەکانی چەرخەکانی ڕابردوو، کە لەوانەیە نیازپاکییو دڵسۆزیی تیابێت —کە تایبەتە بە بارودۆخی ڕابردوو، زۆربەی ئەو پەرتووکانە وێژەی خورافەتو دواکەوتنو تێکشکانە کە بە ناهەق دەدرێتە پاڵ ئایینو کەلەپوور، بڵاوکردنەوەی ئەم پەرتووکانە بەبێ پشکنینو پاککردنەوەو برەودانی بە ناوی ئایینەوە، لە نێوان خەڵكو لاواندا، کە پڕە لە درۆو ئەفسانەو هەندێ لە ڕووداوە شازەکان، کە فێڵ لە هەستەکان دەکات، ئەگەر گێڕەرەوەکانیش ڕاست بکەنو لە دەروونەوە ڕاستیی بزانن، ئەوە تاوانە لەسەر ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە.

ئەوپەڕی شتێ، کە عەقڵی مسوڵمانی ڕاست دەربارەی ئەم جۆرە پەرتووکانە بیڵێ، ئەوەیە لە لایەن پسپۆڕانەوە لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەو تێگەیشتنی ئەو بارودۆخەیە، کە تیایدا نووسراوە، نەك ماددەیەك بێت لەناو خەڵکدا برەوی

پێبدرێت، چونکە ئەو چاوبەستکردنو دەجەلە بەناو کەلەپورو ئایینو بۆ هەموو کارێ، کە لە ڕابردوودا کرابێت، یان هەتا ئەگەر بدرێتە پاڵ هەندێك لە زانای گەورە، کە هەڵەیان کردووە —ئەگەر ئەم قسە بۆیان دروست بێت[1]— لە تێگەیشتنی ئەم باسانەدا کەوتوونەتە هەڵەوە، بە هۆی ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون، زۆر دیاردە هەبووە لە ڕابردوودا نەزانراوە، بەهۆی لێکۆڵینەوەی زانیارییەوە، توانرا شاراوەکانی بکرێتەوەو ئەوەش لە ئەنجامی ئەم بارودۆخە زانستییەی ئێستا، زۆر لافو درۆیان دەرکەوت، هەموویان پووچەڵن، خۆپەیوەستکردن بە چیرۆکی بێماناو پڕوپووچو خورافەتو درۆو دەلەسەو بڵاوکردنەوەیو تێکەڵکردنی نێوان ڕابردووی مرۆڤایەتییو شتە نائاساییەکان، لەگەڵ ئێستای مرۆڤایەتیی، کە وەستاوە لەسەر هیدایەتی خواییو بەرنامەی زانستییو ژیریی، هەموو ئەوانە، جگە لە خزمەتی دوژمنەکانی ئەم ئوممەتە، هیچ بەروبوومێکی نییە، ئەوە نەبێ، کە گیانی زانستو توانا وێران دەکاتو بە بەردەوامیی ئەم ئوممەتە بەرەو لاوازبوون دەبات.

پێویستە لاوانو ئەم ئوممەتە بپارێزێت بە سەنگەری بیروباوەڕی ڕاستو دروست، بە زانیاریی ڕاستەقینە، لەم چەشنە فیکرە زیانبەخشانە، لەم ماددە زیانبەخشانەش دابڕنرێت —لە هەموو ئەوانەی پەیوەندیی بە پەروەردەو فێرکردنو ڕاگەیاندنەوە هەیە— دوور لە چاوی لاوانو خەڵكو گوێو وێژەیان، ئەو ماددە ژەهراوییو زیانبەخشانە بپارێزێت لای کەسانی خاوەن پسپۆڕ، دوور لە دەستی منداڵو نەفامەکان.

---

[1] ئێمە دەزانین هەندێ لە زاناکانی ئیسلام، سەدەها پەرتووکیان دەدرێتە پاڵ، کە زۆر گرانە کەسێك بە تەنها بتوانێ لە ژیاندا بیاننووسێ، ئەمەش بۆیە دەدرێتە پاڵیان، تا هەندێ کەس کە مەبەستیانە فیکرێك بڵاوبکەنەوە، لەڕێگەی متمانەی خەڵك بەو زانایە، برەو بە فیکرەکەیان بدەن، ئەمەش وامان لێدەکات هەموو پەرتووکێ کە دەدرێتە پاڵ ئەو زانا گەورانە، کوێرانە وەرینەگرین، ئەگەر نەدەگونجا لەگەڵ فیکرو مەبەستەکانی ئەو زانا گەورانەدا.

## گەلان بە زانستو مەعریفە پێش دەکەون نەك بە خورافەتو چاوبەستکردن

هیچ گەلێك بە هۆی ساحیرو چاوبەستکارانەوە پێشنەکەوتووە، بەڵکو بەهۆی عەقڵو زانیاریی‌و تواناکان، کە خوا بەخشیویەتی بە مرۆڤ، پێشکەوتووە، بە گوێرەی ئەوەی کە خوا دایناوە لە بوارەکان‌و سروشتی تواناکاندا.

ئەوەی دەستیگرت بە زانستو مەعریفەوە، ڕێگای دووری بۆ نزیك بوویەوە، بەرهەمی گەشەی کرد، هەوڵەکانی بۆ ئاسان بوو، پیشەسازیی‌و خزمەتگوزارییەکانی پێش کەوت، پشتێنەی زانیاریی‌و زانست لە نێوان ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیدا فراوانبوو، لەخاکەکەیدا چارەسەری نەخۆشییەکان کرا. پەتاو نەخۆشیی لەناوبرا، بەڵام بە نەزانین‌و خورافەت، ناڕەحەتییەکانی گەلان‌و هەرژارییەکەی زۆرتربوو، نەخوێندەواری‌و نەخۆشیی تیا بڵاوبووەوە، مافەکان فەوتان، ملشۆڕ بوو، پیرۆزییەکان شکێنران، ئوممەتی ئیسلامیی لە هەموو ئەوانەدا —لەگەڵ داخو ناڕەحەتییدا— پشکی گەورەو قورسی بەرکەوت، دەبێ بزانین ئەو بارودۆخەو ئەو چەرخو قۆناغانەی بە چاکو خراپییەوە، کە بە سەر ئەم ئوممەتەدا تێپەڕیوە، سروشتی ژیریی‌و توانای وتارەکانی لەڕابردوو، زۆر لەو وتارانە —هەتا ئەوەشی چاکە— گونجاو بوو لەگەڵ ئەوکاتو شوێن‌و ڕۆشنبیریی‌و توانایەی ئەو سەردەمەدا، لەبەر ئەوە تووتی ئاسا وتنەوەی لەم ڕۆژگارەدا —بەبێ تێگەیشتن لە تایبەتمەندییەکانی— گوایە کەلەپوورەو وەك شێوەکەی خۆی بڵاوی بکەینەوە، ئەمە بە توندترین جۆرەکانی نەزانین‌و بێئاگایی دادەنرێت، لەو جۆرە وتارانەش زیان نەبێ، هیچی تری لێناکەوێتەوە، بێهودە نەوتراوە: هەڵەیە هەرچی وتراوە بیگێڕیتەوە، چونکە (هەموو جێگایەك وتەی خۆی هەیە)، هەندێ لەو وتانەی، کە خەڵك لە سەردەمە پێشووەکاندا وەریگرتووە، هەڵەیە بیگێڕیتەوەو بڵاوبکرێتەوەو تارای پیرۆزیی بەسەردا بدرێت بۆ ئەم ڕۆژگارە.

دەبێ بیروباوەڕی زانایانی ئوممەتی ئیسلام، نەکەونە داوی بەرنامەی بەش‌و پیشەیی، تا بتوانن هەستن بە ئەرکی ڕزگارکردنی ئوممەت، ئەو تێکچوونانە چارەسەر بکەن بە لایەنە گشتگیرو مەبەستەکانی شەریعەت پڕچەك بن بە

زانستو لێکۆڵینەوەی زانستیانە، مێژوویی‌و کۆمەڵایەتیی‌و دەروونیی‌و پەروەدەیی، بە شێوازی بەرنامەیی فراوانی شیکاریی سروشتی، تێڕوانینی ڕاستەقینەی ئیسلام دەربخەن، هەروەها لە توانایاندایە هەست بە شوێنی ڕووداوو دەقەکان بکەن لە سەردەمی پەیام‌و چەرخەکانی دواییداو هەستبکەن بە هەردوو لایەنی کات‌و شوێن، کاریگەرییەکەی لە تێگەیشتن لەڕووداوو دەقەکان، ئەوەی کە دەبێ کاربکات بۆ جیاکردنەوەیان بە سەلامەتترین پێوانەی بەرنامەیی بۆ دەستنیشانکردنی ئەو شتانەی کە تێکەڵی دوانراوەکان کراوە –بە پێی کات‌و شوێن– لە ڕۆشنبیریی‌و هەستکردن‌و چینی پەیوەندییەکان‌و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، زۆرجار تێگەیشتن سەرگەردان دەبێ، ئەگەر وا تەماشای دەقەکان‌و ڕووداوەکان بکرێت، کە لە بۆشاییەکدایە، وەك ئەوەی شوان‌و مامۆستاو سەرکردەیەك قسە بکات –کاتێ قسە بۆ نەتەوەکەی دەکات– بەڵکو ئەو مامەڵە لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتیی لە هەموو کات‌و شوێنێکدا دەکات، نەك لەگەڵ چەند کۆمەڵ‌و تاقم‌و تاکێك، کە تواناو هەست‌و ڕۆشنبیریی‌و نەریت‌و ڕێڕەوی دەروونییەکانیان جیاوازە، شێوەکانی وتاردان لەیەك کات‌و شوێندا جیاوازییان هەیە، ئەگەر بۆ یەك ئامانجیش بێت، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، لە ڕوویەکەوە بۆ ڕوویەکی تر، بە گوێرەی باری قسەلەگەڵکراوەکە، بە پێی ئەو کارانەی لەپێشەوە بەرژەوەندییەکان‌و پێداویستی‌و تواناکان، کە قسەکەر، یان ئاڕاستەکەر حسابی بۆ دەکات، ئەی ئەگەر کات‌و بارو شوێنەکان دوورکەوتنەوە – بەدرێژایی چەندین سەدە–.

## هۆشیاریی باوکان بنەمای بنیاتنانە

لەوانەیە سوودمەندبێت، ئەگەر نموونەیەك بهێنینەوە لەسەر جیاوازیی وتاردان، بە هۆی سروشتی ڕۆشنبیریی‌و تواناکان‌و سروشتی دوێنراوەکە، ئەمەش گرنگیی شێوازی تێگەیشتن لە زۆر لە تایبەتمەندیی دەقەکاندا ڕوون دەکاتەوە، کە ئەوانەی شوێنکەوتەی بەرنامە بەشیە پیشەییە نەریتییەکەن، لێی تێناگەن، لەبەر ئەوە خەڵك لەگەڵ وتارەکانیاندا وەڵامدانەوەیان نییە، ئەمەش وا دەکات

وتارەکانیان ڕاست نەبێت، بە ڕووتیی یان دووریی لە تایبەتمەندێتیو بارودۆخەکانیان، هەروەها سروشتی دوێنراوەکەو سروشتی باسە قسەلەسەرکراوەکان.

دایکان لە شاری مەککەی پیرۆز - بە گومانی من لە زۆرێك لە وڵاتەکانی تریشدا لە تەمەنی منالّیی- هەندێ لە چەمكو شێوازی بۆ ماوەیی، کە باوی نەماوەو سواوە، بە هۆی بارودۆخو تواناو ڕۆشنبیرییەوە دەیانگێڕایەوە، لەوانە سووربوون لەسەر ئەوەی منالّەکانیان فێر بکەن، کە هەر دەنکێك هەنار لە ناو هەناردا "دەنکە هەنارێکی بەهەشتە" هەنار -وەك خوێنەر دەزانێت- لە شاری تائیفو چیاکانی حیجازدا زۆرە، ئەگەر دەنکە هەنار بەر جلوبەرگ بکەوێت، پەڵەیەکی سوور دروست دەبێت، کە بە ئاستەم لە جلوبەرگەکە پاکدەبێتەوە، بە تایبەتی کەمتوانایی سەردەمە پێشووەکان، ئەگەر ئەمڕۆش وانەبێت لەبەر ئەوەی لە کاتی هەنار خواردندا، پاراستنی هەنارەکە، تا دەنکەکانی پەرشو بڵاونەبێتەوە زۆر ناڕەحەتە، نەك لەسەر منالّ، هەتا لەسەر کەسی گەورەش، ئەو فکرەیە، کە هەر دەنکێکی هەنارەکە، دەنکە هەنارێکی بەهەشتە، فیکرەیەکی خورافیانەی ژیرانە بووە، پاڵنەری بەهێزیش بووە لای منالّەکە -جگە لە تامە خۆشەکەی لای منالّ- تا هەموو دەنکەکان بخواتو بگەڕێ ئەوەشی دەکەوێتە سەر زەوی کۆیکاتەوەو بیخوات، یان نەهێڵێ بەر جلوبەرگەکەی بکەوێ، ئەم فیکرە خورافیەتە کاری دایکی ئاسان کردووە تا منالّەکە جلوبەرگەکانی لە پیسبوون بپارێزێت، ماڵەکەشی پیس نەبێت، دواییش کە مندالّەکە گەورە بوو، بۆی دەرکەوت، ئەمە فیکرەیەکی خورافییە، ئەفسانە نەبێ هیچی تر نەبوو، پێکەنینی پێدێتو زیرەکیی دایکی بۆ دەردەکەوێت، کە چۆن بەو جۆرە ئەوەی ویستوویەتی ڕوو نەدات، ئەنجامیداوە، چونکە منالّ لەو تەمەنەدا مەبەستی دایکی لەو قسەیەدا تێناگات.

لە لایەکی ترەوە، پاراستنی منالّەکە لە لایەن دایکەکەوەو پەنابردنە بەر -بە نەزانین- ئەفسانەو شتی پڕوپووچ بۆ بەدیهێنانی مەبەستێك لەلایەنەکانی ترەو کاریگەریی خراپی دەبێ، هەروەها ئەو دایکانە، کە نەزانن دەربارەی دەروونی منالّ، پەنا دەبەنە بەر هەندێ ناو بۆ ترساندنی منالّ تا نەڕواتە دەرەوەو

هەمیشە لە ژێر چاودێری خۆیدا بێت، وەك ترساندنی منداڵ بە وشەی (دێوو درنج) بە تایبەت لە شەوی تاریکدا، لەو ژینگانەی کە ڕووناکییو جووڵە نییە، لە کاتی تاریکیدا —لەزۆر ژینگەدا— زۆر لەوانە، کە دزن یان شەڕواڵپیسن، یان ڕێگرو چەتەن، شەودێنە دەرەوە، لەبەر ئەوە دایکانیش، تا مناڵەکانیان پارێزراو بێت لەو جۆرە کەسانە، مناڵەکان دەترسێنن، تا بە شەو لە ماڵ نەچنە دەرەوەو دەڵێن کاتێ شەو دادێتو تاریکایی پەیدا دەبێت، جنۆکەو دەعباو دێوو درنج هەیەو وریابن مەڕۆنەدەر، هەندێك لەو دەعبانە جلی ژنانە لەبەر دەکەن، ئافرەت لەو سەردەمانەدا هەموو لەش بە پۆشاك دادەپۆشن، دایکەکەش بە مناڵەکەی دەوت، ئەم جۆرە جنۆکانە لەکۆڵانە تەسکەکاندا، مرۆڤ ناتوانێ جیاوازیی بکات لەنێوان ئەو جنۆکانەو ژناندا، تەنها ئەوە نەبێ، قاچی جنۆکەکە لە شێوەی قاچی گوێدرێژدایە، لێرەدا دەتوانین حاڵی ئەو مناڵە لەبەر چاومان بێت، ئەگەر ویستی بە شەو لە ماڵ بڕواتە دەرەوە، ئافرەتێك ڕووبەڕووی بێت لە تاریکایی ئەو کۆڵانە تەسکەدا، هەستی ئەو مناڵە چۆن دەبێت؟ ئایا چاوەڕێی ئەوە دەکات، بزانێ ئەوەی ڕووبەڕووی دێت قاچی ژنە یان گوێدرێژ؟ حاڵی دڵو ئەندێشەو عەقڵی ئەو مناڵە بچووکە چۆن دەبێت؟

ئەم خورافەتە ترسێنەرە — ئەوەش لە ئەندێشەی ئەو مناڵەدا دروست دەبێت دەربارەی جنۆکە لە شەودا— بەسە بۆ ئەوەی منداڵ بیر لەچوونە دەرەوە نەکات لەشەوی تاریکدا، خۆزگە هەرئەمە بوایە، هەر لەمناڵیدا بوایە، زۆرجار زیانی دەروونیی هەیە، کە هەرگیز لەدەروونی مناڵەکە نابێتەوە، ئیتر هەمیشە ترسنۆكو هەستکردن بەترس تیایدا جێگیردەبێت، بە تایبەتی لە کاتی شەوو تەنهاییدا، هەرکەس وابزانێت، کە شتی ترسناكو نادیار هەمیشە دەوریداوە، خۆی حەشارداوە تا ئازاری بدات، ئەم جۆرە هەستو ئەندێشەو شتە پڕوپوچانە، وای لێدەکات، گۆشەگیر بێتو لە ماڵ نەیتەدەرەوە لە پێناوی ئاسایشو سەلامەتیدا، ئەم جۆرە پەروەردەیە —بێگومان— دەبێتە هۆی چەسپاندنی ترسو بیم لە دەروونی مناڵ، هەتا لە کاتی گەورەبوونو پێگەیشتندا.

ئیتر ئەوکاتە چاوەڕێ دەبین، تا بیابانیی بێت شوێنە چۆڵو شاخو دۆڵو ئەشکەوتەکان ئەو بیزانێت، لە ئێمە زیاتر شارەزابێت.

زۆر لەو منالآنە، کە گەورە بوون، ئینجا دەزانن، کە ئەو دەعباو دێوو خێوو شتانە، هەمووی ئەفسانە بووە، بەڵکو فێڵکردن بووە بۆ ناچارکردنی منالْ لەسەر ڕەفتارێك، کە ئامانج لێی، سەلامەتیی‌و پاراستنی منالّەکە بووە، بەلاّم ناتوانێ خۆی لەو شوێنەوارە دەروونییە زیانبەخشە، کە ئەم جۆرە وتارانە پەیدای دەکاتو ئەم شێوازە پەروەردە نەزانییە دروستیدەکات خۆی بپارێزێت، دەبینیت زۆر کەس لە تازە پێگەیشتووەکان، لەبەردەم ئەم جۆرە هۆکارو شێوازانەدا، لە تاریکیدا ترس دەیانگرێتەوە، کە لە ڕاستی بێبنەمایەو ڕاست نییە، بەتایبەتی لە کاتی تەنهایی‌و لەژووری داخراودا، هەروەها لە دەنگی هەورو گەردەلوولو باران‌و شتیتردا.

لە هەموو بارەکاندا ئەم جۆرە هۆکارانە: چاکیی‌و خراپیی، ناتوانین ماناکانی هەست پێبکەین، یان هۆکارەکانی: چاکە یان خراپیی هەڵبسەنگێنین بە هەڵسەنگاندێکی دروست، مەگەر ئەوکاتو ساتو شوێن‌و بارودۆخەو ئەو کەسانەی کە دوێنراون بخەینە بەرچاو، ئەو ئاسەوارانەی کە لەوە دەکەوێتەوە، لەبەرئەوە لەسەرمانە ئەو جۆرە بیرو شێوازانە دووبارە نەکەینەوە، لەژێر هەر دروشم‌و ناوێك بێت، بەبێئاگایی‌و دەربارەی شوێنەوارەکانی لە ژێر تیشکی شوێن‌و پێویستییەکان‌و تواناکانمان، کە جیاوازترە لە ڕابوردوو، چەند جێی داخە، کە زۆر لە نووسەرو دواندەرەکان ئەو جۆرە دەقانە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ بلاّودەکەنەوەو کاریگەریی خراپی دەبێت، بە تایبەتیی کاتێ دەقەکان ئایینین، جاری وا دەبێت ئەو دەقانە ڕاست نین، یان لادراون لە ماناکەیان، یان بارودۆخەکەی نەزانراوە، یان بەخراپ ڕاڤە دەکرێت، یان لێی تێدەگات، هەموو ئەوانە زیانی هەیە لەسەر ئوممەت، بە تایبەتیی ئەگەر دوێنراوەکان منالّو لاوەکان بن، ئەمەی کە دەیکات بەبێئاگایی نازانێ کاریگەریی خراپی هەیە لەسەر منالّو لاوەکان، گوایە لە پەرتووکی کەلەپووردا هەیەو هاتووە.

## هەوڵی زیاتر بۆ پوختەکردنی چەمکە بنەڕەتییەکان

مامۆستای پێشەوا موحەممەد عەبدە –دوای ئەوەی بەرەنگاری زانستی ئەورووپی بووەو هەندێك لە زاناو بیریاران شوێن ئەورووپا کەوتن– فەرمانیدا لەم چەرخە تازەدا بۆ پاڵفتەکردنی کەلەپوور لە ئاسەواری پڕوپووچ لە مێشکی مسوڵماندا بەرەنگاری ئەو شتە پووچانە ببنەوە، ئەمەش بە دووبارە تێڕوانین لە تێگەیشتنی دەقەکانو وێژەکانی کەلەپوور، لەم بوارەدا ئەو شتانەی کە جێگای مشتومڕبوون لە گۆشەی ڕوانینی هاوچەرخو چەمكو مەعریفەو تواناکانییەوە دووبارە خستییە ڕوو، داواشی کرد چاوبخشێنرێتەوە بە دەقە کەلەپوورییەکانداو لەشێوازی تێگەیشتنو ڕەخنەو ڕاڤەکردنیان، هەروەها چاو بگێڕنەوە بە وتاری ئیسلامیدا، کە بە جۆرێك گونجاو بێت لەگەڵ تازەگەرییو گۆڕانو پێویستیو تواناکانی ئەو سەردەمەدا، مەبەست لە هەوڵەکانیشی پوختەکردنی ڕۆشنبیریو پشتگیریی گیانو عەقڵییەتی زانستی ڕۆڵەکانی ئوممەت بوو، سەرباری هەوڵەکانی موحەممەد عەبدەو چەند کەسێکی تر کە سەرەتایەکی گرنگ بوو، بەڵام هێشتا پێویستی بە هەوڵی زیاتر هەیە، کە بە شێوەیەکی بەرنامەیی بێت، کە بناغەو چەمکە گشتییە پێویستییەکان جێگیر بکات بۆ ڕزگارکردنی عەقڵی مسوڵمان لەفیکری خورافەتو شتی پڕوپووچ، لە سەر بنەمایەکی پتەو، شیاوی ئوممەتی (العلق)و (القلم)و (الحدید) کە چەند سورەتێکی قورئانن بێت، لە چەرخی دەرکەوتنی توانای زانستیی یاساکان، کە ناگۆڕێت بەرنامەی زانستیانەی دروست، تێڕوانینەکان یەکدەخاتو بەشی هاوبەشی فراوان دەکات، بە بێ بەرنامەی زانستی دروست، ئەم ئوممەتە تێڕوانینی دروستی هاوبەشی نابێتو تواناکانی دەفەوتێت لە پوختەکردنی بیرەکانو ڕۆشنبیرییو هەڵوێستەکان بە شێوەیەکی بابەتیانەو قابلو چالاك.

لەبەرئەوە، بەڕێوەبردنی گفتوگۆ بە شێوەیەکی کوێرانە، بێ سوودە، یان لەسەر بنەمای بەرنامەی بەش بەشو پیشەیی زمانەوانیی، دەربارەی کارێکی ناوەرۆکی گرنگ، وەك بەرەنگاربوونەوەی بیری خورافەتو جێگیرکردنی عەقڵییەتی زانستیی، چونکە لە کاتی نەبوونی چوارچێوەیەکی بەرنامەیی بۆ

**گفتوگۆکانی بیروجیاوازییەکانی ڕاوبۆچوونو توندی جیاوازییە وەهمییەکان، هەروەها توندڕەویی هەڵوێستە پوچەکانو ڕاکردن لە ڕوانینی زانستییەوە بۆ دادگاییکردنی نیازەکان، تۆمەتبارکردنی یەکتریو دروستبوونی دوژمنایەتی، کە ڕیزەکان دەدڕێنێو عەزم لاواز دەکاتو هەستی کۆمەڵیی وێران دەکاتو بەربەستی دوورەپەرێزیی دروست دەکاتو گوێ ناداتە نێوانی ئوممەتەکەو هەڵبژاردە ڕۆشنبیرییەکان، ئەو گفتوگۆیانە دەکەونە پێچەوەو ناو مەسەلەی بەشی بچوكو بێکۆتاییو سەرئەنجامی بەرەو پشێوی دەڕوات[1].**

---

[1] سوودبەخشە لێرەدا ئەزموونێکی فێڵ و چاوبەست کە خۆم بە منداڵی دیومە تۆمار بکەم، کە توانیم لە خوا بەزیاد بێت، مەتەڵەکەی هەڵبێنم و رووی فێڵەکەی بدۆزمەوە، تا ببێتە نموونەی ئەو فێڵانەی فالْچییەکان خەڵکی سادەی تێدەخەن. ئەم رووداوە لە کاتی منداڵیمدا لە قۆناغی سەرەتایی و لە مەککەی پیرۆز روویدا، لە مەککە لەو سەردەمەو بە گومانم تا ئەمڕۆش شتێك هەبوو بە ناوی مەندەل (جۆرێکە لە فاڵ و قاوەگرتنەوە بە بەکارهێنانی بۆنی بخوور و دروستکردنی جەوێکی ئەفسووناوی)، کۆمەڵێك فالْچی دەستبڕ فیشاڵی ئەوەیان دەکرد کە دەتوانن شتی دزراو بدۆزنەوەو بشزانن لە کوێیە و کێ دزیویەتی، ئەم کارەش بە جۆرەها شێوە ئەنجامدەدا و خەڵکی نەزان و گرفتار دەکەوتنە داویانەوە، ئەم کارەش زۆر جار پووچ دەبوو هەرچەندە کەم جار راست دەردەچوو، ئەم جارە کەمانەش بەس بوون بۆ ئەوەی نەزان و لێقەوماوان دەستی پێوە بگرن، خۆ ئەو حاڵەتە تایبەتانەش ئەگەر خەڵك سەرنجی شێوەی کاری فالْچییەکانیان دابا، تێدەگەیشتن کە بۆ توانای ئەوان ناگەرێتەوە لە زانینی شتی نادیاردا بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی فێل و چاوبەست کە بە کاریان دەهێنا. ئەو ئەزموونە کە من بینیم شتێك لەمە ڕووندەکاتەوە، ئەوەبوو دراوسێیەکی تەنیشتمان دزییەکی لێکرا، ئەم دراوسێیە خۆی و خێزانەکەشی هەرچەندە لەبەر جییاوازی مەبەست و سروشتمان هیچ پەیوەندییەکی پێمانەوە نەبوو کەچی هات بۆ لای باوکی خوالێخۆشبووم و داوای لێکرد کە ڕێگا بدات بچم لە گەڵی بۆ لای مەندەل، لەبەر ئەوەی من منداڵ بووم، منیش لە گەڵی چووم، لەوێ کابرای مەندەلچی پەنجەی نا بە سەر لووتمدا بۆئەوەی دڵنیا بێت کە هێشتا بالْغ نەبووم، دوای دەستنوێژ گرتن نینۆکی پەنجەگەورەمی بە ماددەیەکی ڕەشی لریسکاوە بۆیە کرد، ئینجا بخوورەکەی داگیرسان و دەستی کرد بە خوێندنەوە و ورتەورت و باسکردنی ئەوەی کە پێویستە ببینم وەکوو شێوەی کورسییەکان و گسکدانی زەوی و ئاوپرژێن کردنی، خۆ من هیچ کام لەو شتانەم بۆ نەبینرا و دوای

**من داوا دەکەم لە زاناو بیریارەکانمان، گرنگی بە باسی بەرنامەی بدەن، کار بکەن ڕۆشنبیریی ئەم ئوممەتە لە تێکچوونو پیسبوون پاکبکەنەوە، بە تایبەتی**

---

خوێندنەوە و دەجوولاندنی زۆر بەزەییم پێدا هاتەوە و پێم گوت کە من ئایەتەلکورسیم خوێندووە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە من لەبەر منداڵیی شتێکم نەبینی کە ڕێگر بێت لە بینینی مەندەل، چونکە وا باوبوو کەسانێك مەندەلیان دیوە. ئەویش پێی گوتم کە وا مەندەلی ئایەتەلکورسیش دەخوێنێت، ئینجا دەستی کردەوە بە باسکردن، بەڵام ئەمجارەش سوودی نەبوو، دوایچاوبڕینێکی زۆر لە نینۆکی پەنجەم بەزەییم بە کاربرادا هاتەوە و پێم گوت: کە من تارماییەك دێتە بەرچاوم، دوایی کە سەرنجم دا ئەوە دەموچاوی خۆمە، کاتێکیش نائومێدبوو لە من رایگەیاند کە کارەکە تەواو و ئێمەش بە بێ ئەنجام بە جێمان هێشت. دواتر وردبوومەوە لە ڕووداوەکە، بۆچی من وەك ئەوەی بڕیارە و خەڵك باسی دەکەن هیچم نەبینی؟ وێڕای منداڵی و تەمەنی کەم هۆکارەکەم بۆ دەرکەوت، کە من کەسێك بووم زۆرم دەخوێندەوە، حەزم لە لەبەرکردن نەبوو و دەمویست تێبگەم و پەنام بۆ لێکدانەوەی دەرس و وەڵامەکانم دەبرد، هەربۆیە ببوومە منداڵێك کە ئاسان نەبوو شتم پێ بقەبووڵێنن، چونکە سوور بووم لەسەر ئەوەی بە قەناعەت و تێگەیشتنەوە بگەم بە ئەنجام. هۆکاری ئەوەی کاری فاڵچییەکە سەرینەگرت ئەوبوو کە نەیدەتوانی شت بە من ئیحا بکات، هۆکارێکی تر ئەوەبوو کە مەندەلچی سوور دەبوو لەسەر ئەوەی کارەکە بە منداڵ بکات و کەسی شت لێدزراو منداڵێك بهێنێت. ئەڵبەتە منداڵێك دەهات کە پەیوەندیی بە خاوەن باسەکەوە هەبوو، زۆر جاریش خەڵك لە بەرچاوی منداڵاندا شتانێك باسدەکەن وا دەزانن کە ئەوان تێیان ناگەن یان گرنگیی پێنادەن، جگە لەوەی منداڵ بۆ خۆی وێنای لەسەر خەڵکی دەوروبەری، لەسەر شوێن و شتە دزراوەکان هەیە، بۆیە مەندەلچییەکە منداڵەکە بەکاردەهێنێت و ئەوەی کە دەیەوێت پێی ئیحا دەکات، منداڵیش بەپێی عادەت لە چەند راستی و خەیاڵاتێك دەدوێت کە ڕەنگە بیپێکێت یا نەیپێکێت، کە ئەمە بۆمان ڕووندەکاتەوە بۆچی چەند جارێك قسەی ئەو فاڵچییە درۆزنانە راست دەردەچن، گرنگ ئەوەیە من لەبەر منداڵی و لەبەر ئەوەی هیچ ڕەبتێکم بە کابرای دزی لێکراو و ژینگەو کەسانی دەوروبەریەوە نەبوو تەنانەت هیچیشم لەسەر دزراوەکان نەدەزانی بۆیە مەحاڵ بووهیچ وێنەو خەیاڵێکم هەبێت لەسەر ڕووداوەکە، ئەمە ڕوونی دەکاتەوە بۆچی کاری مەندەلچییەکە لەگەڵ من سەری نەگرت، لە هەمان کاتدا فێڵ و زیرەکیی فاڵچییە درۆزنەکان رادەماڵێت، کە بۆکەسانی سادەو نەخوێندەوار زەحمەتە پەردە لەسەر ساختەبوونی کارەکەیان لابدەن، پێویستە بە دینداری و هۆشیاری خۆیان بپارێزن لەوەی تێی بکەوون.

فیکری خورافەتو ئەفسوناوییو شتی پڕوپووچو بێمانا، دەقەکانو کەلەپوور بە بەرنامە پوخت بکرێتو دەقو گێڕەرەوەو شێوەو بابەت لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت، پشت ببەسترێت بە بنەما پتەوەکان لە مەبەستەکانیو شوێنی دەرچوونو بەرەنگاربوونەوەکان، بە شێوەیەك بوار نەدرێت بۆ هەڵەی بەرنامەو هەڵەی ڕاڤەو وشەکانو ئاماژە دەقییەکان ببنە ڕێگوزەری خراپو خورافەتو کارنەکردنو بە تەمای بەروبووم.

ئەوەی گرنگە، بەم پەلەیە لە بەردەم خوێنەری بەڕێزدا، چەند چارەسەرێکی داواکراو دادەنێمو کۆڵەکە بنەماییەکان یاد دەخەمەوە لەگەڵ سەرچاوەی ئەو چارەسەرانەو بڕی پێوانەی ئەنجامەکانیان.

ئەم بنەمایانە دەبێت لە لێکۆڵینەوەکاندا حوکمی پێبکرێتو ئەنجامەکانی بنبەست بکرێ، ئەم کۆڵەکانە —بە ڕۆڵیان— کاکڵەی پەیامی ئیسلامو ڕێبازە بنەڕەتییەکانی حوکمی دەکات، کە بریتین لە: ڕێبازەکانی یەکتاپەرستیی، جێنشایەتیی، مەبەستی چاکە لە ژیانی مرۆڤایەتیی، ڕێبازی بەرپرسیاریەتی مرۆڤایەتیی لەسەر بنەمای کارو هەوڵ لەسەر زەوی، بە گوێرەی یاسا هۆکارییە بوونەوەرییەکان.

گرنگترین بنەماو کۆڵەکەکان کە ئیسلام دایناوە لەگەڵ گشتییەتی قورئانو دەقەکانی بریتین لە:

١ـ باسەکە لە بنەڕەتدا، باسی بوونی جیهانانی تر نییە لەم بوونەوەرەدا، یان نەبوونی ئەمە کارێکە —لە خۆیدا— پەیوەندیی بە مرۆڤ و جیهانەکەیەوە نییە، ئەوەی پەیوەندیی بە مرۆڤەوە هەیە، پەیوەندیی ئەم جیهانانەو شتەکانی ترە — سروشتی هەرچۆن بێت —بە جیهانەکەیەوە، بەڕێوەبردنی جیهانییەتی، بەرپرسیاریەتی لێی، ئەوە ئاشکرایە، کە ڕێبازی بەرپرسیارییەتیو ڕێبازی دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، بوار نادات بەم جیهانانەی تر، کە دەسەڵات پەیدا بکەن بەسەر جیهانی مرۆڤدا، دەبێ جیاوازیی بکەین لە نێوان هەموو چەشنەکانی جیهانی نادیارو شاراوەکان، هەیانە ئێمە هیچ لە بارەیەوە نازانین، هەیانە زیندەوەری وردە، ئێمە بە چاو نایبینین، هەمیشە —ئێستاش— هۆکار بووە بۆ زۆرێك لەو نەخۆشییو کارەساتانەی، کە دووچاری مرۆڤ دەبێت، هەیانە سوودی

هەیە بۆ مرۆڤ، زانست ئەمڕۆ توانیویەتی بیدۆزێتەوە، نهێنیو شوێنەوارەکانی ئاشکرا بکات، مامەڵەی لەگەڵ بکات، خۆی لە خراپەکانی بپارێزێ، هەموو ئەو جیهانانە، جیهانەکانی (جان) واتە جیهانی نادیارو شاراوەکان.

٢- شەیتان لە جیهانی پەنهانە، خۆیو زورپییەتەکانی -ئەوانەی کە هاوڕەگەزی شەیتانن لە جنۆکە- هیچ دەسەڵاتێکیان بەسەر مرۆڤدا نییە.

٣- کارەکانی سیحرو بەرچاوبەستی، هەمووی فڕوفێڵو شتی پڕوپووچەو ڕاستییەتی نییە.

٤- مرۆڤایەتیی لەگەڵ دەستپێکردنی پەیامی جیهانیی موحەممەدییدا، چووە ناو بارێکی نوێ لە پێگەیشتنو گەیاندن، مرۆڤ بووە تەواو بیناو جێی بەرپرسیاریەتی، لە جیهانی منالّیی مرۆڤایەتیو جیهانی نەزانینو جیهانی شتی ناباو، گوازرایەوە بۆ جیهانی قورئانو عەقڵو زانستو مەعریفەو کارکردنو گەڕان بەدوای هۆکار، نهێنییەکانی -بە وزەی ژیرییو زانست، تا ئێستاش- جیهانی نادیاری دەرخست لە زیندەوەرە زۆر وردەکان، بەمەش ئەو هۆکارانەی، کە مایەی ترس بوو لایدا، هەروەها عەقڵو زانست بە هۆی دۆزینەوە زانیارییەکانەوە، ئامێرەکانی فالّچییو ساحیرو بەرچاوبەستەکانی خستەڕوو، لەو شتانەی، کە خورافەتو فێڵن، ئەمەش بە هۆی دۆزینەوەی یاسا فیزیاییەکانو تایبەتمەندێتی ماددەکان، نهێنییەکانی دەروونی مرۆڤو نەخۆشییەکانو ئەوەی کاریگەریی لێدەکات.

٥- ئەگەر ئەوانەی لافی سیحرو خورافاتو شتی پڕوپووچ لێدەدەن، لەسەر حەق بوونایە، خۆیان دەوڵەمەند دەکردو سوودیان بۆ خۆیان دەبوو، بەڵام خۆیان لەو پێڕەن، کە بە فێڵ مالّی هەژارو بێئاگاکان داگیر دەکەنو زیانی ماددییو مانایيان پێدەگەیەنن.

لەیادمە، منالّ بووم، گۆڤارێکی میسری (مجلة الأنثين المصرية) ژنێك پرسیاری لە سەرنووسەرەکەی کردبوو، وتبووی پیاوێك هەیە دەتوانێ دڵی منو مێردەکەم یەك بخاتو خۆشەویستیی لەناوياندا دروست بکات، سەرنووسەری گۆڤارەکە دەڵێ: ئەگەر ڕاست دەکات، با دڵی خۆیو بەڕێوەبەری بانکی ناوەندیی میسر ڕێك بخاتو چەند درهەمێکی کەمی پێبدات، ئەوەی جێی پرسیارە، ئەم جۆرە فالّچیو ساحیرانە لە بەرامبەر دوژمنو پیلانو

نهێنییەکانیاندا لە کوێدا خۆیان دەبیننەوە، یان هەر خەریکی قۆڵبڕینی نەفامو فێڵڵێکراوەکانن.

٦- ڕێبازی ڕێزلێگرتنو جێنشینایەتییو ژێربارکردنی بوونەوەرو بەرپرسیارییەتی مانای دەسەڵاتی مرۆڤە بەسەر جیهانەکەیداو خۆی بەرپرسیارە بەرامبەر کردارەکانی خۆی لە بەڕێوەبردنیدا، نەك جیهانی پەنهانییو نادیار مرۆڤ ژێربار بکاتو دەسەڵاتی بەسەریدا هەبێ.

٧- دەرەنجامی کۆتایی، کە لە هەموو لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنو ڕاڤەکردنێك، کە دەیکەن، جگە لە زیان بە مرۆڤ هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت، ئەوەی کە پەنای بۆ دەبەن لە ماددەو کارە دەروونییەکان زیانی هەیە، شوێنکەوتنی ئەوانەو بەڕاستزانینیان، بێئاگاییو نەفامییە، هەرکەس لەو جۆرە کارانە بکاتو خراپەو بێباوەڕییە.

گرنگ ئەوەیە، تێبگەین، کە هەر ڕاڤەو تێگەیشتنو کارێك، پێچەوانەی ڕێبازە بنەڕەتییەکانی ئیسلام بێت، وەرناگیرێت، ئەو کەسەی لافی تواناو زانینی پەنهان لێدەدات، لافلێدانەکەی قبوڵ ناکرێ، هەرگیز لەگەڵ بەرنامەی زانستیانەی دروستی ئیسلامو فراوانییەکەی ڕێك ناکەوێ، هەرگیز ڕێك ناکەوێ لەگەڵ ڕووداوو گێڕراوەکانو ژینگە زانستییو لایەنەکانی کاتو شوێنی ئیسلام.

سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی راشدین
هاوەڵان: سەرکردایەتیی سیاسیی فیکریی
(یەکێتی سەرکردایەتیی فیکریی و سیاسیی)

دەوڵەتی ئومەوی
پەرتبوونی سەرکردایەتیی بۆ سیاسیی و فیکریی

سەرکردایەتیی سیاسیی هۆزگەرایی

سەردەمی ئومەوی
پەرتبوونی سەرکردایەتیی بۆ:
سەرکردایەتیی سیاسیی هۆزگەرایی و
سەرکردایەتی فیکری قوتابخانەیی پیشەیی

شێوەی (٥)

لەبەر ڕۆشنایی گشتگیریی‌و مەبەست ڕێبازو بۆچوونەکان‌و لەبەر ڕۆشنایی تواناو بەرەنگاربووەنەوەکاندا، هەروەها لەبەر ڕۆشنایی دەردو نەخۆشییەکاندا، کە ئەم ئوممەتە پێوەی دەناڵێنن، دەبێ ئەوپەڕی هەوڵ لەم بوارەدا بدرێت، دەرگا دابخرێت بەڕووی ساحیرو فاڵچیی‌و ئەوکەسانەی لەو جۆرەکارانە دەکەن‌و هەموو ئەوانەی، کە کۆسپ دروست دەکەن لەبەردەم گیانی زانستیی‌و هۆکاریێتیدا، هێزی باوەڕو پشتبەستنی ئیسلامی بەجۆرێك بێت تا کون‌و کەلەبەر نەمێنێتەوە، ئەو جۆرە کەسە فێڵبازانە، ڕەشەبای خورافەتیی پیابکەن‌و ژەهری چاوبەستکردن بکەن بەگیان‌و عەقڵ‌و دەروونی لاوەکانداو تەنها بەباوەڕی ڕاست‌و دروست، شارستانییەت بنیات دەنرێت‌و گەلان پێش دەکەون.

## تێکچوونی شەشەم: دەمارگیریی "وازی لێبهێنن، چونکە بۆگەنە"

لە مەککەی پیرۆز گەورە بووم، لە ناو ژینگەی مەککە چاوم کردەوە، بەسەر هەموو ڕەنگەکانی مرۆڤ وا ڕەگەزەکانیان، لە ماڵ‌و لەدراوسێ‌و لە گۆڕەپانی حەرەمی ماڵی خواو لە دالانەکانیدا، ئەوان لە منن، منیش لەوانم، لەڕووی مرۆڤایەتیی‌و نیشتمان‌و ئایین، جیاوازیی ناکات لە نێوان کەسێك‌و کەسێکی تر، مەگەر لە ڕووی سیفات‌و تایبەتمەندییەوە نەبێت.

ئەم منالە لە ماڵ‌و قوتابخانەو ماڵی خوا قورئانی خوێندووە، کۆمەڵێ لە پەرتووکە بنچینەییەکان‌و دەقەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوێندووە، دڵ‌و عەقڵی بە ئایەتەکانی خواو ماناکانیدا دەگەڕا، لە یەکبوونی مرۆڤ، برایەتیی مسوڵمان، چاکەی خزم‌و کەس‌و کار بەرامبەر بەیەکتر:

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء: ١ ).

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) (الحجرات: ١٣ ).

(وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ) (الروم: ٢٢ ).

(وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ) (النساء: ٥٨ ).

(وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى) (الأنعام: ١٥٢ ).

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ) (النساء: ١٣٥ ).

(لاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) (المائدة: ٨ ).

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: "كلكم لآدم، وآدم من تراب، لافضل لعربي على أعجمي ولا عجمي على عربي الا بالتقوى".

دەشفەرموێت: "لايأتني الناس بأعمالهم وتأتوني بأنيابكم".

هەروەها دەفەرموێت: "يا فاطمة بنت محمد إني لا أغني عنك من الله شيءا".

له فەرمودەیەكی تردا دەفەرموێت: "لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها"

بەهەمانشێوە دەفەرموێت "المسلم أخو المسلم لايظلمه ولايسلمه، وكان الله في عون العبد ماكان العبد في عون أخيه".

هەروەها دەفەرموێت "المسلم للمسلم كالبنيان يشد بعضه بعضا".

هەروەها دەفەرموێت "مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم مثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى".

منداڵەكەش دەیخوێندەوەو دەگەڕاو بیریشی تەماویو سەرگەردان بوو، له مێژووی ئوممەتو كێشەكانیو كێشەی هۆزو گەلو ڕەگەزو ڕەنگەكان، هەروەك ئەوەی كە له ئەندەلوس قەوما، ئەندێشەی له مانای هۆزایەتیو دەمارگیریو نەتەوەییو ڕەگەزایەتی تێنەدەگەیشت.

تا گەورەبوو، خۆری منداڵیو پاكیەتی كۆچی كرد، منداڵەكە زەوی ناو مەككەی بەجێهێشتو چووە ناو فەزای دوورگەی عەرەبو وڵاتە عەرەبییەكان، پاشان هەموو زەوی له ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە گەڕا، دیتی خەڵكی چەندین ڕەگەزو تیرەو هۆزو گەلو نەتەوەو زمانو ڕەنگو سنوورو كۆتو غەریبیو ترسو ڕقلێبوونەوەن، ئیتر منداڵەكە قووڵیی كارەساتەكانی ئوممەتی ئیسلامیی بۆ دەركەوت، مانای ناڕەحەتییەكانی هەست پێكردو هۆكارەكانو دووری ڕۆڵەكانو

گەلەکانی لە پەیامی ئیسلامەوە بۆ دەرکەوت، پاشان پەیوەندیی ئیسلامو چەمكو ڕەفتارو ڕۆشنبیریو گیانی ئیسلامیی هەستپێکرد.

ئیسلام پەیامی یەکێتیی مرۆڤ و جیهانەکەی هێنا، کە هەمووی یەك بەشەو پارچەپارچە ناکرێتو لە چاکیەتی کاکڵەو ناوەرۆکی ئەم پەیامە: گیانو ڕەوشتو دادپەروەریو هاوکاریو بەزەیی تیا ڕەنگ دەداتەوەو لە کۆمەڵگەی ئەم پەیامەشدا، کۆمەڵگەی یەکتاپەرستو برایەتییو دادپەروەرییو بەزەیی، کە دوورە لە (گەنیوێتی نەفامی) لە دەمارگیرییو ڕەگەزپەرستییو هۆزایەتییو گەلایەتی تیا دەردەکەوێت، کە مرۆڤ برای یەکنو یەك نیشتمانو ناوەڕۆکیان هەیە، ئا ئەوە بنەمایە، ئەو بنکەیەیە کە مرۆڤ بە گیانو ناوەڕۆك لەسەری جێگیر دەبێت، مرۆڤێكو مرۆڤێکی تر جیاوازیان نییە بە تەقوا نەبێت، یان بەرپرسیارێتییو گەیاندنی سپاردە.

پەیامی ئیسلامو ڕەوشتی ئیسلامو ڕۆشنبیری ئیسلام، پەیامی یەکتاپەرستیو برایەتییو دادپەروەرییو بەزەیی، بازنەکانی سەر بە مرۆڤایەتی لەناو یەك دەروونددا چوون بەناویەکدا بۆ بەزەییو ئایینو مرۆڤایەتی، بەگیانی دادپەروەریو چاکەکردن، وە هەموو مرۆڤ دەگرێتەوە، هیچ نامۆ نییە کە ڕۆڵەکانی پەیامی ئیسلامو بەرەی ئیسلامو پەیامەکەی خاوەنی بەرزترین سیفەتی خۆشەویستیو بەخسندەیی بن (وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (الحشر: ٩ ).

## دەمارگیریی ڕەگەزپەرستیی پیسبوونی باوەڕیو ڕۆشنبیرییو کۆمەڵایەتیی ترسناکە

گرنگە جیاوازییی بکەین لە نێوان دەمارگیرییو ڕەگەزپەرستیی نەفامیی لە نێوان بەجێهێنانی بەزەیی ئیسلامی، دەمارگیرییو ڕەگەزپەرستیی نەفامیی سیفاتی ئاژەڵە، جیاوازیی ستەمکردنە، ئەمە وەك سیلەی ڕەحمی ئیسلامیی

نییه، كه بەزەیی‌و گەیاندن‌و بەخشینە، كە تیایدا بەهێز دەستی بێهێز دەگرێت، گەورە هی بچوك.

پەیوەندیی بەزەیی ئیسلامی، بەخشین‌و پێدانە، ستەم‌و خراپەی تێكەڵ نابێت، پەیوەندیی‌و بەخشینە لە مسوڵمانەوە بۆ برای نزیكی خۆی، ماڵ‌و دەروونی بۆیان دەبەخشێ، چاودێرییان دەكات، ئەمە دەمارگیریی‌و ڕەگەزپەرستیی نییە، كە تاك لە دەمارگیرییدا پەنادەباتە بە ستەمكردن لە مافەكانی خەڵكی، جێگەی هاوشێوەو هاوخوێنەكەشی دەكاتەوە لەسەر حسابی خەڵكی تر، نەك بۆ حەق‌و نەك بۆ لێهاتوویی، بەڵكو لەبەر خزمایەتی‌و پەیوەندی ڕەگەزایەتیی، ئەوەی كە هی خۆیان نییە دەیبەخشن‌و مافی خۆیان نییە، ئەمەش جیاوازیی‌و ستەم‌و كینە بڵاودەكاتەوە، یەكێتیی‌و برایەتیی‌و لێهاتوویی گەیاندن لەناو دەبات، ئەمە دەبێتە هۆی هەموو لاوازیی‌و كێشەو خراپەو بەفیڕۆدان‌و ستەمكردنێك.

لەبەرئەوە، ئەوەندەی ئیسلام دژی دەمارگیریی‌و ڕەگەزپەرستییەو ئەوەندەی ئەوەی كە ماناكانی دادپەروەریی‌و برایەتیی مرۆڤیی دووپات دەكاتەوە (وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ) (وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى)، هەمیشە وەسییەت دەكات بە بەجێهێنانی بەزەیی‌و داوای چاكە دەكات لەگەڵ خزم‌و كەسدا، ئەمەش بۆ پتەوكردنی پەیوەندییەكانی مرۆڤایەتییە، بۆ بڵاوكردنەوەی گیانی خۆشەویستی‌و یارمەتی‌و پەیوەندییەكانی كۆمەڵگەیە، بەڵكو ئیسلام ئەو پەیوەندییانە فراوان دەكات‌و برایەتی شیریی دروست دەكات، مافی خزمیی دراوسێ فراوان دەكات، هەموو ئەو پەیوەندییانەش، پەیوەندیی برایەتیی‌و بەزەییەو ستەم‌و دوژمنكاریی لەگەڵ نییە، هەر لەبەر ئەوە بوو هەڵگەڕانەوەو پاشگەزبوونەوەی هۆزایەتیی‌و گەلایەتی‌و دەمارگیریی‌و ڕەگەزپەرستیی –لەگەڵ ڕووخانی جێنشینایەتی ڕاشیدین (الخلافة الراشدة) زاڵبوونی عەرەبی خێڵەكی‌و هۆزەكان بەسەر سوپای ڕزگاركاری ئیسلام– بووە هۆی پیسبوونی ڕۆشنبیریی‌و كۆمەڵایەتیی ترسناك‌و گیانی نەفامیی داكوتاو بۆگەنی هۆزایەتیی‌و دەمارگیریی لە نێوان ڕۆڵەكانی ئوممەتی ئیسلام بڵاو بوویەوە، چناوی كۆمەڵایەتیی‌و ڕامیاریی دڕاندو كردی بە پاروویەكی چەورو خستییە بەردەم چاوچنۆكەكان.

ڕەگەزپەرستیی دەمارگیریی دادەنرێت بە ترسناکترین شێوەکانی لادان لە بیروباوەڕو فیکرو پیسبوونی ڕۆشنبیریی، ئوممەتی پارچەپارچە کرد، تا وایلێهات خوێنی مرۆڤ بوو بە چەند ڕەنگێكو ئوممەت بوو بە چەند چینو پلەیەك، لە ئاستی کۆمەڵەکاندا بوو بە چەندین نەتەوەو گەلو هۆز، لە ئاستی تاکیش بوو بە خوێنو خزمایەتی، ئەم جۆرە کەشو هەوایە، بووە مایەی هۆکارەکانی لووتبەرزییو خۆبەگەورەزانینو دەسەڵاتدارىو ستەمکردن، ئوممەت کەوتە هەڵدێری کەندەڵانەکانو لە کێشەو ڕقو پارچەپارچەیی.

هەروا بە هەوانتە نییە، کە یەکێ لە پایەکانی ئیسلام –حەج– لە ڕاستیدا هێمای یەکێتییو برایەتیی مرۆڤایەتییە، ئەمەش بە تەواوییو ئاشکرا بەوکاتەدا دەردەکەوێ، کە هەموویان یەك جۆرە جلوبەرگ دەپۆشن، لە شاخی (عەرەفە) دەوەستن بەسەری ڕووت، دوو پارچە قوماشی سپیدا، جیاوازیی نییە لە نێوان گەورەو بچوك، هەژارو دەوڵەمەند، بەهەر زمانێك دەدوێ، بە هەر ڕەنگێك لەدایکبووبێ، هەموویان بران، هەموویان لە ئادەمن، هەموویان لە سەرەتاوە تا کۆتایی مرۆڤن.

لە ئەنجامی ئەوەی، کە ڕەگەزپەرستیی دەمارگیریی یەکێکە لە ڕواڵەتەکانی پیسبوونی ڕۆشنبیریی، هەروەها ڕواڵەتێکە لە ڕواڵەتەکانی دروستبوونی بۆشایی گیانیو ملهوڕی شەیتان، ئەمەش دژی سەرەکییە بۆ یەکێتییو تەواوکارىو یارمەتیو هاوکارىو بەزەییهاتنەوەی مرۆڤەکان لە هەموو ئاستەکاندا بەیەکتردا، پێچەوانەی ماناکانیو باوەڕو لەخواترسانە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْراً مِّنْهُمْ) (الحجرات: ١١ ).

دەبێ دووبارە خوێندنەوەیەکی ژیانمان بکەین –لەسەر بنیاتی چەمکەکانی سەردەمی پێغەمبەرایەتیو کردارەکانی سەردەمی پەیامەکە– پوختەی بکەینەوە لەتێگەیشتنی خراپو ڕاڤەی خراپ، پاکی بکەینەوە لە فرتو فێڵی خاوەن مەبەستەکانو ئەو هەڵە زۆرانەی کە لە لایەن ئەو بیروباوەڕ نەخۆشانەوە دروست بووە.

دەمارگیریی بە لاشەکردنێکی ناشیرینە (تجسد قبيح) بۆ تێکدانی تێڕوانینی ئیسلامو ڕەوشتەکانی لەم شەریعەتە ڕووناكو ڕۆحانییەدا، کە تیایدا یەکێتییو

برایەتیی‌و هاوکاریی‌و یارمەتی تیا دەردەکەوێت —لە ڕووبەڕووبوونەوەی شەریعەتی ستەمی دارستان‌و ئاژەڵی، کە تیایدا جیاکاری‌و جیاوازیی‌و دڵڕەقیی‌و دڕندایەتیی تیایە— لە شەریعەتی نورو ڕووناکیدا حەق هێزێکی پاکی ڕەقی خاوەن بەرەنگارە دژی کەڵبەو چڕنووك‌و ماسولکەکان.

## جیهانی حەق‌و ڕووناکیی‌و جیهانی دارستان‌و تاریکیی

هێز بواری جیاکاریی نییە لە نێوان جیهانی هەق‌و ڕووناکیی‌و جیهانی دارستان‌و ستەم‌و تاریکی، بەڵکو جیاوازیی لە نێوانیاندا لە شوێنی بەکارهێنانی هێزە لە لایەن هەردووکیانەوە، ئیتر هی حەق بێت، یان بەتاڵ؟ هی چاکە بێت، یان خراپە، هی داد بێت یان ستەمکردن، هی بەزەیی‌و سۆز بێت، یان زۆردارییکردن، هی برایەتیی بێت، یان جیاوازیی، بۆ بە بەندەکردنی خەڵك بۆ خوا، یان کۆیلەکردنی خەڵك بۆ دروستکراوەکان‌و سەرشۆڕکردنیان.

یەکێتیی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤ و برایەتیی مرۆڤو بەزەیی هاتنەوەی مرۆڤ، لەچەرخی جیهانییەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی، لە چەرخی ئەو یاساو وزانەی کە خوا ژێرباری کردووە بۆ مرۆڤ، ئەمە ناوەرۆکی پەیامی ئیسلامە بۆ جیهان، بەم پەیامە برایەتیی‌و تەواوکاریی‌و هاوکاری‌و هەق‌و ڕووناکیی پەیدا دەبێ، بەبێ ئەم پەیامە ستەم‌و زۆرداریی‌و کێشەو وێرانە دروستدەبێت.

ئەگەر هەرداریك بەری خۆی هەبێت، ئەوە بەری داری یەکتاپەرستیی بریتییە لە برایەتیی‌و دادو هاوکاریی، ئەگەر هەموو شتێك دژێکی هەبێت، ئەوا دژی یەکتاپەرستیی بریتییە لە جیاوازیی دەمارگیریی‌و خۆبەبەرزدانانی ڕەگەزیی.

نە چاکەو نەدادو نە ئاشتی لە زەوی ئیسلامدا، بە تایبەتی‌و لە زەوی مرۆڤایەتییدا بە گشتی نییە، بە برایەتیی‌و بەزەییهاتنەوە بەیەکتردا نەبێت لە نێوان مرۆڤەکاندا، لەبەرئەوەیە لەو کۆمەڵگەو شارستانییەتەی کە پیس بووە بە (بۆگەن) بوونی جیاوازیی ڕەگەزایەتیی‌و دەمارگیریی هەمەچەشنەکان.

(كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْراً لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ) (آل عمران: ١١٠ ).

(إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ) (الأنبياء: ٩٢ ).
(وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ) (آل عمران: ١٠٣ ).
پێغەمبەری خواش (ﷺ) ڕاستی فەرمووە: "ليس منا من دعا الى عصبة، وليس منا من قاتل على عصبة وليس منا من مات على عصبة". راوه أبو داود في السنن /٤٤٥٦.

ئەگەر ئەمانەوێ –بە ڕاستیی– هەستو چەمکەکانی ئوممەت بگەڕێتەوە، ئەگەر دەمانەوێ یەکێتیی‌و سەرخستن‌و پشتی یەکترگرتن‌و هاوکاریی بگەڕێنینەوە، ئەگەر دەمانەوێ سەرکەوین بەسەر هۆکارەکانی جیاوازیی‌و پەرتبوون‌و کێشەکاندا، ئەگەر دەمانەوێ باوەڕو یەکتاپەرستیی‌و دادو هاوکاریی‌و پشتی یەکترگرتن –بە ڕاستیی– ئایین بنەمای دەوێ، هەموویان بە ویژدانمان بێت، ئەگەر تواناو سەربەرزیی‌و هێزمان دەوێ، هەموویان بە ویژدانی برایەتیی ئیسلامیی دەستپێدەکات، بە پاکردنەوەی ڕۆشبیریی‌و پەروەردە لە ژەهری جیاوازییکردن‌و دەمارگیریی‌و ڕەگەزپەرستیی، بەم جۆرە ئوممەت یەکپارچەو بەهێز دەبێت لەناو چەند بازنەیەکی لە ناو یەکتر لەسەر ماناکانی بەزەییهاتنەوەو نزیکبوونەوەو هاوکاریی‌و پشتی یەکترگرتن[1]، ئەمەش لە تاک‌و خێزانەوە دەستپێدەکات‌و بەناو خزم‌و هۆزو گەلدا تێدەپەڕێت، تا دەگاتە ئوممەت‌و مرۆڤایەتیی لە چاکەکردن‌و بەزەیی‌و برایەتیی، نەك ستەم‌و داپڵۆسین‌و خۆبەگەورەزانین.

گیانی یارمەتیی‌و هاوکاریی لەسەر حەق لە نیشانەی مرۆڤە ئازاکان‌و چاکەکارەکان‌و ئازادیخوازە بەڕێزەکانە، لە ویژدانەوە هەڵدەقوڵێ، لەخاکی منداڵییەتی خاوێن‌و شەرم‌و ناسك‌و بەپیتەوە دەبێتە چڵێکی بەهێزو ڕەق‌و بەردارو هەمیشە بەبەردەبێت.

دەبێت تێڕوانینی یەکتاپەرستیی‌و سۆزو برایەتیی‌و بەزەیی‌و یارمەتیدانی یەکتر، لەناو ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوە ئیسلامییەدا بڵاوببێتەوە، بە بێ سەرپێچیی‌و

---

[1] روى البخاري أن رسول الله (ﷺ) قال: "أنصر أخاك ظالما أو مظلوما، قالوا يا رسول الله هذا ننصره مظلوما، فكيف ننصره ظالما؟ قال تأخذ فوق يديه" صحيح البخاري / ٢٢٦٤.

بڕینی پەیوەندیی ڕەحمە، دەبێ لە سەرووی لیستی کارەکانی بیریارەکاندا لەناوبردنو زاڵبوون بەسەر میکرۆبی دەمارگیریی‌و ڕەگەزپەرستیی لە هەموو کارێکی تر، زیاتر گرنگیی پێبدرێ، باوکانو پەروەردەکارانیش لەم ڕووەوە گرنگیی تەواو بدەن پێی، چونکە دەمارگیریی‌و ڕەگەزپەرستیی دەبێتە مایەی وێرانیی‌و ستەمو لاوازیی‌و کێشەو پارچە پارچەبوونی ئوممەت.

(قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُمُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ) (يونس: ١٠٨ ).

سەرکردایەتییەکی فیکریی ڕامیاریی یەکگرتوو کارامە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتیی و جێنشینایەتیی ڕاشیدیندا

دابەشبوونی سەرکردایەتی

لێکدوورکەوتنەوە

سەرکردایەتییەکی ڕامیاریی خۆسەپێن

سەرکردایەتییەکی فیکریی قوتابخانەیی تیۆری دوورەپەرێز

سەرکردایەتی

ئاسەواری دابەشبوونی ڕەقڵێبوونەوە

سەرکردایەتی ڕامیاریی: قەیرانی شەریعەتبوون، ستەم، بەفیڕۆدان، لاوازیی، ترساندنی ڕامیاریی.

سەرکردایەتی فیکریی: کەنارگیریی، قوتابخانەی تیۆریی، لاوازیی، تۆقاندنی ئاینیی.

ئوممەت

تێکچوونی دەزگاکانی دەسەڵات و ژیانی گشتیی، ناڕەحەتییەکانی ستەمی ڕامیاریی، دەستەوسانی لەپێشکەوتن و لەبەرەنگاربوونەوەی بەهەرڵستکارو گۆڕانەکان، لاوازیی فیکریی، لەڕووونی خوێندن و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان، پیسبوونی ڕۆشبیریی، وتاری ترسێنەری ئاینیی، وێرانبوونی شێوازەکانی پەروەردەو فێرکردن.

شوێنەوارەکانی دابەشبوونی سەرکردایەتی

لەسەر ئوممەت و دەزگاکانی بۆ

ڕامیاریی هۆزایەتیی و ئاینیی و قوتابخانەکانی تیۆریی.

شێوەی (٦)




ئاسەواری کەنارگیریی و پەککەوتەیی فیکریی

شێوەی (٧)

## شوێنەوارەكانی لادانی فیكریی لە بنیاتنانی دەروونی ئوممەت

شوێنەواری كێشەكان لە نێوان هەڵبژاردە فیكرییو هەڵبژاردە ڕامیارییەكاندا، كە بووە هۆی كەنارگیریی هەڵبژاردەی فیكریی، تەنها بەوەوە نەوەستا كە لە ڕووی كردارییەوە دووركەوتنەوەو نوقمبوون لە لایەنەكانی شێوەییو لەكاروباری ڕامیاریی كۆمەڵگەو ڕێككخستنی كۆمەڵایەتیی، یان گرنگیدانیان بە كاروباری تاكو ڕۆڵەكانی ئوممەت، بەڵكو گۆڕانكاریی گەورەی لە فیكری هەڵبژاردەی ڕامیارییو فیكری دوژمنایەتی بوو، بەرەنگاربوونەوەی ڕۆڵو دەسەڵات لای خەڵكی ئوممەت، ئیتر پەیوەندیی ڕۆڵو باسە سەرەكییەكانو تەواوكاریی لەنێوان هەردوو هەڵبژاردەدا، لەناوەرۆكی باسەكە ڕامیارییانە بوو، ئەمەش — پێویستیكرد— كە وتاردانی فیكرییو ئایینی لایەنێكی ڕامیاریی كێشەی بەردەوام دروست بكات، كە ببێتە هۆی دابەشبوونی ویژدانو هەستی ناخی ئوممەت، متمانەی —لەبەر چەند هۆیەكی جیاواز— بە سەركردایەتییە ڕامیارییو ڕژێمە كۆمەڵایەتییەكەی نەما، كە لەسەر ستەمو زۆرداریو دەمارگیری بنیاتنرا.

گرنگترین بەروبوومە تاڵەكانی ئەمە لەسەر فیكری ئیسلامییو گرنگیپێدانی زاناكان، دیارنەمانی لایەنی پەروەردەیی دروستو ئامێری ڕۆشنبیرییو بەرنامەییو تیۆریو كرداریی بوو، لەگەڵ دواكەوتنی دەزگاكانی پەروەردەو فێركردن، ئەمەش بووە هۆی پەیدابوونی جۆرێك لە زانیارییو پەروەردە، كە پشكی گەورەی هەبوو لە تێكشكانی ڕێساو بنەما دەروونییەكانی، كە بنیاتی كۆمەڵگەو ئاوەدانییو شارستانییەتی ئوممەتی لەسەر بنیات دەنرێت.

وتاردانی ترساندنو ڕامیاریی ترساندن، ئەو بەروبوومە نەفرین لێكراوە بوون بۆ پەككەوتن، كە دووچاری هەڵبژاردەی فیكرییو ڕامیاریی مسوڵمان بوون، چونكە تۆقاندن —كە لەو وتاردانانەدا خۆی دەبینییەوە— هۆكاری بێدەسەڵاتیی بۆ دەستبەسەراگرتنی هەڵوێستەكان بوو، ئەوەی تۆقاندن بەكاردەهێنێت باباكانی جوڵەو كلیلەكانی سووڕانەوەی یاساكان نازانێت، زۆربەی خەڵكی ئوممەت —ئەوانە سووتەمەنیی كێشەی ڕامیاریی بوون— لە نێوان هەڵبژاردەی فیكرییو هەڵبژاردنی ڕامیاریی، كە هەموو هەوڵێكی پاراستنی پلەوپایەو

ڕاکێشانی دڵسۆزیان بوو بۆ خۆیان، تا هەموویان بچنە ژێر دەسەڵاتی ڕامیارییەوە.

بنەمای گرفتەکە بووە هۆی لادانی ڕێڕەوی پەیامی کۆمەڵگەی ئیسلامو لاوازیی هۆکاری پەروەدەیی ئیسلامیی بوو لە دروستکردنی ئەو خێڵەکیانە، کە لە ئایینەوە دووربوون، کە پێشتر دەکرانە سەرباز لە سوپای ڕزگارکردنی مسوڵمانانداو، لاوازیی ئامادەکردنو پەروەردەو ئاڕاستەکردنی، ئامێرێکی خراپ بوو، دووبەرەکیی وروژاندو دەوڵەتی جێنشینایەتیی ڕاشیدەی ڕووخاند، فیکری هۆزایەتی پەیدابوو، بووە هۆی بنیاتنانی پادشایەتییەکی توندوتیژ بە هەموو ئەو مانایانەی، کە فیکری هۆزایەتیی هەڵیدەگرێ —لە دواییشدا گەلایەتی— لەکاریگەرییەکانی بیروباوەڕو گۆڕانە ڕامیاریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابوورییەکان، بۆ نموونە هەموو ئەو بەڵگەنامانەی بەخشینی زەوی لە سەردەمی دەوڵەتی پەیامی ئیسلامداو لە سەردەمی پێغەمبەردا، کە دەدرانە هەرکەس بۆ ئەوە بوو، تا ئەو زەویانە بەکاربهێنرێن، نەك بکرێن بە موڵکی کەس، هەموو ئەو بەڵگەنامانە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا سووتێنران، تا ئەو زەویانە ببنە موڵکی تاكو گەورەو خێزانەکان[1]، ئەمەش قوڵیی گۆڕانو لادانەکانو فراوانبوونی بوارو دووپات دەردەخات لە ڕامیارییەکانی سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی ڕاشیدین، قورئان ئەو بارەی ڕۆشن کردووە، کە عەرەبە خێڵەکییەکانی تیا بوو لە لاوازیی‌و سەرەتای شارستانییەتی لە بواری بیروباوەڕو پەروەردەییەوە، ئەمەش ئەوەی دەخواست، کە دووبارە پەروەردەبکرێنەوە بە جۆرێك کە بگونجێت لەباری دەروونیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و شارستانییەتدا، هەر لەبەرئەوە، سەرەتا بتپەرستییە کۆمەڵایەتییە شارستانییتەکەی لێوەرنەگرتن، کە شیاوی مرۆڤ نەبوو، دەبوو بێنە ناو کۆمەڵگەی ئیسلام:

---

[1] بڕوانە: Habibul, Sayed "A Historical Survey of Land Tenuve and Land Revenue Administvation in some: Muslimes Counfries with speciadl Reference to pesia, in the contemporavy Aspects of Economic and social Thinking in Islam. The muslim students Association of USA and Canada planfield ind, USA١٩٧٠..

(قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ) (الحجرات: ١٤ ).

(الأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْراً وَنِفَاقاً وَأَجْدَرُ أَلاَّ يَعْلَمُواْ حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى رَسُولِهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (التوبة: ٩٧ ).

(كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللّهِ وَعِندَ رَسُولِهِ إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ فَمَا اسْتَقَامُواْ لَكُمْ فَاسْتَقِيمُواْ لَهُمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ* كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لاَ يَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَى قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ* اشْتَرَوْاْ بِآيَاتِ اللّهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِ إِنَّهُمْ سَاء مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ* لاَ يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ* فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ* وَإِن نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُواْ أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لاَ أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ* أَلاَ تُقَاتِلُونَ قَوْماً نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّواْ بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَؤُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤُمِنِينَ) (التوبة:٧– ١٣ ).

(الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ) (الأنفال: ٥٦ ).

لەبەرئەوە لە سەرەتاوە ئایینی ئیسلام ئەو عەرەبە خێڵەکیانەی فێری پەروەردەو خوێندن کرد، نوێنەری خوێندەوارو فێرکردنی نارد بۆ ناوچەکانیان‌و ماڵەکانیان، بەڵام ئەو هەموو هەوڵو ڕامیارییانە بە هۆی کۆسپی سەربازیی فارس‌و ڕۆمەکانەوە، کە چواردەوری ئیسلامیان دابوو، لە خۆرهەڵات‌و خۆرئاواوەو مسوڵمانەکانیان دەچەوساندەوەو ڕێگرییان دەکرد لە حەقی خەڵك‌و نەیاندەهێشت ئایینی ئیسلام وەربگرن‌و هەمیشە شەڕیان بە مسوڵمانەکان دەگێڕاو ئامادەکارییان دەکرد بۆ وێرانکردنی دەوڵەت‌و کۆمەڵگەی ئیسلام‌و گێڕانەوەی عەرەب بۆ نەفامیی کۆن‌و ملشۆڕکردنیان بۆ دەسەڵاتی خۆیان.

بەمجۆرە کێشەی ڕامیاریی، دەرەکیی‌و ناوەکیی، بووە هۆی پشتگوێخستنی وڵاتانی ئیسلام لە ڕووی پەروەردەییەوە، هەروەها بووە هۆی پشتگوێخستنی لایەنی زانیاریی مرۆڤایەتیی کۆمەڵگە لە ڕووی لێکۆڵینەوەی سروشت‌و ڕووداوەکان‌و گۆڕانکارەییەکانی کات‌و شوێن، بەمەش گرنگیی منداڵ‌و

پەروەردەکەی کە بنەمای گۆڕانکارییەو ڕێگای پێ ڕاستدەکرێتەوە، هەستی پێنەکرا، چونکە منداڵ بنەمای پێکهێنانی عەقڵی تاکو بنیاتی دەروونییە، پێویستە زۆر گرنگی بە منداڵ بدرێت، چونکە هۆکارێکی گرنگە بۆ هەستکردنو پڕکردنەوەی تێڕوانینی مسوڵمان، چاکەو گیانی هاوکارییو بەخشینی کۆمەڵی بکرێتەوە بە بەری کۆمەڵگادا، چونکە لە سەردەمە ڕابردووەکاندا خراپەو گوێپێنەدانو نەمانی ئازایەتیی وێژەییو بەکارنەهێنانی عەقڵو نەگەڕان بە دوای یاساکانداو تازەکردنەوەی وزەی ئوممەتو دەزگاکانیو بەرزکردنەوەی تواناکانی، هەموو ئەمانە بە گرنگیدان بە چاودێرییکردنی منداڵ دێتەدی.

بەمجۆرە بوار نەڕەخسا بۆ عەقڵی مسوڵمان، کە دەیناڵاند بەدەست ستەمو ترساندنو نوقمبوون لە لایەنە بەشییو تیۆرییەکاندا، تا ڕووبەڕووی تێکچوونەکان لە کەسایەتی مسوڵمانو لادانی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەکان، تێبگات لە منداڵو چاودێریی بکاتو زانیارییەکانی پەروەردەی منداڵو جۆری ڕۆشنبیرییەکەیو لێکۆڵینەوە دەروونییەکەیو هۆکارەکانی گەشەی کەسایەتییو عەقڵیو تواناکانی بخاتەڕوو، بیکاتە باسێکی ناوەندیی زانستیی، کە تیایدا هەوڵو لێکۆڵینەوەو چاودێریی هەبێت، بۆ ناسینی سروشتو یاساکانو کلیکی نهێنییو شاراوەکانو وزەکانی دیاریی بکرێت، شێوازەکانو تواناکانو ئامانجە گونجاوەکان لەگەڵ پێویستییە پێشکەوتووەکان هەماهەنگ بکرێت.

ئەم کورتبینییو پشتگوێخستنە، بە گرنگترین هۆکاری ڕاستەقینە دادەنرێت، کە ڕاڤەی دواکەوتوویی ئوممەت دەکاتو چاککردنەوەی سەختەو هەستانەوەی لەم ڕۆژگارەدا کارێکی زۆر گرانە، ئەمەش سەرکەوتوویی تواناکانی ڕاپەڕینی نوێی ئەورووپا نیشان دەدات کە —لە ژێر تیشکی تێڕوانینە بوونەوەرییو زانستییە لیبرالیە نوێیەکەیداو بەرنامەکانی زانیاریی هەستو ژیریی— توانیی لە باسی پەروەردەیی، کە بنیاتنراوە لەسەر بنەمای زانستی ئەزموونگەریی، ڕاپەڕینەکەی دابمەزرێنێت، بیکاتە بەردی بناغە لە پێشخستنی وزەکانیدا.

# بەشی سێیەم

# منالٚ: بنکەی دەرچوونە (قاعدة الأنطلاق)

لە تێبینییەکانی پێشوو دەربارەی کەموکورتیی لە ڕێڕەوی ئوممەتی ئیسلامو ئەو ئاستەنگانەی، کە هاتنە ڕێی لە لادانو تێکچوونەکان، دەبێ لە بیرمان نەچێت لەگەڵ ئەو هەموو بارودۆخە ناهەموارەدا، ئیسلام بەخشینو کاریگەریی بەردەوامی لەو هەموو چەرخانەدا هەبووەو بنکەی ئیسلامەتی مرۆڤایەتیی فراوان بەردەوام بەناو دەمارەکانیدا هاتوچۆی کردووە، لەگەڵ هەندێ جیاوازیی لەنێوان کاتێكو کاتێکیترداو وڵاتێك لەگەڵ وڵاتێکی تر، بەگوێرەی باری هەموو وڵاتو بەرەیەك —ئەمە پاش ئەو ماوە کەمەی گیانی ئیسلام بووە هۆی مانەوەی قەوارەو پێناسی ئوممەتی ئیسلام، لە هێزو وزەو ڕەوشتو مەبەستە بەرزەکان، ئەگەر بەراورد بکرێت —بۆ چەندین چەرخ— لەگەڵ گەلە بتپەرستەکانو نەفامەکاندا لە دەوروبەری ئوممەتی ئیسلام، ئەمەش وایکرد، کە ئوممەتی ئیسلام —لەگەڵ ئەو هەموو تێکچوونو لادانانە، کە تووشی عەقڵو دەروونو ڕێکخستنەکەی بوو— ئوممەتی باڵاو شارستانییەتی بڵند بێت، هێزی هەرەگەورە بێت بۆ ماوەی چەندین سەدە، کە تیایدا زاناکانی ئیسلامو بیریارەکانو پیتۆڵەکان، چەندین جۆر ئاسۆی نوێو پێشکەوتنو بڵندییو داهێنانی زانستو شارستانییەت، پێشکەش بە مرۆڤایەتیی بکات، مرۆڤایەتیی تا ئەمڕۆ قەرزاری بەرنامەی زانستی ئەزموونگەرییو دەستکەوتە شارستانیەتییە گەورەکانی ئیسلامە، شارستانییەتی مرۆڤایەتیی ئەم ڕێڕەوەی ئەمڕۆی نەدەگرتەبەر، نەدەگەیشتە ئەم ئاستەی ئێستا، ئەگەر کەلەپووری زانستییو شارستانییەتیی ڕەسەنی ئیسلام نەبوایە، هەموو ئەوانە نابێ وامان لێبکات، نەگەڕێین بەشوێن هۆکارەکان، کە گیانی پاڵنەری ئیسلامیی لاوازکردو ڕێی خۆشکرد بۆ دواکەوتویی ئوممەتو تێکشکانی لە گەیاندندا، لە کاتێکدا، کە گەلانی تر بەرەوپێشەوە دەڕۆنو دەبوونە دەسەڵاتدار بەسەر باری داخراوی ئەمڕۆی ئێمەوە کە دەبینین.

زانایان‌و بیریارانی ئەم ئوممەتە بۆیان دەرکەوت، کە بنیاتی ئوممەت تووشی بارێکی ترسناك بووە، زیانی زۆری پێگەیاندووە، باری ناخۆش‌و دواکەوتوویی‌و پارچەپارچەیی بەجۆرێکە، کە دەبێت هەوڵی زۆر بدرێت بۆ چاککردنی ئەو بارەو ڕاستکردنەوەی، بەڵام ئەوەی جێیداخە ئەو هەوڵانە، ئەگەرچی بووەتە هۆی سووککردنی ئەوەی کە زوو نەڕووخێ، بەڵام بەرگریی نەکردووە لە گەورەبوونی نەخۆشییەکە، تا وایلێهات ئەم ئوممەتە دواکەوت‌و هێزی ڕووخاو گەلان پێشکەوتن‌و ڕاپەڕین‌و دەستیانگرت بەهێزو بەرزێتی‌و گەورەییەوە.

## بزووتنەوەی چاکسازیی ئیسلامیی‌و پێویست بوون بە هەڵسەنگاندن

ئەگەر سەرنج بدەین لە مێژووی ئیسلام، کە هەوڵەکانی چاکسازیی زۆربووە، لە لایەن زاناو بیریارو سەرکردەو سوڵتانەکانەوە بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو، لەسەر چەندین بنەماو مەبەست بوو، وەك ئاییینیی، ڕامیاری، شارستانە، لە گرنگترین ئەو هەوڵانە هەوڵی ئەبو حامیدی غەزالی (ساڵی ٥٠٥ك، کۆچی دواییکردووە) بووە، کە هەوڵی ئەوەبوو، تا ڕێڕەوی فیکری ئیسلامیی ڕاست بکاتەوەو پاکی بکاتەوە لە ئەندێشەو فەلسەفەی ئیغریقی کە فیکری ئیسلامیی تێکدابوو، وزەی بە فیرۆدابوو لەو شتانەی، کە لە تێڕوانینی ئیسلامەوە جێگەی بایەخ نین، بووە هۆی پەرتکردنی هەوڵەکانی ژیریی مسوڵمانان، وایلێکرد عەقڵی لەکارخست لە کاروباری بینایی‌و ئاوەدانکردنەوەو جێنشینایەتیی لەم ژیانەدا، کتێبی (تهافت الفلاسفة) ئەم بارەی دەرخست‌و کتێبی (إحياء علوم الدين)ی نووسی، تا ئوممەت وزە گیانییەکەی بکرێتەوە بە بەردا، بە گەڕانەوەی پەیوەندیی ئەرێیی (الايجابية)و تێکەڵبوون لە نێوان زانستە شەرعییەکان‌و ویژدانی ئیسلامیی، هەروەها پاکردنەوەی عەقڵی زانستیی شەرعیی لە تێکچوونە فەلسەفییەکان‌و پابەندبوونی بە شەرعی ئیسلام –بە گوێرەی تێڕوانینی خۆی– بە دونیانەویستی ئیسلامیی، پاکبێت لە لادانە سۆفیگەرییە فەلسەفییە یۆنانییەکە، کە مسوڵمانان بە میرات لێیان وەرگرتن، ئەوەی جێیداخە ئەم

هەوڵانە سەرکەوتوو نەبوو، چونکە چاکسازییەکی بەرنامەیی ڕیشەیی نەبوو، هەوڵە چاکسازییە پێشەنگەکەی لە بازنەی دووروونەوەی فیکریی‌و تیۆریی مایەوە، داخوازییەکانی گۆڕانی ڕیشەیی فیکریی کۆمەڵایەتیی ئیسلامیی بەدینەهێنا.

دوای غەزالی، چەند بیریارو چاکسازێکی تر هاتن، وەك: ئیبن تەیمییە (٧٢٨ك، کۆچی دواییکردووە) ئبن حەزم، ئیبن خەلدون (١٤٠٦ز، کۆچی دوایی کردووە) لەو هەوڵە چاکسازییانە، ئەو چاکسازییە ڕامیاریی‌و کارگێڕیی‌و سەربازییە بوو، کە میرەکانی زەنکیی‌و سەلاّحەددینی ئەیوبیی کردیان، کە تا ئەندازەیەکی باش وزەو گیانی ئومەتی نوێکردەوە، سوپای خاچدروشمەکانیان شکاندو زەویە پیرۆزەکانیان لێ پاککردنەوە، بە هاتنی هۆزە تورکمانە خێڵەکییەکان، هێزو دەسەڵاتی ئیسلام خوێنێکی نوێی کرد بە جەستەی ئوممەتی ئیسلامدا، پاشان دەوڵەتی عوسمانیی ئاڵای ئیسلامی لە خۆرهەڵاتی ئەوروپا بەرزکردەوە، ئەگەرچی وڵاتی عەرەب‌و دراوسێکانی لە قۆناغی وەستان‌و سڕبووندا بوون، هەروەها دەوڵەتی ئیسلام لە ئیسپانیا بەردەوام بوو لەکێشەو ململانێی نێوان هۆزو تیرەو ڕەگەزەکان، تا ئیسپانییەکان توانیان بیانشکێنن، پاشان جیهانی ئیسلامیی لە سەدەی هەژدەهەمی زاینییەوە، نوقمی دواکەوتوویی‌و بێدەسەڵاتی‌و تێکشکان بوو، لە بەردەم هێزی ئەوروپییەکان‌و پاشەکشەی کرد، لێرەدا بەرەنگاربوونەوەی شاراوەو ئومێدی چاکسازیی‌و گۆڕان جووڵەی پەیداکرد لە ناو گەلانی مسوڵماندا، لەوانە هەوڵی (شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ١١١٥ –١٢٠٦ك) بۆ زیندووکردنەوەی فیکری ئیبن تەیمییە (٦١١– ٧٢٨ك)، بزووتنەوەی موحەممەدی کوڕی عەلی لە لیبیا (١٧٨٧– ١٨٥٩ز)، بزووتنەوەی موحەممەدی مەهدی لە سودان (١٨٤٣– ١٨٨٥ز)، بزووتنەوەی عەبدولحەمیدی کوڕی بادیس لە جەزائیر (١٨٨٩– ١٩٤٠ز) کە بزووتنەوەیەکی ئیسلامی چاکسازیی بوو، بنەمایەکی بەهێزی خەباتی گەلی جەزائیر بوو بۆ سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٦٢ز، هەروەها چاکسازیی سوڵتانەکانی عوسمانیی لە ڕووی شارستانیی‌و سەربازییەوە هەر لە سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩– ١٨٠٧ز) تا سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٤٢– ١٩١٨ز) هەروەها چاکسازییەکانی والی میسر (موحەممەد پاشا) (١٧٦٩– ١٨٤٩ ز) لە چاکسازیی

ئایینیی‌و ڕۆشنبیرییدا، هەروەها کارەکانی ئەتاتورک (١٨٨١– ١٩٢٣ز) لە تازەکردنەوەی تورکیا لەسەر شێوازی ئەوروپیی‌و لادانی شەریعەتی ئیسلام‌و لابردنی خیلافەتی عوسمانیی‌و ڕاگەیاندنی کۆماریی لە ساڵی (١٩٢٣ز)و دانانی یاسای سویسریی لە بری شەریعەتی ئیسلام، بزووتنەوەی پێشەوا (حەسەن بەننا لە ساڵی ١٩٤٩ کۆچی دواییکرد)، کە بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی، سیاسیی، چاکسازیی کۆمەڵایەتیی بوو، لە میسر گەشەی کردو وڵاتانی عەرەبی گرتەوە، بزووتنەوەی ئەبولئەعلای مەودودیی لە ساڵی (١٩٧٩ کۆچی دواییکرد)، ئەمیش بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی سیاسیی چاکسازیی کۆمەڵایەتیی بوو لە نیمچەکیشوەری هیند، جگە لە زنجیرەیەك لە بیریارو چاکسازانی وەك: (شاه وەلی اللەی دەهلەوی (١٧٦٣ز کۆچی دواییکرد)، زانای پایەبەرز موحەممەد ئیقبال (١٩٠٢ز کۆچی دواییکرد)، خێرەدین تونسی (١٨٩٠ز کۆچی دواییکرد)، عەبدوڕڕەحمانی کەواکبی (١٩٠٢ز کۆچی دواییکرد)، ڕەشید ڕەزا (١٩٣٥ز کۆچی دواییکرد)، سەید قوتب (١٩٦٦ز شەهید کرا) مالیك بن نەبی (١٩٠٥– ١٩٧٣ز)و زۆر زانای تر.

لەگەڵ ئەوەی، کە زۆربەی هەرە زۆری ئەو هەوڵ‌و بزووتنەوە چاکسازیی‌و گۆڕانکارییانە، کە هەمە چەشنەبوون، هەمووی ئاڕاستەی ئیسلامیی‌و شارستانییەکان لەلایەن بیروباوەڕو ڕامیاریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی گرتەوە لە مەبەستیاندا دروست‌و ڕاستبوون، بەڵام ئەوە ڕوون‌و ئاشکرایە، ئەوەیە، کە ئەو چاکسازو سەرکردەو بیریارانە –لەگەڵ هەموو هەوڵەکانیاندا، کە دایان‌و بەخشیان‌و سوودی هەبوو بۆ گەلانی مسوڵمان– بەڵام ئەوەی، کە ئاشکرایە دەستیان نەخستە سەر بنەمای دەردەکەو سەرچاوەی بەڵاکە، نەیانتوانی مەبەستەکانیان بەدیبهێنن‌و بە شێوەیەکی کاریگەر وزەی شاراوەی ئوممەت بجوڵێنن، هەروەها نەیانتوانی بنیاتی فیکریی، یان دەروونیی ئوممەت چاك بکەن‌و ئەو بۆشاییەی، کە هەیە لەنێوان ئوممەتی ئیسلام‌و گەلە پێشکەوتووەکاندا پڕبکەنەوە لە ڕووی توانای شارستانییەت‌و گەیاندنەوە[1].

---

[1] بۆ تێگەیشتنی ئەم بابەتە هزرییە بڕوانە کتێبی: أبو سليمان، عبدالحميد أحمد. أزمة العقل المسلم. الرياض: المعهد العالمي للفكر الإسلامي و الدار العالمية للكتاب الإسلامي ١٩٩٤.

لەبەردەم ئەم بارەدا، کە ئوممەتی ئیسلامیی تیایە، چارنییە دەبێ بڕیارو لێکۆڵەر بەردەوامبێت لە لێکۆڵینەوەو گەڕان، تا دەگاتە هۆی نەخۆشییەکەو هۆکارە گەورە کاریگەرەکان، پاشان هەوڵی چارەسەریان بۆ بدات، تا لاشەی ئوممەتی ئیسلام ساغ دەبێتەوەو ئەوکاتە بەخشینەکانی بۆ مرۆڤایەتی زۆر دەبێتو مافو لەشساغییو ڕێزو حورمەتی بۆ دەگەڕێتەوەو بەشدار دەبێت لە بنیاتنانی شارستانییەتەکەیدا.

## منداڵ سەربازی ون

ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەیبینین ئەوەیە، شتی وا نەماوە، کە فیکری چاکسازییو بزووتنەوە ئیسلامییەکان باسیان لێوە نەکردبێت بە شێوەیەکی جیددیی، بەڵام گرنگترین لایەنەکانو هۆکارەکان، کە دەبێ لای لێبکرێتەوە، بریتییە لە مەسەلەی منداڵ، کە هۆکاری بنەڕەتییە بۆ گۆڕانکارییو چاکسازیی، ئەوەش لەبەر توانای منداڵە بۆ لەباریەتی بۆ وەرگرتنی گۆڕانو مەرجەکانی چاکسازییو بزووتنەوەکانی چاکسازیی بانگەشەیان بۆ کرد، چونکە دووبارە تاکی مسوڵمان ئامادە دەکاتەوەو کۆمەڵگەی مسوڵمان سەرلەنوێ دەبێتەوە خاوەنی توانا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕووداوەکان.

ئەگەر فیکری مسوڵمان، تێڕوانینی هەبوایە لە کردارەکانی گۆڕانو گەشەو پێشکەوتن لە ڕووی دەروونییو جەستەیی منداڵ، ئەوکاتە ئەو فیکرەیە هەستی دەکرد بەلایەنی گۆڕانکاریی دەروونی مرۆڤ و تێگەیشتن لە بارو داواکارییەکانی، ئەوە چاکترین ڕێگەو پاڵنەر دەبوو بۆ گۆڕانکاریی بەرنامەیی زانستیی ئیسلامییو پاککردنەوەی ڕۆشنبیریی ئیسلامییو بنیاتنانی زانستە مرۆڤایەتییە کۆمەڵایەتییە پەروەردەییەکان، بە ئامانجی بەدەستخستنی توانای زانستی پەروەردەییو بەدیهێنانی گۆڕانی کۆمەڵایەتیو دووبارە داڕشتنەوەی کەسایەتیی مسوڵمان، بەهەموو لایەنە تاکییو کۆمەڵێیەکانییەوە، ئیتر دەبێتە خاوەنی توانای دەروونییو ویژدانییو زانستیی پێویست بۆ بەجێهێنانی کارەکان بە جوانییو بەرەنگاربوونەوەی ڕووداوەکان.

**ڕۆشنبیریی گشتییو ڕۆشنبیریی تایبەتی: نەخۆشییەکە بینا دەڕوخێنێ**

ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە، کە چەند کەسێکی کەم لە گەلانی مسوڵمان گرنگیانداوە بە منداڵو پەروەردەکردنو فێرکردنی لە ڕابردوودا، ئەوەش بە دووبەش دوور لەیەك بوو:

**بەشی یەکەم:** ئەو بەشەیە، کە تایبەتە بە ڕۆڵەکانی کەسە تایبەتییەکان، کە لە ماڵەکانیان فێریان دەکردن، کە ماناکانی نەرمونیانییو ڕێزو قسەی شیرین تیایدا ڕۆڵی هەبوو بۆ پەروەردەکردنی منداڵی خەڵکە هەڵبژاردەو باڵاکانی گەلو گەورەو سەرکردەو خاوەن پلەوپایەکانو دەسەڵاتدارەکان، بۆ ئامادەکردنی ئەو منداڵانە تا ببنە سەرۆکو دەسەڵاتدارو گەورەی کۆمەڵگە، لەو کەسانەی، کە ئاڕاستەکارو ئامۆژگاریان بۆ منداڵەکانیان داناوە: معاویەی کوڕە ئەبو سوفیان، عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، هارونە ڕەشید، هەروەها زۆر گەورەو ناوداریتر، کە پەرتووکەکانی مێژوو و کەلەپوور بۆی باسکردووین، مامۆستای تایبەت منداڵی ئەو گەورانەی پەروەردە کردووەو فێری کردوون، بەتایبەتی لە زانیارییە ئایینییەکانو وێژەو ڕۆشنبیرییو سەرۆکایەتییکردن.

**بەشی دووەم:** ئەو بەشەیە، کە تایبەتە بە ڕۆڵەکانی خەڵکەوە، لە حوجرەکاندا فێری قورئانخوێندن دەکران، لەگەڵ هەندێ حساب، کە بۆ ژیانی ڕۆژانەیان پێویست بوو. ئەو حوجرانەو توانای مامۆستاکانو هۆکارەکانی فێرکردن تیایاندا هەروەکو مێژوو بۆمان باس دەکات —خراپو کەمزانستو لەبەرکردن بووەو بۆ ئەو مەبەستەش لێدان بەکارهێنراوە لەکاتی فێرکردنی منداڵاندا، ئەوە بەرنامەکانی خوێندنی منداڵانی خەڵك بووە، زانستێکی کەم لەو حوجرانە فێردەبوون، لەسەر پارەوگیرفانی خاوەن منداڵەکانیش بووە، کە زۆربەی خاوەنی ئەو منداڵانەش کەمدەستو هەژار بوون، کەس گرنگیی نەداوە بەو حوجرانەو باری خوێندن تیایاندا، چەند کەسێکی کەم نەبێت، وەك ئیمامی غەزالیو زانای پایەبەرز ئیبن خەلدون، ئەمانە ڕەخنەیان ئاڕاستەی ئەم حوجرانە کردووەو هۆکارەکانو خراپیی ئاستی مامۆستاکانیان باس کردووە، هەندێکیان ئامۆژگاریی باوکانیان کردووە، کە ڕێنەدەن مامۆستای ئەو حوجرانە ڕۆڵەکانیان

فێری ئایین بکەن، بە تایبەتی لە بارەی بیروباوەڕەوە، ئەمەش لەبەر بێتوانایی‌و کەمی ئاستی زانستیی ئەو مامۆستایانە بووە لە بواری بیروباوەڕدا.

ئەنجامەکەشی خراپیی باری فێرکردنی ڕۆڵەکانی گەلی مسوڵمان‌و ڕۆشنبیریی‌و پەروەردەکردنیان بووە، ئەوەش لە ئەنجامی بوونی دوو جۆر لە ڕۆشنبیریی‌و فێرکردن.

لەگەڵ ئەم دوو جۆرە فێرکردنەدا، جۆری سێیەمیش هەبوو بۆ ئامادەکردنی فەرمانبەران، لە ڕێگەی ژمارەیەکی کەم لە قوتابخانەو ئەڵقەکانی خوێندن، کە لەلایەن ئەوقافەوە بەڕێوە دەبرا، کۆمەڵێکی کەم لە لاوانی هەڵبژاردە وەردەگیران، تا ببەنە هەڵبژاردەی زانستی ئایینی، کارەکانی نووسین‌و خزمەتی دیوانەکانیان دەکرد، لەگەڵ کاری فەتواو دادوەریی، ئەم فەرمانبەرانە، لەو قوتابخانانەدا وانەی ئایین‌و وێژەو زمان فێردەبوون، بە تایبەتی وانەکانی فقه و بنەما فیقهییەکان، کە زۆر برەویان هەبوو، بە هۆی پێویستبوون بە ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی فەتوازان‌و دادوەر.

ئابەو شێوەیە بوو باری فێرکردنی ڕۆڵەکانی گەلانی مسوڵمان لە ڕابوردوودا — تا ئێستاش لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا هەروایە— کە ئاستی فێرکرنی گشتیی خراپ بوو، تواناو شێوازەکانی دواکەوتوو بوو، ئەوە فێرکردنی ڕۆڵەکانی گەلانی مسوڵمانبوو، ئەمڕۆش هەمان شێوەیە، بەڵام منداڵی گەورەو دەوڵەمەندەکان لەسەر تێچوونی باوکیان لە قوتابخانەی تایبەتیی‌و بیانیی دەخوێنن، کە ئەم قوتابخانانە تواناو هۆکاری زانستیی‌و تەکنیکیی تێدایە، کە هەرگیز خەڵکی کەمدەسەڵات‌و هەژاری ئەم گەلانە، کە مسوڵمانن، ناتوانن تیایدا بخوێنن، ئەو قوتابخانە تایبەتیی‌و بیانیانەی ئەمڕۆش بەشدارن لە بەخۆرئاواکردنی عەقڵی قوتابیاندا، کە ئەمەش پەیوەندیی زۆر لەو قوتابیانە دەپچڕێنن بە ئایین‌و ڕۆشنبیرییەکەیانەوە، هەروەها هەستیان لاواز دەکات دەربارەی ئوممەتەکەیان‌و وزە شاراوەکانی‌و جووڵە تیایدا.

لە زۆربەی بارەکانیشدا دەیانکاتە پێشەواو سەرکردە لە سەرەوە هەلپەرست‌و بۆگەن‌و خۆیان دەسەپێنن —بەهۆی ئامێری سەرکوتکردن‌و پاڵپشتکردنی بیانیی‌و ئەو پیسیانەی، کە لەدەروونی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتەو نەخۆشییە ویژدانییەکان‌و ڕۆشنبیرییەکەیدا هەیە— دەسەڵاتی باڵا دەگرنە دەست

لەوڵاتەکانیاندا، ئیتر هەموو هێزی جووڵەو تواناو دەستپێشخەریی‌و داهێنان دەکوژێتەوەو باری گەلەکانی ئەو وڵاتانە بێدەسەڵاتیی‌و هەژاریی‌و نەفامیی‌و دواکەوتن بەشیەتی، بیانییەکان چاودەبڕنە خێروبێری‌و هەوڵدەدەن، تا سامانەکانی بەتاڵان ببەن‌و پیرۆزییەکان‌و سەروەرییەکانی پێشێل بکەن.

لە ئەنجامی کەمتەرخەمیی ڕۆشنبیریی ئیسلامی، مناڵ لەبازنەیەکی بۆشدایە، ئوممەتی ئیسلامیش لەبەر لاوازیی‌و کەمدەسەڵاتیی بە دەوریدا دەسوڕێتەوەو ناتوانێ بارەکانی ژیانی خۆی بگۆڕێت‌و وزەکانی تازە بکاتەوە، گوێنەدان بە کاروباری پەروەردەکردنی مناڵی مسوڵمان‌و پەککەوتەیی فیکری مسوڵمان لە بواری پەروەردەی مناڵدا، هەروەها هەستنەکردن بە گرنگییەتی گەشەکردنی پەروەردەو فێرکردنی مناڵ لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، کەمتەرخەمییکردنی ترسناك لە ئامادەکردنی داواکارییەکانی ئەم گەشەکردنە، کە کارێکە —بێگومان— لە گرنگترین هۆکارەکانی پەککەوتەیی لە گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی‌و گۆڕانی داواکراو لە دووبارە داڕشتنەوەی عەقڵ‌و ویژدانی مناڵی مسوڵمان، تا لە ئاستی ئاستەنگەکان بێت‌و بتوانێ پێویستییەکانی ئوممەت جێبەجێبکات‌و کاریگەربێت لەگەڵ عەقڵ‌و وێژدانیدا.

## گەشەکردنی هۆشیاریی پەروەردەیی‌و چاکسازیی فێرکردن بنەمای چاکسازییە

بۆ ئەوەی مسوڵمان کەسێك نەبێت ویژدان‌و ژیرییەکەی تێکچووبێت، هیچ شتێ سوودی نەبێ بۆی —کە گەورە دەبێ— وتاردانی چاکسازیی‌و گۆڕانی ڕەفتاریی، دەبێت لابکاتەوە بە لای مناڵی مسوڵماناناندا‌و پەروەردەکردن‌و بەرنامە بۆ دانان‌و پاڵفتەکردنی ڕۆشنبیریی‌و گەشەی ویژدانیی گرنگی پێبدات، تا وزە شاراوەکان بجوڵێ‌و ئوممەتی ئیسلامی گیانی هاوکاریی‌و یارمەتی بەبەردا بکرێت‌و گیانی بەخشین‌و قوربانییدان تیایدا دروستببێت، ئەوکاتە توانای جوانکاریی بەخشینی دەبێت.

گرنگترین هەڵە، کە تێی کەوتووین ئەوەیە، ئێمە خۆمان ماندوو دەکەین لە وتارداندا بۆ گەورەکان‌و پێگەیشتووەکان‌و ئامۆژگارییکردنیان، کەچی بە مناڵیی

پشتگوێیان دەخەین‌و گرنگیان پێنادەین، هەوڵ نادەین گۆڕانکاریی پێویست لە بنیاتنانی دەروونیی‌و ویژدانیان دروستبکەین، کە منداڵیی تەمەنی پەروەردەو فێرکردن‌و کاریگەرییە، تا منداڵەکە گەورە دەبێت، ئەوکاتە بەهەمان شێوەی گەورەکان لاردەبێت —دارەکەی ڕەق‌و وشك— کەس ناتوانێ بیگۆڕێ‌و کاری لێبکات، بەمشێوەیە لادان‌و دەستەوسانیی بەردەوام دەبێت، چڵێکی نەرم‌و ناسك پشتگوێ دەخرێ، بەلاری گەورە دەبێ، ئیتر وەك لقەدارێك وشك‌و لار نەبانگکردن‌و نەدەرمان، سوودی بۆی نییە.

هەستی عەقڵی لای تازەپێگەیشتووەکان بەس نییە —بە پێویست— بۆ جوڵانی ویژدان‌و نابێتە هۆی وروژاندن‌و کاریگەرییان، زۆر کەسی ترسنۆك، کە هەرگیز ئازایەتیی لێدەرناکەوێ، کەچی چەندین دێڕ شیعری حەماسەتاوی لەبەرە، کە مرۆڤی ئازاو بەجەرگ نایزانێ، زۆر پزیشك بە هەڵپە جگەرە دەکێشن، لەکاتێکدا زیانەکانی جگەرەکێشان زۆر بە جوانیی دەزانن، کە هەرگیز بە خەیاڵی ئەو کەسانەدا نەهاتووە، کە لە ژیانیاندا جگەرە بە لێویان نەکەوتووە، چەند ترس دەروون دادەگرێت، کاتێ دەبینێ زۆربەی ڕۆڵەکانی مسوڵمانان —ڕۆشنبیرو ناڕۆشنبیر— تەماشای زۆر لە کەناڵەکانی هەواڵ دەکەن‌و چەند بە هەڵپە ڕۆژنامەو گۆڤارو شیکارەکان لە چەندین سەرچاوەوە وەردەگرن، کە عەقڵیشیان هیچ کەمییەکی تیا نییە دەربارەی کەموکورتیی لە گەلەکەیانداو ئەو پێویستییانەی کە هەیەتی پێیان، بەڵام هەرگیز کاریگەرییەك لە کردارو بەخشین‌و ڕەفتارو کردەوەیاندا نابینی، وەك ئەوەی مسوڵمان ڕادیۆیەك بێت، یان تەلەفزیۆنێك، کە هەمیشە خەریکی شتی بێماناو قاڵە قاڵ بێت، بەڵام لە ڕووی کردارو بەخشین‌و بەخشندەییەوە هیچی نەبێت.

گرنگترین هۆکاری ئەم دیاردە نەخۆشییە، ئەوەیە کە لایەنەکانی گشتیی بنیاتی کەسایەتی مسوڵمان، پشتگوێخراوە لە قۆناغەکانی دروستبوونی سەرەتاییدا، هەوڵی بنیاتنانیش پەرت‌و بڵاوبووتەوە، ئیتر قسەکردن لەم بارەوە بۆ هەرزەکارو لاوەکان بێسوودە، هەموو یادخستەوەو ئامۆژگاریی‌و ڕوونکردنەوەیەك بۆ کەسی هەرزەکار —بریتییە لە هەستکردنی عەقڵیی، ئیتر کاریگەریی لەسەر ویژدان نابێت، مادام لەکاتی منداڵیدا ئەوەی تیا نەڕوابێت،

نموونەی ئەمەش، وەك نموونەی زمانە لە یەکەمجارو زمان لە دووەمجار لەکاریگەرییان لەسەر دەروون‌و وروژاندنیان، وروژاندن‌و داهێنان هەمیشە لەزمانی یەکەمدا دەبێت، لەبەرئەوە گرنگی دەوڵەمەندکردنی زمانی یەکەم —بۆ هەموو گەلێك، بەهەموو نوێیەك، لەبواری ڕۆشبیریی‌و زانستدا— کارێکە لەئەوپەڕی گرنگیدا، ئەگەر وانەبێ توانای داهێنان‌و جوانکاریی لەگەیاندندا، لەدەروونی ڕۆڵەکانی گەلانی مسوڵماندا، هەرگیز دروستنابێ، بەڵام زمانی دووەم، کە پشت بە دەروونی مرۆڤ دەبەستێ لەسەر لێکدانەوەو وەرگێڕان، هەروا بە ئاسانی ناتوانێ هەست‌و وروژاندنەکان بجوڵێنێ، لە زمانی یەکەمدا وشە لە بابەت جیاناکرێتەوە، هەرگیز بابەت بێ وشە نابێت‌و داهێنانی هاوچەشنیەتی لە نێوان وشە، کە هێمایەو بابەت کاکڵەی نهێنی وروژاندن‌و کاریگەرییە لە زمانی یەکەمدا.

لەبەرئەوە پەروەردەو شێوە وێنەکان‌و ماناکان، کە بە شێوازێکی ڕاست‌و دروست بچێنرێت لە قۆناغەکانی گەشەی یەکەمی مرۆڤدا لە کۆتاییی‌و ژیانی مرۆڤدا ویژدان دەجوڵێت‌و دەیوروژێنێت، کە دەبێت مرۆڤ لەوبارەوە کاریگەرو وروژێن بێت.

## وانەی موساییانەو گۆڕانی کۆمەڵایەتیی

ئەوەی گرنگە یادی بخەینەوە وەك پەندەکانی قورئان، چەندین چیرۆکی تیایە، کە ئەزموونی ئیسلامیی موسایی، لە چاکسازیی گەلی ئیسرائیلییەکان، ئەوانەی کە کرانە کۆیلەو دەچەوسێنرانەوە، بە ستەم‌و زۆرداریی لە لایەن فیرعەونەکانی میسرەوە، خوای گەورە ویستی وابوو، کە منەت بخاتە سەریان‌و ئەو خراپەو ستەم‌و کۆیلایەتییە لە دەروونیاندا چاکسازیی بکات، کاتێ موسای پێغەمبەریان دەریهێنان‌و بردنی بۆ بیابانی (سیناء) لە ڕێگەی زەوی بەڵێنپێدراو، داوای لێکردن زەوی وەربگرن‌و بنیاتی دەوڵەتی کۆمەڵگە بکەن، ئیتر ئازادبن‌و خۆیان بەرپرسی خۆیانن.

بەڵام ئەو گەلە لەسەر کۆیلایەتی گەورە بوو بوون، دەروونی کۆیلەیان هەبوو، نەیاندەتوانی هەستن، بنیات بکەن‌و قوربانیی بدەن‌و دەستپێشخەریی بکەن، لەبەرئەوە وەڵامەکەیان بۆ موسا (علیه السلام) وەڵامی کۆیلەیانە بوو، پڕترس‌و

بێدەستپێشخەریی بوو، کە موسا (علیه السلام) فەرمووی: (يَا قَوْمِ ادْخُلُوا الأَرْضَ المُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ* قَالُوا يَا مُوسَى إِنَّ فِيهَا قَوْماً جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىَ يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ) (المائدة:٢١– ٢٢ ).

دەستپێشخەرییەکردن –کە سیفەتی دووەمی دەروونی کۆیلەکانە– بە وەرنەگرتنی بەرپرسیارییەتییو خستنەسەرشانی خەڵکیتر، کە ئەوە لێرەدا گەورەمان موسایە (علیه السلام)، کە لە زمانی گەلانی ئەمڕۆدا پێی دەوترێت (حکومەت)، یان نەتەوە یەکگرتووەکان، یان (کۆمەڵگەی نێو نەتەوەیی)، چونکە کۆیلە –لە ئەنجامی باری دەروونییو پێکهاتەکەی– هەمیشە لە باری نەرێتیی (سلبی)دا، مافو بەرژەوەندیی نییە دەستپێشخەریی بکات، ئەوەی کە دەیتوانی بیکات گوێڕایەڵی فرمانە، ئەو (کۆیلەی فەرمان بەسەردراوەکە) لەبەرئەوە بەشی دووەمی وەڵامی بەنی ئیسرائیل بۆ موسا (علیه السلام)، وەڵامێکی سەرشۆڕانەو وازهێنان لە بەرپرسیارییەتیو خستنەسەرشانی خەڵکانیتر بوو، ئەوەش کە داوای لێکردن موساو خوای موسا بوو: (قَالُواْ يَا مُوسَى إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَداً مَّا دَامُواْ فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ) (المائدة: ٢٤ ).

کاتێ موسا زانی، کە بانگکردنو ئامۆژگارییو پیاهەڵشاخان سوودی نییە لە گۆڕینی بنیاتی ئەو کۆیلانە، هێزو ئازایەتییان نییە لە بنیاتنانو بەرگریکردندا، ئیتر هەموو هەوڵێکی موسا ئاڕاستەی شارستانییەت لە ناویاندا بڕوخێنێتو کۆمەڵگەیان پێدروستبکاتو بەرەنگاریی ڕووەکانیان پێبکات.

گرنگە، کە جیاوازیی بکەین لەنێوان ئاڕاستەی ویژدانو وزەی دەروونیی، سروشتی دیواری ویژدانو وزەی دەروونیی، ویژدانو وزەی دەروونیی دەتوانرێ ئاڕاستە بکرێنو دووبارە بنیات بنرێنەوە لەسەر هەندێ شت، کە پێی قایلدەبنو دەگۆڕێن بەگوێرەی ئەو هەستکردنو ئەزموونانەی، کە دووچاری مرۆڤ دەبێت، کافر باوەڕناهێنێت، دوژمنکار دوور دەکەوێتەوە لە خراپە، سەرگەردان ڕێگای هیدایەت دەگرێ، بەڵام بناغەی سروشتی ویژدانو بنیاتی دەروونیی گۆڕانی بەسەردا نایەت، چونکە هەرگیز ئازا نابێتە ترسنۆك، مرۆڤی ڕژد نابێتە بەخشەر، مرۆڤی ئازادو بەڕێز نابێتە کەسێکی هیچو پووچ، نموونەی ئەمانە سەربازێکی

باش له سوپاداو ئەندامی تاقمێکی تاوانبار، هەردووکیان له سیفەتی ئازایەتییدا هاوبەشن، بەڵام له ڕووی ئاڕاستەوە جیاوازن، سەربازی سوپا پیاوی چاکەو گەلو نیشتمان دەپارێزێ، بەڵام ئەو پیاوەی له تاقمە تاوانبارەکەیە، خراپەو خەریکی تاوانکردنو ئازاردانی خەڵکە، بۆی هەیە ئەو پیاوە خراپە واز له خراپەکردن بێنێ، بگەڕێتەوە، سەربازی سوپاکەش، بۆی هەیە سەری لێبشێوێو سەربکاتە خراپەکردن، بۆ نموونە عومەری کوڕی خەتابو عەمری کوڕی هیشام (ئەبوجەهل) هەردووکیان قارەمانو پێشەوا بوون، بەڵام (عومەری فاروق) قارەمانی هیدایەتو ئیسلام بوو، ئەبوجەهلیش قارەمانی بێباوەڕییو نەفامیی بوو.

لەبەرئەوە، بڕیاری گەورەمان موسا (علیه السلام) —بە ئاڕاستەکردنی خوایی— کە خوا زانیاریی سروشتی مرۆڤو باری بنیاتی ئەو گەلە، له ڕووی دەروونییەوە دەزانێت —تا ڕوو بکاتە کاری ڕیشەیی بۆ بەدیهێنانی چاکسازییو گۆڕانکاریی لەسەر ئاستی عەقڵو لەسەر ئاستی دڵو ویژدان، پەلەنەکردن له بەروبووم، بەکارکردن لەسەر دووبارە پەروەردەکردنی گەل، لەبەرئەوە هەوڵەکانی ڕووی له تازەپێگەیشتووەکانو بنیاتیان بوو لەسەر بنەما دروستەکان له ڕووی ڕۆشنبیرییو ژیرییو ویژدانەوە.

(وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ) (الأعراف: ١٤٥ )، هەروەها موسا —علیه السلام— دوای کرد له گەلەکەی —بە ئاڕاستەیەکی خوایی— کە بەرەی (کۆیلە) بوون، تا چل ساڵ له بیابانی سینا بمێنێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەو ناڕەحەتییو ناهەمواریییەدا، تا بەرەیەکی تر بنیاتدەنرێتو ئامادە دەبێتو پاکدەبێتەوە له شوێنەوارەکانی تێکچوونی عەقڵ له ویژدانو دەروون، کە له سەردەمی کۆیلایەتیدا پەیدابوو بوو: (قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الأَرْضِ فَلاَ تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ) (المائدة: ٢٦ ).

ئەنجامەکەی بنیاتنانی بەرەی سەربەستو ئازادەکان بوو: (فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ

النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ) (البقرة: ٢٥١ ).

لەم ئەزموونە پەروەردگارییەدا، وانەو پەندو ئامۆژگاریی تیایە بۆ هەر کەسێ، کە خاوەنی زانستو زانیاریی بێت دەربارەی سروشتی زانیارییەکانی دەروونو پەروەردەو کۆمەڵگە.

لەبەرئەوە نەبوونییو نادیاریی منالٚ، کە بکرێتە بەردی بناغەی گۆڕانکاریی زانستیانەو گرنگ لە پرۆژەی گۆڕانی کۆمەڵایەتییو چاکسازیی گەل، تەنها وتاردان ئاڕاستەی پێگەیشتووەکان بکرێتو هەرئەوان ئامۆژگاریی بکرێن، ئەوە پەلەکردنە لە لێکردنەوەی بەرووبووم، پێش ئەوەی پێبگات، ئەوە ڕەنگدانەوەی قەیرانی فیکرە لە ناو گەلدا، بێئاگاییە لە ڕۆڵی زانستو لێکۆڵینەوەو وانەو پێوانەو ئەزموونگەریی لە زانستە سروشتییەکانو تەواوکارییەتی لەگەڵ زانستەکانی نیگای خوایی. لەبەرئەوە، دەبێ بزانین کەنادیاریی منالٚو ئەم بێئاگاییە، هەردووکیان لە گرنگترین هۆکارەکانن، کە ڕێگرن لەم ڕۆژگارەدا لەبەردەم گەیشتن بە پرۆژەی وتاردانی ئیسلامیی، کە نەگاتە مەبەستە باڵاو بەرزەکانی، ئەگەرچی کات تێپەڕیوەو چەندین داوای چاکسازییو گۆڕانکارییو شێوازەکانو ئاڕاستەکانیان هەبووە، لەگەڵ ئەو زەرورییە گەورانەی، کە چاکسازان کردوویانەو قوربانییان داوە لەو پێناوەدا –تا ئێستاش– هەر لەو ڕێگایەدا بەردەوام لە هەوڵو کارو لێکۆڵینەوەدان.




شوێنەوارەکانی ترساندن لەسەر دەروونی گەل‌و گەیاندنی

شێوەی (٨)

## شوێنی فیکر لە گرفتە گەورەکانی ئوممەتدا

گومانی تیا نییە، کە گرفتەکانو قەیرانەکانی ئەم ئوممەتە، زۆرو هەمەچەشنەیە، ئەو هۆکارانەش، کە دەبنە گەشەو خۆراکی ئەم گرفتو قەیرانانە هەر زۆرن، بەڵام لێرەدا –لە زۆربەی بارەکاندا– چەند گرفتێکی گەورە هەیە، کە دادەنرێت بە بناغەو بنەما بۆ زۆر لەگرفتەکانی تر، کە هەموویان لێی جیادەبنەوەو کاری لێدەکەن، هەروەها هۆکاری زۆریش هەیە ئەم گرفتانە دروستدەکات، بەڵام ئەوەی گرنگە لە ناو ئەو هەموو گرفتو هۆکارە ئاڵۆزو کەڵەکەبوانەدا، کە ئاگامان لێی بێت، هۆکارە بنەڕەتییەکانە، کە بەبێ بەرەنگاربوونەوەیان ناتوانین کارا بین لەگەڵ ئەو گرفتانەدا، تا ببێتە هۆکاری دەرچوون بەرەو چارەسەرو زاڵبوون بەسەر هەموو هۆکارەکانی تردا.

ئەوەی، کە ڕوونو ئاشکرایە، ئەوەیە، کە جیهانی ئیسلامیی زۆر فراوانە، هەموو دەرامەتە مرۆییو ماددییەکانی تیایە، ڕەگی مێژوویی‌و شارستانییەتی هەیە، پڕە لە ئومێدو هیواکان، هەموو ڕەوشتو ڕێبازەکانی تیایە، لەگەڵ ئەوەشدا جیهانێکی دواکەوتووە، لە بارێکی بەشبەشی ترسناکدایە، کێشەو هەرا دابەش بووە بەسەر هەموو بەشەکانیدا، ئەم بارەش بووەتە هۆی ئەوەی، کە هەندێ هێز، کە نە لە قەبارەو نە لە زۆری دەرامەتدا، هاوتای جیهانی ئیسلامیی نییە، واتە بچووکەو خاوەنی ئامانجی بەرزو بڵند نییە، زاڵ بێت بەسەر جیهانی ئیسلامداو بیکاتە ژێردەستەی خۆی، مافەکانی لێزەوت بکات، بە هۆی پارچەپارچەبوونی وڵاتی ئیسلامیش تواناکانیان لەدەستداوە، هەندێ وێژەی گەلی زۆر بە جوانی باری ژیانی ئەو گەلانە ڕوون دەکاتەوە، کە جێگەی هەزار نووسراوو وتراو دەگرێتەوە، لەوانە دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی دەشتەکیی پرسیاری لێکرا، دەربارەی کەسێك بزانن خۆشی دەوێت، وەڵامی کابرای دەشتەکیی یەکسەر وتی: (بەڵێ)، "چونکە نە دراوسێیەو نە خزم!!" باری ژیانی ئەم ئوممەتی ئیسلامیش لەڕووی کێشەو هاوکاریی‌و خۆشەویستییەوە، کە دەبێتە هۆی گەشەکردنی پەیوەندیی‌و هاوکاریی، هۆی خۆشەویستیی دەچەسپێنێ لە نێوان ڕۆڵەکانی نەتەوەدا.

ئەگەر بنەما ئەمەبێت "المسلم أخو المسلم لايظلمه ولا يسلمه" يان "من كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته" ياخود "المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا" هەروەها "مثل المؤمنين في توادهم وتعاطفهم وتراحمهم مثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى".

چۆن ڕاڤەی ئەم بارە خراپە پێچەوانەو ناشیرین بکەین؟ بەکام ئایین، یان بە کام باوەڕ، بە کام ژیریی‌و ژێربێژیی، یان بە کام سوودو بەرژەوەندیی دەتوانین لەمبارە تێبگەین‌و پاساوی بدەینەوە؟!

لایەنی دووەمی گەورەی باری دواکەوتنی ئوممەت‌و لاوازیی گەیاندنەکەی‌و ئەو هۆیانەی، کە بوونەتە مایەی هەژاریی‌و لاوازیی‌و فەوتان‌و وێرانبوونی، لەگەڵ ئەو هەموو ڕووبەرە فراوانەدا، لە ئۆقیانووسەوە بۆ ئۆقیانووس، لەگەڵ ئەو هەموو دەرامەتەی، کە لە ئەو وڵاتانەدا هەیە، هەروەها لەگەڵ بوونی هەموو ڕەگەزو زمان‌و ڕەنگێك تیادا، کە تا دوێنێ بڵندترین‌و دەوڵەمەندترین‌و بە تواناترین گەلان بوون‌و هەڵگری ئاڵای شارستانییەت بوون:

(وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ من قَبْلِهِمْ) (النور: ٥٥).

(كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْراً لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ) (آل عمران: ١١٠ ).

چۆن ئەمە ڕوویدا؟ زەویی هەر زەوییە، خەڵکەکەش نەوەی نەتەوەکەن، ئەمان داوا دەکەن کەچی خەڵکی پێش دەکەوێت، ئەمان لاواز دەبن‌و دوژمنەکەیان بەهێز دەبێت؟

تێڕوانین بۆ تێگەیشتن لەم دیاردەیە زۆرە، هۆکاری زۆر دراوەتە پاڵ ئەم دیاردەیە، هەموو چارەسەرەکان —ئەوەی کە دەیبینین— کە لەسەر ئەم تێڕوانینە دانران پەکیان کەوت، لەبەرئەوە، دەبێت تێڕوانینێکی فراوانترو قووڵتر هەبێ، تا لەم دیاردەیە تێبگەین‌و هۆکارەکانی بزانین‌و بە قووڵیی لێی وردبینەوە، بە بێئەوەی لە بیرو هۆشماندا تێکەڵی دروست بکەین لە نێوان هۆکارە لاوەکییەکان‌و نیشانەکانی نەخۆشییەکە.

# ئیسلام سەرچاوەی هەموو چاکەیەکە لەم ئوممەتە داماوە

یەکەم پرسیار لە جیهانی شارستانییەتی خۆرئاوای عەلمانیی –بەکەلەپووری شارستانیی و ئەزموونی تایبەتییەوە– پەیوەندیی بە ئایین و ڕۆڵی ئایین لەمێژووی شارستانیەتەکەیدا، دەبینین خۆرهەڵاتناس و خۆرئاواناسەکان و عەلمانییەکان، کە ئیسلام تۆمەتباردەکەن گوایە سەرچاوەی هەموو مەینەتیی و ناڕەحەتیی و ئازارەکانی ئەم گەلانەیە، کە دووچاری کێشەو پارچەپارچەیی کردوون.

ئیسلام یەکەم هۆکارو گرنگترین شتە، کە عەلمانییەکان بەنەفامیی و نەزانین، خاوەن مەبەستە خراپەکان لە خۆرهەڵاتناسەکان بەفێڵکردن، بەپەلە هەرچی گرفت و ناڕەحەتیی هەیە لە مێژووی موسوڵماناندا دەیدەنە پاڵ ئیسلام، هەرچەندە ئیسلام پاکوخاوێن بێت لەو تۆمەتانە، هەرچەند بەشدارییکردنی ئیسلام چاك بێت بۆ چارەسەری ئەو ناخۆشیانە، هەرچەند تۆماری مێژووییەکەی پرشنگدارو ڕازاوە بێت.

ڕاستی بریسکاوە لە بواری یەکێتیی و هاوکاریی، ئەوەیە، هەموو بەشدارییەکی چاکەی ئیسلام لە مێژووی موسوڵمانەکاندا، یارمەتی یەکێتیی و داوای یەکێتیی موسوڵمانان دەکات، هەموو ئەو شتانە دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و ڕەوشتی ئیسلامی، ئیسلام بووە بنەما بۆ یەکگرتنی هۆزو گەلەکان، یەکیخستن و کردنیە برا، هەموو خراپیی و ناشیرینییەکانی دەمارگیریی کردە شتی چاکەو داوای یەکسانیی و برایەتیی و هاوکاریی کرد، هەموو مرۆڤەکان لە یەك کەسن، جیاوازییان لەگەڵ و هۆزدا هۆکارو یارمەتیدەرە بۆ یەکترناسین و کارلەیەککردن و تەواوکاریی یەکتری، جیاوازیی زمان و ڕەنگی مرۆڤەکان دیاردەیە، کە لە دروستکراوە سەرسوڕهێنەرەکانی خواو نیشانەی جوانکاریی دروستکراوەکانی خوایە لەیەکسانکردنی مرۆڤەکان و تەواوکردنیان، لە ناو دروستکراوەکانی خوادا، هیچ ئامێرو هۆکارێك نییە بۆ لوتبەرزیی و خۆبەگەورەزانین و کێشەو شەڕو دوژمنایەتیی، بەڕێزترین کەس لای خوا "لەخواترسترینیانە"، خۆشەویسترین کەسیش لای خوا "بەسوودترینیانە" بۆ دروستکراوەکانی خوا، بە دادپەروەرانەو بە پێی شەریعەتی ئیسلام، هەموو کەسێکی دوورو نزیك دەگرێتەوە.

(وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى) (الأنعام: ١٥٢ ).

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) (المائدة: ٨ ).

(وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (آل عمران: ١٠٣ ).

(وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (آل عمران: ١٠٥).

(إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ) (الحجرات: ١٠).

ئەگەر کەسێ بگەڕێ بە دوای هەڵوێستی ئیسلام، دەربارەی یەکێتیی مسوڵمانانو سووربوونی ئیسلامو ڕۆڵی لەبەرەنگاربوونەوەی هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەو پارچەپارچەییو کێشەکانی ئەم ئوممەتە، ئەو کاتە دەبینی دەنگی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تۆماری مێژووی سەردەمی پێغەمبەرایەتیی چەندە ڕۆڵی هەبووە لە بنیاتنانی ئەم ئوممەتەو ڕامیاریی ئیسلامدا، دەبینی لە دادپەروەرییو هاوکارییو یارمەتییو دڵدانەوەو دامەزراندنی بنەماکانی ئاشتییو فراوانو ئاسایشی گشتیی لە کۆمەڵگادا، ئەوکاتە دەروونی مسوڵمانەکان ناڕەحەت دەبێت، کاتێ ئەم هەموو کێشەو پارچەپارچەییە لە ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامدا دەبینێ، هەمیشە بە ئاواتو ئومێدی ئەو ڕۆژەوەیە، کە مسوڵمانەکان خۆشەویستییو یەکێتیی لە نێوانیاندا دروسبێت لەسەر ئەو بنەمایەی، کە ئیسلام بانگی بۆ دەکاتو داوای دەکات: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ* إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ* يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْراً مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْراً مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (الحجرات:٩–١١).

بەم شێوەیە دەبینین، کە هیچ بوارێك نییە بۆ ئەوەی هیچ تاوانێك بدرێتە پاڵ ئیسلام، لەو کێشەو پارچە پارچەییانەی، کە لە جیهانی ئیسلام دادەنرێت، بەڵکو ئیسلام خەڵك بانگدەکات بۆ یەکێتیی‌و یەکگرتن، یەکێکیش لەڕەگەزە سەرەکییەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی کێشەو پارچەپارچەیی، ئایینێکە فەرمان دەدات بە یەکێتیی‌و خۆشەویستیی، دژی کێشەو دوژمنایەتیی‌و پارچەپارچەییشە.

ئەگەر ئیسلام‌و ڕەوشتەکانی‌و تێڕوانینە بوونەوەرییەکەی، هۆکار نەبن لەم کێشەو بەشبەشبوونە لە ڕیزی مسوڵمانانندا، ئایا هۆکارەکە زۆری ڕەگەزەکان‌و زمانەکان‌و داب‌و نەریتەکان‌و فراوانی وڵاتەکانە؟ ئایا ئەوە هۆکاری کێشەو پارچە پارچەبوونی جیهانی ئیسلامییە؟ ئایا ئیستعمارو پیلانی بیانیی‌و فرت‌و فێڵەکانیان‌و دوژمنایەتییان بۆ ئیسلام هۆکارنین، بۆ ئەم پارچەپارچەبوون‌و کین‌و دوژمنایەتییە لە نێوان وڵاتانی جیهانی ئیسلام‌و گەلەکەیدا؟

## داگیرکەر نەخۆشییەو زیادکەری نەخۆشییەکەیە

ئێمە –ئەگەرچی ڕامیاریی‌و فرتوفێڵ‌و دوژمنایەتیکردنی داگیرکەر دەزانین، تائێستاش هۆکارەو بەشداریدەکات لەو بارە خراپەی، کە جیهانی ئیسلامیی تیایە– لە هەمانکاتدا باوەڕمان وایە، کە داگیرکەرو سەرکەوتنی ڕامیارییە دوژمنکارییەکەی نیشانەی نەخۆشییە، کە خاکێکی نەخۆش یارمەتیدەرێتی، کە بریتییە لەو نەخۆشییانەی لە ناو ئوممەتی ئیسلامیدا، کە قەڵا سەختەکانی دەڕوخێنێت‌و یارمەتی ڕامیاریی داگیرکەر دەدات، کە جێپێی خۆی تیا بکاتەوە، کاتێ ئوممەت ڕێزو تواناکانی لەت‌و پەت بووبێت، هەرگیز ناتوانێ لە داگیرکەر ڕزگاری ببێت، تا سەرنەکەوێت بەسەر هۆکارەکانی کێشەو گرفتەکانی ناوخۆی جیهانی ئیسلامییدا، کە ئەو کێشەو گرفتانە، ڕێگەخۆشکەرە بۆ ڕامیاریی داگیرکەرو پیلانەکانی لەناو ئەم ئوممەتەدا.

هەتا هەست بکەین، بە لاوەکییەتیی‌و کەمیی کاریگەریی ئەو هۆکارانە، دەبێ فراوانترو قووڵتر تێبگەین لەو دیاردەی نەخۆشیانە لەقەوارەو ناوەوەی دەروونمان، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە، چاك وایە چەند نموونەیەك لە

نموونەکانی مۆڤایەتی هاوشێوەی سیفەتەکانی نەتەوەی ئیسلام باس بکەین، کە چۆنو داگیرکەرو ستەمکاریی باڵی کێشابوو بەسەریاندا، تا ببینین، کە چۆن بەرەنگاری ئەو دیاردەیە بوونەوەو ئاسەوارەکانی ببینین، بە بەراورد لەگەڵ کارەکانی ئەو نەتەوانەو ئێمە، ئایا ئەو هۆکارانە لە خۆیدا بەسە بۆ ڕاڤەکردنی دیاردەی نەخۆشییەکانمانو ئاسەواری تیاماندا؟ سێ نموونە هەڵدەبژێرین، کە لەگەڵ بارودۆخی ئوممەتی ئیسلامدا لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەن، ئەوانەش: چین، هیند، ئەورووپا.

## بەراوردەکان لە باسی یەکبوونی ئیسلامی: چین، هیند، ئەورووپا

### چین

با لە چینەوە دەستپێبکەین، چونکە لەزۆر سیفەتەوە، مێژووەکەی خەریکە لەگەڵ جیهانی ئیسلامدا، وەك دوانەیەك وابێت، لە ڕووی برو چۆنییەتییەوە، لە ڕووی فراوانیی و هەمەچەشنەییەوە، لە ڕووی مێژووییەوە.

چین، جیهانێکە —وەك جیهانی ئیسلامیی— نزیکەی پێنجییەکی مرۆڤایەتیی تیایە، جیهانێکی فراوان، ناوچەی بەفرینو سەهۆڵبەندانی مەنشۆریا بۆ بیابانەکانو دارستانەکان درێژ دەبنەوە، تا دەگەنە قەراغی وڵاتەکانی هەرێمی کەمەرە، چەندین گەلو هۆزی تیایە، لە ڕووی ڕەگەزو زمانو چەشنەوە جیاوازن، پەیوەندیی زمان لە نێوان گەلەکانیدا لە ڕێگەی فێربوونی وێنەی هەزارەها وشەی قورسو ئاڵۆزە، کە هەموویان تیایدا هاوبەشن، چونکە زمانی خەڵکی چین زمانی وێنەکانە، لە شێوەی زمانی هیروغلیفی فیرعەونی کۆنی میسردایە.

بەمشێوەیە کاتێ دوو کەسی خەڵکی چین بەیەك دەگەن، زۆر بەناڕەحتیی لە زمانی یەکتر تێدەگەن، چونکە ئەو وشەیەی کە دەریدەبڕن زۆر جیاوازە لە نێوان خۆیاندا، بەهۆی ئەو زمانە وێنەییە نووسراوەییە دەتوانن فێربن و هەموو ڕۆڵەکانی چین وەك زمانو هۆکار هەموویان تیادا هاوبەشن، چین خاوەنی مێژووییەکی دوورو درێژە، چەندین میرو دەسەڵاتدار، فەرمانڕەوایی گەلانی چینی کردووە، لە نێوانیان کێشەو جەنگی زۆر ڕوویداوە، گەلانی چین دووچاری زۆر

ئازارو ستەم بوونەتەوە، هەروەها داگیرکەر نینۆکی خۆی لێگیرکردووەو دەسەڵاتی بەسەردا سەپاندووەو ستەمی زۆری لێکردووە، لەسەر هەمانشێوازی ڕەفتاری داگیرکەر لە جیهانی ئیسلامدا، ئیتر سوڵتانو میرو دەرەبەگو داگیرکەر دەسەڵاتی بەسەر چیندا هەبووە.

بەڵام مایەوە —بە هۆی ڕۆشنبیریی گەلەکانیو ویژدانو هەستی کۆمەڵییان— وەك یەك کۆمەڵگەو قەوارەو دەوڵەت، ئەو کێشەی ئەمڕۆ هەیە لە نێوان چینو تایوان، لە ڕاستیدا ئامانجەکەی جیابوونەوە نییە لە چینو پارچەپارچەکردنی ڕیزەکانی خەڵکی چین نییە، بەڵکو کێشەی نێوان چەند تاقمو بەرژەوەندییەکە لە ژێر پەردەی شەرعییەتپێدان، ئەوەی وا دەکات، کە تایوان دەرچێت لە یەکپارچەیی وڵاتی چینو خاکی نیشتمانی چین (دایك)و ئاگر هەڵدەگیرسێنێ، بریتییە لە بەرژەوەندییەکانی بیانییو هێزو ڕۆکێتو کەشتییە جەنگییەکانیەتی.

## هندستان

نمونەی دووەم بریتییە لە وڵاتی هیندستان، هیندستانیش کۆمەڵگەیەکی مرۆییە، کە ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی پێنج یەکی مرۆڤایەتییە لەسەر ڕووی زەوی، لە ملیارێك کەس تێپەڕیوە، نیمچە دوورگەی هیند لە شاخە بەفرینەکانی هیمالایا، تا نزیکی هێڵی کەمەرە دەگرێتەوە، چەندین گەلو هۆز لەخۆدەگرێت، هیندستان ڕەگەزو ڕەنگو زمانو بیروباوەڕی فرەچەشنەی هەیە، وڵاتی هیندستانیش —وەك جیهانی ئیسلامییو وڵاتی چین— دووچارەی ستەمی میرە دەسەڵاتدارەکانو دەرەبەگەکانو زۆرداریی داگیرکەر بووەوە، بەڵکو لە هەندێ ڕووەوە، باری ژیانیان تاڵترو گوزەرانیان زۆر خراپتربوو.

زەوی دەوڵەتی پاکستانی مسوڵمان، بەشێك بوو لە جیهانی هیندستان، ئەو گرفتە زۆرەی، کە وڵاتی هیندستان پێوەی دەناڵێنێ لە دەمارگیریی‌و زمانی زۆرو ئاینی هەمەچەشنەو گرفتە کۆمەڵایەتییو ئابوورییەکان، زۆر زیاترە لەو گرفتانەی، کە لە وڵاتی پاکستاندا هەیە، کەچی دەوڵەتی هیندستان بەیەك پارچەیی مایەوە، جەژنی نەتەوایەتیی دەوڵەتی بەنگلادیشی مسوڵمان، ڕۆژی جیابوونەوەیەتی لەدەوڵەتی پاکستانی مسوڵمان، کە لە بنەڕەتدا بە ناوی

ئیسلامەوە دروستبووە، ئەو کێشە زۆرانەی، کە لە وڵاتی پاکستانو هەرێمەکانیدا هەیە، داهاتووی یەکبوونی ئەم وڵاتە مسوڵمانە دەخاتە مەترسییەوە.

ئەوەی لێرەدا شیاوی ئاماژەپێکردنە، ئەوەیە، کە شیکارانی ڕامیاریی جەنگەکانی نێوان هیندستانو پاکستان دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی، کە ڕۆشنبیریی‌و ویژدانو هەستی کۆمەڵی هیندۆس، هەمیشە جیابوونەوەی هەر پارچەیەك لە خاکی هیندستان بەلایانەوە قبووڵ نییە وە نایانەوێ لە دەوڵەتی هیندستانی گەورە هیچ پارچەیەك جیا بێتەوە.

## ئەورووپا

نموونەی سێیەم بریتییە لە کەرتی ئەورووپاو یەکێتییە ئابووریی‌و سەربازیی‌و ڕامیارییە سەرکەوتووەکەی، هەموومان مێژووی ئەورووپا دەزانین، کە پڕبووە لەشەڕو جەنگ‌و کێشەی داگیرکاریی‌و نەتەوایەتیی گەورە بۆ ماوەی چەندین سەدە لەنێوان وڵاتە جیاجیاکانیدا، چۆن ئەو کێشانە پەرەیسەندو ئاگری جەنگێکی گەورەی جیهانیی نایەوە، کە بووە هۆی کوژرانی چەندین ملیۆن کەس‌و وێرانبوونی ئەورووپا، دەبینین ئەم کەرتەیە —بەمێژووی کێشەکانی‌و زۆری ڕۆشنبیریی‌و نەریت‌و ڕەگەزو زمانو گەلەکانی ئەو گۆڕانکارییە بوونەوەرییانەی، کە تیایدا ڕوویدا— بەرژەوەندییەکانیان لەکێشەو ڕووبەڕووبوونەوەوە گۆڕا بۆ یەکێتیی‌و کۆبوونەوەو هاوکاریی‌و یارمەتی بۆ بنیاتنانو گەشەکردن، بەشدارییکردن لەگەڵ کۆمەڵە ئابووریی‌و ڕامیارییە گەورەکانی جیهان بۆ دابەشکرنی دەستکەوت‌و بازاڕو دەرامەتەکان، لە پێناوی بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیدا لە بنیاتنانی ئەورووپای یەکگرتوو، بە ئامێرو دەزگاو کۆمەڵەو دراوی یەکگرتووەیەوە (یۆرۆ) بە ئامانجی گەیشتن بۆ دابەشکردنی دەستکەوتەکان لەگەڵ دۆلار، کە دراوێکی جیهانییە، بوو بە شوێنی کۆکردنەوەی سامانی جیهانیی تیایدا.

تا لەڕێگەی ئەو یەکگرتنەوە، دەستبگرێت بەسەر هەموو سامانەکاندا، لەوڵاتە بچوك‌و هەژارەکاندا، لەپێشەنگی هەموویانەوە، وڵاتانی جیهانی ئیسلامیی، بە دابینکردنی دراوەکانی ئابوورییە گەورەکان، کە تێچووی وەك

دۆلار نییه —لە ڕاستیدا— ئەگەر نرخی ئەو کاغەزەی، کە لەسەری چاپدەکرێت، باشە چۆن دوژمنەکانی دوێنێ لە گەلانی ئەوروپا توانیان یەکبگرن لە پێناوی ئەو بەرژەوەندیانەدا، هەرچی برینیان هەیە تیمارکرا؟! چۆن بەرژەوەندیی نێوانیان توانی دوژمنایەتیی نێوانیان بسڕێتەوە؟! هیچ ڕاڤەیەك بۆ ئەم دیاردەیە ناکرێت، تەنها ڕۆڵی هەستو ویژدانو ڕۆشنبیریی نەبێت لای ئەم گەلانە، کە کۆبوونەتەوە بەدەر لە هەموو کێشەیەك، کە لە نێوانیاندا هەبووە، بۆ خزمەتکردنی بەرژوەندیی گشتیی.

بە یەکێتی ئەوروپا ئەو مانگە ترسێنەرە دروست بوو، لە یەکێتییە جیهانییە گەورەکان، کە چواردەوری جیهانی ئیسلامو ئەفریقیای لاوازو پارچە پارچەی داوە، کە پێکدێت لە یەکێتییەکانی چینو هیندستانو ڕوسیاو ئەوروپاو ئەمریکا، جیهانی ئیسلامیی‌و کەرتی لاوازی ئەفریقیا دەکەونە بەردەم ئەو یەکێتیانە، هەروەها جیهانی ئەمریکای باشووریش بووەتە ناوچەی دەستبەسەراگرتنو دەسەڵاتداریی‌و کێشەو نێچیرێکە دڕندە لەسەری کۆبووەتەوە.

ئەم بارە داخاویی‌و خوێناوییەی، کە جیهانی ئیسلامیی‌و ئەفریقی تیادایە — کە کارەساتە بۆ خەڵکی ئەم شوێنانە— بووتە خاڵی کێشەو ململانێی نێوان هێزە جیهانییەکان، ئەوەی کە گرنگە بۆ مرۆڤایەتیی ئەوەیە ئەو بۆشاییە پڕبکرێتەوە بە دروستکردنو بەرپابوونی یەکێتی جیهانیی ئیسلامیی‌و ئەفریقیی‌و ببنە هاوبەشی هێزە جیهانییەکان، بەمەش جیهان دوور دەبێت لە ترسی جەنگێکی وێرانکەر، کە هەرگیز ناتوانرێت سەرەنجامی ئاسەواری ئەو جەنگەو ئاسەواری چەکەکانی بزانرێت لەسەر داهاتووی مرۆڤ و شارستانییەتی مرۆڤایەتیی.

ئەوەی ڕوونە، کە لەو نموونانەدا هێنامانەوە پێشتر، ئەو هۆکارانەی، کە وتمان هۆکارن بۆ پارچە پارچەبوونی جیهانی ئیسلامیی‌و کێشەو بەشبەشییەکانی لە نێوانیانداو چۆن دوژمن دەستیگرت بەسەرماندا، ئەمە بەس نییە، هەرگیز بە تەنهاش ڕاڤەی ئەم کێشەو لەتو پەتبوونەی جیهانی ئیسلامیی ناکات، لەگەڵ بوونی ئەو هۆکارانەدا، جگە لە ئێمە ئەوان وەك ئێمەیان لێنەهات، بەڵکو ئەوان لە کۆتاییدا یەکیانگرتو بوونە هاوکارو یارمەتیدەری یەکتر، بە پێچەوانەوە ئێمە تا ئێستاش لە کێشەو پەرتبووندا دەژین.

ولاَتانی جیهانی عەرەبیی ناتوانن شانازیی بکەن بە دۆخی چاکتری ولاَتانی تر لە گەلە مسولْمانەکان، چونکە ولاَتانی عەرەبییش پەرتبووە —لە کاتێکدا وەك دلْی ئوممەتی ئیسلامیی وان بەهەموو ئەو پەیوەندیی دۆستایەتیانەی کە هەیانە— بۆ زیاتر لە بیست دەولْەت، کە هێندە کێشەیان هەیە وزەیان بەفیڕۆچووە، پارچەپارچە بوونو دوژمن خۆی تیا قایم کردووە —لە ئەمڕۆدا— کۆبوونەوەو کۆمەلْەی ولاَتانی عەرەبیی، هیچ مانایەکی ڕاستەقینەی نییە.

ئەوەی جیاوازیی سەرسوڕهێنەرە، ئەوەیە کە زۆربەی ڕێککەوتنە ئابووریی‌و ڕامیارییەکان کە بووەتە هۆی یەکگرتنی ئەوروپا، لە ولاَتی عەرەبیدا نموونەیان هەیە لە: ڕێککەوتنی بازاڕی هاوبەش‌و کەمکردنەوەی باج‌و گومرگ، هاندانی بازرگانی لە نێوان ولاَتە عەرەبییەکاندا، ڕێککەوتنی بەرگریی هاوبەش، بەلاَم لە زەمیندا هیچ یەکێك لەو ڕێکەوتنانە جێبەجێنەکران، بەربەست لە نێوان ولاَتانی عەرەب‌و گەلەکانیاندا هەر هەیە، دیواری ئەو بەربەستانە بەرزترو بەرزتر دەبێتەوە، کێشەکان زۆرترو فراوانتر دەبن، وەك ئەوە وابێت کە هەر ڕێککەوتنێك لەسەر هەرشتێك دەکرێت، نابێت هەرگیز ڕووناکیی ببینێت، هەرگیز لە واقیع‌و لە پەیوەندییەکانی لایەنە عەرەبییەکاندا نەیەتەدی.

## ئایین‌و ژیریی‌و بەرژەوەندیی هەموویان فەرمانمان پێدەکەن بۆ یەکبوون‌و هاوکاریی

ئەگەر ئایین فەرمانمان پێنەدات بە پەرتبوون‌و کێشە، بەلْکو هانمان بدات بۆ یەکێتیی‌و برایەتی، ئەگەر ژیریی‌و بەرژەوەندییش فەرمانمان پێنەکەن بە پەرتبوونی کێشە، بەلْکو هانمان بدەن لەسەر یەکبوون‌و کۆبوونەوەو پشتگیرییکردنی یەکتر، ئیتر ئێمە پێچەوانەی ئەوەبین، کە ژیریی‌و بەرژەوەندیی ئایین فەرمانمان پێدەکەن، کە بیکەین، لەبەرئەوە دەبێ لێکۆلْینەوە بکەین، یەکەمجار لە قولاَییەکی دوورەوە، لەناوەوەی خۆمان، نەك لە دەرەوە (إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ) (الرعد: ١١ )، پەرتبوون‌و کێشە لە نەخۆشییە کۆمەلاَیەتییەکانە، کە پەیوەندیی هەیە بە لایەنی کۆمەلْکاریی لە

کەسایەتی مرۆڤایەتییدا، دەبێ ئەوە جێگەی لێکۆڵینەوەو پشکنین بێت، زانینی هۆکارەکانی تێکدانی لایەنی کۆمەڵکاریی لە کەسایەتی مرۆڤی مسوڵماندا، شارەزابوون لێی زۆر پێویستە.

هەمووومان دەزانین، کە یەکبوونو کۆمەڵبوونو هاوکارییو یارمەتیدان، لە گرنگترین پێکهێنەرەکانی لایەنی کۆمەڵکارییو گشتیی لە لایەنەکانی کەسایەتیی مرۆڤایەتییە، سەلامەتیی پێکهاتەی لایەنەکانی کەسایەتیی مرۆڤایەتییش —تاکو کۆمەڵ— کارێکی پێویستە بۆ ڕاست وەستانی کەسایەتی مرۆڤایەتییو هاوسەنگبوونی، بەوەش کۆمەڵگە دەوەستێتو هاوسەنگیی پەیدا دەکات.

خودی مرۆڤ —لە بنەڕەتی سروشتە مرۆڤایەتییەکەیدا— تاکێکە هەڵسوکەوتەکانی پەیوەندیی بە ویستی خۆیەوە هەیە، خۆی بەرپرسە لە کارو فەرمانەکانی خۆی لەم بوونەدا، لە ڕووی مادديیو گیانییەوە، بەمجۆرە کارێك مادديی بێت، یان گیانیی، لەخۆیەوە ناکرێت لە لایەنی کۆمەڵکاریی لە پێکهاتەی مرۆڤەوە نەبێت، بەوەش کۆمەڵگە پێك دێت، کە کارێکی پێویستە بۆ بوونی مرۆڤ و بەردەوامبوونی مادديی، لە خێزانەوە دەستپێدەکاتو بە دایكو باوكو کۆمەڵگە کۆتایی دێت، کە تاکە هۆکاری بواری ژیانو مانەوەیەتی.

هەروەها لە کۆمەڵگەو پەیوەندییەکانیو گەیاندنە مرۆڤایەتییەکەی تیایدا، بە هۆیەوە بوونی ماددیو بەرزێتی گیانی ئەندامەکانی کۆمەڵگە دروست دەبێت، هیچ مرۆڤێك بوونی نییە، ناتوانێ گەشە بکاتو بمێنێتەوە، بە تەنها بە سروشتی تواناو پێویستییەکانی خۆی، بە هۆی منداڵیەتی مرۆڤایەتیی دوورو درێژەوە، هەر دەبێ کۆمەڵگە هەبێت، کە مرۆڤ تیایدا گەشە بکاتو بپارێزرێت تیایداو چاودێریی بکرێت، لە ڕوانگەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە ویستی خۆی دەردەبڕێت، لە بوارە شاراوەکانی هەستو دەروونو ڕەوشتو مەبەستەکانشدا بەدیدەهێنێ، بە جۆرێ کاریگەرییەکەی لە کۆمەڵگەدا مانای بوونی خۆی بەدیدەهێنێت، هەقو دادو چاکەو خۆشەویستییو بەخشینو سۆزو بەزەییو چاکەکردنو جیاکارییو جوانکاریی لە کۆمەڵگەدا نەبێت، دەرناکەوێت، لەو کاریگەرییە کۆمەڵایەتییە، کە لایەنی کۆمەڵکاریی تیادا دەردەکەوێت لە ژیانی مرۆڤدا نابێت، مرۆڤ بەکۆمەڵگەوە لە ڕاستیدا مرۆڤەو لەناو کۆمەڵگەدا لە ئەوکارانەی، کە لە کۆمەڵگەدا دەیکات مرۆڤایەتییەکەی دەردەکەوێت.

## کەلێنی کۆمەڵیی لە ڕۆشنبیریی ئوممەتدا: کەسێ شتی نەبێ هیچ نابەخشێ

هەر کەلێنێك دروست ببێت لە چاودێرییکردنی لایەنی کۆمەڵکاری لەپێکهاتەی تاکدا، ئەوە شوێنەواری خراپو دوورمەودای دەبێت، لەسەر گەیاندنی تاکو جۆری ژیانیو بوونی، لەڕووی ماددییو گیانییەوە، بەمجۆرەش سروشتی لایەنی کۆمەڵکاریی لەکەسایەتی تاکدا، بە پێی چاکیی، یان خراپی سروشتی کۆمەڵگەکە دیاریدەکرێت، جۆری پەیوەندییەکانو دەزگاکانی کۆمەڵگە، کاریگەریی دەبێت لە مەودای هاوسەنگییو مرۆڤایەتیی بۆ بنیاتنانی ئوممەتو بەرزبوونەوەی.

ئەگەر کەلێنێکمان بەدیکرد لە گەیاندنی کۆمەڵگاری تاکەکانی کۆمەڵگە، کەموکورتییکردن لە چاودێریکردنی پەیوەندییەکانیو دەزگاکانی کۆمەڵگە، دەبێ ڕوانینو وردبوونەیەکنان لە بیری ئەو کۆمەڵگەیەوە ڕۆشنبیریو بەرنامە پەروەدەییەکەی، چونکە کەلێنی بیرو ڕۆشنبیریی —پاشانیش بەرنامەکانی پەروەردە— دەبێتە بناغە بۆ تێکچوونی تێڕوانینی کۆمەڵگەی دروست، هەرستکردنی هاوسەنگانە بۆ لایەنو پێویستییەکانی تاك، هەروەها لایەنەکانو پێویستییەکانی کۆمەڵیی، چارەنووسی کۆمەڵگەی کەلێن تێبوو هەر وێرانبوونو تێکشکانو تێپەڕبوونە بە ڕێگای سواندا، منالیی مرۆڤایەتیی تێگەیشتنو پەیوەندییو ڕۆڵ لە تاکییو کۆمەڵدا لە دوو سەرچاوەوە وەردەگیرێت، سەرچاوەی یەکەم: لە فیترەتەوە، لە هەستو پێویستییەکانەوە، لە هەستکردنی فیترەتی ژیرییەوە.

سەرچاوەی دووەم: لە گشتییەتی چەمکەکانی ڕۆشنبیریی کۆمەڵگەوە، لەسەر مەودای سەرمەتی ئەو گشتییەتانەو ڕۆشنبیرییو هاوسەنگبوونو وەڵامدانەوەی لەگەڵ جووڵەی واقیعی کۆمەڵگە، تواناکان، گۆڕانەکان، بەرەنگاربوونەوەکان، هاوسەنگیی تاكو کۆمەڵی لەسەر دەوەستێت، مەودای توانای لەسەر سەرکەوتن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ئاستەنگانەی کە تووشی دەبن، چۆن بتوانێ مەودای توانای خۆی بەکاربهێنێ بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆیو کۆمەڵگەی لە ڕووی ماددییو گیانییەوە.

لایەنی دەروونیی ویژدانیی گیانی لە قۆناغی منالّیدا بە سروشتی ڕۆڵی منالّیی بناغەیی لە بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤایەتیدا، کارێکی فراوانترو گرنگترە لە لایەنی زانستی لە مندالّدا، بەڵکو لایەنی زانستیی لەم قۆناغەدا (قۆناغی منالّیی) پاشکۆو هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بنیاتی لایەنی دەروونییو ویژدانی، ئەمەش چونکە بنیاتی دەروونییو کاریگەریی ویژدانی لای مرۆڤ لە قۆناغی مندالّیدا دروست دەبێتو تەواو دەبێت، بەڵام پێکهێنانی زانستیی بریتییە لە کردارێکی پێشکەوتووی بەردەوام بە مەودای ژیانی مرۆڤ، نە دەوستێتو نە دادەبڕێت (لەلانەکەوە بۆ گۆڕ) وەرگرتنی زانیاریی کردارێکە بەدەستپێکردنی ژیان دەستپێدەکاتو بە کۆتایی هاتنی ژیان نەبێت کۆتایی نایەت، بەڵام پێکهاتنی دەروونو ویژدانو کەسایەتیی مرۆڤ لە قۆناغی مندالّیدا دروست دەبێتو گەشە دەکات، تا دەگاتە کۆتایی قۆناغی هەرزەکارییو تەواوبوونی گرێی دووەم لەتەمەنی مرۆڤ.

لەبەرئەوە، دەبێ لایەنی پەروەردەیی دەروونیو ویژدانییو گیانیی لە ڕۆشنبیریی پەروەردەییدا گرنگی زۆری پێبدرێت لە هەموو نەتەوەکاندا، ئەوە دووپات بکرێتەوە، کە لایەنەکانی ڕۆشنبیریی زانستیی کە دەدرێتە منالّ، دەبێ هۆکاربێت بەپلەی یەکەم بۆ بنیاتی دەروونییو ویژدانییو گیانیی، دارشتنەوەی جۆری ژیرییەتی لای تازە پێگەیشتووەکان لەگەڵ لایەنی ڕۆڵی زانستی، کە لەگەڵ لایەنی ویژدانی لە بنیاتی تواناکانی منالّ، لەبەرئەوە پێویستە —لەپێناوی پێشکەوتنو بەکارهێنانی تواناکانی منالّ— چاودێریی کاریگەریی لەسەر پێکهێنانی لایەنی دەروونییو ویژدانییو باوەڕیی بکرێت، چاودێریی چەمکەکانی ژیریی بنەڕەتیی بکرێت، ئاگاداری ئاسەوارەکانی بێت، بە جۆرێك بێت شوێنەواری دەروونییو ویژدانییو ژیریی ئیجابیانە بێت، چونکە دوای تەواوبوونی قۆناغی هەرزەکاریی، هیچ گۆڕانێکی بنەڕەتیی لە سروشتی دەروونییو ویژدانی مرۆڤدا ڕوونادات، کارکردن بۆ چاکسازییکردنی بنیاتی دەروونیی کۆمەڵگە، دەبێ لە قۆناغی منالّییەوە دەست پێبکات، چونکە سەرەتاو گشتییەتی چوونە ناوەوەی ڕۆشنبیرییو زانست، پێشکەشکردنی بە شێوازێکی پەروەردەیی دروست، تیایدا چاودێریی شێوازەکانی پەروەردەیی زانستیی ڕاستو دروست لە

پێکهێنانی ژیریی تازەپێگەیشتووەکانو دەروونیانو ویژدانیاندا دەکرێت، بە ئامانجی بەدیهێنانی تەندروستییو دەروونییو ویژدانیی، هاوسەنگکردنی لایەنی تاکییو لایەنی کۆمەڵیی لە پێکهێنانی کەسایەتیی تاك بەو سیفەتەی، کە ئەندامێکە لە ئوممەتو کۆمەڵگە.

## لایەنی کۆمەڵکاریی لە بیری ئیسلامییدا

ئەگەر وردبینەوە لە مێژووی بیری ئوممەتی ئیسلام، بە تایبەتی لایەنی کۆمەڵکاریی، کە تایبەتە بە پێکهێنانی کەسایەتیی مسوڵمان لەم بیرەدا، ئەگەر ڕێڕەوەکەی بگرین، دەبینین، کە هاوشێوەیەکی (توافق) سەرسوڕهێنەر —بەچەپو ڕاستدا– هەیە لەنێوان چاکەکانی کۆمەڵگەو خراپەکانیدا، سەلامەتیی گەیاندنی مرۆڤایەتی شارستانییەتی.

گیانی کۆمەڵکاریی لە سەردەمی پێغەمبەرایەتییدا، لە چاکترین باردا بووەو لە بەرزترین ئاستدا، هەستی تاکەکانی کۆمەڵگە، کە سەر بە ئەو کۆمەڵگەنو بەرپرسیارنو هاوکاریی یەکتر دەکەن —بەو سیفەتەی کە ئەندامن لە جەستەی ئوممەتو کۆمەڵدا– لەوپەڕی هەستکردنو کاریگەربوونو ویژدانیدا بووە: (وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (الحشر: ٩ )، لەم گیانە کۆمەڵکاریە بەهێزو کاریگەرەوە، کە بۆشایی تیا نابینرێت، بەڵکو لە بنەمای گەشەی کۆمەڵگەی عەرەبی هۆزایەتیی ئازادو سادەوە هاتووە، کە کۆت نەکراوەو نەشکاوە بە ڕژێمی ستەمو زۆرداریکردن، بەڵکو زۆرتری کردو قووڵتری کرد، بواری فراوانترکرد، گیانی باوەڕو یەکتاپەرستیی جێنشینایەتیی ئیسلامی، کە ئایینی ئیسلام، لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا لە یارمەتیدانو هاوکاریی هۆزایەتییەوە گۆڕیی بۆ هاوکارییو برایەتیی ئیسلامیی، لەسەر دادپەروەرییو یارمەتیدانی یەکتر دامەزرا، ئەوە پێغەمبەرە (ﷺ)، کە سەرۆکی حکومەتەکەیەو کەسی یەکەمە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، یاساکانی ڕژێمی دادپەروەریی دادەڕێژێت، کە تیایدا چاودێریی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە دەکات، ڕێزی مرۆڤایەتییەکەی دەپارێزێت، مافیان دەپارێزێت

به مسوڵمانو نامسوڵمانەوە، تاکار گەیشتە ئەوەی دابینکاریی دەوڵەتیی دانا بۆ قەرزەکان، ئەمەش بە مەبەستی چاودێرییکردنو هاندانی هاوکارییکردن لە نێوان ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەدا، ئەگەر کەسێك بمردایەو قەرزاربوایەو ماڵەکەی بەشی قەرزدانەوەی نەکردایە، دەوڵەت قەرزی خاوەن قەرزەکەی دەخستە ئەستۆی خۆیو مافی پێدەدانەوە، فەرمووی: "من مات وترك مالا فلورثته، ومن مات وترك دينا فعلي سداده".

لەبەرئەوە مسوڵمانەکان قوربانییو بەخشینی زۆریان لە پێناو ئوممەتی ئیسلامدا، هیچ نامۆ نییە لەم کۆمەڵگەیەدا –لە باری پێویستی کۆمەڵگە، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) داوا لەبەخشین بکات لە مسوڵمانەکان– کە هاوڕێکانی پێغەمبەر (ﷺ) سامانی زۆر ببەخشن، لە ناو بەخشەرەکاندا، ئەبوبەکری صدیقی تیابوو، کە پیاوێکی ژیرو ڕاکانی هەمیشە ڕاستو دروستبوونو زۆر تێگەیشتووبوو[1]، چۆن

[1] سوودبەخشە لەگەڵ خوێنەر شتێك لە کەسایەتی و دانایی ئەبووبەکر بهێنینە بەرچاو، بۆ ئەوەی بزانین کردەوەکەی ئەو چۆن گوزارشت لە گیانی کۆمەڵگای سەردەمی پەیام دەکات، ئەبووبەکر لە بەر دانایی و وردبینی و تێژهۆشیی و ئازایەتیەکەی بوو کە بووە هاوڕێی پێغەمبەری خودا، هەر لەبەر ئەم سیفەتانە و پێویستی بە هۆش و راوێژ و لێزانین بوو کە کەلە گەشتی مەترسیدا بردی لە گەڵ خۆی و پیاوانی جەنگ و کوشتاری نەبرد. هەرئەو بوو بە زەینە ڕوونەکەی بڕوایەکی بەڵگەنەویستی هێنا بە گەشتی ئیسراو میعراجی پێغەمبەر. هەرئەویش بوو — بە گێڕانەوەی ئەبووداود و ئەحمەد — بە دڵێکی ئازا و بڕوایەکی ڕوون و زەینێکی پاکەوە، لە ساتەوەختەکانی خەم و کارەساتی سەرسوڕهێنی وەفاتی پێغەمبەردا لەسەرپێ ڕاوەستا و پێغەمبەریش لە هەموو کەسێکی تر بۆ ئەو خۆشەویستتر و نزیکتر بوو، بۆ ئەوەی ئوممەت بگێڕێتەوە بۆ وریایی و بڕوا و ئاینی بۆ ڕۆشن بکاتەوە و رووی گوتار بکاتە ئوممەت و هەموو وەچەکانی دواتر، لە رووی پاکیی یەکتاپەرستیی و پالفتە کردنی پەرستن تەنها بۆ خوداوە و بڵێت: ئەو کەسەی خوا دەپەرستێت خوا زیندووە و نامرێت و ئەوکەسەش کە موحەممەدی دەپەرست ئەوە موحەممەد مرد. وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل افاين مات أو قتل انقلبتم على اعقابكم ومن ينقلب على عقبيه فلن يضر الله شيئا و سيجزي الله الشاكرين آل عمران ١٤٤. تەنانەت عومەر و مسوڵمانە واق ورماوە کۆست کەوتوەکان وەك ئیبن ماجە دەیگێڕێتەوە وتیان: وەك بڵێت ئەم ئایەتەمان تەنها ئەو ڕۆژە دیوە! ئەبووبەکر ئەو پیاوە بوو کە

سەرکەوتووانە و وردبینانە کەشتی دەوڵەتە نوێکەی پێغەمبەری لە پێوارەی وەفاتی ئەودا، لە ناو شۆرشی سیاسیی عەرەبە دەشتەکاییەکاندا لە دژی دەوڵەت ڕێبەریکرد، ئەو عەرەبانەی ئامادە نەبوون بچنە ژێرباری کۆمەڵگاری شارستانییەوە، ئەبووبەکر لە مەبەستیان حاڵیی بوو لە کاتێکدا زۆر کەسی تر بە عومەری خەتتابیشەوە دەرکیان پێنەکردبوو. ئەوەبوو ئەبووبەکر بە بڕشتەوە و بە بێ کەمتەرخەمی و لاوازیی بڕیاریدا ئەو ئەعرابە یاخیبووانە ملکەچ بکات و بیانگێڕێتەوە بۆ یاساکانی کۆبەندی مرۆڤانەی شارستانییانە و هێزو توانای شۆرشی سیاسیی و هەڵگەڕانەوەی حەزارییان سەرکوت بکات، بۆیە چاوپۆشی نەکرد لە دانی مافە گشتییەکان و جەختیکرد لەسەر سەندنی زەکاتی سامانەکانیان و گوتی: بەخودا سوێند دەخۆم ئەو کەسەی جیاوازیی بکات لە نێوان نوێژ و زەکات لە گەڵی دەجەنگم.ئەبووبەکر بە هۆشی تەواوی خۆی و بە بینینی تیژ لە مانای جەنگی بتپەرستە بەدەوییەکانی عەرەب تێگەیشتبوو بە جیا لەوانەی جوولەکە و نەسرانی و ئاگر پەرست بوون وخاوەنی شارستانێتیی بون، بە مەبەستی ئەوەی بیانخاتە کۆمەڵگای ئیسلامیی مرۆڤانەی شارستانییەوە. قالت الأعراب آمنا قل لم تؤمنوا ولكن قولوا أسلمنا و لما يدخل الإيمان في قلوبكم الحجرات ١٤.عومەر دەیزانی و هاوەڵانیش دەیانزانی ئەبووبەکر چەند ئازایە و چەند بۆچوونەکانی ورد و بەجێن بۆیە راکەیان پەسەندکرد بە بێ هیچ زۆرکردنێك، چونکە متمانەیان بە دانایی و زانایی و شارەزایی ئەبووبەکر هەبوو، ئەبووبەکریش هیچ زەبرێکی لە سەر ئەوان نەبوو جگە متمانەی خەڵك بە لێزانین و بیرتیژیی. بوخاری دەگێڕێتەوە لە ئەبووهورەیرە کاتێك پێغەمبەری خودا وەفاتیکرد و ئەبووبەکر بووبە جێنشین و خەڵکانێك لە عەرەب کافربوون، عومەر بە ئەبووبەکری گوت: چۆن لە گەڵ خەڵك بە شەڕدێی لە حاڵێکدا پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: فەرمانم پێدراوە لە گەڵ خەڵك بجەنگم تا وەکوو دەڵێن: لااله الا الله، کە وتیان لا اله الا الله ماڵ و خۆیان لە من دەپارێزن مەگەر بەحەق و حسابی خودا نەبێت؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی: بە خودا هەرکەس جیاوازی بکات لە نێوان نوێژو زەکات لە گەڵی بەشەڕدێم، چونکە زەکات مافە بەسەر ماڵەوە، بەخودا ئەگەر حوشتربەندێك کە زوو دەیاندا بە پێغەمبەر ئەمڕۆ نەمدەنێ بە شەڕ دێم لە گەڵیان لەسەری. عومەر وتی: بەخودا قەسەم ئەمە ئەوەبوو کە خودا سینەی ئەبووبەکری گوشادەکرد بۆ جەنگ و ئەوسا منیش زانیم ئەوە راستە.

نموونەیەکی تر بۆ بەهێزیی رەهەندی کۆبوونی پیڕی هاوەڵان بەو ماناگەل و نیگایەی کە زەحمەتە بۆ پیڕی مەمانان کە رەهەندی کۆبوونما لاوازبووە دەرکی بکەین بە خەیاڵماندا بێت، ئەوەیە کە دارمی لە سونەنەکەیدا (چاپی احیاء السنة ١/٤٠) لە عکرمە دەیگێڕێتەوە کە ئوم ئەیمەن بۆ وەفاتی پێغەمبەر دەگریا، پێیان گوت: ئەوە بۆ پێغمبەری خودا دەگریت ئەی ئوم ئەیمەن؟ وتی: بەخودا بۆ پێغەمبەری

**مسوڵمانەکان ماڵیان دەبەخشی، ئەبوبەکریش وەك ئەوان ماڵو سامانی دەبەخشی، بەڵکو هەموو ماڵو سامانەکەی دەبەخشی، هیچی بۆ ماڵو مناڵەکەی بەجێنەدەهێشت!! باشە بۆچی پیاوێکی ژیری وەك ئەبوبەکر، هیچ شتێ بۆ ماڵو مناڵی بەجێناهێڵێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی: "ماذا ترکت لأبنائك؟" تا بزانێ ئەبوبەکر لەم بارودۆخە سەختەدا چی کردووە، ئەبوبەکر بە کورتییو پوختییو بە بیرێکی پاكو تێڕوانینێکی قووڵەوە وتی: "لقد ترکت لهم الله ورسوله" ئەمەش سروشتی ڕژێمی کۆمەڵایەتییو لایەنی کۆمەڵکارییو شێوازی گەیاندن دەگەیەنێت.**

**ئەوەی گرنگی لایەنی کۆمەڵکاریی نەزانێ، وا هەست دەکات، کە وەڵامەکەی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) تەنها متمانە بوونە بە خواو قوڵیی باوەڕی ئەبوبەکرە بەخوا، ئەمیش وەك هەموو هاوڕێ بەڕێزەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ئەوەی کە ئەبوبەکر وتی، دوورتر دەگرێتەوە، ئەمە تێڕوانینی ئەبوبەکر دەردەخات، دەربارەی ئەو ڕژێمە کۆمەڵایەتییەی، کە ئەو پەیڕەوی دەکات، ئەو**

---

خودا ناگریم، چونکە دەزانم ئەو چووە بۆ شوێنێك کە لە دنیا باشترە بۆی، بەڵام بۆ ئەوە دەگریم کە ئیتر هەواڵی ئاسمان لە زەوی دەپچڕێت.حەماد وتی: فرمێسك قسەی ئەییوبی بڕی کاتێك گەیشتە ئێرە. ئەمە ئوم ئەیمەنە بە پیری خۆشەویست و پشتیوانەکەی لە دەستداوە. بەڵام وا وەڵامی ئەو کەسە دەداتەوە کە سەرەخۆشی لێدەکات و بیری دەخاتەوە، کە پێغەمبەر لە خۆشیدایەو لای خوا حاڵێکی هەیە باشتر لە حاڵی ئەم دنیایە، وەڵامێك نەك بە بایەخ و سۆزی تاکەکەسی کە بگری بۆ جودایی خرشەویستێکی بەنرخ کە لە کاتی پیریی و لاوازیی و ئاتاجبوونیدا لە دەستی چووە، بەڵکو یەکەجار بۆ حاڵی ئوممەت و ئاتاجبوونی ئوممەت دەگری کە دەنگ و باسی ئاسمانی لێدەبڕێت. ئومئەیمەن دەگری و ئەییوبیش لە گەڵی دەگری، نەك بۆ خۆیان و سۆزداریی و برینی دڵیان، بەڵکو بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ باری ئوممەت و بەرژەوندی ئوممەت و ئاتاجی ئوممەت دەگرین.

بە چەشنی ئەم ڕەهەندی کۆبوونە و سووربوونی گشتییان لە سەر بەرژەوەندی و ئاتاجی ئوممەت، ئەو پێڕە ئەو هەموو دەستکەوتەیان هێنایە بەرهەم، بە بێ ئەم ڕەهەندە لە کەسایەتی مسوڵماندا هیچ دەرفەتێك بۆ بووژاندنەوەی ئوممەت و تێکۆشانی ڕاستگۆیانە بۆ پێداویستییەکانی و ڕێز و سەربەرزیی ڕۆڵەکانی بە دەست ناکەوێت.

کۆمەڵگەیە یارمەتییو هاوکاریی تیایە، هەژار تیادا نافەوتێ، لاواز تیایدا نییە، ئیتر پێویست ناکات، کەس ڕژدو ڕەزیلو پیسکە بێتو ماڵ کۆبکاتەوە، تاك بۆ هەموان، هەموانیش بۆ تاك، هەموویان لەم بارەیەوە هاوکارو یارمەتیدەری یەکترو براو بەخشرو کۆمەککاری یەکترن.

لێرەدا هەندێ جیاوازیی گرنگمان بۆ ڕووندەبێتەوە لە نێوان کۆمەڵگەی سەردەمی پێغەمبەرو چەمکەکانو گەیاندنی، چەمکەکانی سەردەمانی سەرکەشییو دوورەپەرێزیی، کە لایەنی کۆمەڵکاریی لە ڕژێمی کۆمەڵگەدا لاوازبوو، ئەمەش کاری کردە سەر بێئاگابوونی هەڵبژاردەی فیکریی لە تێگەیشتن لە مانای ئەم لایەنەو ئەو مانانەی، کە پەیوەندیی بە دەقەکانو ماناکانەوە هەیە، چونکە هەرگیز: "لیس من رأى كمن سمع" هیچ بەڵگەیەك وەك ئەزموون ڕوون نییە، کۆمەڵگەی سەرکەشییو بە فێرۆدانو ستەمکردن، کە کۆمەڵگەی دادگەرییو ڕێزدارییو یارمەتییو هاوکاریی نەدیوە هەست ناکات —ئەزموونی نەماوەو ئامێری زانستەکەی لە دەستچووە— چی هەیە لە ناو دەقەکان، لە ماناکانو بەڵگەکانیان "فكل إماء بما فيه ينضح"، واتە: هەموو دەفرێك چی تیا بێت، هەر ئەوەی لێدەدڵۆپێت.

لەبەرئەوە تێگەیشتنی بیریارو قسەزانەکان لە سەردەمی کەنارگیریدا، دەربارەی وەڵامەکەی ئەبوبەکر دەیانوت: ڕەنگدانەوەی باوەڕیەتی بەخواو پشت پێبەستنییەتی، هیچ گومانو دوودڵییەك نییە لای کەس، کە ئەبوبەکر خاوەنی وزەیەکی گیانیی گەورەبوو، ئەمیش وەك زۆر کەسی تری سەردەمی خۆی —لەو هاوڕێیانەی کە سامانو ماڵی زۆریان بەخشیوە— باوەڕو متمانەو پشت بەستنی بە خوا زۆر بووە، بەڵام لایەنێکی تری هەیە، ئەمە باسێکی گرنگی دیکەیە، کە ئەبوبەکر جێبەجێی کردووە، ئەو کەسە هەستی پێدەکات، کە شارەزایی هەبێت لە سروشتی ئەو ڕژێمەی، کە ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) لە ژێر سێبەرەکەیدا ژیاوەو بەشداریکردووە لە بنیاتنانیدا، بە ڕستەیەکی کورتیش وەڵامی پرسیارەکەی پێغەمبەری (ﷺ) پێداوەتەوە، قوڵی تێگەیشتنی لە لایەنەکانی ئەو هەڵوێستەش دەرخست، ئەو بڕیارەی، کە دەریکرد بڕیارێکی کوێرانە نەبوو، تەقینەوەی سۆز نەبوو، کە دوایی پەشیمان بێت لە کارەکەی، بەڵکو بڕیارێکی

دروستو بە نەخشەو لە جێگەی خۆیدابوو، بڕیارێك بوو، كە بە هۆیەوە ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێت) ئەركی كۆمەڵگای بەجێهێنا لە پشتگیریی كردنی هەوڵەكانی كۆمەڵگەداو بە دەم پێویستییەكانی ئەو ڕۆژگارەوە چوو، لە هەمانكاتدا هیچ ترسێك نەبوو لە تارمایی پێویستیو سووربوون لەسەر پاراستنی شتێك بۆ پاشەكەوتكردنی بۆ كاتی تەنگانەو ناڕەحەتی، ئەوەش لەبەر قووڵی باوەڕەكەی بوو بە خوای گەورە، كە هەمیشە جێگەی متمانەی ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێت) بووە، بەڵام باوەڕیشی هەبووە بە حكومەتی مسوڵمانانو متمانەی هەبووە بەو ڕژێمە كۆمەڵایەتییەو زانیویەتی چاودێریی ئەو كەسانە دەكات، كە پێویستیان هەبێت، لەبەرئەوە هەركاتێ كۆمەڵگە پێویستی بە یارمەتیی هەبێت، ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێت) هیچ لە سامانی خۆی پاشەكەوت ناكات، چونكە ئەو كۆمەڵگەیەی، كە پێغەمبەر (ﷺ) سەرۆكیەتیو سەركردەی ڕژێمەكەیەتی، ئەو دابینكارو دابینكاری پێویستییەكانیەتی، هەركاتێ پێویستی بە شت هەبوو، یان سەختیی تووش بوو، هەرگیز سەرشۆڕو ڕیسوا نابێت، ئەو یان هەر كەسێكی تری خێزاندار، كۆمەڵگە پێویستی خەڵك دابیندەكات، هەتا دوای مردنیشیان، ئەمەش هاندانە بۆ بەجێهێنانی پەیوەندییەكانو بەزەیی هاتنەوە بە یەكتردا، "من مات وترك مالا فلورثته، ومن مات وترك دينا فعلي سداده" هەركەس مردو سامانو ماڵی لێبەجێما، ئەو سامانو ماڵە بۆ میراتبەرەكانی، هەركەسیش مردو قەرزار بوو، ئەوە من قەرزەكەی بۆ دەدەمەوە. ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) لەبەرئەوە ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێت) متمانەی هەبوو كە پێغەمبەرو كۆمەڵگەكە یارمەتی دەدەن، ئەگەر خۆی ماڵو منداڵی بێدەرامەت كەوتن، چاكەیان لەگەڵ دەكەنو شكاویان دەگرنەوە "تركت لهم الله ورسوله" ئیتر پێویست ناكات ماڵو سامان لەكۆمەڵگە بگرێتەوە، ئەگەر كۆمەڵگە پێویستی پێی هەبوو، بە بێ تێگەیشتن لەو ڕژێمەو سروشتی ئەو كۆمەڵگەیە، ئەوە كەس لەو گفتوگۆیە تێناگات، هەرچەندە كورتو پڕماناو بە بەڵگەیە لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەكری سدیقدا، مەگەر ئەوانەی خاوەنی زانستی كۆمەڵایەتیینو خاوەن شارەزایین، ئەوانەی كە ژیانیان لەو ڕژێمەدا بوو، سروشتی گەیاندنەكەیان دەزانی.

بەڵام کاتێ لایەنی کۆمەڵکاریی تێکچوو،ماڵو سامان داگیرکرا، خێرو بەرەکەت لە لایەن چەند کەسێکەوە دەستیبەسەرا گیرا، بۆ دروستکردنی پشتگیرماڵی خەڵك بەناهەق خورا، ستەمکرا لە بێبەشو هەژارەکان، تا وای لێهات، کەس متمانەی بەکۆمەڵگەو ڕژێمەکە نەما، هەموو کەس خۆی بووە دابینکاری خۆیو منداڵەکانی، جگە لە خۆی و منداڵەکانی، گرنگی بە کەسی تر نادات، نەپشت بە کۆمەڵگە دەبەستێتو نە کۆمەڵگەش پشت بەو دەبەستێ، لەنێوان ئەمو کۆمەڵگەکەدا، هیچ پەیوەندییەکی هاوکارییو دابینکاریی نییە، کە تاك کۆمەڵگە بپارێزێ لە ناڕەحەتییەکانو بێدەرامەتییەکان، ئیتر نامۆ نییە، کە ببینین زۆربەی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان ڕادەکەن –بە مەبەستو بێمەبەست– لە پێدانی هەموو مافێکی گشتیی ڕژدیی دەکەن –لە کاتی بووندا– لە هەموو پێویستییەکی گشتیی، لە بەردەمیاندا دەزگاکان دەڕوخێن، پێویستییەکانو شتە گرنگەکان بەفیڕۆ دەچن، کەچی ئەمانە تەماشا دەکەنو هیچ کات گوێی پێنادەن، چەند بەراوردکردن لە نێوان ئەمانو لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلانی تردا، ئازاربەخشە، کاتێ دەبینین گەلانی تر گرنگە دەدەن بە پەروەردەکردنی هەستی کۆمەڵکارییو هەستی بەخشینو پێدان لە نێوانیاندا بەهێز دەبێت.

## شوێنەواری ترسناکی لاوازیی لایەنی کۆمەڵکاریی لە ڕۆشنبیرییو پەروەدەدا

لەگەڵ لاوازیی لایەنی کۆمەڵکاریی لە کەسایەتیی مسوڵمان لە بواری ڕۆشنبیرییو پەروەردەدا، بۆ نەوەکانی ئوممەتی ئیسلام لە چەرخەکانی دواکەوتنو تێکشکاندا، هیچ نامۆییەکی تیا نییە، ئەگەر ستەمو وێرانکاریمان بە بەربڵاوی بینی، دەستی بەخشینو پێدان نەبینین، کۆمەڵگە وێرانو دەزگاکانی کۆمەڵگە تێکچوو، گۆڕەپانەکەی پڕ بوو لە کێشەو ململانێ.

لەگەڵ لاوازیی لایەنی کۆمەڵکاریی لە کەسایەتیی مسوڵماندا، هیچ نامۆ نییە، کە دەزگاکانی گشتیی ئوممەتی ئیسلام بڕووخێت، چنراوەکەی هەڵبوەشێتەوە، بیناکەی بڕووخێت، ئەوکاتە مافی گشتیی بە قورسیی جێبەجێدەکرێت، باج

نەدرێتو ئەو دەستانەی کە بەخشەرن، کەمببنەوە، قوربانیدان بە گیان نەمێنێت، لە کاتێکدا، کە تاك هەوڵدەدات هەرچی پێویستییەکانی خۆیو خێزانەکەی هەیە، دابینی بکات، لە هەمانکاتدا هیچ گوێ ناداتە هەژارو بێنەواکانی ناو کۆمەڵگە، چونکە دەزانێ، ئەگەر لێی بقەومێ، تەنها خۆی دابینکاریی خۆیو خێزانەکەیەتی، بەدەم کەسەوە ناچێتو چاوی هیچ کەسیش ئەم نابینێت، هەژارییەکەی برۆی کەس ناجولێنێ، لە کاتی نەداریدا کەس بە هانای خۆیو خێزانییەوە نایەت -لەکاتی پێویستدا- تەنها ئازاری نەدارو سەرشۆڕی دەستپان کردنەوە نەبێ، زمانی حاڵی دەڵێ: "من لایرحم لا یرحم" سەرسوڕهێنەر نییە، کە لە ئەنجامی نەبوونی پەروەدەی لایەنی کۆمەڵکاریی لە بنیاتنانی کەسایەتیی نەوەکانی، زۆر لە گەلانی ئیسلامی لەچەرخەکانی تێکشکاندا، کە دیاردەی سوالکردن زۆر بێت، لە شەقامەکاندا چەندین کەسی لاوازو دەمو چاو زەردو جلشڕو پێخاوس ببینین، بە بێئەوەی دەنگێکی هەق بەرزبێتەوە بۆ بەزەیی هاتنەوە بەحاڵیدا، ئیتر -لەزمانی ئیسلامو یارمەتی کۆمەڵایەتی- هەر چینو ڕەگەزێك بن، ئەگەر کۆمەڵگەو ڕژێمەکەی بۆ کەسانی خاوەن پێویست، بڕێکی دیارییکراو یارمەتی دابنایە، تا ڕێزی مرۆڤایەتیان لە دەست نەدەنو ملشۆڕیی و سوالکردن، نەدەماو منالانی بێسەرپەرشت نەدەبوونە زەمینەیەکی بەپیت بۆ بڵاوبوونەوەی تاوانو داوێنپیسیی، بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیەو بێدەنگی لێی، بە چاو دیارەو ویژدان ئازار دەدات، ئەمەش شایەتی لاوازیی لایەنی کۆمەڵکاریی ئوممەتی ئیسلامو نیشانەی نادروستییو بەجێنەهێنانی ئەرکەکانی ڕژێمی کۆمەڵایەتییە.

هیچ نامۆ نییە، لەگەڵ لاوازیی لایەنی کۆمەڵکاریی لە بنیاتی کەسایەتیی مسوڵماندا بەدڕەفتاریی کۆمەڵایەتیی بڵاوبێتەوە، هەژارییو نەفامیی لەگەڵدا بێتو خزمەتگوزاریی خراپتر بێتو خەڵکی لە ئەرکی سەرشانی و گەیاندنی مافەکانی، خۆی دەرباز بکات، بە شێوەیەك تەماشای سامانی گشتیی بکرێت، هەرکات بۆی لوا دەستی بە سەردا بگرێت و تالانی بکات، ئەم نەخۆشییە کۆمەڵایەتییانە، نەخۆشیی دواکەوتن لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئوممەتی لە دواوە دەبێت، نەیپارێزێتو بۆی دڵسۆز نەبێت، ناپاکیکردن لە سپاردەدا

بگرێتەوەو ڕەگەکانی دەربهێنێتو کێشەی لەسەر چۆنییەتی دابڕکردنی سامانەکانی گەل هەبێت.

لایەنی کۆمەڵکاریی لە بنیاتی کەسایەتیی مسوڵماندا، لە سەرەتای هاتنی پەیامی ئیسلام بەمجۆرە بوو، هێز نەبوو لە بنیاتناندا، هێز نەبوو لە گەیاندندا، دەستکەوتو بەخشینی —لە کاتێکی کەمدا— زۆری بەدیهێنا، کە تا ئەمڕۆ هەتا هەتایە لەیادی کاتو لە مێژوودا لاپەڕەکانی درەوشاوەیە لە بوارەکانی چاکسازییو هێزو بەخشیندا.

بە کەوتنی سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینو زاڵبوونی گیانی نەفامیی هۆزایەتیی بەسەر گۆڕەپانی ڕامیاریی بە گیانی دەمارگیرییو ڕەگەزپەرستیی نەفامیی، زاڵبوون بەسەر دەسەڵاتدا، بە شێوەی ئاژەڵیانەو دوور لە ڕێبازەکانی حەقو دادپەروەرییو چاکسازیی، کە ئەمەش دەمارگیرییو لوتبەرزییو یاساغکردنی مافەکانی لێکەوتەوە، وەك دەستکەوتێك بۆ سەرکەوتوو، هەموو ئەمانە —بە خێراییەکی جیاواز— بووە هۆی گەڕانە دواوەی هێزی پاڵنەری گیانی ئیسلامییو لایەنی کۆمەڵکاریی بەرەو لاوازبوون چوو، کێشە بڵاوبووەوە، دڕندەکان زاڵ بوون، خوێن بەلافاو ڕژا، لەگەڵ ئەم بارەدا، هێزی ئوممەتی ئیسلام لاوازبوو، بوونی چەندین ڕەگەزو گەلو پاشانشین، ئەوانەی پاکبوون لەسەردەمی پەیامی ئیسلامدا، کەنارییان گرت، گۆشەگیرکەوتن، دوورکەوتنەوە لە ڕامیاریی ئوممەتو خراپەو خوێنڕێژیی، سەریانکردە وانە خوێندنو یادی خوا لە مزگەوتەکانداو کەنارگیرو پەراوێزکەوتن لە قوتابخانەو تەکییەکاندا.

زیانەکانی ئوممەتی ئیسلام، هەربەوە نەوەستا، لە نێوان پاشماوەی کەسە پاکەکانو قوتابیانی قوتابخانەی مەدینە لەزانایان، کە سەرکەوتن بۆ دەمارگیرییو هۆزایەتیی بوو، بەڵکو —بە داخێکی زۆرەوە— هێزی بەرەنگاریش ڕووخێنرا، ئەو چاکسازییە لەسەر ڕێنوێنی ڕامیارییەکانی سەردەمی هاتنی پەیامی ئیسلام بنیاتنرابوو. ئەوە گرنگ نییە، هەوڵێك، یان چەند هەوڵێك، پەکی بکەوێت بۆ چاکسازیی، بەڵام گرنگ ئەوەیە، کە ئەو پەککەوتنەیان هەڵاتنە لە مەیدانی کۆتایی سوڕو خۆبەدەستەوەدانو بێدەسەڵاتییو لاوازیی.

بەداخەوە، هەموو هەوڵەکانی پیاوانی قوتابخانەی مەدینەو میراتگرانی سەردەمی پەیامی ئیسلام لە سەردەمەکانی دەسەڵاتی ئومەوییەکان، کەناریانگرتو گۆشەگیرکەوتن -جگە لە چەند هاڵاوێردەیەکی کەم- خۆیان دابەستەوەو کاریگەرییان لەسەر ئوممەت سنووردرابوو لە بوارێکی تەسکدا، کە تایبەت بوو لە تایبەتمەندییەکانی کاروباری تاکەکانو هەڵسوکەوتیان بەشێوەیەکی تاکیی.

ئەم خۆبەدەستەوەدانە بووە هۆی ڕەگداکوتانی بارێکی خراپ لە بواری کۆمەڵایەتییو بیرو ویژدانی ئوممەتی ئیسلامو بنەماو ڕێساکانی کاولکرد، ئیتر دەزگاکانی دەسەڵاتو ڕامیاریی چووە ویژدانی ئوممەت -بەهۆی بارو بیری ئوممەت- بووە شوێنی گومانو دوو دڵیی، لای زۆربەی خەڵکی ئەو دەزگاو دەسەڵاتە شەرعییەتی نەبوو، لەم هەڵوێستە خراپەوە ڕووبەڕووبوونەوەو دۆڕاندن پەیدابوو لە جەنگدا لەبری ئەوە زاناکانی مەدینە -کە ئەوان لە پێشترن لە داناییو پێکاندندا- هەڵەکانی شێوازی توندوتیژیی لە ڕووبەڕووبوونەوەکەدا، لە پێناو چاکسازیی گۆڕاندا روونبکەنەوە، لەسەریان بوو لێکۆڵینەوە بکەن لە شێوازی باشترو چاکتر، ئەوەش لە بواری دۆزینەوەی سروشتی کەلێنەکانو شێوازە کاریگەرەکان بۆ گێڕانەوەی بنیاتی کەسایەتیی ئیسلامییو چاککردنی ڕێڕەوی ئاڕاستەکەیانو بەهێزکردنی هۆکارەکانی لایەنی کۆمەڵکاریی چاك تیایدا، بەڵام زیاتر بەردەوامبوون لەخۆگرتنو کەنارگیریی‌و دوورەپەرێزیی، ڕووبەڕووبوونەوەش چەندین شێوەی وەرگرت بە بێئەوەی زاناکانو بیریارەکان بەئاگابێنەوە دەربارەی ڕۆڵی منداڵ لە گەڕانەوەی دارشتنی کەسایەتیی ئوممەتو ژیریی‌و بیناکردنی دەروونی منداڵ، بە شێوەیەکی سروشتیی‌و ڕێكو دروست، ئەوەی کە تایبەت بوو بە پەروەردەی منداڵەوە، تەنها فێرکردنو شارەزاکردنی ئاین بوو، بە بۆیەیەکی کەسایەتیی سنووردار، ئەو شێوازە پەروەردەییە ویژدانییە کاریگەرە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵو تازەپێگەیشتووەکان -کە هەردووکیان لایەنی گۆڕانکارییەکەن- ڕێگای فیکری ئیسلامیی پەروەردەیی بگرنو چەمکەکانی پەروەردەی ئیسلامی پاكو پوخت بگرنەبەر.

بەمشێوەیە هەوڵ ڕوویکردە بەردەوامبوون لە کێشەو وەرنەگرتن، بەڵام بە شێوەیەکی سلبیی بەردەوامبوونی هەموو تیمەکان لە هەڵکەندنی چاڵو کەندەڵانو بەهێزکردنی شوێنەکانیان، ئامادەکردنی هۆکارو بەسەربازکردنی یارمەتیدان، بۆ پاراستنی ئەو شوێنانە، کە بە بەردەوامبوونیان بەردەوام تواناکانی ئوممەت لەگەڵیدا بەرەو وێرانبوونو دارمان دەڕۆیشت.

دەسەڵاتو ڕامیارییو کاروباری گشتییو سامانەکان دابڕابوو، لەلایەن ئەوکەسانەی کە هۆزپەرستو دەمارگیرو کەسانی سەربازیی بوون، بەڵام لایەنی کاروباری تاکو هەڵسوکەتیان، ئەوە لە ناوچەی دەسەڵاتی کەسانی دیندارو بیریارەکان بوو، یارمەتیدەرانو سەربازانو سامانەکان، هۆکارەکانیو ئامێرەکانی دەستی ڕامیارانی دەسەڵاتداربوو، مزگەوتو تەکییەکانو ئەڵقەی ئامۆژگارییکردنو فتوادان ئامێری پیاوانی ئاینی بوو، ئیتر تێکڕای خەڵکەکە، بوونە نێچیری کێشەی نێوان ئەو دوو دەسەڵاتەو ستەمو نەفامیو بێدەسەڵاتییو هەژاریی دایگرتبوون، کۆمەڵگەی مسوڵمان بووە لەوەڕگەیەکی بەپیت بۆ کاری پڕوپوچو ئەفسانەو بەنجبوون، بە بێئاگا بۆ دەروێشایەتییو سۆفیگەریی.

## پێویستییەتی بیناکردنی لایەنی کۆمەڵکاریی لە ڕۆشنبیرییو پەروەردەدا

کارەساتەکە لەوەدا بوو —بە بێئاگا— کە ئەم بارودۆخە نەخۆشە، بووە بنەما، لەسەر ئەم بنەمایە، بنیاتی تێڕوانینی گشتیی ئیسلام دامەزرا، لە لایەن هەڵبژاردەی فیکرییەوە ڕەنگیدابییەوە لە ژیانی ئەمڕۆی فیکری ئوممەتو لایەنی کۆمەڵکاریی، بوو بەڕۆشنبیرییو پەروەردەو فێرکردن، ئیتر گۆشەگیرییو دوورگرتن، بوو بە نیشانە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی، هەموو مەبەستێکی تەنها "عیبادەتکردن بوو" لە چەمکە فیقهییەکانەوە مرۆڤی مسوڵمانیش سلبیی بوو دەربارەی ژیان، دوای ئەوەی، کە لایەنی ڕۆحیی تیا بەتاڵ کرایەوە، ئیتر هەموو ژیانی هەر "کاروبارەکانی" بوو لەگەڵ چۆنییەتی لایەنە یاساییەکەی، هەوڵو جوانکارییو ئاوەدانکردنەوەو وەفاکردنیش بە بەرپرسیارێتییو جێنشینایەتیی لە زەوی هیچی بۆ ناکرێ.

پەرتوکەکانی فیقهی ئیسلامیی بووەتە ئەڵقەی گەیاندن لە نێوان ڕۆشنبیریی تایبەتیی فیکریی‌و ڕۆشنبیریی خەڵکیی بە گشتیی، واتە لەڕاستییدا بووەتە بەڵگەی دروستبوونی عەقڵییەتی مسوڵمان‌و بناغەی بنیاتی دەروونیی، ئەم پلەوپایە گرنگە مەڵبەندییە لەچەرخەکانی دوایيدا بۆ پەرتوکی فیقە لە ڕۆشنبیریی مسوڵماندا، وامان لێدەکات کەهەست بکەین بە مەودای ئەو زیانە گەورەو نەخۆشییە هەمیشەییەی، کە تووشی دروستبوونی ژیریی مسوڵمان‌و دەروونی مسوڵمان بووە، کاتێ ئەو پەرتوکە فیقهیانی لایەنی کۆمەڵکاریی گشتییان پشتگوێ خستبوو لە نەخشەی ئاڕاستەکردن‌و نیشانداندا، کاتێ کاروباری یادی خواو جێبەجێکردنی دروشمەکان بریتی بوو لە (خواپەرستن)، کە لایەنی (ڕۆحی)یە لە ژیانی مرۆڤدا، کە هەموو مەبەست‌و ئامانجێکە، بەمەش ژیان‌و کاروتێکۆشانی داماڵی —بە کردار لەژیانی خەڵکیی گشتییدا— لە لایەنی ڕۆحیی، ژیان لە جێنشینایەتیی بوو بە (کاروبار).

بەم تێڕوانینە گشتییە شێوێندراوە، ئەو دوورەپەرێزیی‌و گۆشەگیرییە خراپە، دەربارەی ژیان‌و کاریگەرییەکانی‌و گۆڕانەکانی، هەرگیز نەدەکرا باسی بەردەوامبوونی لێکۆڵینەوە بکرێت لە کاروبارو یاساکان‌و گۆڕانەکانی ژیان، دۆزینەوەی کلیلی چاکسازیی‌و گۆڕان‌و پێشکەوتن زۆر قورسبوو تیایدا، هەرگیز پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی نەیدەتوانی لەوە بەئاگابێت، کە بنیاتی لایەنی کۆمەڵکاریی لە قۆناغی منالییەوە، تاکە ئامێری گۆڕانی کاریگەرە، ڕێگای شیفاشە بۆ دووبارە بیناکردنەوەی کۆمەڵگەکان، پڕکردنەوەی کەموکورتیی لە قەوارەی گەل‌و نەتەوەکاندا، خێزان کلیلی سەرکەوتنی ئەو هەوڵە پەروەردەییانەو بناغەی سەرکەوتنێتی.

ئوممەت ناتوانێ ڕێڕەوی خۆی ڕاست بکاتەوە، هەتا بنکەی دەرچوون‌و بناغەی بۆچوونی چاك نەکات، تێڕوانینی تەواوی هاوسەنگانەی لە هەموو لایەنەکانی تاك‌و کۆمەڵەوە بۆ پەیدا نەبێت، تێڕوانینەکانی زانستییانەو شارستانییانە بێت بە جووڵەو پاڵنەرەکانی ئەو تێڕوانینانە.

تا ئەو کاتەی پەرتوکەکانی فیقە و ڕۆشنبیریی‌و پەروەردەی ئیسلامیی چاکسازیی دەکرێت، تا دەبێتە بەڵگەی تێگەیشتن‌و فیقە و پەروەردەیەکی فراوان‌و دروست، کە ببێتە بنگەی هۆشیاریی شارستانیی فراوان‌و تەواوو ئیجابیی، فیکرو ڕۆشنبیریی‌و تێگەیشتنێکی شارستانییانە بەرهەم دەهێنرێت، گرنگی بدات بە ژیریی‌و دەروون‌و کەسایەتیی مسوڵمان، بە تاک‌و کۆمەڵییەوە، پێشکەوێت‌و گەشە بکات لە ڕووی پەروەردەو هەر لە سەرەتای پێگەیشتن‌و سەوزی لقەکانییەوەو قۆناغەکانی منالّییەتی‌و تازەگەشەکردنی، چونکە بوارو ئومێد نییە لە کەسایەتی ئیسلامییدا، کە خاوەنی هێزو یارمەتیی‌و دەستپێشخەریی‌و داهێنان بێت‌و بتوانێت ئەم ئوممەتە بخاتە سەر ڕێگای ڕێنوێنی لە پێشەنگی نەتەوە پێشکەوتووەکان‌و سەرکردەکان‌و پێشەنگەکان[١].

---

[١] ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نووسراوی زانایان لە بارەی فەرمانڕەوایی‌و سیاسەتەوە، دەبینین زۆری تیۆرییە، یان پەیوەستە بە ڕێکخستنی کارگێڕییەوە و گیانی ئامۆژگاریی دەسەڵاتداری پێوەیە، بۆ فەرمانڕەوا دەنووسریّ‌و زۆرجار پێشکەش بە ئەو دەکرێت‌و نووسراومان نییە ڕوویکرابێتە ئوممەت، چونکە ئوممەت بۆ خۆی خاوەنی دەسەڵاتە و دەبێتە سەرچاوەی دەسەڵات‌و هەموو کاروبارەکانی شووراو مافەکان‌و مافی ڕۆڵەکانی‌و ئەرك‌و بەرژوەندییە سیاسییەکانیان. بۆ نموونە ئەوەی پێشەوا ماوەردی کە سەرۆکی داوەرانی سەردەمی عەبباسی بووە، بە ڕەچاوکردنی هەڵسوکەوتی فەرماندە تورکەکانی سوپا کە بوو بوونە دەسەڵاتدارو دەسەڵاتیان قۆرخکردبوو، هەروا بۆ پاراستنی پاشماوەکانی ڕێسای خەلافەت‌و یاسای شەریعەت، لە کتێبی (ألاحكام السلطانية)دا جێگیری کردبوو کە بەیعەت بە دوو کەسیش دادەمەزرێت، هەروەك چۆن گرێبەستی هاوسەرگیریی دوو کەسە.

بۆ سوودی زیاتر بگەڕێرەوە بۆ کتێبی (العنف وإدارة الصراع السياسي في الفكر الاسلامي بين المبدأ والخيار: رؤية إسلامية) هی نووسەر. کە تێیدا گرنگی پابەندبوون بە شوورا لە سیاسەتکردنی ناو کۆمەڵگا ڕووندەکاتەوەو باس لە بەکارهێنانی میکانیزمی مەدەنیی و ئاشتییانە دەکاتەوە لە ڕاستکردنەوی ڕەوتی سیاسیی کۆمەڵگادا، چونکە بەم کارە منداڵدانی کۆمەڵایەتیی لە پارچە پارچەبوون دەپارێزێت‌و بزاڤەکانی ریفۆرم پەرەدەستێنن‌و گەشە دەکەن، سەرەنجام جێگیربوونی سیاسیی بۆ کۆمەڵگا بەدیدەهێنێت.

# گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییو لێدوانی پەروەردەیی

ئەگەر ئەوەمان زانیی ئەم ئوممەتە لە ئێستادا لاوازو دواکەوتوو بەش بەشە، ئەگەر زانیمان، کە ئەم ئوممەتە خاوەنی دەرامەتێکی ماددیی دەوڵەمەندە، خاوەنی ڕێبازو ڕەوشتی بەرزو ڕەفتاری گیانییە، ئەگەر قایلبووین، کە دواکەوتنی ئەم ئوممەتە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەخۆشییەی تووشی ناوەوەی بووە، لە لاوازییو بێدەسەلاتیی، کە لە ئەنجامی ململانێی نێوان هەڵبژاردە ڕامیارییەکانو هەڵبژاردە فیکرییەکان پەیدا بووە، بە هۆیانەوە بۆچوونی بوونەوەری ئوممەت تووشی تێکچوونی بووە، هەموو ئەوانەش بوونە هۆی وشکییو بەش بەشو ڕووکەش لە بەرنامەکانی زانیارییو زانستە مرۆڤایەتییەکان، بینیمان چۆن هەوڵەکانی چاکسازیی لە سەدەکانی ڕابووردوودا نەیتوانیوە تا ئەمڕۆ، ئامانجە باڵاکان بەدەستبهێنێت لە تازەکردنەوەی وزەی ئوممەتو ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوەکەی، ئەو پرسیارەی کە ڕوومان تێدەکات ئەوەیە، ئەی چارەسەر چییە؟ چۆن دەتوانین وزەو چاکسازیی ڕێڕەوی گۆڕانکاریی تازە بکەینەوە؟ ئەو شێوازە چاکسازییە کامەیە، کە پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی –بە شێوەی کاریگەر– تا ئەمڕۆ پەنای بۆ نەبردووە، لە ناو ئەو شێوازو هۆکارانەی، کە پەنای بۆ بردووە؟.

دەبێ لە سەرەتاوە دەست پێبکەین، بە دۆزینەوەی گرفتەکە، چی بکەین، ئەو ئاستەنگانەی، کە ڕووبەڕووی ئوممەتی ئیسلامی دەبنەوە، بناسین، ئەگەر کاکڵەی گرفتەکە توانا بێ لەسەر گۆڕان، ئەگەر کاکڵەی گرفتەکە نەبوونی دەستپێشخەرییو داهێنان بێت، ئەگەر کاکڵەی گرفتەکە پاڵدانەوەو سەرشۆڕکردن بێت، ئەگەر کاکڵەی گرفتەکە لاوازیی وزەو ویژدانییو ئازایەتیی وێژەییو لاوازیی ڕێزی مرۆڤایەتیی بێت، ئەگەر گرفتەکە نەبوونی عەقڵیەتی زانستیی داهێنەرانەو گیانی کارکردنو دەستپێشخەریکردن بێت، ئەگەر لە کۆتاییدا گرفتەکە –بە فراوانییەوە– نەبوونی مرۆڤی ڕێزدارو ئازاو بەخشەرو سەرخەری بەتوانا لە ڕووی زانستو زانیارییەوە بێت، ئەگەر ئەوە گرفتەکە بێت، وەڵام ئەوەیە، دەبێ گۆڕانکارییەکە لە سروشتی بینای دەروونییو ویژانیی ئەم

مرۆڤەدا بێت، دەبێ کار بکرێت لەسەر دروستکردنی عەقڵییەتی زانستیی داهێنەری بنیاتنەری مسوڵمان، بە هەموو ئەوانەی، کە لەو عەقڵییەتەدا هەیە لە ڕەوشتو چەمکەکانو بۆچوونە یەکتاپەرستییە جێنشینایەتییە بەرزەکەی، گۆڕانی ڕیشەیی مرۆڤ، کە سروشتی بینای دەروونییو ویژدانییو ژیریی مرۆڤ پێك دەهێنێ، بە ئامێرو هۆکاری پەروەردەیی دروست پێکدێت، لە قۆناغی منداڵیدا، واتە لە دوو گرێی یەکەمی ژیانی مرۆڤدا دەبێت.

ئەگەر پەروەردەی تازەپێگەیشتووەکان، ڕێکوپێك نەبێت لە پێکهێنانی ویژدانو بۆچوونە بوونەوەرییە کۆمەڵایەتییەکانو بنیاتی زانستیی، تاکو تەواوو هاوسەنگو چاکو زانستی بێت لە قۆناغی پێگەیشتندا، ئەوا بوارنییە بۆ گۆڕانکاری کاریگەر، یان ڕاستکردنەوەی ڕێڕەو لە قۆناغەکانی دواییدا، چونکە لقەکە ڕەقبووەو لارو وشکبووە، ئیتر تاك ناتوانێ وەڵامی بانگخواز بداتەوە، چاك شت ناگەیەنێ، بەرەنگاری ئاستەنگەکان نابێتەوە، چونکە ستوونی بینای قەوارەی دەروون دانراوە، سەرچاوەکانی ویژدانو بەخشین تەنك بووە، بناغەی چەمکەکانو تێڕوانینە گشتییەکان (كليات التصورات) تێکچووە، هەموو هەوڵی بۆ گۆڕانکاریی ژمارەو نەخشی سەرئاوە، ئەو دەنگانە دەکەونە سەرگوێچکەیەکی کەڕ، دڵێکی بەتاڵ، هێزێکی ڕوخاو، پێش تەواوبوونی دەنگەکە، ئاسەوارەکەی وەکو توانەوەی پاشماوەی هێڵی سەر ئاوەکەیە، بەردەوام بانگ دەکەینو هاوار دەکەین —لە هەموو کارو هەڵوێستێکدا— دەڵێین ئێمە بێ ویستین، بێ تواناین، پێویستمان بە توانایە، پێویستمان بە ویستە، ساڵانو قەڕنەکان دەڕواتو ئێمە هەرنابینە خاوەنی ویست، چونکە ویستو عەزیمەت لە فرمانەکانی ویژدانە، ویژدانیش بە فرمانکردن پێك نایەت، بڕیار دروست نابێت، تەنها لە قۆناغی مناڵیدا پێکدێت، بە ئامێرو هۆکارە پەروەردەییە دروستەکان پێکدێت.

ئێمە هەڵەین، کاتێ وادەزانین، کە هەستی زانستی ژیریی کە ئاڕاستەی کەسێکی پێگەیشتوو دەکرێت ئیتر ئەوە بەسە، —بە بێ عەمباری وزەی ویژدانیی لە دەروونیدا— بۆ پاڵنانی دەروونی مرۆڤایەتیی بۆ کارکردنو بەخشینو خۆگرییو دەمەزراوی خۆگرتن بەرامبەر بە ناخۆشییەکان، بە ئامانجی بە دەستخستنی داواکراوو زاڵبوون بەسەر ئاستەنگەکاندا.

ئا بەم جۆرە، گۆڕانکاریی ڕاستەقینە شتێکی ئاستەمە، هەموو هەوڵە چاکسازییەکان پەکی دەکەوێتو ئامانجەکانی بەدیناهێنێ، چونکە وتاری تازەپێگەیشتووەکان، هەرگیز گۆڕان لە بناغەی بینای دەروونیدا دروست ناکات، ئێمەش لەبەر کەموکورتیی وتارەکانمان بۆ تازە پێگەیشتووەکان، هیچ گۆڕانێکی پەروەردەیی پێویست لە دەرونیاندا دروست ناکەین، بەم کەموکورتیکردنە دەربارەی گرنگیدانی پەروەردەیی بە منداڵ، ئەوا هەوڵو چاکسازییکردنی چاکەسازان لە ئەڵقەیەکی بۆشدا دەسوڕێنەوە لە وتاردان بۆ تازەپێگەیشتووەکان، هیچ گۆڕانێك تیایدا ڕوونادات، چاکسازیی بە تێپەڕبوونی نەوەکانو بەرەکان دەمێنێتەوە بەوشکیی‌و دووریی، هەمیشە لە مێشکدا هیواو ئاواتەکان بە نادیاریی دەمێننەوە.

## چۆن لە وتاری ئیسلامیی پەروەردەیی تێدەگەین؟

وتاری ئیسلامیی لە سەردەمی پەیامدا چەندین جۆر بوو: بە چەندایەتی جێگاو شوێنەکان، چەندایەتی دوێنراوان (المخاطبين)، چەندایەتی بارودۆخەکان، لایەنەکانو مەبەستەکان، بەمەش وتارێکی چالاكو کاریگەربوو. لەگرنگترین هۆکارەکانی لاوازیی وتاری ئیسلامیی لەم دواییەدا: لاوازیی شارەزایی خاوەن وتارەکەیە، لاوازییان دەربارەی هەستکردن بە لایەنەکانی ئەو وتارە، بەبارودۆخی دوێنراوانو پێویستییەکانیان، ئەمەش وایان لێدەکات، کە زۆرجار هەڵە دەکەن لە تێگەیشتنی ئەو وتارەو تێکی دەداتو کاریگەریی لاواز دەکات، دەیگۆڕێ بۆ وتارێکی تیۆریی، زۆرجار ئاسەوارەکانی مەبەستی تری لێدەردەکەوێت، بەری بەرهەمەکەی تاڵ دەبێت، کە ئومێد بووە وانە بێت.

## لاوازیی لێکۆڵینەوە مرۆڤایەتییەکان بووە هۆی تێکەڵیی لایەنەکانو بوارەکان

لاوازیی لێکۆڵینەوە مرۆڤایەتییەکان لە چەرخەکانی دوایی ئەم ئوممەتەدا، بووە هۆی لاوازیی فیکری ئیسلامیی، تێکەڵبوونی لایەنەکانو بوارە جیاوازەکان،

له زۆر باسدا هەستمکردووە بە شوێنەواری تێکەڵبوونی لایەنو بوارو بارودۆخەکان، دواترینیان، کە لایەنەکانی لە لێکۆڵینەوەیەکدا، کە باسی توندوتیژییو بەڕێوەبردنی کێشەی ڕامیاریی لەڕوانگەی ئیسلامەوە دەکات، خستمەڕوو، لە کتێبێکدا، کە لەلایەن پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییەوە چاپکراو دەرچووە، تیایدا ئەوەم ڕوونکردووەتەوە، کەگرنگترین هۆکارە ڕێگرەکان لەبەردەم ڕێرەوی چاکسازییو ڕاستکردنەوەی ئیسلامیی، باسی تێکەڵکردنە لەنێوان لایەنی بەڕێوەبردنی کێشەی ڕامیاریی لە ناو کۆمەڵگەدا، کێشەی ڕامیاریی، کە لەنێوان کۆمەڵگەکاندا هەیە، یان بەرنامەیەکی تر تێکەڵکردنی چەمکە ڕامیارییە ناوخۆییەکانو ڕامیاریی دەرەوە، بەم تێکەڵکردنە لەلایەن مسوڵمانەکانەوە، وەك ئەوەیە، کە شمشێر لە جێگەی خۆی دانەنرێت، کارێك بە لایەکدا بەرن بۆ مەبەستی خۆی نەبێت، لە پێشەوە ڕوونمکردەوە، کە ئەم گرفتە بەرنامەییە لە فیکری ئیسلامییدا لە لێکۆڵینەوەیەکدا بڵاومکردەوە لە قاهیرە، دەربارەی (نظرية الاسلام الاقتصادية) تیایدا باسی بنەماکانی ئابووریی ئیسلامم کردووە، لەگەڵ ڕێبازە بنەڕەتییەکانیو ڕامیارییەکانی پێغەمبەرایەتیی، کە پێغەمبەر (ﷺ) گرتوویەتییەبەر بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕێبازانە لەبارودۆخی چەرخی خۆیداو بەپێی تواناو کاتەکەی، زانینی کاریگەرییەکان لەسەر ئەو ڕامیارییو مەبەستانە، ئێمە چۆن سوودمەندبین لێی بۆ نەخشەکێشانی ڕامیارییەك، کە گونجاو بێت لەگەڵ بارودۆخو چەرخو تواناکانماندا، هەروەها لەو لێکۆڵینەوەیەدا ئەوەم ڕوونکردووەتەوە، کە لە گرنگترین هۆکارەکانی هەڵەکان لەتێگەیشتن لە مەبەستەکانی ئابووریی ئیسلامو هۆکاری لادان لە جێبەجێکردنەکانی ئەم دواییەدا، بریتییە لە تێکەڵکردن لە نێوان یاساکانی ئابووریی ناوخۆو بەندو باوەکانیو ڕێساکانی ئابووریی دەرەوەو بەندو باوەکانی، لەبەرئەوە، هەرگیز نامۆ نییە، کە بیری کەسێکی ئیسلامیی، کە بریتییە لە (ئیبن حەزمی ئەندەلوسی)، فەتوا دەدات، کە ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کشتوکاڵی جولەکەکان، کە پێغەمبەر بە پێی بارودۆخی ئەو سەردەمەی دابووی بە جولەکەکان، دەڵێ: ئەو فەرموودەیە سڕاوەتەوە، چونکە باسی نیوەی بەروبووم دەکات لە کۆی بەرهەم، هەموو فەرموودەکانی

حەرامکردنی (مزارعە) لە مەدینە سڕاونەتەوە، چونکە پێغەمبەر بە سوو (ربا) وەسفیکردوون، هۆی سڕینەوەکەش لای (ئیبن حەزم) ئەوەیە، ئەوە کۆتا شت بووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) کۆدوویەتی لەگەڵ جولەکەکانی خەیبەر، دەربارەی (مزارعە) بە بێ ئەوەی (ئیبن حەزم) لای لاڕوون بێتەوە، کە ئەوە تێکەڵکردنە لە نێوان لایەنی ناوخۆییو لایەنی دەرەکیی ئابووریی، ئەو ڕێساو بڕیارانەی، کە هەیە لە ئابووریی دەرەکیدا، جیایە لە یاساو بڕیاری ئابووریی ناوخۆییدا، تێکەڵکردنی بەرنامەیی لە نێوانیاندا. دەبێتە هۆی هەڵەی تێڕوانینو تێکچوونی فیکر[1]، ئەگەر لەسەر خوێنەر قورس بێت، بە تایبەتی ئەو کەسانەی، کە خاوەنی شارەزاییو زانست نین بە بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگەو وڵاتانو نەخشەو ئابووریی بەڕێوەبردنیان، دەبێ ئەم جیاوازییە وردە هەست پێبکەن، چونکە بیری فەلسەفیانەی تیۆریی لە بارودۆخو کاتی (ئیبن حەزم)دا سروشتی زانیارییو تاکییەتی وایکرد لە بیری ئەم کەسە شارەزایە، لا نەکاتەوە بەلای ئەوەدا، کە کارێکی وەها لەگەڵ گەلێك کە مسوڵمان نین، لە قەوارەو کۆمەڵگەیەکی جیاوازو دوژمن بە کۆمەڵگەی مسوڵمانان، کاتێ داوای زەوی دەکەن لە مسوڵمانەکان بۆ ئەوەی بیکەن بە کشتوکاڵ بەدووبەشی، کە دواتریش بەجێدەهێڵنو دەڕۆن، ئەم ڕێکەوتنە قورسە لەگەڵ جولەکە لەسەر (مزارعە) لەو بارودۆخە جیاوازەی، کە لە شاری مەدینەدا هەیە، بۆ بەتاڵکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی ڕامیارییەکی جێگیر، کە لە مەودای چەندین ساڵدا لە ناو کۆمەڵگەی مسوڵمانەکاندا، لە مەدینە کاری پێکراوە، تاکە کارێك لە بارودۆخێکی جیاوازدا دێت، بە بێ پێشەکی ئەوە یاساغ

---

[1] بڕوانە: أبوسليمان، عبدالحميد أحمد، العنف وإدارة الصراع السياسي في الفكر السياسي الاسلامي بين المبدأ والخيار: رؤية اسلامية. دمشق. المعهد العالمي للفكر الاسلامي ودار الفكر. ٢٠٠٢م. هەروەها کتێبی: أبوسليمان، عبدالحميد أحمد، نظرية الاسلام الاقتصادية الفلسفة والوسائل المعاصرة، القاهرة، مكتب الخانجي ١٩٦٠.

هەروەها:

Abusulay man. Abdulhamid. Ahmad. "The Theary of the Fconomics of Islam""Journal of Economics and MANAGEMENTS. W, No. ١٨٨٢ (١٩٩٨): International Islamic University IIUM. Kualalampur.

دەکات، کە پێشتر قەدەغە بووە، ئەوەش حەڵاڵ حەرام دەکاتو سوو (ربا) بە کتوپڕ بە بێ پێشەکی حەڵاڵ دەکات، ئەگەر سروشتی زانستو بەرنامەیەتییەکەی لەوکاتەدا، یان (ئیبن حەزم)و زۆر لەزانایانی تر بوەستانایە لەسەر ئەو شتانەی، کە گشتییەتن (کلیات)و جیاوازیی نێوان باسەکانیان بە وردیی‌و بەرنامەییانە بکردایە، بە پشتبەستن بە شارەزاییو ئەزموونو کارکردن، زۆر لەو جیاوازیانەیان هەستپێدەکرد، جیاوازیی نێوان لایەنەکانیان دەکرد، تێگەیشتنیان بۆ وتاری ئیسلامیی قووڵتردەبوو، سوودی گەورەتریان دەگەیاند، هیچ کەلێنێك نەدەبوو بۆ تێکەڵکرنو تێکدانیو هیچ دەلاقەیەك نەدەمایەوە، کە ئوممەتی ئیسلام پێوەی بناڵێنێ، ئەوەی ئێمە، دەربارەی قسە دەکەین، بریتییە لە تێکەڵکردنی نێوان وتاری هەرزەکارو ژێر لە ڕووی زانستییەوە لەگەڵ وتاری منالی تازە پێگەیشتووی دەروونیی ویژدانی پەروەردەیی.

## چەندایەتیی وتاردان بە چەندایەتی دوێنراوەکان

ئەگەر سەرنج بدەین، دەبینین، کە وتاری نیگای ئیسلامیی هەمەچەشنەیە، بە گوێرەی ئەوکەسانەی، کە قسەیان لەگەڵ دەکات، بە هەمەچەشنەیی لایەنەکانی بوون، بە هەمەچەشنەیی پێویستییەکان، دواندنی گشتیی هەیە، دواندنی بوونەوەریی ئەزەلی هەیە، هەروەها دواندنی کاتی شوێنیو شوێنی جوڵەیی هەیە، دواندنی ژیریی بیرکردنەوەیی هەیە، وتاردانی دەروونی ویژدانی ئامۆژگارییانە بۆ باوەڕدار هەیە، وتاردانی ترسێنەرو سەخت هەیە بۆ کەسانی لوتبەرزو خۆبەزلزان، وتاردانی تیایە بۆ کەسی ڕێنوێنیکەرو پەروەردەکارو مژدەدەر بۆ باوەڕداری کاراو ئیشکەر، وتاری تیایە بۆ دڵنەوایی منالو گەنجی تازەپێگەیشتوو، وتاری فراوانو دەوڵەمەندی تیایە، هەروەها وتاری تیایە بۆ کاتی پێویستو لێقەومان، وتاری ڕامیارییو دەسەڵاتی تیایە، وتاری تیایە بۆ کەسی سادە، وتاری تیایە بۆ سەرکردەو داناکان، وتاری تیایە بۆ تێکڕای خەڵکیی، وتاری پێغەمبەرایەتیو پەیامی تیایە، هەموو وتارێك سروشتو مەبەستی خۆی تیایە، دەبێ گرنگی پێبدرێ لە تێگەیشتنی بارودۆخو کاریگەرو شێوازی ڕاڤەکردنی وتارەکە، لەبەرئەوە، تەماشەکردنی زۆری وتارەکان بە زۆری

وتار بۆدراوەکان لەسەر ئەوەی باسی ڕاستو درۆ، یان باسی سڕینەوەو سڕێنراوە، ئەوە تەماشاکردنێکی سادەو ڕووکەشەو بەڵگەیە لەسەر لاوازیی فیکر.

لەبەرئەوە لە ترسناکترین ئەو شتانەی، کە فیکر تێیدەکەوێت لە کاتی بنیاتنانی کۆمەڵگەو شارستانییەتدا، تەماشاکردنی وتارەکانە بە ڕووکەشی لە دروستکردنی فیکرو بنیاتی کۆمەڵگەدا، لەپێشەوە باسمانکرد، کە وتاری وا هەیە لایەنەکان تێکەڵ دەکات، بە جۆرێ دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی وزەی بنیاتنانو کاریگەر، ئەوەش بەهۆی ئەو ترسە دەروونییە ئاینییەوە، کە دروستی دەکات، ئەم جۆرە وتارانە بۆ سەردەمی گۆشەگیریی‌و کەنارگیریی وتراوە کە لە هەمانکاتدا ترسی ماددیی ڕامیاری زاڵبوو لەڕێگەی ڕامیاریی دەسەڵات، ئەوەش بە هۆی لاوازیی‌و وێرانبوونی فیکرو دەسەڵات، کە هۆکارەکەی خۆجیاکردنەوەبوو لە نێوان فیکرو ڕامیاریی، نەمانی کارکردنی لە فیکر لە لایەکو نەمانی فیکریش لە مومارەسەو کارکردن لەلایەکی ترەوە.

لە کەش‌و هەوای کەنارگیریی‌و دوورکەوتنەوە، فیکری ئیسلامیی کەوتە هەڵەی تێکەڵکردنی نێوان وتاردانی کاتو شوێن لەسەردەمی پەیام، وتاردانی ئەزەلیی ئاینی خواییی، واتە تێکەڵکردنی جێگیر بە گۆڕاو، هەردەبوو –بە هۆی کەنارگیریی فکرییەوە– وتاری ترس‌و هەڕەشەو تۆقاندن تێکەڵ ببوایە لەگەڵ وتاری ڕێنماییکردن‌و ئاڕاستەکردندا، تێکەڵکردنی وتاردان بۆ بێباوەڕ لەگەڵ باوەڕدار، تێکەڵکردنی وتاری پێغەمبەرایەتیی بە وتاری دەسەڵاتو ڕامیاریی، تێکەڵکردنی وتاری سەرکردەو داناکانی بەوتاری کەمدەستیی‌و هەژاریی، تێکەڵکردنی وتاری چاودێرییکردنی منداڵ لەگەڵ وتاری بەرپرسیارێتی هەرزەو ڕەفتارەکانی.

ئەو تێکەڵکردنە ئامێرێکی پێویستبوو، چونکە پەککەوتەیی فیکریی دروستیکردبوو، لەگەڵ لاوازیی تێڕوانینی زانستیانەو بەشیەتی بەرنامەیی دەقی زمانەوانیی بێپەیوەندیی بە لێکۆڵینەوەی زانستیی کۆمەڵایەتیی فراوانی یاسایی.

## شوێنەوارە وێرانکارەکانی خراپ دانانی پیرۆزیی وتارەکان: دەروونی کۆیلەکان

بە هۆی تێکەڵکردنی وتارەکانەوەو بەپیرۆزدانانی وتارەکان، وتاری ترساندنی فیکریی خۆی سەپاندو بۆ فەرزکردنی پاشکۆیەتیی فیکریی، دەمداخستن‌و وشکبوون، ڕاهاتنی دەروون لەگەڵ ئەو ڕەنگە لە فیکرو ڕۆشنبیریی‌و ئەو کەسە پاکانەی، کە ئەم فیکرە هەڵدەگرن، دەسەڵاتی ڕامیاریی زۆرداری دەستەوسان لەم وتارانە، ئاسەوارە دەروونییە وێرانکارییەکەی زۆری سوودی لێبینی، خەڵکی بەگشتیی ڕەشۆی بەدەستەوەدا، خۆی دا بەدەست قەدەرو دەسەڵات‌و ستەم‌و بۆگەنەوە، هەتا لای خەڵکی بەگشتیی، دەروونیی کۆیلایەتی دروستبوو، خۆیدایە دەست کەسانیتر، خۆی سەرشۆڕکرد بۆ گەورەکەی، پەرژینی بەندیخانەکەی بۆ دەپاراستن، شینی دەکرد بۆ کوتەك وەشێن، تاوای لێهات بینیمان –دوای نەمانی سەردەمی داگیرکاریی، کە پشێویی هەموو کون‌و قوژبنێکی گرتبووەوە– کەسانی وا هەبوون داخیان دەخوارد بۆ ڕابووردووی "گەورە" داگیرکار، خەمباردەبوون بۆ نەمانی سەردەمی داگیرکاریی، ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین، کە خەڵکی دەرچوونەتە دەرەوەو ڕادەکەن بە شوێن دەهۆڵی درۆو دەلەسەکانی ڕاگەیاندن لە تەرمی "گەورەکان" لە خوێنرێژو ستەمکارەکان‌و فرمێسکیان بۆ دەڕێژن، فرمێسکی هیچ‌و پووچ‌و خەساربوون دەبینین.

وتاری ترساندنی دەروونیی، دەمگرتنی ژیریی، کوژانەوەی فیکر، سەپاندنی ڕاکان‌و قایلکردن، دەرگایەکە ڕواڵەتەکەی ڕەحمەتەو کراسی پیرۆزیی بە بەردا کراوە، پیشەسازیی دەربڕین‌و ڕەوانبێژیی، لافلێدانی بەرژەوەندییە خەیاڵاوییەکان، بەڵام ناوەوەی –بەبێ گوێدانە نیازەکان کە هۆکارن لەم وتارانەدا– پەردە دەخرێتە سەر عەقڵ، وەرنەگرتنی زانستە، کۆلەکردنی دەروون‌و ویژدانە، سیحرکردنە لە گیان، بەڕێوەبردنی کاروباری گۆڕە لەسەر دواکەوتن.

وتاری کۆنی ئیسلامیی، ترساندنی دەروونیی لەگەڵ بوو بۆ ئەوەی ڕووخان‌و پشێویی ڕوونەدات، مەبەستی زیاتر دەسەڵات پەیداکردنی چینی دەسەڵاتدار

بەسەر خەڵکداو ملشۆڕکردنیان بۆ فیکری بێدەنگیی، وتار ڕووی دەکردە تازەپێگەیشتووەکان، بچوك‌و منداڵان پشتگوێخران، پەراوێزخران‌و بۆیاخکران — هەروەکو چۆن بۆیاخی وتاری تازەگەشەکردووەکان کرا— بە زمانی ترساندن‌و هەڕەشەکردن، لە گرنگترین ئامێرەکانی ئەم وتارانە، تێکەڵکردنی وتاری باوەڕدار بوو بە وتاری بێباوەڕ، تێکەڵکردنی جێگیر بە گۆڕاو، بە پیرۆزدانان‌و پاك‌و بەرزێتیی دەقەکان بۆ ملکەچکردنی عەقڵی مسوڵمان، تا تەماشای دەوروبەر نەکات‌و ژیریی نەخاتە کارو هەست بە یاساکان نەکات، تا دەروون‌و ژیریی مسوڵمان، هەرچی شتی دژ بە یەکترە وەریبگرێت، مسوڵمانەکان خۆیان بدەن بەدەستەوە بۆ شتێ، کە "زیانیان پێدەگەیەنێ‌و سوودیان پێناگەیەنێ" لە ئەفسانەکان‌و شتە بێ بنەماو پڕوپووچەکان، ئیتر گرنگیدان بەفیڕۆچوو بە وتاردانی پێغەمبەرانەو دڵسۆزانەی ویژدانی دەروونیی پەروەردەیی بۆ منداڵ‌و تێگەیشتن‌و هەستکردن‌و هۆکارەکان‌و ئەو مەبەستانەی، کە بە هۆیەوە باوەڕو ئازایەتیی‌و گیانی خەبات‌و دەستپێشخەریی تیایدا، پەروەردە دەبێ، وایلێهات گرنگیدان بە ژیانی پێغەمبەر[1]و دەقەکان، خەریکبوو تەنها باسی کاروباری تایبەتی دەروون‌و فیکرو زیادکرنەوەو وەسفکردنی جەنگ‌و غەزاکان بێت.

---

[1] پێویستە لە پێناو فێرکردنی نەوجەوانانـدا جارێکی تر کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) بنووسرێنەوە. بەشێوەیەك گرنگیی بدرێت بە خودی پەیام‌و مەبەست‌و میتۆدەکانی، لەبەر ڕۆشنایی واقیعی کۆمەڵگای موسڵمان‌و وزوو پێویستییەکانی ئەو کۆسپانەی وان لە ڕێگایدا، تا بتوانین نموونەو ئایدیایەکی زیندوو بخەینە بەرچاویان، ئەوسا مەککە دەبێتە نموونەی قۆناغی دانانی بناغە و چەمك و ئامادەکردنی سەرکردایەتی‌و ساغکرنەوەکان‌و مەدینەش دەبێتە نموونەی بنیاتنانی کۆمەڵگاو نەتەوەو دەزگاکانی، لەم سەروبەندەدا ڕووداوگەل‌و کارەسات ڕوویانداو جەنگ‌و کوشتارو پەلامار بەرپابوون، نەوەکو سیرە بریتی بێت لە تەنها گێڕانەوەی زنجیرەیەك ململانێ و جەنگ‌و کوشتار، وەها پێغەمبەر بێتە بەرچاومان کە جەنگاوەر و پەلاماردەرێك بێت لە جەنگاوەران‌و پەلاماردەرانی مێژوو، وەك ئەوەی خۆرهەڵاتناسەکان برەوی پێدەدەن، بە گوتەزای بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە جەنگ‌و نووکی شمشێر، بەم شێوەیە پەیامی ئیسلامەتی دەبێتە پەراوێزو جەنگ‌و پەلامارەکان دەبنە بناغە، لە حاڵێکدا پێویستە پەیام بناغە بێت‌و جەنگ‌و پێکدادانەکان پەراوێزێك بن، بە پێی داخوازیی و بارودۆخ و ڕووداوەکانی مێژوو.

## وتاری پەروەردەیی‌و وتاری یاسایی: ڕژێمی تۆڵەسەندن وەك نموونە

وتاردان دەربارەی ڕژێمی تۆڵەسەندنەوە لە ئیسلامدا، وەك نموونە هەڵدەبژێرین بۆ هاوسەنگبوونی وتاری ئیسلامیی‌و هەمەچشنەیی لایەنەکان‌و ئەرێیەتی ئامانجەکانی لە یارمەتیدانی مرۆڤی مسوڵماندا لەسەر کاروبارەکانی ڕۆژانەی —بە تاك‌و کۆمەڵەوە— لە بارێکی باش‌و ئاسایش‌و ئارامیدا، دەستی دەگرێ —لە سنووری سروشتە مرۆڤایەتییەکەیدا— بەرەوگەشەکردن‌و بەخشین‌و وەفاکردن بە لێپرسراوێتیی‌و چاکەکاریی‌و ڕێزداریی، ئەم وتارە هەڵدەبژێرین، چونکە لە وتارەکانی تر زۆرترە، بە تایبەتی لە چەرخەکانی دواییدا، بووە هۆی —لای دۆستان‌و دوژمنان وەك یەك— تێکەڵکردن‌و خراپتێگەیشتن‌و بێئاگاکردنی مانای دەقەکان، کە دەبێت لەسەر بناغەی تێگەیشتنی سروشتی مرۆڤایەتیی بێت، مەبەستەکانی شەریعەت‌و هەڵسوکەوتی بنیاتنەرانە لەگەڵیدا، بە ئامانجی بەدیهێنانی جێبەجێکردنی ژیانێکی خۆش‌و چاك‌و کارامە.

بە وردبوونەوە لە سروشتی دەروونی مرۆڤایەتیی‌و لێکۆڵینەوەی شاراوەکانی، هەروەها وردبوونەوە لە وتاری تۆڵەسەندنەوە لە ئیسلامدا، هەست بە ڕاستەقینەیەتی مانای وتاری ئیسلامیی هەمەچەشنەیی‌و مەبەست لە هەموو جۆرەکانی لەوانەش وتاری تۆڵەسەندنەوە لە ئیسلامدا، دەبینیت وتاری ئیسلامیی، وتاری ئاسایش‌و دڵنیایی‌و ئارامییە، نەك وتاری تۆقێنەرو ترساندن بێت، کە بەدەستی دەسەڵات بێت، تا زاڵ بێت بەسەرخەڵکداو ترس بخاتە دڵیانەوە، هەوڵەکانیان ڕاوبکات بە هۆیەوە، شوێن ناموسیان بکەوێت، بەمەش دەبێتە ئامێرێك بەدەستییەوە بۆ ترساندنی خەڵك‌و دەروونیان دەبێتە کۆیلە، بە خۆڕایی ئیسلام ئەوەندە گرنگی نەداوە بە ئەم جۆرە وتارە: بۆ دابینکردنی دادپەروەریی‌و ئارامیی دەروونی خەڵك، جگە لەم جۆرە وتارە لە پێشتر هەیە، هەروا خۆڕایی نییە، کە ئەو مەرجانەی ئەم ڕژێمە دایدەنێ لە شایەتیدا لەتاوانەکانی ناموسیی‌و تۆڵەی داناوە، بۆ ئەوکەسەی، کە نەیسلەمێنێ، چونکە تۆڵەکردنەوە لەمجۆرە تاوانانەدا، لە ڕاستیدا بۆ دەرخستنە، نەك لەبەر خودی تاوانەکە بێت، هەروەکو هەموو شتەکانی تر، کە هاوشێوەی ئەمەبن، لە تاوانەکانی دەروون‌و ئارەزووەکانی دەروون، کە دەروون توانای نییە دەسەڵات

دابین بکات بەسەریدا، ئەم کارەش کۆتاییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەو ویژدان، بە پێچەوانەی تاوانەکانی خوێن‌و کوشتن‌و دزیکردنی سامان، کە مەبەست لە تۆڵە تیایدا کارەکەو بەرگریی کردنییەتی، تا جارێکی تر ڕوونەدات، دەستدرێژکاران راوەدوو دەنرێن، تا خەڵك پارێزراو بێت لە دوژمنایەتیان و تاوانەکانیان[١].

دیارنەمانی بیرکردنەوەو تێڕامانی زانستییانەی سنووربۆدانراو لە یاساکان‌و ژیان‌و ڕووداوەکان، بووە هۆی تێکەڵکردنی وتاردان، هەروەها وتاری منداڵان پشتگوێخراو لایەنەکانی پەروەردەیی هەستپێنەکرا، واتە تێپەڕبوونی منداڵیی‌و تێنەگەیشتنی وێنەگەیشتنی سروشتی منداڵیی، هەروەها تێگەیشتنی پێشکەوتنی قۆناغەکانی، زانینی ڕۆڵی منداڵیی لە ئامادەبوون‌و گۆڕاندا، تێگەیشتنی ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتیی‌و وتاری سووربوون لەسەر مافەکانی منداڵ، شێوازی پەروەردەکردنی‌و جۆری وتاردان بۆی‌و مانای ئەو وتارانە.

وتاری ترساندنی دەروونیی، کە فیکری ئوممەتی گرتەوە، خەریك بوو لە ناو عەقڵیەتی ئوممەتدا، جگە لە وتاری ترساندن‌و تۆڵەلێکردنەوە نەبێ لە منداڵ هیچی تر بەجێنەهێڵرێ، پاساوی دەدایەوەو کرابووە شوێنی هەڵواسینی بێدەستیی‌و سەرکوتکردن، ئەوەش لەلایەنی دەقێك –ئەگەر دروستبێت بە بێ بازدان بەسەر وشەدا– کە شتێکی مەبەستاوی بووە بۆ کارکردن لەگەڵ بارێکی شازو جیاکاریی، لەوانە کە بەخێوکەری منداڵێك لە (١٠)ساڵیدا لە منداڵەکەی دەدات لەسەر نوێژنەکردن: (علموا الصبي الصلاة إبن سبع سنين واضربوه عليها إبن عشر") (سنن الترمذي: ٣٧٢).

ئەم فەرموودەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە نابێ تۆڵە لە منداڵ بکرێتەوە لە ڕووی جەستەییەوە، لەسەر هیچ کارێك تا نەگاتە تەمەنی جیاکردنەوە (تمیز)و لە بەرپرسیاریەتیی تێنەگات، تا نەگاتە تەمەنی ١٠ ساڵ، ئیتر ئەوەش بە لێدانی سووك‌و بێ ئازار، یان ترساندن، کە منداڵەکە وا بزانێت ئازار دەدرێت، دوای

[١] بڕوانە: أبوسليمان، عبدالحميد، مجلة التجديد، الجامعة الاسلامية العالمية.

گرتنەبەری هەموو ڕێگا پەروەدەییەکان، ئەگەر بە زانستو تێگەیشتنەوە بێت، هەرگیز منداڵەکە لاسار نابێت، بە جۆرێك بێت کە لایەنی نوێژکردن ڕۆشن بکرێتەوەو بە گرنگ تەماشا بکرێت، نەك بە ڕاستەقینەیی پەناببرێتە بەر لێدانی منداڵەکە، کە لێدانی منداڵ نیشانەی پەککەوتنەو بەجێنەهێنانی شێوازەکانی پەروەردە کردنیەتی، کە لەو قۆناغەدا زۆر پێویستی بە پەروەردەیە، ئەگینا چۆن منداڵ دەتوانێ لاسایی گەورە بکاتەوە —هەموو هۆکارە پەروەدەییەکان بۆ چاندنی باوەڕ لە دەروونیداو ڕاهێنانی لەسەرنوێژکردنو پێشەنگی هەبێت لەسەرەتای منداڵییەوە— گرنگیبدات بە کارو سووربوون لەسەری بۆ ماوەی سێ ساڵ، هەموو ڕۆژێ پێنج جار، دوایی منداڵ نوێژ وازلێبهێنێتو نەیکاتو گوێی پێنەداتو جێبەجێی نەکات.

زاڵبوونی بوونی ئەو دەقە تایبەتییە (فەرموودەکە) —ئەگەر دەقەکە ڕاست بێتو وشەکانی بێ کەموکورتیيو هەڵەبن— لەم بارە تایبەتییەداو لە کەشو هەوای وتاری ترساندندا، چەمکی تۆڵەسەندن بوو بە بناغەی گشتیی پەروەردە، هۆکارێکیشە زاڵبووە بەسەر چەمکی ئوممەت بەرامبەر بە منداڵ، کەمکردنەوەی پلەوپایەی، بە بچوکدانانو پشتگوێخستنی کاری منداڵ، ئەو دەروونە تەڕو تازانە بەترسو تۆڵە پەروەردە دەکران، تا بووە ڕێگوزەرێکی گشتیی بۆ چەمکێکی نەزۆکی زانیاریی —بۆ منداڵانی ئوممەت بە گشتیی— لەسەردەرخستنی شتێك لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز، کە پێویستە بۆ دامەزراندنی نوێژ، کەمێکیش بۆ کاروباری ژیانی ڕۆژانە، هەروەها بووە هۆی دیارنەمانی ڕاستییەکی گەورە، لە ڕاستییەکانی سەردەمی پەیامی پێغەمبەرایەتیی، ئەویش ئەوەیە، کە پێغەمبەر (ﷺ) باوكو باپیرو پەروەردەکارێکی سەرکەوتوو بووەو لە ژیاندا هەرگیز لەمنداڵی نەداوە، چونکە بە بەزەیيو خۆگربووەو چاودێریی باری منداڵی کردووە، پێویستییەکانی بۆ پەیداکردوون، هەستیکردووە بە سروشتی دەروونو تواناو ئەو قۆناغەی کە پیایدا تێدەپەڕێت، بە گوێرەی ژیریيو هەستکردنیان قسەی لەگەڵ کردوون، کەسی وەك ئەو، هەرگیز لە ژیاندا پێویستی بەوە نەبووە، کە لە منداڵ

**بدات، چەکی پێغەمبەر (ﷺ) بریتییە لە خۆشەویستیی‌و خۆگریی‌و لێبووردەیی‌و چاودێریی کردن‌و ترساندنی ژیرانە لە پەیوەندیی خۆشەویستییەکاندا[1].**

[1] بوخاری لە ئەنەس دەگێڕێتەوە کە: پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو خەڵك رەفتاری جوانتر بووە، برایەکم هەبو ناوی: أبو عمیر بوو، وتی: وابزانم لە شیر براببووەوە، ئەگەر بهاتایە دەیفەرموو: ئەی ئەبوعومەیر، ئەوە چۆلەکەکە چی بەسەرهات؟ چۆلەکەیەکی هەبوو یاریی پێدەکرد، رێدەکەوت کاتی نوێژ دەهات‌و پێغەمبەر لە ماڵمان بوو، فەرمانی دەدا ئەو بەڕەیەی لە ژێریدا بوو گسکیان دەدا و ئاوپرژێنیان دەکرد، ئینجا هەڵدەستا بۆ نوێژو ئێمەش لە پشتییەوە نوێژی بۆ دەکردین. (صحیح البخاري: ٥٧٣٥).

ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا لە عەبدوڵلای کوڕی حاریسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا عەبدوڵلاو عوبەیدوڵلا دەرزەنێك لە وەچەی عەبباسی ریز دەکردو ئینجا دەیفەرموو: هەرکەسێك زووتر بگاتە لام ئەوەو ئەوەی دەدەمێ، ئەوانیش پێشبڕکێیان دەکرد بۆ لای دەکەوتن بەسەر پشت‌و سینەیداو ئەویش ماچی دەکردن‌و باوەشی پێدا دەکردن.

هەروەها ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا لە ئەبوهویرەرەوە دەگێڕێتەوە: کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا نوێژی عیشایان دەکرد، کە چوو بۆ سەجدە حەسەن‌و حوسەین بازیان دایە سەر پشتی، کە سەری بەرز کردەوە لە پشتەوە بە سووکیی دەستی گرتن‌و خستنییە سەر زەوی، کە چووەوە بۆ سەجدە جارێکی تر چوونەوە سەر پشتی، تا نوێژەکەی تەواو کرد، ئینجا لەسەر رانی داینان، وتی: چوومە خزمەتی‌و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بیانگێڕمەوە، ئینجا بروسکەیەك هات، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: بڕۆن بۆ لای دایکتان، ئەبوهورەیرە دەڵێت: رووناکیی ئەو بروسکەیە مایەوە تا ئەوان چوونە لای دایکیان. (مسند أحمد: ١٠٢٤٦).

ئەحمەد لە موسنەددا لە رافیعی کوڕی غیفارییی دەگێڕێتەوە کە: مندالٌ بووم بەردم دەگرتە دارخورمای یەکێك لە ئەنصار، پێغەمبەر (ﷺ) هات پێیان گوت: لێرەدا منداڵێك هەیە بەرد دەگرێتە دارخورماکەمان، هێنایان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێی فەرموو: رۆڵە بۆچی بەرد دەگریتە خورما؟ وتم: دەیخۆم، فەرمووی: بەرد مەگرە دارخوماو لەو خورمایە بخۆ کە دەوەرێتە خوارەوە. ئینجا دەستی هێنا بەسەر سەرمداو فەرمووی: خوایە سکی تێر بکە.

تیرمزی لە سونەنەکەیدا لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمووی دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم (ﷺ) کرد، قەت پێی نەوتم: ئۆف، قەت بە شتێك کە دروستم کردبێت پێی نەوتم بۆ دروستت کرد؟ ئەگەر

هەرگیز ئیسلام مەبەستی ترساندنی دەروونی خەڵك نییەو نایەوێ خەڵك لە ئیسلام وەك (دەروونی كۆیلەكان) بێت، هەروەها تۆڵەكردنەوە بۆ ترساندنی دەروونی خەڵك نییە، بەڵكو یەكێكە لە هۆكارەكانی پشتگیركردنی هەستی خەڵكیی بە ئاسایشو ئارامیی ئوممەتو بەئاگابوون لێیانو پاراستنیان، پشتگیریكردنی هێزی چاكە لە دەروونیاندا، تاریان بنێت لەشەڕو خراپەو تاواندا: (وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً) (الإسراء: ٣٢).

(مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً) (المائدة: ٣٢ ).

ئەمە بۆ ترساندنی ئەو دەروونانەیە كە نەخۆشن، نەك بۆ ترساندنی بێتاوان، كۆتا دەرمانیش سووتاندنە، لەبەرئەوەیە كە گومان تۆڵەی لەگەڵ نییە، چونكە مەبەست لە تۆڵەكردنەوە نەهێشتنی تاوانە، نەك ڕاوكردنی هەڵە، یان تۆڵەسەندن لە خەڵكو ئازاردانیان، هەرشتێكیش بێتە هۆی ئەوە، جگە لەتۆڵەكردنەوە — ئەگەر بە لابردنی تۆڵەسەندنەوەش بێت– ئەوە لە پێشترە، لەبەرئەوە هەمیشە هانی لێبووردن دەدرێت لە كاتی تۆڵە سەندنەوەدا، مادام لێبووردنەكە بە شێوەیەكی ئارەزوومەندانەو ترسی تۆڵەكردنەوەی دوایی لێناكرێت، لە مێژووی دادپەروەرایەتیی سەردەمی پێغەمبەرو سەردەمی جێنشینەكانی ڕاشیدین، چاكترین شایەتو بەڵگە هەیە لەسەر ئەمە.

ئەوە كەموكورتی نییە لە جێبەجێكردنی شەریعەتدا، بەڵكو ئەمە لێبووردەیی شەریعەتەو بۆ ئارامشكردنی ژیانە، ترسیش نییە هەرشتێكی تری لەسەر پێوانە بكرێت —بە هەڵە– كاروباری یادكردنو نوێژكردن بێت، چونكە تۆڵەسەندنەوە لە تاوانبار ئەوپەڕی سنوورە، ئەگەر ئاسایشی داواكراو بەدیهات، ئەوە چاكترە، بەڵام نوێژ بەجێهێنانی فەرزەكانی، كەمترین سنوورە بۆ یادكردنو بڵندترین سنوور بە پێی وزەی مرۆڤ و پێویستی دەروونییەتی بێ زیادەڕەوییو ڕۆچوون.

---

وازم لە شتێك هێنابا نەیدەوت: بۆ وازت لێ هێنا؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو خەڵك ڕەفتاری جوانتر بوو. (مسند أحمد: ١٩٤٥٣).

## وتاری پێغەمبەرایەتیی پەروەردەیی نموونەییانە

با بزانین پێغەمبەر (ﷺ) چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ حسەینی کوڕی عەلی، کە کچەزایەتی، کردووە، کاتێ دەزانین پێغەمبەرەو پێشەواو سەرکردەیە، پێشنوێژی دەکات بۆ مسوڵمانەکان لەناو مزگەوتدا، ئەم مناڵە لەگەڵ باپیری (پێغەمبەر) هاتە مزگەوت، چووە سەرپشتی باپیری لە کاتی کڕنووش بردنو سەرلەزەوی، پێغەمبەر (ﷺ) وازیهێنا، تا کەمێك لەسەرپشتی یاریکرد، پاشان پێش سەربەرزکردنەوە، بە سووکیی لایبرد، کاتێ هاوڕێکانی پرسیاریان لێکرد، کە کڕنووشەکەی لەسەر زەوی درێژبوو، ئەویش وەڵامێکی پەروەردەیی کاریگەرانەی زۆر کورتی بەدەستەواژەیەکی قووڵ، دانەوە: (إبني إرتحلني فكرهت أن أعجله حتى يقضي حاجته) (سنن النسائي: ١١٢٩). بەڵام ئەوەی لەفیکری گۆشەگیریی‌و پەراوێزخستنی مناڵ توانرا هەستپێبکرێت، ئەوە تێگەیشتنێکی ئاسان‌و ڕووکەش بوو، پەیوەندیی بە هەستکردن بە دەروونی پەروەردەیی مناڵەوەو لایەنەکانی هەڵوێستی نەبوو، کە بریتییە لە ڕێزگرتنی مناڵیەتی‌و مناڵ‌و ئەندازەگرتنی پێویستی مناڵ‌و هەروەها سووربوون لەسەر وەڵامدانەوەی ڕاست‌و دروستی مناڵ، بەڵگەی ئەم ڕووداوەو ئەم وانەو بارودۆخە، تەنها ئەوە نییە، کە پێغەمبەر (ﷺ) مناڵی خۆشویستووە، چونکە هەستەکانی خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کچەزاکەی پاساوی ئەوە ناداتەوە —لە خودی خۆیدا— ئەو هەڵوێستەو ئەو درێژەدانە بە کڕنووشبردن بە دوورودرێژیی، کە خەڵکی لەدوایەوە نوێژ دەکەن، تاوای دەرخات، کە کچەزاکەی خۆی خۆش دەوێت، گوێنەداتە ئەو خەڵکەی، کە لە پشتی سەریەوە ڕیزیان بەستووەو نوێژ دەکەن، چونکە هیچ نامۆو جیاکاری نییە کە پێغەمبەر (ﷺ) کوڕی کچەکەی خۆی خۆش بوێت، تا بیەوێت بۆ خەڵکیشی دەربخات، چونکە خۆشەویستی لەو چەشنە لە هەموو مۆرڤێکدا هەیە، بەڵام ئەوەی، کە پێغەمبەر (ﷺ) وتی: کاتێ وەڵامی خەڵکەکەی دایەوە، ماناکەی نازانرێ، مەگەر لەو بارودۆخە تێبگەیت‌و هەستبکەیت بە لایەنەکانی ئاڕاستەی پێغەمبەرایەتیی لە ڕووی دەروونیی‌و پەروەردەییەوە.

دەبینین چۆن ئەو منالّە لە لای باپیریەتیو ئەویش پێشنوێژیی بۆ خەڵك دەكات، پاشان ئەم باپیرە سەردەخاتە سەر زەویو كڕنووش دەبات، هەموو تێگەیشتنێكی منالّەكە لەم هەڵوێستە دابەزینی باپیریەتی بۆ زەوی، ئەو منالّە هەست ناكاتو نازانێت ئەم هەڵوێستە مانای چییە لە لایەن گەورەوە، كە بریتییە لە نوێژكردنو باپیریشی پێشنوێژە (إمام)، ئەو جوڵەیەش كڕنووشبردنەو كۆمەڵی مسوڵمانەكانیش لەپشتی باپیریەوە شوێن جووڵەی دەكەون، هەموو ئەمانە لە توانای تێگەیشتنی ئەو منالّەدا نییە، ئەو منالّە هیچ شتی بەلایەوە، كەلای گەورەكان گرنگە، لای ئەو گرنگ نییە، هەموو ئەوەی، كە لێی تێگەیشت ئەوەبوو، كە باپیری دابەزی بۆ زەوی، ئەمیش خێراو بە خۆشییەوە چووە سەر پشتیو دەستیكرد بە یارییكردنو گەمەو گاڵتە.

لێرەدا، دانایی پێغەمبەر (ﷺ) دەردەكەوێت، كە چۆن هەستیكردووە بە سروشتی جیهانی منالّییەتیو شێوازەكانی كاركردن لەگەڵ منالّدا، ئەوە دەرفەتێكی كردارییە، بۆ فێركردنی هاوڕێكانیو وانەیەكی كاریگەرە لە جیهانی منالّییەتیو وتاردانی جیهانی مندالّییەتی، كڕنووشەكەی درێژ كردەوە، پەلەی نەكرد لەدابەزاندنی منالّە یاریزانەكەی سەرپشتی، چونكە منالّە هەر ئەوە هەستپێدەكات، كە باپیری دایگرتووەو دەریكردووە، بە تایبەتی لە كاتی نوێژدا، ناكرێ قسە لەگەڵ ئەم منالّە بكات، هەڵوێستو كڕنووشبردنەكەی بەبێ دەنگییو بێقسەكردن بۆ ڕوون بكاتەوەو ئیتر منالّەكەش نەترسێ، لەبەرئەوە دەبینین پێغەمبەر ﷺدرێژە دەدات بە كڕنووشەكەی، تا دەرفەت هەبێ، منالّەكە یارییو گەمەی خۆی لەسەر پشتی بكات، كە دایگرتە خوارەوە منالّەكە دڵخۆشبوو، یاریكرد، دەروونی ساف بوو، دەریشی نەكردو تاریشی نەنا[1].

[1] ئەحمەد لە موسنەدەكەیدا ریوایەتی كردووە: ٢٦٣٦٣:

وتی: موحەممەدی كوڕی ئەبی یەعقوب لە عەبدوڵڵای كوڕی شەدداد لە باوكییەوە بۆی گێڕاینەوە كە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە یەكێك لە دوو نوێژی نیوەڕۆ، یان عەسر هاتە دەرەوە بۆ لامان، حەسەن، یا حوسەینی هەڵگرتبوو، پێغەمبەر چووە پێشەوە، مندالّەكەی داناو ئینجا نوێژی دابەستو نوێژی كرد، ئینجا چوو بۆ سوجدە، لە سوجدەیەكی نوێژەكەیدا زۆری پێچوو، وتی من سەرم بەرزكردەوە دیم

کاتێ ئەقرەعی کوڕی حابس وتی: بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بینی حەسەنی کچەزای ماچ دەکات، وتی من (١٠) مناڵم هەیەو هیچیانم ماچ نەکردووە، خێرا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من لایرحم لایرحم) (صحیح البخاري: ٥٥٣٨)، مرۆڤ یەکەمجار واگومان دەبات کە خوا ڕەحمی پێناکات، بەڵام ئەوەی، کە لێرەدا هاتووە، ئەوەیە لەلایەنی دەروونیو پەروەردەییەوە، کە هەرکەس بەزەیی بە بچوکدا نەیەتەوەو دڵڕەقیی بنوێنێ بەرامبەر بە مناڵ، کاتێ ئەو منالە گەورەبوو، دڵڕەق دەبێ بەرامبەر بەو گەورەیە: واتە هەرکەس بەزەیی بە منالی بچوکدا نەیتەوە، ئەوا کاتێ پیر دەبێت، ئەو منالە بەزەیی پیادا نایەتەوە، بەمجۆرە نەخۆشییو دەردەکانی دەروون بەشوێن یەکتریدا دێنو تێدەپەڕن بەسەر نەوەکاندا بە هۆی نەفامییو دڵڕەقییەوە.

بەڵام لەگەڵ کەموکورتیی تێگەیشتنی منالی، پشتگوێخستنی قۆناغەکانی منالی، دابیننەکردنی پێویستییەکانی، هەرگیز ناکرێت تێبگەین لەو وانەیەی، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی لایەنەکانی پەروەردە پیشانی داین، لەو سنوورەدا ناوەستێ، کە تەنها دەربڕینی خۆشەویستی باوك بێت بۆ کوڕەکەی، بەڵکو ئەمە فێرکردنی شێوازە دروستەکانە لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ منالییەتی بەبەرنامەی خۆشەویستیو سۆزو چاودێریکردنو گرنگیدان بە هەستو نەستی منالییو ڕێزگرتنیو متمانەکردن بە دەروون.

با گوێبگرین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ قسە دەکات لەگەڵ عەبدوڵڵا، کە کوڕی عەباسی مامیەتی، پێی دەفەرموێ: "ئەی منالەکە من چەند وشەیەکت فێردەکەم، خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێ، خوا بپارێزە، هەمیشە دەبینی ڕووی لە تۆیە، ئەگەر داوات کرد، تەنها لە خوا داوا بکە، کە داوای یارمەتیت کرد، تەنها لە

---

منداڵەکە وا لەسەر پشتی پێغەمبەری خوداو پێغەمبەریش لە سوجدەدا بوو، چوومەوە سوجدە، کە پێغەمبەری خوا نوێژەکەی تەواو کرد، خەڵك پرسییان: ئەی پێغەمبەری خودا لە نوێژەکەدا سوجدەکەت زۆر درێژکردەوە تەنانەت وامانزانی شتێك روویداوە، یان وەحیت بۆ دێ؟ فەرمووی: هیچ شتێك لەوانە نەبووە، بەڵام کوڕەکەم لەسەر پشتم بوو، پێم ناخۆش بوو پەلەی لێ بکەم تا کارەکەی جێبەجێ دەکات.

خوا داوا بکە، بزانە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببێتەوە لەسەر ئەوەی سوودت پێبگەیەنن، هیچ سودت پێناگەیەنن، بەو شتە نەبێ، کە خوا بۆتی نووسیوە، ئەگەریش کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێبگەیەنن، ناتوانن زیانت پێبگەیەنن، مەگەر بەو شتە نەبێ، کە خوا لەسەرتی نووسیوە، خامەو پێنووسەکان بەرزبوونەتەوەو لاپەڕەکانیش وشك بوونەتەوە". ترمیزی گێڕاویەتییەوە لە سونەنەکەیدا: ٢٤٤٠، وتی: حديث حسن صحيح.

چی لەم وتارەدا بەدیدەکەین؟ دوو مانای پەروەردەیی بنەڕەتیی هەردووکیان بەردی بناغەی هەموو پەروەردەیەکی ڕاستو دروستە بۆ مرۆڤی ئازادو بڕوادار، کە پەرستشی خەیرو چاکسازیی دەکات، یەکەمیان بنیاتنانی پەیوەندیی خۆشەویستییو پشتگیریی دەروونیی لە نێوان گەنجو پەروەردگاریدا، کە هەمیشە مسوڵمان دەپارێزێتو چاودێری دەکات، دووەمیان بریتییە لە گەشەپێدانی گیانی ئازایەتییو دەستپێشخەریی لەسەر بنەمای هەستی دڵو قابیلبوونی ژیریی، بەرپرسیارییەتی ویژدان، هەوڵدان بۆ جێنشینایەتیی، ئەگەر خەڵك فەتواشت لێوە بۆ بدەن[1].

لە وتاری پێغەمبەردا (ﷺ) بۆ کەسێ، کە تێبگات لە سروشتی دەروونەکانو ئەو قۆناغانەی، کە منالی پیا تێدەپەڕێت، هیچ بانگەوازێکی تیانییە دەربارەی گوێنەدانە بەرپرسیاریی و ترسنۆکییو هیچ شتێك لەو مانایانە، چونکە مەبەستی وتارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ منالّ بریتییە لە دروستکردنی ئازایەتییو ڕێزدارییو متمانەبەخۆ، بەڵام کارو کاریگەریی کارو لێپرسراویەتی خاوەن تواناو شیاویەتی لە تازەپێگەیشتووەکاندا، ئەوە بواری وتاردانە بۆ ژیرییو بەرپرسیارێتیو گەڕان بە دوای هۆکارەکانداو دەستپێکردنو پشتبەستن بە خوا

[1] ئیمام ئەحمەد بە سەنەدی خۆی لە هاوەڵی پێغەمبەر وابیسەی کوڕی مەعبەد دەگێڕێتەوە کە گوتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا پرسیاری لێ بکەم لەسەر چاکەو تاوان؟ وتم: سوێند بەو خودایەی تۆی بەراستی ناردووە، نەهاتووم پرسیاری شتێکت لێ بکەم جگە لەمە، فەرمووی: چاکە ئەوەیە سینەتی بۆ گوشاد دەبێتو تاوانیش ئەوەیە لە سینەتدا دەبێتە گرێ، با خەڵکیش بۆی بە ڕەوا بزانن، (المسند ج٤ ص٢٢٧). هەروەها دارمی لە کتێبی (الرقائق، باب في البر والإثم) هێناویەتی ٣٢٢/٢٠.

ناخرێته حیسابی کەسێکی پێگەیشتوو، تا عەقڵی تەواو نەبێتو هەست نەکات بەو کارەو سوور نەبێت لەسەر هەوڵو دەستگرتن بە هۆکارەکان[1].

وتاری پێغەمبەر (ﷺ) وتاری پەروەردەکردنە بۆ مناڵ، خۆشەویستیی دەربڕینە بۆ مناڵو ڕێزگرتنییەتی، هەرلەبەر ئەوەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) بەلای هەر منداڵێکدا، یان کۆمەڵە منداڵێکدا بڕۆیشتایە سەلامی لێدەکردن[2]، مرۆڤی پێگەیشتوو پیاوان بن یان ژنان، ئەو منالانە بوون، کە لە منداڵیدا ڕێزیان لێگیراو متمانەیان پێکرا، ئەگەر ویستت کەسێکی پێگەیشتوو ژیرو بەڕێز ببینی، ئەوا بچووکەکان لەسەر ڕێزداریيو متمانەو خۆشەویستیيو بەزەیی پەروەردەبکە.

ئەو گەنجەی، کە قامچی ئارەزوو لەشی لەت لەتکردبوو، هاتو داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) تا زینا بکات، ئەوەی دەربڕی، کە لە ناو دەروونیدا پەنگیخواردبووەوە، ئەمیش هەڕەشەی لێناکاتو نایترسێنێ، بەڵکو قسەی لەگەڵ کردو دەروونی وروژاندو بەرزێتیی شاراوەی تیا هێنایە دەرەوە، تا بیکاتە پاسەوانی ئەو بارەی، کە ئەم گەنجە گیرۆدەی بووبوو، لە کاتێکدا ئامۆژگاریی لاوانی دەکرد ئەوانەی، کە ناتوانن ژنبهێنن، دەستبگرن بە هۆکارەکانەوە، لەوانە ڕۆژووگرتن، چونکە ڕۆژوو ئارەزوو دەبڕێ، یارمەتیی گەنجەکان دەدات لەسەر دەروونیان، لە هەمانکاتدا داوا دەکات گەنجەکان زوو ژنبهێنن، باری شانیانی سووك دەکرد، یارمەتی هەژارانی دەدا بۆ دابینکردنی تێچوونی ژنهێنان.

ئەمەیە سروشتی وتاری پێغەمبەر لە بواری پەروەردەییدا بۆ مناڵ، تیادا داوای دەرخستنی گرنگیپێدانو چاودێریی دەکات، خۆشەویستیيو نەرمو نیانیی لەگەڵ منالدا دەردەخات.

---

[1] موسلیم لە صەحیحەکەیدا (٤٨١٦) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتییەوە کە فەرموویەتی: (سوور بە لەسەر ئەوەی سوودت پێدەگەیەنێت، پشتیش بە خوا ببەستە و لاواز مەبە). هەروەها ترمیزی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە گێڕاویەتییەوە کە دەڵێت: پیاوێك وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا............).

[2] صحيح البخاري: ٤٠، عن أنس رضي الله عنه، متفق عليه.

له منالّیدا —له لایەنی خۆشەویستیی‌و هاندان‌و گرنگیپێدان‌و ڕێزگرتن— دەروون گەشە دەكات، تواناو وزەكان گەشە دەكەن لەسەر كارو بەخشین‌و پێدان‌و دەستپێشخەریی‌و بەرزێتیی‌و ڕێزدا.

بەڵكو گرنگیدانی پێغەمبەر (ﷺ) بە كاروباری ماڵ‌و لە پێش ئەوەی چاوەكانی ڕووناكیی ببینێت دەستپێدەكات، ئەوەش بەهەڵبژاردنی دایك‌و باوكی چاك، كە بتوانن جوان منالّ پەروەردە بكەن "أنكحوا الصالحين والصالحات"[1]، "تخيروا لنطفكم وأنكحوا الأكفاء"[2]، "تزوجوا الودود الولود"[3].

مسوڵمانەكان وتاری پێغەمبەریان (ﷺ) لە بواری پەروەردەیی بە بەزەییانەییان بەرامبەر بە منالّ بەفیڕۆ داوە، لە جیاتی ئەو وتارە، وتاری گاڵتەپێكردن‌و توندو ترساندنیان داناوە، هیچ گرنگییەكیان نەداوە بە لێكۆڵینەوەی ماڵ‌و منداڵییەت‌و گەشەی ڕواندنی تواناو وزەكانی دەروونیی‌و جەستەیی شاراوە تیایدا، بۆ بەدیهاتنی گەڕانەوەی وزەو گۆڕانكاریی هیچیان نەكردووە، ئیتر گەلەكانیان سەرشۆڕبوون، وزە شارەوەكان كوژانەوە، هۆزو دوژمنان‌و نامۆكان‌و پاشاكانیان هێنا، تا بەرەنگارییان بۆ بكەن‌و وڵاتەكانیان بۆ بپارێزن، گەلەكانیان سەركوت بكەن‌و ئەوانیش‌و خۆشیان —لە كۆتایی سوورەكەدا— ببنە نێچیری چەكی سەربازەكانیان‌و دەسەڵاتی دوژمنەكانیان.

---

[1] سنن الدارمي: ٢٠٨٦.

٢ سنن إبن ماجة: ١٩٥٨.

٣ سنن النسائي: ٣١٧٥.

# بەشی چوارەم

# چارەسەری بنەڕەتیی: بنیاتنانی منداڵییە

وەك لە پێشەوە باسمانکرد، هۆکارە کاریگەرەکان لە باسە گەورەکاندا، هەمە چەشنەیە، هەوڵەکانیش بۆ چارەسەرکردنی گرفتە گەورەکان هەر دەبێ هەمەچەشنە بێت، دەبێت بزانین، کە لە هەموو بارەکاندا، هەموو هۆکارو هەوڵێك بەندە بە کێشو ئەوبەرێتی لەسەر سروشتی هەڵوێست، لەسەر بارودۆخی گرفتو ئاستەنگو ئەو پەیوەندییانەی، کە دەوریانداوە، لەبەرئەوە، ئەم لێکۆڵینەوە، ئەو تێڕوانینو چارەسەرەی پێشکەشی دەکات، بۆ خستنەگەڕی پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی، گرنگییەتی هۆکارە زۆرەکانی تر هەڵناوەشێتەوە، لە قەیرانی ئوممەتو کەموکورتیی گەیاندنەکەیدا، گرنگی هەوڵەکانو سەرەتای کارەکانو چاکسازییەك، کە هەیە لە هەموو ڕووەکانو بەرەکانی ڕامیارییو ئابووریيو کۆمەڵایەتییو بانگەوازییەتو بەرگریی هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو مەبەست لێی، تەواوکردنی ئامێرەکانی زانستییو فیکرییو ڕۆشنبیرییو پەروەردەییە، هەتاکو کارکردن تێرو تەواو بێت لەگەڵ هەموو هۆکارە کاریگەرەکان لە هەڵوێستدا، هەروەها تەواوکردنی هەموو هەوڵەکان بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن لە چارەسەرکردنی قەیرانەکەو گەڕانەوەی وزەو ڕۆڵی شارستانی پێشەکی ئوممەتی ئیسلام، هەرچەند تامی زانست لە ڕووی کەموکورتییەکانیەوە گوژاڵکەبێتو تامی ڕەخنەی خۆی تاڵ بێت.

ئەو هۆکارەی، کە ئەم لێکۆڵینەوە ئامانجیەتیو گرنگی پێدەدات، بریتییە لە کاروباری منداڵییەت کە کۆتایی بەوەیە تا ئێستاش ئەو لایەنە نادیارە گرنگەیە لە فیکری ئیسلامییدا، کە بووە ڕێگر لە بەردەم خستنەگەڕی پڕۆژەی چاکسازیی ئوممەتو جوڵاندنی شاراوەکانی وزەی گۆڕین تیادا، هەروەها دیارنەمانی ڕۆڵی منداڵ لە بنیاتی کۆمەڵگە، لەپاش سەردەمی پەیامی پێغەمبەرایەتییو تائێستاش، هۆکاری سەرەکییە لە وێرانبوونی کۆمەڵگەی مسوڵمانانو

دابەشبوونی کۆمەڵییەکەی‌و کێشەکانی‌و بڵاوبوونەوەی هێزی هۆکاری پەککەوتنی هەوڵەکانیش بووە لە گۆڕان‌و چاکسازیی کەلێنەکان، هەروەها هۆ بووە بە ئەنجام نەگەیاندنی پڕۆژەکانی چاکسازیی شارستانییەتی ئیسلامیی تا ئەمڕۆ.

لە لاپەڕەکانی پێشوودا، هەوڵماندا وێنەیەکی ئەو ژینگە ڕامیاریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و فیکرییە بکێشین، ئەو هۆکارانەش ڕوونبکەینەوە، کە بووە هۆی لاوازیی گرنگیدان –لە فیکری ئیسلامییدا– بە منالییەت‌و ڕۆڵی منال لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیی لەلایەك‌و پەیوەندیی بە خراپی باری کۆمەڵایەتیی‌و گەڕانە دواوەی شارستانییەتی ئیسلامیی لەلایەکی ترەوە، هەروەها جیابوونەوەی دوورکەوتنەوەی هەردوو هەڵبژاردەی فیکریی‌و ڕامیاریی –ئەو پەککەوتنەی، کە لەوەوە پەیدابوو– بووە هۆی زاڵبوونی فیکری دەقی تیۆریی، لەمەشەوە سۆفستایی قوتابخانەیی لە (ڕۆشنبیریی تایبەتیی) پەیدابوو، فیکری پڕوپووچ‌و ڕووکەش لە (ڕۆشنبیریی گشتیی) دروست بوو، (دەقیەتی دەرخەری) لە (بەرنامەی فێرکردن) هاتەکایەوە، (دەسەڵاتییەتی بەرز تەماشای خۆکردن‌و زۆرداریی) لە (بەرنامەی پەروەردە) دەرکەوت، ستەم‌و بە فیرۆدان‌و زۆرداریی لە کاروباری دەسەڵات‌و حوکمدا پەیدابوو، لە ڕووی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگەوە، پارچەپارچەیی‌و ململانێ دروست بوو، کەموکورتیی‌و تێکشکان لە گەیاندنی تاك‌و کۆمەڵگە سەریهەڵدا، لە شارستانییەت‌و ئاوەدانکردنەوەدا ڕووخان‌و بەرەو دواڕۆیشتن پەیدابوو.

## ڕێگای چاکسازیی‌و بەرەنگاربوونەوەی ئاستەنگەکان

لەگەڵ ئەوەی، کە قەیرانی ئەم ئوممەتە لە بناغەکەیدا، ڕامیاریی کۆمەڵایەتییە، کە بە هۆی کێشەی لایەن‌و تاقم‌و ڕەگەزەکانەوە پەیدابووە، دواتر بوو بە قەیرانێکی فیکریی ڕۆشنبیریی شارستانییەت‌و لەگەڵ ئەم بارەدا تێڕوانین‌و ڕۆشنبیریی تێکچوو، فیکریشی لەگەڵ کوژایەوە، دوایی کارەساتەکە لەوەدا بوو، کاتێ گۆڕا بۆ قەیرانی دەروونیی ویژدانیی پەروەردەیی قووڵبوو بە

میرات مایەوە، بووە هۆی ئەوەی، کە ئوممەت پاڵبداتەوەو توانای لەسەر چاکسازیی‌و لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان بگەڕێنێتەوە.

بۆ ئەوەی قەیرانەکە چارەسەر بکرێ، چاکسازیی تەواو هەبێت، ئوممەتیش هەنگاو بنێ بەسەر ڕێگرەکانداو ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان بوەستێ، دەبێ لێکۆڵینەوەو پەند وەربگرین لەم قۆناغە، دەستبکەین بە هەڵوەشانەوەو شیکارکردنی پێچەوانە، بە ئامانجی ناسینی ناوەڕۆکی ئاستەنگەکان، ڕووەکانی کەموکورتیی لە گەیاندن، کە تووشی ئوممەت دەبێ، تا پێشەنگەکانی ڕووەکانی گۆڕان‌و چاکسازیی بدۆزینەوە، ئوممەت ڕووبەڕووی ببێتەوەو بتوانێ توانای بگەڕێتەوە لەسەر جوانکاریی گەیاندن، هەروەها دامەزراندن‌و چەسپاندنی ئاینی یەکتاپەرستی‌و جێنشینیایەتیی‌و دادپەروەریی‌و کارو یارمەتیی‌و ئاسایش‌و ئاشتیی، لە گەیاندنی ڕۆڵی لە هەڵسەنگاندن‌و ڕاستکردنەوەو بەخشین‌و شارستانییەتی مرۆڤایەتیی.

## ئاستەنگەکان

بۆ ئەوەی هەوڵەکان کاریگەر بێت‌و چاکسازییەکان بەرهەمدار بێت، دەبێ ئێمە بزانین ئەو ئاستەنگە گەورانە کە ڕووبەڕووی عەقڵی مسوڵمان‌و ئوممەتی ئیسلام دەبێتەوە چییە، تا ببێتە بەڵگەی ڕێنموونیی‌و ئاڕاستەی کارەکانی گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی بکات، پێوەریش ئەنجامەکانی ڕاستییە زانستییەکان بێت، نەك تەنها ئاواتخواستن بۆ توانای زانستیی‌و تەکنیکیی (تەکنەلۆجی).

گەورەترین ئاستەنگ، کە ئەمڕۆ ڕووبەڕووی جیهانی ئیسلامیی بووەتەوە، کە دەبێ ڕێی لێبگرین‌و پێش هەموو شت زاڵ بین بەسەریدا، کە مەرجی سەکەوتنە لە هەموو شتێکی تر، بریتییە لە ئاستەنگی (توانای زانستیی تەکنەلۆجی) کە توانا گەورەکەی بوو بەهۆی سەرشۆڕکردنی جیهانی ئیسلامیی، هۆکارەکانی (بەجیهانیبوون)[1]، زیاتر توانای بیانییەکانی بەهێزکرد —بە هۆی توانا زانستیی‌و

[1] دەبێ جیاوازیی بکەین لە نێوان جیهانییەت و بەجیهانییبوون، چونکە جیهانییەت —لە بۆچوونی ئێمەدا- بریتییە لە داڕێژراوێکی بڕیاری ڕاستیی، لەبەر ئەوە لە بنیاتی زمانەوانییدا، واتە تواناو

تەکنەلۆجییەکەوە– لەسەر زیاتر دەسەڵات پەیداکردن لەسەر ئوممەتی ئیسلامو زاڵبوون بەسەریداو سامانەکەیان بە تالآنبرد، ڕۆڵی ئوممەتی ئیسلامو ڕۆشنبیرییەکەیو قەوارەکەی، پەراوێزخراو پارچە پارچەکرا.

به دەستخستنی (توانای زانستیی تەکنەلۆجی) کارێکە بە هێنانی ئامێرەکانو کەلوپەلو ناردنی کۆمەڵی لاوان بۆ هۆڵی خوێندن نییە، بەڵکو ئەمە –بە پلەی یەکەم لە ڕووی ڕۆشنبیرییو بەرنامەو پەروەردەوە– بە پێشخستنی عەقڵییەتی زانستییەوە، هەروەها گەشەپێدانی توانای دەروونیی داهێنراوانەیە، هەرچی ئامێرو کەلوپەل هەیە لە دەرەوە هێنامان، سەرەنجامەکەی هەر چەسپاندنی گیانی بەکاربردن بوو لای نەوەکانی ئەم ئوممەتە، دەرامەتەکان بە فیڕۆ ڕۆیشت، کۆمەڵێ لە کەسانی تەکنیکیی، کە شتیان لەبەرکردووە، کوێرانە نووسینگەکانیان پڕکرد لە بێکاریی ڕووپۆشکراو، چونکە گرفتەکە لە ناوەڕۆکدا گرفتی فیکریی ڕۆشنبیریی پەروەردەییە، پێش ئەوەی، کە باسی ماددە چەندێتی بێت.

دەبێ هەرنەتەوەیەك، کاتێ هەوڵدەدات لەسەر وەرگرتنی توانای زانستیی تەکنەلۆجی، خاوەنی بیرێکی مرۆڤایەتیی کۆمەڵایەتیی زیندوو، زانیاریی کۆمەڵایەتیی مرۆڤایەتیی زیندوو، پڕۆگرامی زانستی یاسایی، کە لەسەر عەقڵی مرۆڤی بە ئاگا بنیاتنرا بێ.

ڕۆشنبیریی زانست و تەکنیك، بریتییە لە ڕۆشنبیریی یاسایی، بەرنامەیەتییەکەی بەرنامەیی یاساییە، بەڵام هەرئەوە بە تەنها ڕۆشنبیرییو شارستانییەتی زانستیی گیانی خێرخواز دابین ناکات، بۆ ئەوەی ڕۆشنبیریی زانستیی مرۆڤایەتیی شارستانیی گیانی خێرخوازبێت دەبێت ئامانجی ئەو

---

هۆکارە زانستییەکان، کە وادەکات مرۆڤ پەیوەندییو یەکترناسینو ئاڵوگۆڕو هاوکاریی هەبێ، بەڵام بەجیهانییبوون ئەمە داڕشتەیەکە، مانای پێشێلکردن دەگەیەنێ، کە زاراوەیە مەبەست لێی بریتییە لەوەی کە ئەمڕۆ دەکرێ لە بەکارهێنانی تواناکانو بوارە زانستییەکان لە لایەن خاوەن هێزو دەسەڵاتەکانەوە، بۆ زاڵبوون بە سەر گەلانو لاوازکردنیانو ژێربارکردنیان و دەسەڵات پەیداکردن بە سەریانداو بە تالآنبردنی سامانەکانیان.

ڕۆشنبیرییە، ڕێکخستن‌و کۆمەڵایەتیی‌و داهێنراوانەی زانستیی ئامانجی خێرخوازانە بێت، پشتببەستێ بە ڕێنموونی جێگیرە باوەڕییەکان بە خوای حەق، لەسەر بناغەی ڕێبازی مەبەستیەتی یەکتاپەرستی ڕەوشتیی، بەهاکانی دادو هاوکاریی‌و ئاشتیی، نەك هەموو هەوڵێکی زۆرکردن‌و گەورەکردن‌و بەرهەمهێنانی چەکی بەڵاو وێرانکار بێ، بۆ ئەوەی ئوممەت بتوانێ بەرەنگاری ئاستەنگی (زانست‌و تەکنیك) ببێتەوە، دەبێ بەرەنگاری گرفتە ڕۆشنبیریی‌و پەروەردەییەکانی ببینەوە، تابتوانێت مەرجەکانی بەرنامەیەتیی پەروەردەیی پێویست فەراهەمبهێنێت، بۆ سەرکەوتن لە بەدەستهێنانی توانای زانستیی تەکنیکیی.

## گرفتی ڕۆشنبیریی: لابردنی جەنگە ناڕاستەکان‌و ڕاستکردنەوەی چەمکەکان

### ئیسلام ئایینی ژیریی و قایلکردن و زانستە

گرفتی یەکەم لەم شوێنەدا، بریتییە لە گرفتی ڕۆشنبیریی، ئەم گرفتە دەبێ ڕووبەڕووی ببینەوەو تێکچوونەکان‌و کەموکورتییەکەی، ڕاست بکەینەوە، کە نوقم بووە لە بنەماکانی ژیرییەتی زانستیی، بەرنامە یاساییەکان تێکدەدات‌و وزەی فیکریی لاواز دەکات.

دەبێ ئوممەت متمانەی بە خۆی بگەڕێنێتەوە، هەروەها بە بەهاکان‌و ڕێبازەکان‌و ڕۆڵەکانی، سەردەمی پەیام لەسەر باوەڕ بنیاتنرابوو، کە ئەویش لەسەر قایلبوون‌و ڕاوێژو ڕێزی عەقڵ دامەزرا بوو، پەیامی ئیسلامیش قسەی لەگەڵ ویژدان‌و عەقڵو دەروون دەکرد، ڕێگای قایلکردنی زانستیانەی گرتەبەر، جەنگی لەگەڵ ڕێگای نەفامیی‌و شوێنکەوتنی کوێرانە بەرپاکرد، باوەڕ وتارێك بوو هاوڕێکان پرسیاریان لێوەدەکرد، هاوڕێکان گفتوگۆیان لەسەر دەکرد، ڕەخنەیان دەگرت، هاوڕێکان باوەڕیان پێهێنا، باوەڕیانهێنا بە باوەڕی تێگەیشتن‌و خۆیان دابەدەستەوە، بەڵام بە قایلبوونەوە، نەك باوەڕی ترس، نەك

خۆبەدەستەوەدانی ترساندنو تۆقاندن، بۆیە بوونە ڕێنموونیکەری کاراو خەباتکارانی بەهێز.

ڕێزگرتن لە عەقڵی مرۆڤ و ڕێزگرتن بە قایلبوونی ویژدان، هەردووکیان ئەو بەردە دامەزراوو بەهێزەبوون، کە چەرخی پەیامی ئیسلامی لەسەر بنیات نرا، ئازادکردنی مرۆڤ و ئازادکردنی ویژدانی مرۆڤ، مەبەستی ئیسلامو مەبەستی فتوحاتەکانی ئیسلام بوو:

(وَقُلِ الْحَقُّ من رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ) (الكهف: ٢٩ ).

(وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَـذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّاً وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيراً) (النساء: ٧٥ ).

(وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ) (البقرة: ١٩٠ ).

(فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (البقرة: ١٩٤).

## تۆڵە لە مسوڵمانی پاشگەزبوو، پەیوەندیی بە باوەڕ یان قایلبوونەوە نییە

هیچ کەس لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کاتێ پاشگەزبووبێتەوە، لە هەڕەشەی مەرگ نەترساوە، چونکە دەیانزانی باوەڕبوون بەبێ قایلبوون نابێ، ئەمە بنەمایەکە لەبنەماکانی ئایینو مەبەستەکاتەکانی، نابێتو دروست نییە ئاین بسەپێنرێ بەسەر مرۆڤدا، هەڕەشە پەیوەندیی بەباوەڕو دڵەوە نەبوو، بەڵکو وتار بوو بۆ جولەکە، پیلانیان دەگێڕا، تا بە ڕواڵەت بچنە ناو ئیسلامەوەو لە ئیسلام بێنە دەرەوە، بۆ دروستکردنیی گومان لە دڵی خەڵکدا، ئەوە باسی پیلانو نەفرەتو فێڵە، نەك پەیوەندیی بەباسی باوەڕو قایلبوونەوە بێت.

(وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُواْ بِالَّذِيَ أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُواْ آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) (آل عمران: ٧٢ )، لەبەر ئەوە، لەمەدا هەڕەشەکردن لە پیلانگێڕانو ترساندنیان، هەڵوەشانەوەی مافی مرۆڤ نییە لە قایلبوونو

باوەڕیی، هیچ کەسیان لە خەڵکی ئایینەکانیترو شارستانییەتەکان، بە زۆرو کوتەك نەهێناوەتە ناو ڕژێمو باوەڕیی، تەنها ئەوە نەبوو، کە کەسێ باوەڕی هێنابێ لە قایلبوونو زانستەوە، هەرگیز ئایینیی یەکتاپەرستییو جێنشینایەتییو بەرپرسیاریەتییان نەگۆڕیوە بە شتی پڕوپوچو هاوبەش پەیداکردنو بتپەرستییو نەفامیی بێباوەڕییو ئینکارییکردن، بەڵکو ئەم ژیرییە باوەڕی بەمرۆڤ هێنا، لە بڕیاردانی بە مافی چارەنووسی خۆیدا، ئەوبارەی هۆزە بتپەرستە عەرەبییەکان نەبووە، کە ڕژێمی کۆمەڵایەتییان لە باری سەرەتاییدا بوو، ئەم کارەی لەلایەن هۆزە عەرەبەکانەوە کاری باوەڕهێنانو قایلبوون نەبوو، بەڵکو کاری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی شارستانیی بوو (كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لاَ يَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً) (التوبة: ٨ ) (قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ) (الحجرات: ١٤ ).

ئەمە ئەو بارەی سەردەمی دوایی ناگرێتەوە، کە متمانەیان —لە سەنگەرەکانی بەرگریی دژی هێرشەکانی نەفامییەت— بە مرۆڤ، بە ژیرییو مافی نەما، خۆیان گرژکردەوە لە بڵێسەی بەرگرییکردن لە خودو پیرۆزییەکان بۆ دەقە ڕووتەکان لەهەستی ناوەرۆك بەدوای کاتو شوێندا، لەبەرئەوە (پاشگەزبوونەوە) سنوور بوو، نەك (تەمێکردن)، باوەڕیش بەمە تێکەڵ بوو بە گومانی زۆرکاریی، هەرورەکو خزمایەتییو خوێن بۆ نەتەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هۆکار بوو بۆ ناچارکردنی عەرەبێکی سەرەتایی بتپەرست، لە ئیسلام بوون لەسەر ڕژێمە کۆمەڵایەتییەکەی، نەك بۆ سەرەتایەتی کۆمەڵگەکەیو بێبەهاییو پەیوەندییەکانی، بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی بەهاکانو ڕژێمە کۆمەڵایەتییە شارستانییەتییەکانو هاوشێوەکانیان، لە خاوەن ئایینە ئاسمانییەکان و شارستانییەکان لە جولەکە و گاور و مەجووسییەکان، ئەوەی لە شارستانییەتدا هاوشێوەی ئەوانە[١]، زۆرکردن لە هۆزە عەرەبەکان لەسەر ڕێبازی (إما حرب وإما

[١] أبو سليمان، عبد الحميد أحمد، ترجمة: ناصر أحمد المرشد البريك. النظرية الاسلامية للعلاقات الدولية: إتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الاسلامية. الرياض: مطابع الفرزدق التجارية، ب ت. ص٢٠٢- ٢١١.

إسلام) واته یان جەنگ، یان مسوڵمان بوون، ئەمە دەستگرتنی ئەو کەسە سەرەتاییانەیە —بەزەیی هاتەوە پیایاندا— بۆ ناو کۆمەڵگەی شارستانیی‌و پێگەیشتنی کۆمەڵایەتیی‌و ڕێزی مرۆڤایەتیی، ئەمە پشتگوێخستن نەبوو بۆ ڕێبازی سەربەستی بیروباوەڕ.

## کۆنی نوێ لە بەرنامە: ئایینیی و شارستانیی

ئەم نمونەیە ئەمانبات بۆ گرفتی بەش‌و پیتییەتی دەقی‌و لاوازیی بەرنامەیی لە پەیوەندییە لەپێشترەکان‌و ڕێبازەکان بە دووردرێژیی‌و ڕووداوەکان لە ڕۆشنبیریی ئوممەتی ئیسلام، ڕۆڵی لە تێکدانی عەقڵییەتی زانستیی، چونکە ئەگەر ڕووبەڕووی ئەم گرفتە بە شێوەیەکی تەواوو زانستیانە نەبێت، ئەو کاتە گفتوگۆی فیکریی، گفتوگۆیەکی نەزۆك دەبێت‌و لە ئەڵقەیەکی بۆشدا دەسوڕێتەوە، دەشبێتە هۆی دامەزراندنی بنیاتی ڕووبەڕووبوونەوەی یەکترو پێچەوانەیی‌و کۆکردنەوەی کۆمەڵە لە یەکتر لە نێوان ڕۆشنبیرانی ئوممەت‌و بیریارەکانیدا، لە نێوان لاساییکارو هاوچەرخیی، ئایینیی‌و شارستانیی‌و عەلمانیی، ئوممەت واز لێبهێنرێت —لە نێوان ململانێ، کە لە شێرەکانی ڕۆشنبیرانی ئوممەت— لە هۆشچوون‌و کوژانەوەدا.

زۆرێك لە (دەزگاکانی) ئایینیی هەستی ترس زاڵبوو بەسەریدا، بە هۆی هێرشی ڕۆشنبیریی هێرشبەرانەوە، بە حوکمی لاوازیی توانا لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی، لەبەرئەوە لە زۆربەی وتارەکانیدا (ترساندن)ی تیایە، هەروەها هێرش پێچەوانە لەسەر شارستانییەتیی‌و عەلمانیی، ئەوانەی پێچەوانەی بن دەبنە دەرچوو لە ئایین، ئەمە لەڕوویەکەوە، هەروەها قایلنەبوونی شارستانیی بە وتاری ئاینیی‌و بەرنامەکانی فیکریی‌و وتارەکەی، بووە هۆی ترسناکییەتی وتاری شارستانیی‌و عەلمانیی‌و دوژمنکارییەکەی، ئایین وەسفبکرێت بە درۆو بە دواکەوتن‌و نەفامیی، چونکە هەنگاوی ئەو هەڵناگرێت لە ئەم پێشکەوتنەو لاسایی کردنەوەی کوێرانە (بۆ خەڵکیتر).

ئەم پێکدادانە بووە هۆی جەمسەرگیرییەکی وێرانکەر شارستانیی‌و عەلمانیی نەفامی لە ناسینی شاراوەکانی ئایینییەکەی‌و شارستانییەتەکەی لادا، تا

هەڵوێستی لە ئایین‌و مێژوو لە نێوان دوژمنایەتیکردن‌و گوێپێنەداندا ئەملاولا دەکات، هەروەها کەسی ئایندار، لە هەمانکاتدا گوێ ناداتە شارستانییەتی مرۆڤایەتیی لە زانیارییەکان، ئەم ترسە لەلایەنییەوە لەسەر ئایینەکەی‌و مێژووەکەی‌و کەلەپوورەکەیەتی، لە گیانی دۆڕاندن‌و خۆبەدەستەوەدان بۆ زانیاریی مرۆڤایەتیی‌و عەقڵییەتی هێنراو، بەمەش ئوممەت ئیفلیج بووەو دابەشبووە بەسەر دوو قوتابخانەدا: یەکەمییان قوتابخانەی ئایینیی پیشەیی لاساییکار، دووەمیان قوتابخانەی شارستانیی نائاینیی لاسایی کاری خۆرئاوا، ناوەرۆکی کەموکورتیی‌و پێچەوانەیەتیان بنیاتنراوە لەسەر —لە زۆر ڕووەوە— ترس‌و بێدەستیی‌و نەفامی.

دەبێ فەتیلەی ترساندنی فیکریی لە وتارداندا، لەلای هەموو لایەنەکانی فیکریی‌و زانستیی دەربهێنرێت، دەبێ پەککەوتەیی نەفامیی لەلایەنەکانی فیکریی دژیەکەکان لابرێت، ئەمە تاکە ڕێگەیە بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆو خستنەکاری فیکر لەو یاسانەی، کە لە بەردەم ئوممەتدا دەخرێنە ڕوو، ئەو ئاستەنگانەی کە ڕووبەڕووی بووەتەوە، گیانی هاوکاریی جێگەی گیانی پیادادان بگرێتەوە، لە بنیاتی پڕۆژەی شارستانییەتی ئیسلامیی ئوممەتی، ئەو پڕۆژەیەی، کە لەسەر باوەڕو یەکتاپەرستیی‌و جێنشینایەتیی‌و بەهاو دادپەروەریی‌و هاوکاریی‌و ئاشتیی‌و ئامێری ژیریی زانست، هەروەها گەیاندن بە جوانیی‌و چاکەوە، کە ئەوەش بەهاو ڕێبازێکی بەرزە، داوایەکی ڕاستگۆیانەی هەموو دڵسۆزێکی ڕۆڵەکانی ئوممەتی ئیسلامەو ئامانجێکە بەرزترە لە خزمایەتیی‌و کەسایەتیی.

داوای (کادیر)ی شارستانیی مسوڵمان مەبەستەکەی —لە ڕووی ڕێبازەوە— بریتییە لە بەدەستهێنانی توانای زانستی یاسایی، داوای (کادیری) ئایینی ئیسلامیش —لە ڕووی ڕێبازەوە— بریتییە لە ڕێنموونی بەهاکانی ئیسلام‌و ڕەوشتە بەرزەکانی، پێچەوانەش نەبێت —لە ڕاستیدا داواو هەڵوێستی (کادیری)ی شارستانیی مسوڵمان لەگەڵ مەبەست‌و نیازەکانی کادیری مسوڵمانە، بەڵام گرفتەکە —لە ڕاستیدا— پەیدا دەبێ، کە گفتوگۆی هەدوو تیمەکە لەسەر بناغەیەکی بەرنامەیی نەبێت، بەڵکو لەسەرچاوەو بۆچوون‌و عەمباری فیکری

کورتو تێکچووەوە بێت، کە نەبێتە بنکەیەکی چاك بۆ تێگەیەشتنی هاوبەش، یان گفتوگۆی بنیاتنەرانە.

دەبێ لە سەرەتاوە زەمینەی گفتوگۆ ساز بکرێت، دواتر ڕێککەوین لەسەر جێگیرەکان، پاشان ڕێککەوتن لەسەر ئامانجو مەبەستەکان، هەموو گرفتە بنەڕەتییەکان بخرێنە ڕوو لای هەموو تیمێك، بە شێوەیەك ڕێگا بدات بە ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو ڕاگۆڕینەوە لەسەر ئەو زانیارییانەی، کە پەیوەندیان بە ئاستەنگو جیاوازییەکانەوە هەیە، ناوەرۆکەکەشی بزانرێت، لەگەڵ دۆزینەوەی چارەسەری دروستو گونجاو بۆ ئەو ئاستەنگانە، تا زەمینەیەكو ئامانجێکی هاوبەش دامەزرێت لەسەر جێگیرەکانو مەبەستە هاوبەشەکان، بە گیانی یەکتر وەرگرتنو بەردەوامبوونی گفتوگۆی بەرهەمدار، هەروەها هاوکاریی چاکە لەگەڵ یەکتر لە یەکێتیی شارستانیی مرۆڤایەتیی.

مسوڵمانەکانو تێکڕای شارستانییەکانو ڕۆشنبیرەکان ڕێککەوتوون لەسەر باوەڕبوون بە خوای بەدیهێنەرو تاكو تەنهاو ڕێنموونی نیگایی، مەبەستەکانیشی لە بەهاکانی دادپەروەریی‌و چاکە، ڕێزداریی مرۆڤ، بەرپرسیارییەتی کار، ڕێك دەکەون بەدوای گەڕان بە شوێنی یاساکاندا لەگەڵ ئەرکی هەوڵدانو جوانکاریی لە گەیاندنی بەرپرسیارێتی لە کردەوەدا.

تێکڕا ڕێکدەکەون لەسەر بەرزێتی پەیامی ئیسلام، ڕێکدەکەون لەسەر نمونەیەتی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، ڕێکدەکەون لەسەر ئەوەی، کە ئوممەتی ئیسلام لە ڕێرەوەی سەردەمی پێغەمبەرو مەبەستە پیرۆزەکانی لایداوە، ڕێکدەکەون، کە ئوممەتی ئیسلام توانای لە دەستداوەو لاوازبووە، دەزگاکانی ڕووخاوەو ریزەکانی دڕاوە، مافی زەوتکراوە، گەلەکانی سەرشۆڕکراوە، پیرۆزییەکانی پێشێلکراوە.

ڕێککدەکەون لەسەر پێویستیەت بە دەستخستنی توانا لەزانستو تەکنیکدا، بە دەستخستنی هۆکارەکانی هێزی ماددی‌و مانایی، پێویستیەتیی چاکسازیی، جوڵاندنی وزەی شاراوەی ئوممەت، دەستگرتن بە ڕەوشتو ڕەفتارە بەرزەکانەوە، بەڵام ئەگەر لایەنەکان خۆیان ئامادە نەکەن بۆ گفتوگۆی بەردەوام، ئەوا ئەم ڕێککەوتنانە لە ئومێدو هیواوە نزیکترە، تا لە ڕاستیەوە،

دەبێ گفتوگۆش لەسەر بنەمای زانستو زانیاریی دەستی هەردوو لایەن بێت، ئیتر لە گۆڕەپانی ئایینو کەلەپوور، مێژووی ئیسلامیی بێت، یان لەگۆڕەپانی کەلەپووری مرۆڤایەتیی لە زانستە یاساییە کۆمەڵایەتییەکانو بەرنامەکانی تێڕوانینو لێکۆڵینەوەی زانستیی تیایدا.

لە ڕاستیدا ئوممەتی ئیسلامیی، بەدەست جۆرە عەلمانییەتێکەوە گرفتارە کە لەم عەلمانییەتەدا باری فیکریی لە شارستانییو لە ئایینیی لەلای یەکسانە، لەوەوە پەیدابووە، کە هەردوو لایەن سوورن لەسەر پەراوێزکردنی یەکتر، بەدەستکەوتی زانستییو توانایی‌و فیکری یەکتر، کە گفتوگۆ دەکاتە ڕوو وەرچەرخان لە یەکترو پشتکردنە یەکترو قووڵکردنی جیاوازییەکانی نێوانیان، داخستنی دەلاقەی بەیەکگەیشتن، ئیتر ویژدانی ئوممەت نامێنێتو هێزی دەکوژێتەوە.

با دەستبکەین بە دروستکردنی بەرەیەکی نوێ لە زانایانو ڕۆشنبیران، کە خاوەنی زانستی نیگاو بەڵگەنامەبن، هەستبکەن بە مەبەستەکانی ئایینو بەهاکانی، بە گەنجینەی کەلەپوورو وانەو پەندەکانی، بەناسینی زانیاریی مرۆڤییو کۆمەڵایەتیو ماددیی، بەرنامەکانی یاسا ئەزموونییەکان، با زاناکانو ڕۆشنبیران دەستبکەن بە فراوانکردنی بازنەی زانیارییو بەرنامەکانیان، دەستبگرن بە هۆکاری گفتوگۆو هاوکاریی بەرهەمدارەوە، پێویستە زانکۆو مەڵبەندەکانی لێکۆڵینەوەی زانیاریی بەرنامە دابنێتو ڕێنوێنی سەرچاوەکان بکاتو ماددەی پێویست دابنێ بۆ ڕۆشنبیریی مسوڵمان لە هەموو ڕووەکانی زانستی ئایینی خوایی‌و یاسا مرۆڤایەتییەکانەوە، گۆڕەپانی زانستیی لەم بارەوە هەوڵی زۆری داوەو بنەمای دامەزراندووە، زانیارییە ئیسلامییەکانی کردووەو بەرنامەکانی فیکری چاکسازیشی کردووە، کە باسێکە خراوەتە سەر گۆڕەپانی زانستی ڕۆشنبیریی لە جیهانی ئیسلامی، کە لەسەر ئەم بنەڕەتەوە وێژەی یەکبوونی ئوممەتو مەبەستەکانی دەبریسکێتەوە، لەگەڵ بەرنەمانی فیکرو شێوازی ڕێکخستنی، ئەم هەوڵانە دەبێ گەشەی پێبدرێتو زیاتر پێشبخرێت.

ئەوەی جێی داوایە، دەبێ لایەنە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتر دانیشن، خاوەن زانست بن بە ناسینی مەبەستەکانی ئایینو بەهاو وزەکانی زانیارییە یاساییەکان،

دەبێ لەو هۆکارانە بکۆڵنەوە، کە بووەتە ڕێگر لە بەردەم ئوممەتی ئیسلام، کە توانای بەرپابوونی ئایینەکەیان‌و مەبەستەکانی ئایینەکەیانی نییە، هەروەها ئەو شتانە چیە، کە بووە هۆی ئەوەی نەتوانن بیگەیەنن‌و توانای زانستیی‌و تەکنیکیان نەبێت، چۆن بتوانن فیکری ئوممەت لە شتی بێماناو پڕوپووچ پاك بکەنەوە؟ چۆن ڕووبەڕووی بڵاوبوونەوەی سلبیەت‌و لاوازیی لایەنی گشتیی لە بنیاتی کەسایەتیی ڕۆڵەکانی ئوممەت ببنەوە، ڕۆڵی ئەو سلبییەتە لە کوژاندنەوەی گیانی هێزو ئازایەتیی‌و دەستپێشخەری‌و بەخشین‌و سەرخستن لە گەیاندنیدا؟ چۆن بووەتە ڕێگر لە بەردەم وەڵامدانەوەی کرداریانەی ویژدانیی بۆ داواکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان.

ئەگەر زاناو ژیرو بیریارەکانی ئەم ئوممەتە لەم بارودۆخە شلۆقەدا گفتوگۆیان بکردایە، لەسەر هەموو ڕێبازو لایەنەکانیان، بناغەیەکی هاوبەشیان ئامادە بکردایە، لە مەبەست‌و ڕێبازەکانیان، ئەوە کارو فرمانی بەیەکگەیشتنی فیکرو چاکسازییەکەی ئاسان بوو، دەیانتوانی نەخشەی زانستییانە بە هاوکاریی یەکتر دابنێن کە تیایدا هەموو لایەنێکی هاوکاریی یەکتریان دەکرد بۆ چاکسازیی کەلێنەکان‌و بنیاتی بنکەکان‌و دامەزراندنی داهاتووی ئوممەتی ئیسلام‌و بەرەکانی.

## گرنگیدانی شارستانییەکان‌و تێبینییە بەرنامەییەکانیان

لە گرنگترین ئەو باسانەی کە لایەنە جیاوازەکان، چ لایەنی ئاینیی لاساییکار، یان شارستانی خۆرئاواپەرست، بەبێ بنەڕەت لەسەری جیاوازن ئەوەیە: ئایا پابەندبوونی شارستانییەکان‌و قوتابیانی زانیاریی مرۆڤایەتیی بەرنامەی زانستیی یاسایی واتای ئینکاری کردنی جیهانە نادیارەکان‌و کارەکانی پەروەردگار لەم بوونەوەرەداو داناییەکەی لە دروستکراوەکانیداو مەبەست لە ئەم دروستکراوانە دەگەینێ؟ ئایا پابەندبوون بە ژیریی هۆکارێتی ئینکارکردنی نادیارو قەدەری خوایە لە کاروبارەکانی بوونەوەردا؟ ئەم تێکەڵکردنە لە دوو ڕووەوە پەیدابوون:

**یەکەمیان**: کاتێ ئاییندارەکان نزا دەکەن‌و خۆبەدەستەوە دەدەن‌و پشت بە خوا دەبەستن‌و باوەڕیان بە دانایی خوا هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری

دروستكراوەكان، چەند دەق‌و شاهێدێك دەڵێن، لە وتاری ئامۆژگاریی كردنیشدا پێشكەش دەكەن، لە وێنە گشتییەكەیدا دابڕاوە، كاتێ دەیخەنەڕوو، هەروەها لە چوارچێوەی زانستییەكەی دابڕاوە، لەلایەنەكانی شوێن‌و كاتەوە دابڕاوە، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە یاساكان لە دروستكراوەكانداو ئاسەوارەكانی لە ژیاندا، چونكە هەموو فیكرییان كاریگەر نابێت بە هێزی جوڵەو كردار لە كۆمەڵگادا، ئەو كاتە كاریگەریەكەی لە گوێی شارستانییەكاندا، وەك بێئاگاكردن‌و خەڵك دوورخستنەوە لە ژیان دەبێت، ئایندارەكان هەندێجار ڕوودەكەنە گەلان‌و پاڵیانپێوە دەنێن كە شت بكەن، —بەبێ هودە— بۆ گۆڕانی ئەو بارەی، كە تیایدان‌و بەرەنگای ئاستەنگەكان ببنەوە، لەهەندێ كاتیشدا، قسەكەیان بۆ دڵنەواییكردنی خەڵكەو ئەوبارەی كە خەڵكەكەی تیایە، بەمەش زیاتر پوچەڵ دەبنەوە، بە بێ گوێدان، یان ئەندازەگرتنی بارو ژیانیان، توانای وزەكانیان، بەمەش بە بێ ڕێنموونی قەیرانەكەیان دەتەقێنێتەوە، زیاتر تووشی ناڕەحەتیی دەبن‌و قەوارەیان نامێنێ، وزەیان بە فیڕۆ دەچێ، هەوڵەكانی بنیاتنان‌و چاكسازیی بە فیڕۆ دەچێ.

**دووەمیان:** كاتێ عەلمانییەكان‌و خۆرئاواپەرستەكان‌و شارستانییەكان، كە ڕێگریی دەكەن‌و گوێناگرن بۆ ئایندارەكان، كۆمەڵە پرسیارێ دەكەن، كە تێكەڵە لە وەرنەگرتن‌و كەمكردنەوەی شكۆی قسەكانی ئایندارەكان‌و بانگەوازەكەیان‌و بۆ پشت تێكردنیان‌و شوێنكەوتنی بیانیی داگیركەر، ئینكاریی پیرۆزیی ئایین‌و ئەوەشی كە دیندارەكان لە دەقەكان دەیخوێننەوە، ئینكاریی جیهانیی نادیارو لایەنەكانی دەسەڵاتی خواو كاروبارەكانی خوا لەبەڕێوەبردنی دروستكراوەكانیدا دەكەن.

ئەگەر هەموو لایەنەكانی بە گشتیی —لە گۆشە جیاوازەكانەوە— لە ڕاستیدا لەسەر ڕێبازو بنەماكان، كە باوەڕبوون بە خواو یاساكانی خواو داوای وردبوونەوەو كاركردن دەكات، ڕێككەوتنایە: (إحرص على ما ينفعك واستعن بالله ولاتعجز)[١] چۆن ئەم تێكەڵكردنە دروست دەبوو، لەگەڵ بوونی ئەم ئەندازە

[١] رواه مسلم في صحيحه: ٤٨١٦.

هاوبەشەی نێوان ڕۆڵەکانی ئوممەت، لە بێئاگاکردن لە لایەكو ئینکاریی کردنو کافرکردن لە لایەکی ترەوە، ئەم پێچەوانەیەتییەو جەمسەرگەرییە چۆن ڕوویدەدا؟ چۆن لە نێوانیاندا دابڕانی گفتوگۆ ڕووی دەدا؟ چۆن هەڵوێستەکان پێچەوانەی یەکتر دەبوون؟ چۆن ململانێی نەزۆك دروستدەبوو؟

ئەوەی ئەم هەڵەو ئەم تێکەڵییەی دروستکردووە، قسەی ڕاستو دروست تیایدا، لەسەرچاوەکانیدا، لە ئاییندا زۆر لە بەڵگەکانی بە فیرۆچووە لە پیتیەتی کۆمەڵەیەك لە گێڕانەوەکان، کە پەیوەندیان بە ڕووداوەکانو هەڵوێستەکان هەیە، کە بۆ ماوەی نیو سەدە پەرتو بڵاوبووەوە، ئەوەش سەردەمی پێغەمبەرایەتیو سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدین بوو، گێڕاوەکانی ئەم سەردەمە درایە پاڵ زنجیرەیەکی زۆر لە کەسانی گێڕەرەوە (الرواة) کە پلەی تێگەیشتنو هەستکردنیان جیاوازبوو، گۆشەی تێڕوانینیان وەك یەك نەبوو، ناخیان وەك یەك سەلامات نەبوو، لە ماوەی دوو سەدە، لەگەڵ جیاوازیی لە نێوان وڵاتەکانو سیفەتەکانو بۆچوونەکانو حەزەکانیان، ئەوەی تووشیهاتن —بەرەکانیشیان تووشیهات— لە جەنگو ململانێکان، کە دابەشی کردن بەسەر بەرژەوەندییەکانو گروپو تیرەگەرییەکانو بۆچوونو ڕاو مەبەستی هەمەچەشنەدا، ئەمەش وایکرد: کە نووسینەوەو لێکۆڵینەوەو بابەتییەتو کاریگەرە بە ئاگاکانو بێئاگاکان لە قورسترین کارەکان بێت، پاش تێپەڕبوونی ئەو گرێو چەرخانە، دەترسیت کاتێ دەبینی، کە چۆن توانیویانە دەمدرێژیی بکەنە سەر مەقامی پێغەمبەرایەتییو لادانو درۆ هەڵبەستنو دانانی درۆ بەدەمییەوە، لەم بارەداو بەڵگە دامەزراندنو وردەکاریی زۆر قورس، بەئاگابوون لە سەلامەتی ڕێگوزەری گێڕاوەکە زۆر سەختە، کە فەرموودەکان لە ژمارە نایەن، ئەمەش لەبواری گێڕانەوەدا هەڵەی زۆری لێپەیدابوو، تێکەڵییو کەموکورتییو سستی تیاکرا، درۆو دەلەسەو لافلێدانو فێڵکردن پەیدابوو، بە هۆی زۆری قسە، نەزانینی ماناکان، یان بەهۆی هەڵە لەکاتی بیستندا، یان تێکەڵکردن لەکاتی بیستندا، یان لەبیرچوونەوە، یان ئارەزووبازیی، یان گەڕان بە دوای ناوو شۆرەتدا، یان بەهۆی بێئاگایی، یان بە هۆی تێکردنی ماددەی خراپ، کە زۆریان ئەمەیان کردووە کاتێ لێی ورد دەبیتەوە، دەتوانی بە وردیی تەماشای تێکەڵکردنی ئەو شتانە بکەیت، هەتا لە

یەك گێڕەرەوەشدا، ئەمەش لە كاتی دادگاییكردن بۆ ناوەرۆكی مەتن‌و ڕەخنەی ناوەرۆكەكەی ڕوون دەبێتەوە، قوتابیانی زانست لەم بارەوە زانیاریی زۆریان هەیە، ئەم ئەندازەیەش زۆرتردەبێت، بە زۆربوونی ئەو كەسانەی، كە ئەم دەقانە وەردەگرن لە كەسانی تایبەتمەندو زاناكان، ئەوانەی كە یاساكانی سروشت‌و ڕووداوەكان‌و لێكۆڵینەوەو پوختەكردن دەكەن، چونكە ئەوەی زانستی دەقەكان‌و ڕووداوە مێژووییەكان كۆدەكاتەوەو هەواڵی –لە هەمانكاتدا– سوننەتەكان‌و بارەكان لە بوارەكەیدا دەزانێ‌و زیاتر بەتواناترە لە هەستكردن بەمەبەستەكان، هەروەها گەیاندنی بەش بە گشت، جێبەجێكردنیان بەڕێباز، هەستكردن بەڕووەكانی كەموكورتی، ڕێگوزەرەكانی هەڵەكان‌و لادانەكان، تێگەیشتنی خراپ یان مەبەست، ئەمەش ئیبن خەلدون (رەحمەتی خوای لێبێت) لەم چەرخەی دواییدا لێی بەئاگاهات‌و بەرنامە زانستییەكەشی شارەزابوو.

ئەوەی گرنگ بێت، بۆ زاناكان‌و ئەوانەی لێكۆڵینەوە دەكەن، دەربارەی بە بەڵگەكردنی دەقەكان ئەوەیە، كە بزانن فەرمانی ڕوانین لە دەقەكان، بە تایبەتی دەقی فەرمودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)و گرنگیدان پێی، لێكۆڵینەوەی باسەكان، ئەو ئاسەوارانەی لێی دەكەوێتەوە، تەنها خاوەن تایبەتمەندییەكان ناگرێتەوە لە زانستی گێڕانەوە (علم الرواية)و زانستی فیقهو یاسا، بەڵكو دوو تاقمی تری خەڵك خرایە پاڵیان:

**تاقمی یەكەم:** بریتییە لە گشت مسوڵمانان، ئەوانەی كە –بە هۆی بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیریی‌و هۆشیاریی دەربارەی كاروباری ژیانیان‌و ئەوەی كاریگەری لێدەكات– دەخوێننێنەوە گرنگیدەدەن بە زۆرێك لە دەقەكان، بە چەندین شێوەی جیاواز، زۆر جار كاریگەرییەكەی لە چوارچێوەی ڕۆشنبیرییە هاوچەرخەكەیاندا سەلبیەو خراپە.

**تاقمی دووەم:** خاوەن پسپۆڕی زانستیی لە زۆر كاروباری ژیانی مادديی‌و مرۆڤایەتیی‌و كۆمەڵایەتیی، ئەوانەی دادگایی دەقەكان دەكەن بە هۆی شارەزاییان‌و زانیاریی‌و زانستەكانیان، لەبەرئەوە پشكنینی دەق لەسەر دەستی ئەوانەدا لەسەر بناغەیەكی زانستی یاسایی دەبێت، لە شێوەی گێڕانەوەكە ناوەستێت، یان پیشەگەرێتی گێڕەرەوەكە، بەڵكو بازدەداتە دەقەكەو چۆنیەتی

ناوەرۆکەکەی‌و ئەو مانایانەی کە هەیەتی، دەیگەڕێننەوە بۆ بنەماو هۆکارو ئەو شتانەی، کە پەیوەندیی پێوە هەیە، بەمەش پشتێنی لێکۆڵینەوەو ڕوانین فراوان دەبێت، دەشکشێت (بە هۆیەوە) بۆ لایەنە زانستیی‌و بابەتییەکان، فراوانترو دوورتر لە گرنگیدانی شێوەی گێڕراوەکان یان ئامێریەتی بیناکردنی حوکمەکان.

گرنگیدانی خەڵك بە کاروباری ژیانیان‌و کاریگەرییەکان لەسەری، گرنگیدانی زانایانی فەرمودە بە پوختەکردنی فیکر، دەبێ ڕێزی بۆ دابنرێت‌و گەشەی پێبدرێت، نەك ئینکار بکرێت‌و قەبوڵ نەکرێت، بە بەڵگەی پسپۆڕێتی تەسك، چونکە پشتێنی لێکۆڵینەوەی زانستیی خۆی‌و هۆکارەکانی فراوان بووەو گۆڕاوە، زۆرێك لە قوتابیانی زانستی ئایین‌و کەلەپوور نایزانن‌و ئامێرو هۆکارەکانی شارەزانین، مافی خەڵکەکە لە دادگایی —لەسەر تیشکی ئەوەی، کە لەژیانیاندا دەیبینن— پسپۆڕەکان بکەن لە ئەنجامی قسەکانیان، بیانگێڕنەوە بۆ پەرتوك‌و ئەڵقەی وانەکان‌و هەڵسوکەوتیان‌و ئامێرەکانی هەژمارکردنیان‌و ژمارەکردنیان، بۆ دووبارە تێڕوانینی قووڵ‌و زانینی سەرچاوەکانی کەموکورتیی، بەهەندگرتنی‌و واقیعی ژیان‌و مەبەستەکانی شەریعەت‌و بەرژەوەندیی بەندەکان لە بەرچاو بگیرێت.

لەگەڵ بوونی ڕەخنەی بەشیی لە هەموو ڕوویەکەوە، بەڵام هۆکارەکان‌و توانا زانستییەکان گەورە بووە، بە شێوەیەك، کە توانایەکی فراوانیی بەخشیوە بە لێکۆڵینەوەو ڕوانین‌و پشکنین‌و پێویستە بە هەند وەربگیرێ، سوودی لێوەربگیرێ لە دووبارە داڕشتنەوەی زانیاریی دەق‌و بەرنامەو ئامێرەکانی بەجۆرێك، کە یەکێتیی‌و تەواوکاریی زانستی بەدیبهێنی، ڕۆشنبیری ئیسلامی پاکبکاتەوە، ڕێنموونی خوایی‌و نیگا دامەزراوەو بکات، نەهێڵێت پیرۆزیی دەقەکان بە خراپیی بەکاربهێنرێت: ئەو بەکارهێنانەی، کە دەبێتە هۆی —بە بێگوێدانە ئامانج‌و مەبەستەکان— مانەوەی باری دواکەوتن‌و وەستان، ئاسانکردنی ڕێگای پاساودانەوەی فیکری خورافەت‌و برەوپێدانی، کە دەبێتە وێرانکەری زانستی ئیسلامیی، دەشبێتە ڕێگری بەردەمی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی.

## توانا نوێکانو بەرنامەیەتی فراوان لە باسەکانی ڕەخنەی دەقو گێڕەرەوە (کەسەکان)

ئەوەی گێڕراوەتەوە لەفەرموودەکانو سوننەتە بڕواپێکراوەکان، لە سنووری سەد هەزار فەرموودەدایە، زۆریشیان دووبارەن، بەشێکی زیاتر، یان کەمتر، یان بە پێی جیاوازیی وشەکان، هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان، ڕێ ناکەونو یەکساننین لە ئاستی متمانە بە گێڕراوەکە، هەیانە ڕاستە (صحیح)و هەیانە لاواوە (ضعیف)، بەڵکو تیاندایە هەندێ کەس بە فەرمودەی دانراو (موضوع)ی دادەنێ، زۆرجار هەڵسەنگاندنی دەقێك، یا گێڕراوەیەك جیاوازیی هەیە لە نێوان قوتابیانی زانستی فەرمودەدا، تا ئاستێ، کە مرۆڤ تووشی سەرگەردانییو پرسیار دەکات، دەربارەی مەودای بابەتییەتی بەرنامە، وردی جێبەجێکردنی، مەودای پێویستی بۆ دووبارە پیاچوونەوەی، سوودوەرگرتن لەتواناکانی چەرخی زانستیی لەپێشخستنیدا، لەگەڵ ئەوەشدا، سەدان هەزار فەرمودەی ناڕاست هەیە، کە ڕەفزکراوە، نەگێڕاوەتەوە، هەتا وابووە، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، پێنج سەد هەزار فەرموودەی لە بەردەست بووە، تەنها پەنجا هەزار فەرموودەی وەرگرتووە، هەمووشی ڕاست نییە، بەڵکو هەندێکیشیان بە لاواز دادەنرێن، ئەمەش فرمانێکی گرنگو ئازاراوییە، ئەو بڕە زۆرە دەردەخات لە گێڕراوە درۆکان، کە بە فەرمووده دانانرێت، زانینی ئەم ڕاستیە، ئەوەی ئەگەر سەرنج بدەین لەسەر مەودای ئەو هەوڵەی کە زانایان داویانە، ئەو ناڕەحەتیانەی تووشیان بووە، ئەوبارە دەروونییە فیکرییە، ڕقی ململانێی ئەو تەوژمانە دەردەخات لەناو قەوارەی ئوممەتی ئیسلامدا، هەروەها لە دەربڕینی ئایینی چەکی پیرۆزیدا هۆکارێکی بەبرەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەو سەرکەوتن، ڕێگەی خۆشکرد بۆ لادان، بەهاتنە ناوەوەی ئیسرائیلیاتو پڕوپووچو شتیتر لە ئامانجو مەبەستە باوەڕییەکانو ڕامیاریەکان، ڕێگەیدا بە گێڕانەوەی ئەم بڕە زۆرە لە فەرموودەی نادروستو لافلێدراوو بڵاوبوونەوەی بە ناو ئوممەتی ئیسلادا، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو بارە دەروونییە لای زۆرێك لە گێڕەرەوانی فەرموودە لەو چەرخەدا، کە ئارەزووی هەبووە لە گێڕانەوەو گەڕان بە دوای پلەوپایەو

ڕاوکردنی دەقەکان (تصيد النصوص)و بڵاوکردنەوەی بە هەر شێوەیەك بێت، بە بێ گوێدانە —لە هەموو بارەکاندا— رووی وردو پشکنینی داواکراو، تاوای لێهات زۆریان بووە ولاغی باری بۆ هەموو خاوەن مەبەستو مەرامێك، هۆکارێك بۆ سەرلێشێواندنی گشتیی‌و ئوممەت، هەروەها شێواندنی تێڕوانینیان‌و پیسکردنی فیکرو ڕۆشنبیرییان.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە، کە زۆربەی ئەو دەقە گێڕراوانە، چەند دەییەکیان نەبێت لەو فەرموودەو سوننەتە کردارییانە —بە حوکمی سروشتی دەقەکان— لای زانایان ناگەنە پلەی (متواتر) واتە هەموو کەسەکان ڕاستگۆبن‌و لەیەکترییان گێڕابێتەوە، کە بتوانی یەك فەرموودەیان بە دروست بزانی، یان هەڵەو درۆی تیا نەبێ، بەڵکو هەندێ لە گێڕراوە ئاسان نییە لێی تێبگەی بۆچی بە (آحاد) دەگێڕدرێتەوە، ئەوەش بە هۆی سروشتی گشتیەتی بابەتەو گرنگییەکەی‌و سروشتی فراوانی بوارەکەی، هەق بوو (متواتر) بوایە، بەڵکو لەم فەرموودانە —لەبەر زۆر نامۆیی— جیاوازیی‌و دژایەتیی تیایە، —هەتا لەیەك گێڕەرەوەدا— لە وشەو لە بنیاتدا، کە ژێریی وەریناگرێت لەزۆربەی بارەکاندا.

گەورەکانی سەردەمی پێغەمبەرایەتیی‌و سەرکردەکانی فەرموودەیان نەدەگێڕایەوە، سووربوون لەسەر بڵاونەکردنەوەی، چونکە خراپ تێگەیشتن لەم فەرموودانە ترسناك بوو، بە هۆی نەزانیی خەڵك بۆ ئەو بارودۆخە کاتی‌و شوێنییەی، کە لەگەڵ ڕووداوەکانی فەرموودەکەدا بوو، چونکە، ئەگەر ئەو بارودۆخە نەزانی، تێگەیشتن لە فەرموودەو مەبەستو ماناکانی، قورسە، لەبەرئەوە سوربوونی هاوڕێکانی پێغەمبەر (ﷺ)، لەسەر نەگێڕانەوەی فەرموودە یان کەمگێڕانەوەی، کارێکە دەبێ تێبگەین لە داناییەکەی‌و ماناکەی لەکاتی هەڵسوکەوت لەگەڵ دەقەکاندا، بە تایبەتی لەگەڵ دەگمەنی ئەوەی، کە لەگەڵ گێڕراوەکەدا بووە، ئەمەش تیشکی تەواو دەخاتە سەر بارودۆخی کاتو شوێن‌و مەبەستەکان، کە پەیوەندیی بەگێڕانەوەکەوە بووە.

ئەوەی بووە هۆی ئەوەی کە زانایانی دوایین فەرموودەی (آحاد) بگێڕنەوەو زۆری لێ باس بکەن، چ ڕاستەکانی، یان لاوازەکانی —بەو ئەندازە لە هەڵپەکردن— لەگەڵ مەبەستە ڕامیاریی‌و بیروباوەڕەکانی، بریتییە لە فیکری

دەستەوسانیو گۆشەگیریی، بە ئامانجی داپۆشینی پەککەوتنی فیکر بە دەسەڵاتی پیرۆزییەت، ئەم دیاردەیەش گەورەبوو، بە شێوەیەکی ڕاستەوانە لەگەڵ پەککەوتنی فیکرو ڕوانینو کەمی شارەزاییو ئەزموون، هەتا پەککەوتنی فیکریی زیادی بکردایەو توانای لێکۆڵینەوەی نەبوایە بۆ بەدواچوونی گۆڕانەکان، گەڕان بە دوای دەقدا زیاتر دەبوو لەسەر حسابی فیکرو ڕوانینی مەبەستیانە، ئەمەش بواری دەرەخساند بۆ لاساییکردنەوە، تاوای لێهات هەندێکیان دەقێکی لاوازی لا باشتر بوو لە ڕایەکی ڕاست، ڕا لە شەریعەتدا قسەی هیچ شوێنکەوتنی ئارەزوو نییە، بەڵکو بریتییە لە هەستی گیانی شەریعەتو مەبەستەکانی لە کاتێکدا، کە دەقێکی ڕاستەوخۆ نەبێت، پێوانەکردن فریای ناکەوێت لەسەری لە بەدیهێنانی مەبەستەکانی شەریعەتو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ.

ئەو جیاوازییەی هەیە دەربارەی نووسینەوەی فەرموودە —بە ڕێگریکردنو بڵاونەکردنەوەی، یان ڕێپێنەدانو نووسنیی— بەڵگەیە لەسەر جیاوازیی ڕاوبۆچوونەکان لە بنەمای سەلامەتی زۆرکردنی گێڕاوەکان بە بێ زانست، لە ترسی خراپ تێگەیشتنو هەستنەکردن بە بارودۆخی شوێنیو کاتیی ئەوەی پەیوەندیی بە بوارەکانییەوە بێت، ئایا ئەوانە فەرمودەن لە بارەی ڕاگەیاندنەوە: واتە ڕاگەیاندنی پەیام (وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَاحْذَرُواْ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُبِينُ) (المائدة: ٩٢ )؟ یان فەرموودەو ئاڕاستەنو پەیوەندیی بەڕۆڵی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەیە لە دەسەڵاتو بەڕێوەبردنی دەوڵەتو ژێردەستەو فێرکردنو ڕۆشنکردنەوەی ئەوەی، کە پەیوەندیی بەخەڵکی کۆمەڵگەوە هەیە، بە پێی باری خەڵکەکەو تواکانیان، ئەوەی کە دێتە ڕێیان لە پێویستیو بارودۆخو ڕووداوەکان، بە پێی باریان هەوڵیان بۆ دەدات لەسەر تیشکی ڕێنمونی ئەو شەریعەتەی، کە دابەزێنراوە، (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ) (النساء: ٥٩ )؟ یان گوێڕایەڵیکردنە لە فەرمانێکداو قورئان نەیبڕیوەتەوەو پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشنی دەکاتەوەو درێژەی پێدەدا، وەك سوننەتە کردارییەکان، کە قورئان دەقی هەیە لە بارەیەوە، وەك کاروباری نوێژو زەکات (وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) (النور: ٥٦ ). نوێژو زەکات دووپایەی گەورەن لە

پایەکانی ئایین، قورئانی پیرۆز، بە دوورو درێژیی ڕوونی نەکردووەتەوەو درێژەی نەداوە، بە پێچەوانەی ڕۆژوو حەجەوە، کە قورئان ڕۆشنی کردووەتەوە لە بنەکەیانداو دەقی هەیە، لەبەرئەوە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە تاییەتی کردارییەکانی، سەرچاوەی بنەڕەتی کاروباری نوێژو زەکاتە، بەڵام ئەوەی وتەی پێغەمبەرەو (ﷺ) کردارەکانییەتی، پەیوەندیی بە کاروباری ژیانو داواکانی بژێوییەوە هەیە: "فإنما أنا بشر"[١].

هەروەها دەبێ چاودێریی هەڵوێستی خەلیفەکانی ڕاشیدینو هاوڕێ گەورەکانو پیاوانی ڕیزی یەکەم لێیان بکەین، دەربارەی کەسێ کە فەرموودەی پێغەمبەری بە تەنیا ڕیوایەت کردبێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و ئاڕاستەکردنی، کە لەگەڵ ڕووداوەکان لە بارودۆخێکی تایبەتدا هەڵسوکەوتی کردبێ، سووربوونیان لەسەر ئەوە، کە لە شاری مەدینەی منەوەرە بمێنێتەوە تا فەرموودە بگێڕێتەوە بۆ هاوچەرخەکانیانو ئەوانەی لەو سەردەمەدا بوونو بارودۆخی ریوایەتەکانیشیان هەستپێدەکرد.

هەروەها دەبێ لە گشتییەتی ئەو فەرموودانەی، کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) خۆی گێڕاویەتییەوە تێبگەین لە ڕێگریی کردن لە نووسین، یان ڕێپێدان، ئەوەی کەلێی بەدیدەکرێت لە ڕێگریکردن یان ڕێپێدان، لە مەبەستەکان، بەمە شتێکی بێدەمارگیریی‌و ڕێبازو دروستکردنی، لەسەر تیشکی ئەوەی دەیزانین، کە بووە بە گرفت لە گێڕانەوەداو بووە بە کۆسپ، هەموو ئەوانە فرمانێکە شیاوی بیرکردنەوەو لێوردبوونەوەیە، یارمەتی تێڕوانین دەدات لەپوختەکردنی

---

[١] ئیمامی موسلیم بە سەنەدی خۆی لە رافیعی کوڕی خورەیج دەگرێتەوە کە گوتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتە مەدینە، خەڵکی مەدینەش دارخورمایان متوربە دەکرد، فەرمووی: چی دەکەن؟ وتیان: زووتر کردوومانە، فەرمووی: ئومێد دەکەم ئەگەر نەیکەن باشتر بێت، ئەوانیش وازیان لێ هێنا، ئەو ساڵە بەرووبوومی کەمبوو، وتی: مرۆڤم، ئەگەر لە بارەی ئایینەکەتانەوە شتێکم پێوتن وەریبگرن، ئەگەر بە شتێك وەك بۆچوون فەرمانم پێدان، من تەنها مرۆڤێکم.
کتێبی (الفضائل، بابی پێویستی جێبەجێکردنی فەرمانە شەرعییەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، نەك ئەوانەی دەچنە ناو ژیانی دنیاوە وەك بۆچوون، ٤/١٨٣٥، فەرموودەی ژمارە ١٤٠).

بەرنامەدا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوەی کە تووشی ڕۆشنبیریی ئوممەت بووە لە عەیبو ئاستەنگەکان، ئەو بارەی هەندێ کەس کوێرانەو بە خراپیی دەقەکان بەکاردەهێنێو کردوویەتی بە عەمباری کۆکردنەوەی خورافەتو ئەفسانەو مەبەستو ئارەزووەکانو سەرخستنی دوژمنایەتیی، بووە بە هۆکار بۆ سەرشۆڕکردنی ویژدانی ئوممەتو لغاوکردنی ژیریی‌و ترساندنی ویژدانی، کردووشیە بە ئامێرێك بۆ جەنگو ململانێو بووە بە یارمەتیدەرو ئامێر بە دەستی دوژمنانەوە.

ئەگەر گرفتەکانی گێڕانەوە، لاوازییەکانی ڕەخنەی دەقیشی بخەینەپاڵ، چونکە ڕەخنەی چالاك لە زانیاریی ڕەخنەگر سەرەتا دەڵێت شارەزایی بابەتەکەو پسپۆڕە تیایدا، کە ئەمەش بۆ زۆر کەس نەلواوە لە بوارەکانی گێڕانەوەدا، کە لێکۆڵینەوەکانیان تەنها لایەنی وشەو شێوەو ڕێساکانی دەرخستووە، بەڵکو وتە -لای هەندێکی زۆر لە دواییەکان- "وتە بەوتەبێژەکەوە دەناسرێ" لەبری "قسەکەر بەقسەوە دەناسرێ" تا بینیمان -بە هۆی لاوازیی بوونی زانستیی‌و ڕەخنە- چۆن قسەی قسەکەر دەگێڕێتەوە لەگەڵ پێچەوانەکەشیدا -کە لە زۆر کات- ناگونجێ لەگەڵ گیانی شەریعەتو ڕێبازەکانی عەقڵ، یان تێڕوانینی زانستیانەی دروست، لاوازیی لێنەکۆڵینەوەو ڕەخنەش گەیشتە ئاستی پێوانە پشتگوێخراوو ئاستی دروستی دەقی فەرموودەکان، بە پێوەری قورئان کە وشەی گشتگیرەو پیرۆزەو دامەزراوەو بە بەڵگەو ڕاستو دروستە:

(مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ من شَيْءٍ) (الأنعام: ٣٨ ).

(الَر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ من لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ) (هود: ١ ).

(وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَى عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) (الأعراف: ٥٢ ).

بەمشێوەیە پلەو پایەی قورئان هاتە دواوە -لە چەرخەکانی بڵاوبوونەوەی فیکرو دوورەپەرێزیی- کە ڕستەکانی ئاڕاستەی گشتییەوە ئاشکرایە، تا سەرچاوەی تێگەیشتنو ئاڕاستەکارو ڕێنمونی بێت -لە هەموو بارەکانو شوێنەکانو کاتەکان- شوێنەکەی لە دەقە (آحاد)ەکان لە پێشترە لەلایەنە کاتیی‌و شوێنیی‌و ڕاستییەکانی‌و لاوازەکان -بێتێگەیشتن- ئەمەش بۆ پشووی

عەقڵە، لە ماندووبوونی بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەو ڕوانین‌و بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانەکان‌و تازەگەرییەکان، ئەمەش لەوەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کاتێ بەراوردی ئەو ئەندازە کەمە لە دەقەکانی سوونەت، کە پێشەوایانی لێکۆڵەرەوە، لەپێشەوەی هەموویان ئەبوحەنیفە نوعمان، کردوویەتی بەبەڵگە، ئەو ئەندازە زۆرەی، کە دەنگیان پێبەرزدەکەنەوە، تێکڕای قوتابیانی بچووکی زانست —بەبێ زانیاری‌و زانست‌و لێکۆڵینەوە—.

زۆر لەم دەقانە —لە ڕاستیدا— گرنگە پوختە بکرێن، ڕاستیی پیاوەکانی بزانرێت، ئەوانەی دەقنووسەکان نەیان بینیوون، هاوچەرخیان نەبوون، لەوانەی پێش چەرخیان کەوتوون لە پیاوانی گێڕەرەوە، هیچیان لێ نەزانراون، مەگەر بە بیستن لێیان لە چەرخەکان‌و تیمەکان‌و جەنگەکان‌و ئاژاوەکان.

لە لایەکی ترەوە، هەندێکی زۆر لەو دەقانە، کە دەسوڕێنەوە بە چواردەوری ڕەخنەی دەقەکەی جیاوازیی هەیە، تا ئێستاش کارێکە، وەك چۆڵەوانەیەك وایە، کە کەسێ پیابڕوات بۆ لێکۆڵینەوەو قسەکردن لێی، دەقەکانی‌و ئەو زیادەیەی کە پێوەی لکێنراوە پێچەوانەی یەکترن، کە هەورێك لە بارەی چەمکەکەیەوە هەیە، بە هۆی بەرنامەکانی چەمکی پیشەیی، بە هۆیەوە —بە بێ هۆشیاریی— پێشەنگ‌و سەرچاوەکانی شەریعەت وێران بوون، کەسانێ، کە نەگەیشتبوونە پلەی زانیاریی فەتواو ئامۆژگارو فێرکردنیان پێکرد، بە تایبەتی ئەوانەی کە زانیاریی شەریعەت‌و زمان‌و زانستەکانی فەرموودەو شارەزای بارەکان‌و سروشت‌و گۆڕانەکان ئاگادارنەبوون، جگە لە خاوەن مەبەست‌و ئارەزووەکان، هەموو ئەمانە بوونە هۆی زیانگەیاندن بە ڕۆشنبیریی ئوممەت، بووشن بە یارمەتیدەر بۆ بڵاوکردنەوەی شتی پڕوپوچ‌و ئەفسانەو خورافەت‌و سلبییەت‌و ترساندن، گیانی زانستییەت‌و کۆمەڵکاریی لەناوبرد، گیانی بیرکردنەوەو وردبوونەوەو زانستە ئیسلامییەکانی دەرهێنا، هیچ نامۆ نییە —ئەگەر— کە مرۆڤی مسوڵمان پەککەوتوو ببینین، زانایەك —لە بێ زانستییدا— ببینین، کە خێو دەسەڵاتی بەسەردا هەبێت، ئیتر ئەوکاتە سوننەتەکان‌و ئەندازەکان ڕەشەبای چەواشەکاریی خورافەت بیبات، ساحیر سیحری لێبکات‌و ببێتە کەسێکی لاوازو شەیتان‌و جنۆکە زاڵ بن بەسەریدا.

## چەند نموونەیەك لە ڕەخنەی دەق: زانستی نادیارو پیسبوونی ڕۆشنبیریی

خراپ نییە لەم بوارە گرنگەدا نموونەیەك بهێنینەوە، كە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی فیكرو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە گرفتەكان، ئێمە دەزانین، كە مسوڵمان هەوڵدەدات پشت بە خواو بەباوەڕەكەی، كردەوە دەكات، لای مسوڵمان نوشتەو فاڵو ئەستێرەناسییو (هێڵ لەسەر لم)و ڕەشبینییو سیحرو بیری پڕوپوچ[١]، لەگەڵ ئەوەشا دەبینین لە (صحیحی مسلم)دا هاتووە، كە معاویەی كوڕی حەكەم دەیگێڕێتەوە، وتویەتی: قلت یارسول الله إني حدیث عهد بالجاهلیة وقد جاء الله بالإسلام، أن منا رجالا یأنون الكهان، قال (فلا تأتهم) قلت: ومنا رجال یتطیرون، قال: "ذلك شيء یجدونه في صدورهم فلا یصدوهم (أي لایمنعهم) قلت: ومنا رجال یخطون، قال "كان نبی من الأنبیاء یخط فمن وافق خطه ذلك"[٢] ئەم دەقە لە ڕواڵەتدا ئەوە نیشاندەدات كە پێغەمبەر (ﷺ)

---

[١] ئەبوداود لە سونەندا دەگێڕێتەوە: ٣٤٠٨، بە سەنەدێكی حەسەن لە قوبەیسەی كوڕی مخاریق وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا دەیفەرموو: فاڵگرتنەوە و ڕەملگرتنەوە و هەڵدانی باڵندە بە ڕاست و چەپدا، جۆرێكن لە بتپەرستین، (جبت)، وتی: الطرف، بریتییە لە هەڵدانی باڵندە، چ بۆ نوقلانەی باش بێت، یان خراپ، ابوداود وتی: العیافە واتە: خەت كێشان لە لمدا، جوهری لە صحاح دا دەڵێت: الجبت: وشەیەكە بۆ بتو كاهینو جادوگەر و هاوچەشنی ئەمانە بەكاردێت. بڕوانە: (منهل الواردین شرح ریاض الصالحین)ی دكتۆر صبحی الصالح، چاپی استانبول، ص٩٧٣.

[٢] دكتۆر صوبحی صالح لە (منهل الواردین ـ شرح ریاض الصالحین) ل٩١٤ دەڵێت: مەبەست ئەوەیە كە خەتكیشان لەسەر لم مانیعی نییە، ئەگەر زانستێكی وابێت بگونجێت لەگەڵ ئەوەی لە پێغەمبەران بە تایبەت ئیدریس نەقڵ كراوە، بەڵام ئەگەر كەهانەتو درۆبێت ئەوە ڕەت دەكرێتەوە.

ئەسڵی خەتكێشان ئەوەیە كە ڕەممالەكە سێ خەت دەكێشێت بە جۆ، یان ناوكە خورما لێیان دەداو ئینجا دەڵێت وا دەبێتو وا دەبێ.

دیارە پێغەمبەری خودا ڕێگری لە هەموو جۆرێك لە فاڵچێتی گرتووە، بەڵام چاوپۆشی كردنی بە ڕەملگەری كردووە، لەبەرئەوەی پێغەمبەرێكی وەكو ئیدریس كردوویەتی.

دانیناوه به (خط)داو ئەوەی، كه دەبێته هۆی —ئەوەی كه پرسیاركەر بێگومان مەبەستییەتی— دەرخستنی نادیار كه ئەمەش پێچەوانەی قورئانه، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی شتێكی تر بووبێ، ئەوه پرسیاركەر نایزانێ یان بۆی نەچووه، ئەگەر ئەوه ڕاستبێت، ئیتر ئەوه جێگەی سەرسوڕمانه، كه پێغەمبەر (ﷺ) نیگای بۆ دێت خەڵك فێركات لەلایەنی ڕاستو دروستیی (ضرب الرمل) لێدانی لم، تا سوودی لێوەربگرن، پێغەمبەر (ﷺ) لەم ڕووەوه سەرسوڕهێنەره كه دەبێته هۆی —به پێی ئەم دەقه— زانینی نادیار، تاكو نەبنه —به هۆی نەفامیەوه به ڕووی ڕاستی هێڵی لم— نێچیری دەجالەكانو فاڵچییەكان، نموونەی ئەم دەقەو بەم تێگەیشتنه كه له پیاوێكی زانستیی شەرعییو پایەبەرز، بەهەند وەردەگیرێ، كۆڵەكەیەك پێشكەش دەكاتو دەلاقەیەك دەكاتەوه، عەمبارێك دروستدەكات بۆ خاوەن مەبەسته خراپەكان، قورئانیش —بەبێ پێچو پەنا— ڕووی ڕاستی ئەم كارانەی دەرخستووەو ڕوونیكردووەتەوەو دەفەرموێت:

(قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلاَ ضَرّاً إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) (الأعراف: ١٨٨ ).

(عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً* إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَداً) (الجن:٢٦– ٢٧ ).

وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ وَلَكِنَّ اللّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِ مَن يَشَاءُ) (آل عمران: ١٧٩ ).

فەرموودەیەكی تر، كه (بوخاریو مسلم) گێڕاویانەتەوه، وەك ئەو فەرموودەی پێشتر وایه، (بوخاریو موسلیم) له عائیشەوه دەیگێڕنەوه "عن عائيشة رضي الله عنه قالت: سال رسول الله (ﷺ) أناس عن الكهان فقال "ليسوا بشيء" فقالوا: يا رسول الله إنهم يحد ثوننا أحيانا بشيء فيكدن حقا، فقال رسول الله (ﷺ) "تلك الكلمة من الحق يخطفها الجني فيقرها في أذن وليه فيخلطون معها مئة كذبة" لەگێڕانەوەكەی بوخاریدا كه لەعائیشەوه دەیگێڕێتەوه "عن عائشة رضي الله عنها أنها سمعت رسول الله (ﷺ) يقول "إن الملائكة تنزل

في العنان وهو السحاب، فتذكر الأمر قضي في السماء فيسترق الشيطان السمع، فيسمعه، فيوحيه الى الكهان، فيكذبون معها مئة كذبة عند أنفسهم".

بەمشێوەیە، بەپێی پیتی ئەم فەرموودەیە، ئەوا سیحرباز شتێ لە نادیار دەزانێ، جنۆکەو شەیتانەکان دەیبیستن، دەیدەن بەوان، پاشان سیحربازەکان زیادەی دەخەنەسەر لەوەی، کە دەیزانن لە نادیار بە حەزی خۆیان لە درۆ، کەچی دەبینین قورئان ئەوە باس دەکات، کە نادیار تەنها خوا دەیزانێت، بڕیار دەدات کە بارگۆڕاوە، گوێگرتن ڕێگری لێکراوە، لە کاتێکدا، کۆتا پەیام هاتووە، مرۆڤ گەیشتووەتە قۆناغی پێگەیشتنو بەرپرسیارییەتی تەواو کە دەتوانێ سپاردەی جێنشینایەتیی‌و بەڕێوەبردنی کاروباری جیهانیی خۆی جێبەجێبکات، کەسیش (غیب) نادیار نازانێت تەنها خوا نەبێت:

(قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً) (الجن: ١).

(وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاء فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً وَشُهُباً* وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَّصَداً* وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَداً) (الجن:٨– ١٠ ).

(عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً* إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَداً* لِيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَداً) (الجن:٢٦– ٢٨ ).

(وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِّلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ) (الملك: ٥ ).

(إِلاَّ مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ) (الحجر: ١٨ ).

(إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ) (الصافات: ١٠ ).

(قُل لاَّ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ) (الأنعام: ٥٠).

(قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ) (النمل: ٦٥ ).

ئەگەر قورئانی پیرۆز، بە ڕوونترین شێوە ئەوە ڕۆشنبکاتەوە، کە جیهانی دوای پەیام (قورئان) گەیشتووەتە قۆناغی پێگەیشتن، دەتوانێ تەواوترین بەرپرسیارییەتی لە بڕیارو ویستدا هەڵبگرێ، ئەمە مانای نەبوونی جیهانانی تر نییە، ئەوە لە کاروباری خوایە، گرنگ ئەوەیە، کە مرۆڤ لە سەردەمی قورئان‌و زانست، جیهانییەت بە ویست‌و ئیزنی خۆی —نەك كەسیتر— جیهانەكەی بەڕێوە دەبات‌و پرسیاری لەسەر دەكرێت، دوای پەیام (قورئان) بوار نییە، بۆ هیچ هێزێك لە هێزەكانی جیهانی تر، كە دەست بخاتە كاروبارو یاساكانی خوا، لەژیان‌و جیهانی مرۆڤدا، چونكە كەس بۆی نییە، شتی نادیار دەربارەی ڕووداوی ژیانی جیهانی مرۆڤ بزانێت‌و لێیەوە دەسەڵات پەیدا بكات بەسەر مرۆڤدا، لەبەرئەوەی پاسەوان دانراوە، پێغەمبەران پارێزەریان هەیە لەو نیگایەی بۆیان دێت، هەركەس بتوانێ گوێ بگرێ بۆ دزینی هەواڵ، ئەوە لەلایەن خوای گەورەوە نەیزەكی بۆ دەنێرێ‌و ئاگری بۆ دەهاوێ‌و هەڵەناكات‌و دەیپێكێ، خوای گەورە بەمەش ویستی چاكەی هەیە لەگەڵ مرۆڤ و لە خراپە دەیپارێزێ، دەسەڵاتی جیهانەكانی تر بەسەر مرۆڤدا، ڕێگری لێكراوە تا نەبێتە كۆسپ لەبەردەم هەڵگوتنی بەرپرسیاریەتییەكەیدا، هەروا خۆڕایی نییە، كە ریوایەتی سورەتی (جن) بە ڕابوردوو هاتووە: (كنا) بەڵام (الآن) ئەوە شتەكە گۆڕاوە، بەڵكو هەواڵدان دەربارەی جنۆكە بە پێغەمبەر (ﷺ) بە جیهانی جنۆكە بە گێڕانەوە بووە نەك بە بینین: (قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ) واتە بڵێ: نیگام بۆ هاتووە نەك بینیومە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو فەرموودەیەی، كە لە پێشەوە باسمانكرد، وا دەردەكەوێ، كە پێچەوانەی وێنە قورئانییەكەیە، فریشتەكان —لەگەڵ ئەوەی، كە ڕژێمێكی قایم هەیە بۆ ڕێگریی لە جنۆكەكان لە گوێگرتن— بە كەمتەرخەم پیشان دەدرێن، یان نایانبینن، یان بێدەسەڵاتن، یان گوێ نادەنە بڵاوبوونەوەی نهێنی نادیار، كە خوا هەواڵی لێداوە، كە بڕیاریداوە بپارێزرێت‌و كەس نەیزانێ، ئەگەر پێغەمبەران، كە خوا خۆی نیگایان بۆ دەنێرێ‌و دەیان پارێزێت، كە ئەوە گونجاو نییە ئێمە دەربارەی فریشتەكانی خوا لەو جۆرە گومانانە ببەین:

(لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ) (التحريم: ٦ ) ئەم بڕیارە دەردەكات بەبێ پێچ‌و شاراوە (عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً* إِلَّا مَنِ

ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَداً* لِيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَداً) (الجن:٢٦– ٢٨ ).

ئەگەر نموونەی ئەم دەقانە ڕاست بێت، لەوانەیە دەقی هەندێ لەو فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست نەبێ، لە ڕووی زانستیی‌و ڕەخنەی دەقەوە، کە چەندین لەکەی گێڕانەوەی تیایەو کە زانایانی فەرموودە لێی بێئاگابوون، گەورەیی هەربۆ خوایە کە نە هەڵە دەکاتو نە لە بیری دەچێ، هیچ زانایەك ناتوانێ هەڵەی لێبگرێ، ئیتر ئایا هیچ شتێ هەیە، کە مانا بکرێ لەسەر ئەوەی، ئەو گفتوگۆیانە مەبەست چەند کەسانێکی دیاریکراو بووبێت، یان چەند چیرییەکی دیاریکراو، پێغەمبەر ویسبێتی (ﷺ) زیانەکانی لە خۆی لادات، بەڵام بەشێوازو پێشەکییەکی گونجاو لەگەڵ عەقڵو توانایانو لە ڕووی دەروونیی‌و ژیرییەوە، هەندێکیان زۆر سەرەتایی بوون، هەقبوو ئەو کەسەی، کە ڕیوایەتی ئەو فەرموودەی دەکرد، بارودۆخی ئەو کاتەی ڕۆشن بکردایەتەوەو ڕاڤەی بکردایە، لەبەرئەوە، ئەو کەسەی، کە سووربوو لەسەر وەرگرتنی ئەم جۆرە فەرمانە، وا تەماشای نەکات، مەگەر لەو ڕووەوە نەبێ، کە دەوترێ بە ئەندازەی عەقڵی خەڵکی قسە بکە، ئەوەی کە لەم چەشنە بارە کردارییەدا هەستی پێدەکەن، بەمەش دەبێتە دەقێك، کە سروشتێکی تایبەتی دەبێ، لە پێویستییەکانی وتاردانی خەڵکییە، لەو باسەی، کە سووکترین زیانیان دانێ بۆیان، بوخاری لە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە (قال: حدثوا الناس بما يعرفون أتحبون أن يكذب الله ورسوله) هەروەها ئیمامی موسلیم لە ئیبن مەسعودەوە دەگێڕێتەوە: (ما أنت بمجدث قوما حيدثا لا تبلغه عقولهم الا كان لبعضهم فتنة)، دەبێ نەك هەر ڕەخنەی کەسەکان قایم بگرین، بەڵکو دەبێ ڕەخنە لە دەقیش بگرین، بەرنامەو ڕاڤەش قایمبگرین‌و بیکەین بە دادوەر، بەشێوەیەك قورئانی پیرۆزو مەبەستو چەمکەکانی دادوەر بێت لە وەرگرتنی جگە لە قورئان، لە دەقەکانو لێکۆڵینەوەکانو ماناکاندا، بەمەش دەرگا دادەخرێت –لەسەر بنەمای گیانی شەریعەت– کە بە هیچ شێوەیەك تێکەڵبوونو شێواندن ڕوومان لێنەکات، نەشبێتە عەمبار بۆ خورافەتو شتی ئەفسانەو پیسبوونی فیکریی‌و ڕۆشنبیریی، فەرموودە دروستەکانی

پێغەمبەرایەتیی، گەنجینەیەکی دەوڵەمەندە، پێویستمان بە زیاتر نییە لە فەرموودە، کە ڕاستو دروست نەبن، بەڵام هەر فەرموودەیەك ماناکەی ڕاست بێت، بەڵام کەسەکەی، کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە نەچەسپێنرێ لە دەقەکاندا وەریدەگرین، تەنها لە بواری دانایی‌و ئامۆژگاریی، ئەوەش لەبەر ڕاستی ماناکەی، کە دەگونجێ لەگەڵ گیانی شەریعەتدا.

## لە جیهانی ئەمڕۆدا بوارنییە بۆ فیکری خورافەت بەناوی ئیسلامەوە

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی زانست، ئیتر بوار نەما بۆ فیکری خورافەتو کاری چەواشەکاری، خوێندنی (المعوذتان) بەسە بۆ کەسێ کەترسی ویم دایبگرێ — لەبەر هۆکاری دەروونیو ڕۆشنبیریی— لەهەر زیانێکی ماددییو نامادديی کە خەڵك لە ڕووی دەروونییەوە دەترسنو دڵەخورپەیان پێدەکەوێ، هەندێ ڕووداوی ڕێکەوتو درۆی درۆزنەکانو ترساندنی چیرۆك گێڕەکانو فڕتو فێڵی دەجالەکان، ئەم کارە گەورە دەکەن، هەتا لە سەردەمی پێشهاتنی پەیامی شارستانییەتی جیهانیی، پەیامی قورئانو زانستو پێنوس، قورئان باسی ڕاستیی فەرمانی لەم شێوەی کردووە، کە بریتییە لە خەڵەتاندنو چاوبەستکردن:

(قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى) (طه: ٦٦ ).

(وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ) (البقرة: ١٠٢ ).

قورئان لەم بارەیەوە ڕاشکاوانەو بەڕوونی باسی دەکاتو دەریدەخات، کە هیچ لەو سیحرو شتانە سوودیان بۆ دەروون، یان سامان، یان منداڵ، یان ئایین، جگە لە زیانیی گیانییو دەروونییو ماددیی هیچیان سودیان نییە، ئەوەی شوێن ئەم کارانە بکەوێ بۆ ئەوەی سودوەربگرێ ئەوە شوێن تراویلکە (سراب) کەوتووە، ئەگەر ئەو فێڵبازو سیحربازانە توانای سوودگەیاندنیان هەبوایە —ئیتر لەهەر پۆشاکێکدا بن— سوودیان بۆ خۆیان دەگەیاند، بەو توانایە پێویستیان بە کەس نەدەبوو، هەر لافو درۆو دەلەسەیەك لەو بارەوە تەنها بۆ خەڵەتاندنی کەسانی سادەو ساویلکەو قوماربازو چاوچنۆکەکانن.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە، کە بزانین (معوذتین) لە ناوەرۆکیاندا نزاکردنە لای خوا بۆ پاراستنی ژیریی مسوڵمانو دڵی مسوڵمان، کە بە هەر هۆیەك دووچاری دڵەڕاوکێ بوو بێ، یان ئەگەر تووشی نەخۆشی دەروونیی هاتبێ، یان کاریگەریی بۆماوەیی (وارثة)ی لەسەربێ، یان هەندێ بەڵاو ناخۆشی، کە زانست هیچ هۆکارێکی لێنازانێ —تا ئەمڕۆ— کە ڕزگاری بکات، ئیتر (معوذتان)و خوێندنیان، پەنابردنە بۆ خوای بەتوانا، کە ئاگای لە هەموو شتێکەو یارمەتی دەداتو دەیپارێزێ لەو خورپەو ئەندێشەو دوودڵیو زەرەرو خراپانە، واتە خوێندنیان هۆکاری پاراستنی خوایین، سەنگەری خوایین لەهەموو خراپەیەك، کۆتایی هەموو دوودڵییەکە، هۆکارنین بۆلادانی بیروباوەڕو تێکدانی ژیریی‌و سەرگەردانی هەوڵدان، هۆکارنین بۆ ئەنجامدانی کاری خورافەتو سیحربازیی، عەمبار نییە بۆ کردنەوەی ئیسرائیلیاتی پڕوپوچو ئەفسانەو درۆو دەلەسە، خراپتێکەیشتنو ماناکردن، پاشماوەی بیروباوەڕەکانو فەلسەفە چەواشەکارەکان.

سورەتی (الناس) قورئانە، نزایە مرۆڤ پەنای پێدەگرێ بەخوا، داوای یارمەتی خوا دەکات دژی وەسوەسەی شەیتانەکانو جنۆکەکان، ڕوونو ئاشکرایە، کە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بەسیحرەوە نییە، ئەو وەسوەسەی، کە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە دەیخاتە دڵەکان، ئەمانە هیچ شتی ناتوانن —تەنها ئەوەنەبێ، کە خەڵك لە ناو دەروونیدا هەست بەوەسوەسە دەکات— هیچ دەسەڵاتێکیان بەسەر کەسدا نییە، هەرکەسێ سەرپێچیان بکات، ڕزگاری دەبێ، هەرکەس گوێڕایەڵیان بکاتو شوێنیان بکەوێ، تووشی زیان دەبێ.

بەڵام سورەتی (الفلق)، ئەمە نزایە مرۆڤی باوەڕ بەخوا، پەنا دەگرێ بە خوا لە خراپەی خەڵکی، داوای کۆمەکی خوا دەکات، تا سەرکەوێ بەسەر خرپەو فێڵەکانیاندا، پەنا دەگرێ بە خوا دژی ئازارو زیانەکانیان، لەو کەسانەی، کە فاڵچییو سیحربازو نووشتەچین، تا پارێزراوبن لە زیانەکانیان، کە ئەم کەسانە، تاقمێکی خراپن لەناو خەڵکدا، ئەم کردارانە فێربوون لە چەرخەکانی تاریکیو فاڵچیەکانی پەرستگاکانی شارستانیە کۆنەکان، وەك سیحربازەکانی سەردەمی فیرعەونەکانو پاشاکانی بابلو ئەوانەی —لە شارستانییەتە کۆنەکان پێش شارستانییەتی یۆنانی— کە زانستی تایبەتیان هەبووەو خەڵکی نەیزانیوە چی

دەكەن، بێگومان كەمێك زانستو زانیاریی تیا بووە بۆ خەڵەتاندنی خەڵكانی سادەو ساویلكە، ئەم كارانە لە شارستانییە كۆنەكاندا، وەك سەردەمی فیرعەونەكانو پاشاكانی بابلو ئاشوور ناسرابوو، بەڵكو هەندێ تاقم لە گەلانی قەرەج، تا ئەمڕۆش ئەم جۆرە كارانە دەكەن، لە ناویاندا داوێنپیسیو دزیكردن بڵاوە، لەبەرئەوە ئەو كارانەی، كە ئەوان دەیكەن، هەندێ جار زیانی هەیە، ئەو كەرەستانەی دەیدەن بەخەڵك كە دەچنە لایان بۆكاری فاڵچییەتی، هەمەچەشنەیەو ئازاریان دەداتو كاریان لێدەكات، یان بەهۆی پیسكردنی ئەو شتانەی بەكاریدەهێنن، لە خواردەمەنییە شلەكانو پۆشاكو شتیتر، ئێمە ئەمڕۆ دەزانین كە كەمێكی زۆر كەم لەو كەرەستەی، كە بە چاو نابینرێ، زیانی گەورەی دەبێ، لەهەموو بارەكاندا هەموو كارێكی ئەو سیحربازانە شتی دەروونییە، دەشزانین كە شتی دەروونیی كاریگەریی هەیەو زیان بەدەروونو ئەندامەكانی جەستە دەگەیەنێ، لەبەرئەوە پزیشكەیەتی دوروونییو پیشەی لەم چەشنە —ئەگەر كەسێكی نیازپاك نەبێ، زانیاریشی هەبێ، خاوەن پسپۆڕی نەبێ لە چارەسەری دەروونی —زیانی دەبێ، ئەوەی جێیداخە هەندێ كەس پەنا دەبەنە بەر ئەو كەسە فێڵبازانە بۆ چارەسەر، یان سوودگەیاندن، یان هەوڵدان بۆ زیانگەیاندنو فێڵكردن لە خەڵكانیتر، ئەو چەواشەكارانە نە بۆ خۆیانو نە بۆ كەسانی تر، جگە لە زییانو خراپە، هیچ شتێكی تریان نییە، سورەتی (الفلق) بۆ باوەڕدار بریتییە لە نزاو داوای یارمەتیكردن دژی فرتو فێڵو حەسوودی كەسانی چاوچنۆك، ئەوانەی هەمیشە خۆزگە دەخوازن بۆ نەمانی نیعمەتو خۆشیی خەڵكانیتر، ئەم سورەتە دژی فێڵی فێڵبازانەو دژی ئازارو زیانەكانی ئەو كەسە سیحربازو نوشتەگەرانەیە، كە كاری ئەم فێڵبازانە كەسانی سادە دەخەڵەتێنێو وا گومان دەبەن، كە خاوەنی هێزو دەسەڵاتنو هەندێ هێزی سیحری نادیاریان هەیە، لەبەرئەوە، دەبێ دەسەڵاتی كۆمەڵگە (حكومەت) بەرەنگاری ئەم تاقمە مشەخۆرە زیان بەخشەو هاوشێوەكانیان ببێتەوە، خەڵك هۆشیار بكەنەوە، تا بتوانن كارو كردارەكانی ئەو جۆرە كەسە مشەخۆرانە پووچەڵبكەنەوەو شوێنیان نەكەون، تا كۆمەڵگە پارێزراو بێتو مرۆڤەكان پارێزراوبنو بەرگریی لە ئایینو ئوممەت بكەن.

## جیهانی پێش هاتنی موحەممەدییو جیهانی پاش هاتنی

گومانی تیا نییە، هەست دەکەین، لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتی کە پیایدا تێپەڕیوە، کە جیهانی دوای هاتنی پەیامی موحەممەدی جیاوازە لە جیهانی دوای هاتنی پەیامی موحەممەدیی، چونکە جیهانی پێش هاتنی پەیامیی موحەممەدیی پڕبووە لە شتی سەرسوڕهێنەرو نائاسایی، هەروەها پڕبووە لە خورافەتو شتی ئەفسانە، بەڵام جیهانی دوای هاتنی پەیامیی موحەممەدیی جیهانی قورئانو زانستو یاسا بووە.

ئەوەی کە سودبەخشە ئەوەیە کە گفتوگۆ بکەین لەسەر تێگەیشتنی هەندێ لەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا هاتووە، دەربارەی ژێربارکردنی جنۆکە بۆ (سلێمان)ی پێغەمبەری خوا، دەربارەی (الملکین)[1] لە بابل کە هاروتو ماروت

---

[1] موحەممەدی کوڕی یوسف بەناوبانگ بە ئیبن حەییانی ئەندەلوسی غەرناتی (٦٤٥ــ ٧٥٤ك) لە کتێبی (البحر المحیط) لە خوێندنەوەی (الملكین)دا باس لەوە دەکات کە جمهور بە مەلەکەین خوێندوویانەتەوە، وادیارە ئەو دوانە لە فریشتەکان بوون، وتراوە: جوبرەئیلو میکائیل، هەروەها وتراوە: دوو فریشتەی تر بوون، ئەوانیش هارووت و مارووتن.

ئیبن عەباس و حەسەنو ئەبوئەسوەدی دوئیلی و زەحەاك و ئیبن ئەبزی بە (مەلیکەین) خوێندوویانەتەوە، ئیبن عەبباس وتی: دوو پیاوی جادووگەر بوون لە بابل، چونکە فریشتە خەڵك فێری جادوو ناکەن.

حەسەن وتی: ئەوان دوو دێوبوون لە بابلی عێراق، ئەبوئەسوەد: هارووتو مارووت بوون، کە ئەمەش وەکو قسەکەی حەسەن وایە. ئیبن ئەبزی وتی: ئەوان داوودو سولەیمان بوون، لەسەر پێغەمبەرمانو ئەوانیش جوانترین درووودو سڵاو بێ.

وتراوە: ئەوان دوو شەیتان بوون، کەواتە بە قسەی ابن أبزی بێ (ما) دەبێ نافیە بێو لەسەر قسەکانی تر لەم خوێندنەوانە دەبێ (ما) مەوصولە بێ.

مانای (انزال) بریتییە لە فڕێدانە ناودڵ، موفەسسیران لە خوێندنەوەی (مەلەکین)دا داستانی زۆریان باسکردووەو چیرۆکی سەرسوڕهێنەرو ناماقوڵیان لە بابەتی بەدڕەوشتیی و دڵداریی‌و بێبڕوایی‌و ئەو دوان لە بابل سزا دەدرێن، لەو چیرۆکانەی کە لەگەڵ ئەو سەردەومانەدا دەگونجێن، کە خورافاتی زۆری تیا پەسەندو ریوایەت و سەیرو سەمەرەی تیا پەیدا دەبوو، بە بۆنەی بڵاوبوونەوەی جەهلو خورافاتو

بوون، ئەم باسە عەمبارێکی چاکە بۆ هەندێ کەس، تا پاساوی فیکری خورافەتو سیحربازیی بداتەوە، خەڵکی سادەو ساویلکە چاوبەست بکات، بیخاتە تۆڕو پەتی لافلێدانی کەسە فێڵبازو سیحربازو فاڵچییەکانەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَـكِنَّ الشَّيْاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ) (البقرة: ١٠٢ ).

ئەگەر لەم ئایەتەی سەرەوە وردبینەوە، دەبینین باسی کارو ڕووداوو هەڵسوکەوتێ دەکات، کە لەسەردەمی پێشهاتنی پەیامی موحەممەدییدا ڕوویداوە، مرۆڤایەتیی پێشهاتنی پەیامی موحەممەدیی لە ناوەرۆکیدا سادەبووە، دابەشبووە بەسەر چەندین هۆزو گەلی دوور لە یەکترو کەمزانستو زانیاریی، ئەو نەتەوەو هۆزانە، چەندین پەیامو ئاڕاستەیان بۆ نێرراوە، تا دەستیان بگرێ بەرەو گەشەکردنو بەرزبوونەوە، تا سەردەمی قۆناغی پەیامی موحەممەدیی، کە زانستییو جیهانیی بووە، لەبەرئەوە یەکێ لە داواکانی هۆزو نەتەوە سەرەتاییەکان، داواکردنی موعجیزەو شتی نائاسایی بووە، ئەو موعجیزانە هۆکاری دەستی پێغەمبەرەکانی پێش موحەممەد (ﷺ) بووە، بۆ ئاڕاستەکردنی ژیانی نەتەوەکانیان، تا بگەنە دڵو عەقڵی خەڵکەکە، کە زۆربەیان خەڵکی سادەو ساویلکە بوون، دۆزینەوەی قایلکردنی سنووردار بۆیان بەرەو پێغەمبەرەکەو پەیامەکەشی ئامانج بووە، کە ئەم ڕاستییەش لە قورئاندا لەسورەتی (الجن)دا

---

لاوازیی بیر. هەرچۆن بێ، ئیبن حەییان دەگات بەوەی لەگەڵ ئیبن عەبباس هاوڕابێت، کاتێك هەموو ئەم وڕاوانەی ئەمڕۆش زۆر کەس قبووڵیانە هەمووی کۆکردەوەو لەسەری گوتن:

(هەموو ئەمانە هیچیان ڕاست نین‌و فریشتەکان پارێزراون لە گوناه). بڕوانە: البحر المحیط، ابن حیان، نشر دار الفکر، بیروت ١٩٩٢، ج١/٥٢٨.

هەیە، جیاوازیی نێوان سەردەمی کۆنو سەردەمی پەیامی کۆتایی موحەممەد (ﷺ) ڕوون دەکاتەوە.

ئایەتی ژمارە ١٠٢ی سورەتی (البقرة)، کە لە پێشەوە هەیە، ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە ئەوە بۆ (سلێمان)، ژێربارکراوە لە کارەکانی جنۆکەکانو هێزەکانی سروشت، ئەو شتانەی تریش، کە لە چەند جێگایەکی تری قورئاندا باسکراوە، ئەوە لە ڕووی یارمەتی خوایيو شتی نائاسایی پێغەمبەرایەتییەوە، بە بێئەوەی باوەڕی سولەیمان هیچ کەلێنێکی تێبکەوێ، بەبێئەوەی هیچ هەوڵێکی خۆی تیابووبێ، لەگەڵ جیهانەکانیتر، بە تایبەتی جیهانی جنۆکەکان، چونکە شەیتانەکان ئیتر جنۆکەبن، یان مرۆڤ، دەبێ بێباوەڕو لوتبەرزو سەرپێچیکاریی فەرمانی پەروەردگاریان بن، ئینجا ئەم نازناوەیان بەسەردا دەسەپێنرێ.

هەروەها " الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ" ئەمش پێشهاتنی پەیامی موحەممەدیی بووە، دەربارەی شتی نائاساییو پەیوەندیی جیهانی مرۆڤی سەرەتایی بەجیهانی تر، ڕاست یان ئەندێشە بێت لە بەرەوچوونی تەواوبوونی مرۆڤایەتیی (الکمال الإنساني)و سەربەخۆییو هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی تەواو لەگەیاندنیدا لە ناو بازنەی ململانێی نێوان هەقو بەتاڵ، ڕووناکییو تاریکیی، لە جیهانییو دەروونییدا، لەبەرئەوە گونجاونییە لە دەقە قورئانییەکە —هەتا بۆ ئەو سەردەمەش— وا تێبگەی لێی، کە فریشتە خەڵك فێری خراپەو بێباوەڕیی دەکەن، ئەو تێگەیشتنە شیاوی فریشتەکان نییە، هیچ هەستێکی پاکیی ئیسلامیی وەرناگرێت، کە ئەمەش بۆچوونی عەبدوڵلای کوڕی عەباسو ئیبن ئەبزیو ئیبن حەبان، خوێندنەوەی تەواو بریتییە لە (الملکین) لامەکە کەسرەی لەژێرە، نەك (الملکین) لامەکەی فەتحەی لەسەرە، جۆرەکانی خوێندنەوە ئاماژە بۆ (الملکین) بە فەتحەی لام دەکات، کە جووتی (ملك)ە بەفەتحەی لام، کۆی بریتییە لە (ملوك)، خوێندنەوەی بە (ملکین)، کە لامەکە کەسرەی هەبێ، کۆکەشی (ملوك) بێت لە ڕای مندا لە پێشترە، ئەوکاتە مەبەست لەوشەکە (ملوك) واتە پاشاکان بەمانای گەورەی پەرستگاکانی سەردەمی کۆن دێت، کە لە پێش شارستانییەتی یۆناندا باوبوو، خۆیان پسپۆڕبوون لە زانستو زانیاریی، کە سەرچاوەی هێزو گەشاوەیی بەردەمی خەڵکەکە بوون، لەسەر شێوەی چیرۆکی موسا (علیه السلام) لەگەڵ سیحربازەکانی فیرعەون کە بەفرۆفێڵەکانیان

خەڵكیان دەخەڵەتاندو چاوبەستیان لێدەكردن، لەبەرئەوە، كاتێ بینیان كە پەتو گوریسەكانیان بە مارێكی ڕاستەقینە لەناوچوو پەتو گوریسەكانی خۆیان تەنها لە بەرچاوی خەڵك ماربوون، ئەگینا هەر پەتو گوریس بوون، لەبەرئەوە زانییان، كە (موسا) ڕاستە، خێرا باوەڕیان پێهێنا، بەڵام بە پێچەوانەی سەردەمی یۆنان، كە زانستو زانیارییەكانیان لە نێوان خەڵكدا لە ئەڵقەی كراوەدا فێری خەڵكی دەكرد.

ئەوەی تێبینی دەكرێ، ئەوەیەو كە ئەو ئەو پاشاو سیحربازانە كاتێ خەڵكیان فێری زانستی خۆیان دەكرد لەوەی، كە خوا پێی دابوون –بێگومان هەندێكیان ئەگەر خراپ بەكاربێت زیانی دەبێ– قوتابییەكانیان لەو زانستو زانیاریانە، كە بەمیرات بۆیان مابووەوە دەترساند، گوایە ئەگەر نەزانن باش بەكاریبهێنن، دەبێتە بەڵا بەسەریانەوە، خراپەو ئازاریان كردووە، خەڵكیان لاداوە لە ڕێگای ڕاست، قورئانی پیرۆز ڕوونی كردووەتەوە، كە خراپ بەكارهێنانی ئەو زانستو توانایانە لە زیانو ئازارو چەواشەكاریی بێباوەڕییە بە نیعمەتی زانست، زیانی پەتیو بێسوودیشە، هەركەس پێی هەڵسێو بیكات پاشەڕۆژی خراپە، ئەم مانایە شیاوی تێگەیشتنە، ئەمە شیاوی پلەوپایەی فریشتەكانی خوایە، ئەمە لەپێشترە بۆ مامۆستا چاكەكان لەبارودۆخی ئەو شارستانییەتییانەی پێشوو، شێوازی هەڵسوكەوتیان، كە دەبێ هەستی ئیسلامیی پاك وەرینەگرێ، لەگەڵ بنەماكانی ڕەخنەی دروستەكان، كە زۆر پابەندە بە گیانی قورئانو چەمكەكانی، كاتێ باسی ژیانو ڕێڕەوی پێغەمبەرانو فریشتەو پیاوچاكان دەكات.

لەوانەیە سوودی هەبێ، كە بیری خوێنەر بهێنێتەوە، كە جووڵەو دەنگو ڕووناكییو ڕێكخستنی شانۆ لە یارییەكانی (سێركو سیحر) لەسەر شانۆ، خۆیان جۆرە فێڵێكن، لە سینەمادا ئەگەر نەمانزانیایە بە زانستی یەقین، كە ئەوە تاكە وێنەنو بە شوێن یەكدا دێنو بە خێرایی نمایش دەكرێنو چاو دەخەڵەتێنن، ئەوا سوێندمان دەخوارد، كە جوڵەیەكی زیندووی ڕاستەقینەیە.

چەواشەكارییو فرتو فێڵو سیحربازییو هەندێ زانیاریی دەربارەی سیفەتی ماددەكانو ڕێگوزەری دەروونەكان، چەند ڕەنگێكی جیاوازە لە فێڵو هەندێجار

بە ناوی سیحر، هەندێ جار بەناوی ئایین، کە هەموویان –ئەگەر سەرچاوەکانیان جیاوازییش بن– لە یەك مەبەستدا یەکدەگرنەوە، ئەویش خەڵەتاندنی کەسانی سادەو نەفامو داماون، لەوەشەوە سامانو پلەو پایەو دارایی کۆدەکەنەوە، بە بێئەوەی گوێبدەنە ئەو زیانەی، کە لە خەڵکی دەدەنو ئازاریان پێدەگەیەنن، هەموو ئەو شتانە شیاو نییە، بۆ کەسی باوەڕداری یەکتاپەرست، کە بکەوێتە تۆڕەکانیانەوەو عەقڵو ئایینو سامانی لە دەست بدات.

ئەمە نموونەیەکە لە تێڕوانینی جیاواز لەم شتانە، جیاوازیی فیکر، دژایەتیی بەرنامەکان، لە گرفتو ترسناکییەکان، لە شوێنەوارە زیانبەخشەکان لەسەر عەقڵیەتیی ئوممەتی ئیسلامیی، ئەمەش زۆر کەم کەسانی پسپۆڕی زانستیی لێی دەکۆڵنەوەو ڕووەکانی دەردەخەن، کەلێنەکانی پڕدەکەنەوە، لە بارەیەوە بنەماکانی هەڵسوکەوتی فیکریی‌و پەروەردەیی ئەرێیان (إیجابی) دروست دادەنێن، تاوەکو بیروباوەڕە ژیرییەکانو تواناکان وێران نەبێت، لانەدات لە ڕێنمونییەکانی قورئانو بەرپرسیاریەتی جێنشینایەتیی.

## پێویستییەتی ڕاستکردنەوەی بەرنامەیی و تەکنیکی ڕۆشنبیریی

زۆر لەو دەقانەی، کە بە ڕاست دادەنرێن، ڕاست نییە –لە ڕاستیدا– لەبەرکەلێنێك، یان هەرشتێکی تر لەگێڕانەوەیان لەدەقدا، چونکە تا ئێستا بە هۆی کەموکورتیی زانیاریمانو بەرنامەکان کە دەبێ پێشبخرێ، بە تایبەتی لە بواری ڕەخنەی دەق، لەبواری لێکۆڵینەوەی پیاوان، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارانە لەسەر تیشکی ڕەخنەگرتن لە دەق، هەندێکیان ڕاستە، بەڵام لە بارودۆخی تایبەتی خۆیدا، کە ئەوەی ئەمڕۆ دەیخوێنیتەوە لە بارودۆخی ئەو سەردەمە، شارەزا نییە، لەبەر ئەوە لە تێگەیشتندا هەڵەدەکات، ڕۆشنبیریی ئوممەت –لەبەر خراپیی تێگەیشتنی– پیس دەکات، عەقڵیەتی تێکدەدات، دەرگای –بەهۆی دەسەڵاتو پیرۆزییەوە– خورافەتو شتی بێمانا دەکاتەوە، کە دەبێتە هۆی ڕووخاندنی بەرپرسیارییەتی جێنشینایەتیی‌و زانستیی‌و وزەو دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەی ئیسلام.

مەبەست لەوەی پێشوو، ئەوە نییە، کە لە هەموو کارێك‌و فرمانێکدا ڕای تەواو هەیە، بەڵکو مەبەست لەوە، کردنەوەی دەرگای گفتوگۆی زانستیانەی بەرنامەیی جوانە لە نێوان زاناکان‌و بیریارە بەتواناکان بە بەرنامەیەتی‌و زانست‌و ڕۆشنبیریی تێرو تەواو، بە هۆیەوە، مەبەستەکان‌و ئامانجەکان دیاریدەکرێت، کارەکانی لەسەر تیشکی شەریعەت‌و مەبەستەکانی‌و باری ژیانی ئوممەت‌و گرفتەکانی چارەسەر بکرێت، جێگرەکان پوختە بکرێن، گۆڕانەکان بئاخرێن، ئاستەنگەکان ڕووبەڕووببنەوە، بەمشێوە، بە گورجیی کاردەکەن لەسەر ئازادکردنی بەرنامەکانی فیکرو چاکسازیی‌و سوودوەرگرتن لە تازەگەرییەکان لە ئامێرەکان‌و تواناکان، ڕۆشنبیریی خۆمانی پێپاك دەکەینەوە، ڕێگاش دادەخەین لەسەر ئەوەی، کە ئامێرەکانی تەواو نییەو دەروون نەخۆشەو خاوەن مەبەستە، بەڕەکە لە ژێر پێیان دەردەهێنرێت، چەکی زاڵبوونی پیرۆزیی‌و وتاری ترساندن لە دەستیان وەردەگیرێت، ئیتر ناتوانن بەردەوامبن لە زیانگەیاندن بە عەقڵی ئوممەت‌و ویژدانی، ئا بەمجۆرە، ئوممەت دەتوانێ تێڕوانینی پاکیی خۆی بگەڕێنێتەوەو بەهاکان‌و بیرو ویژدانی بخاتەوە کار، تواناکەی بگەڕێنێتەوە لەسەر گورج‌و گۆڵیی گەیاندنی زانیاریی‌و زانستیی‌و جوانکاریی تیایدا.

## گرفتی پەروەردەیی: پرۆگرام‌و سەرچاوە

گرفتی گەورە، پاش گرفتی بەرنامەیی‌و ڕۆشنبیریی، بەهۆی تاکلایەنی زانست‌و ئەو بەرهەمانەی کە لە پیسبوونی ڕۆشنبیرییەوە پەیدابووە، ئەگەر ویستمان کاری گورجوگۆڵ بکەین‌و لە پێناوی بەدیهێنانی توانای ئوممەت لەسەر چاکسازیی‌و گۆڕان، کارکردن بۆ چەسپاندنی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی لە ئامانجە باڵاکانییەتی، بریتییە لە گرفتی پەروەردەیی.

ئوممەتی ئیسلامیی ژمارەیەکی زۆر لە بیریارو سەرکردەی چاکسازی لێهەڵکەتووە، کە بە نووسین‌و خەبات‌و کۆششیان توانیویانە زۆر لە کەلێنەکان دەستنیشان بکەن کە ئوممەتی ئیسلام پێوەی دەناڵێنێ، زۆر لەو سیفەتانەی، کە دەبێ لێی ڕزگاربێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئوممەت تا ئەمڕۆ سەرکەوتوو نەبوو لە

داهێنانی گۆڕاندا، ڕزگارنەبووە لە لەکەو ئەو نەخۆشیانەی، کە گرفتاری بووە، بێگومان ئەم عەقڵە ڕووناکانە بەئاگانەبوو لەلایەنی پەروەردەیی منالّییەت، کە بناغەی هەموو گۆڕانێکە، منالّو لایەنی پەروەردەیی، تاسنوورێکی دوور لە پەراوێزدا مایەوە لە فیکرو ڕامیارییو چالاکیی فیکرییو کۆمەلآیەتی ئوممەتی ئیسلامدا.

هەروەکو لە پێشەوە ڕوونمان کردەوە، کە گرفتی پەوەردەیی بریتییە لە بەروبوومی گرفتی فیکر، چونکە عەقلّی مسولّمان —لە کەنارگیریدا— هەستکردنی بە سروشتی گۆڕانەکان نەبوو، بە هۆی زۆری ئەو ڕووداوانەی، کە بەدوای یەکدا هاتن، کە ئەم ڕووداوانە ئاستەنگی زانستییو سەربازییو کارگێڕییو ڕامیاریی لەگەلّدا بوو، کە سەرکردە ڕامیارییو فیکرییەکان لێی بەئاگاهاتن، لەگەلّ ئەمەدا، لای نەکردەوە بەلای گرنگیی لایەنی پەروەردە لە پاراستنی بناغەکانی بنیاتی ئوممەت، هەروەها ئاڕاستەکردنی گۆڕانە کۆمەلآیەتییەکانو شوێنکەوتنی ئەرێیی گۆڕانەکان.

بە تێکشکانی فیکری پەروەردەیی —بەو سیفەتەی، کە بەشێکە لە تێکشکانی فیکری یاسایی کۆمەلآیەتیی مرۆڤیی، —تێڕوانینی گشتیی کۆمەلآیەتیی تێکچوو، خراپەو وێرانەی کۆمەلآیەتیی ڕەگی داکوتا، بە هۆی گەورەبوونی نەخۆشیی ستەمکردنو زۆرداریی لە ڕامیارییو فیکرو پەروەردە، چونکە نە ڕاوێژو نە دادپەروەرییو نە توانا، بە بێ ڕۆشنبیریو فیکر پەیدا نابێ، هەروەها نە گەشەو نە پێشکەوتن، بەبێ پەروەردەو فێرکردن دروست نابێ.

کۆمەلّگەی ستەمو ترساندنو زۆرداریی بریتییە لە کۆمەلّگەی تاك دەسەلآت، کە ڕۆلّو هاوبەشی کەسانی تری تیا نییە، هەموو کەسێ ستەم لە کەسی خوار خۆی دەکات، هەموو تاکێك دەروونی کۆیلەی هەیە، تووشی نەخۆشیی سەرشۆڕیی بۆ کەسی لەخۆی بەهێزتر بووە —بەو بارەی، کە لەسەری ڕاهاتووە— دەبێتە سەرکەشو ستەمکار بەسەر ئەو کەسانەوەی، کە لە خوارەوەی خۆیدانو لەو لاوازترن، لە ڕووی ڕاستییەوە هیچ پەیوەندییەکی هاوکارییو یارمەتییدان لە نێوان ڕۆلّەکانی کۆمەلّگەی کۆیلە دروست نابێت، بەلّکو تاکایەتییو خۆخۆیی لەسەر سوود پەیدا دەبێ، هەولّدان بۆ پاشکۆیەتی، ملشۆڕییو ستەمدیدەییە، لە

زنجیرەیەکدا لای کەسی هەرەگەورەو ستەمکاری پایەبڵند نەبێ کۆتایی نایەت، کە ئەویش خۆی دەپەرستێو ملکەچی گەورە بیانییەکانە، خۆی دەدات بەدەستەوە، ویستی دەدات بەدەست چاوچنۆکییو دەسەڵاتی بیانییەوە، لە ئەنجام سووربوونی لەسەرخۆییو بەرژەوەندییو خۆشییەکانی خۆی، لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆی، گوێ ناداتە مافەکانی ئوممەتەکەی.

سروشتییە لە کۆمەڵگەی دەروون کۆیلەو ستەمی هەرەمییو فیکری تاکڕەویی، کە ڕێزبەندیی مافی منداڵ —لەبەر لاوازییەکەی— لە خوارەوەی پلەی پەیژەکە بێت، بڕێکی کەمقەبارەو ئەندازێکی پشتگوێخراو لەبەهاو ڕێزدا بێت، هێزی داهاتوو تۆوی گەشەو ئومێدیی گەلو ڕووگەی ئاواتەکان بێت، ئەم منداڵە نەتێدەگاتو نەهۆشیارەو نەهەست دەکات، ئەو کە دەکەوێتە خوارەوەی هەرەمی بەکۆیلەکردنەکە، دەبێ بە فەرمانو بەگوێرەی حەزی گەورە تەمەنەکان، لە باوكو براو خزمو مامۆستا، بڕوات بەڕێوە، هەمیشە دەبێ ملکەچو بەدەم داواکانیانەوە بڕوات، کەسێکی وەك ئەو، بۆی نییە پرسیار بکات، یان پرسیاری لێبکرێت، نابێ گفتوگۆ بکات، ناشبێ گفتوگۆی لەگەڵ بکرێت.

دەبێ بێدەنگو گوێڕایەڵ بێت، ڕاوبۆچوونە منداڵیەکانی ڕێزی لێناگیرێ، گوێ نادرێتە حەزە منداڵیەکەی، دەبێ بە بێ پرسیارکردنو بەرەنگاربوونەوە، هەستێ بە لەبەرکردنو وتنەوەو لاساییکردنەوەو شوێنکەوتن، ئەمە لە کۆمەڵگەی کۆیلەکاندا بەرنامەکاندا بەرنامەکانی پەروەردەو چەمکەکانییەتی، بەڵام ترساندنو تۆڵەکردنەوە، هەردووکیان ئامێری بنەڕەتین، ئیتر ئاشکرا بێ، یان شاراوە.

## پێویستییەتی چاودێریکردنی پەیوەندی نێوان زانستییو ویژدانی پەروەردەیی

لەبەرئەوەی کە بوار نەبوو —لەگەڵ ئەمجۆرە لەبەرنامەو هۆکارەکان لە زانستو پەروەردەو فێرکردن— بۆ وتاری پێغەمبەرێتیی بۆ منداڵ، کە لەسەر ئەرمونیانییو خۆشەویستییو چاودێرییو ڕێزگرتنو هاندان بنیاتنراوە، بوارنییە

بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی كۆمەڵایەتیی پەروەردەیی منداڵو وزەو تواناو ڕۆڵی لە چاكسازییو گۆڕانی كۆمەڵایەتییو شارستانیی.

لەبەرئەوە، دەبێ چاكسازیی فیكریی دەست بكات —بە هەموو ئەوەی، كە هەیەتی لە ئامێرە ڕۆشنبیرییو پەروەردەییە دروستەكان— بە وەبەرهێنانی چڕو ڕاستەوخۆ لە گۆڕەپانی پەروەردەدا ئەوەی —كە لەوەوە— تەواوكاری دروستكردنەوەی كەسایەتییو مسوڵمان دەگەڕێتەوەو ئازادیی دەكاتو بنیاتی تاكێكی بەهێزو دروست، كە دەبێتە ئەندامێكی چالاك لەكۆمەڵگەیەكی دروستو بەهێزو دامەزراوو هاوكاریی یەكتر، لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، لەلایەنی زانستییشەوە، دەبێتە كەسێكی ژیرو بیریارو وردبین، لە لایەنی بنیاتی دەروونیو ویژدانییەوە، دەروونێكی باوەڕدارو ئازادو ئیجابییو بەڕێز دەبێتو ئازاو دەستپێشخەر دەبێت.

هەتا بتوانین دووبارە بنیاتی عەقڵییەتو دەروونی منداڵی مسوڵمان داڕێژین، گۆڕانی ئەرێشی تیا دروست بكەین، كە گیانی باوەڕو یەكتاپەرستییو بەخشینی جێنشینایەتیی بنوێنێت لەسەر بنەما زانستییە پێشكەوتووەكان دەبێ —بۆ بەدیهێنانی ئەوە— جێگیرو گۆڕاوەكان بزانین لەبەرنامەی پەروەردەی منداڵی مسوڵماندا، هەروەها لێكۆڵینەوەی زانستی پەروەردەیی گەشەپێبدەینو بوارەكانی قوڵ بكەین، لەبەر تیشكی جێگیرە ئیسلامییەكان، بە جۆرێك، كە بەرنامەكانو هۆكارەكانو هەوڵەكانو گرنگیی پێدانە پەروەردەییەكان، بگونجێت لەگەڵ گەشەی زانستو شارەزاییدا، لەگەڵ سروشتی گۆڕانەكانو ئاستەنگەكان، لەگەڵ ئەو شتانەی هەیە بۆ منداڵ لە هۆكارو تواناكانو وزەكان بۆ گەشەی سیفەتو توانا پێویستەكان بۆ سەركەوتنو بەرەو پێشەوەچوون لە بواری تواناو بەخشیندا.

هەتا بتوانین ئەو توانایە بهێنینەدی، گۆڕانی كۆمەڵایەتیی داواكراو بەدەستبهێنن، تەنها خستنە بەردەمی تێڕوانینی ئیسلامیی گشتییو ڕێبازە باوەڕییە بنەڕەتییەكان بەس نییە، بەڵكو دەبێ چارەسەرێكی زانستییانەی بەرنامەییانە دابنرێت، تا تێكەڵیو كوێرانەیی لە نێوان جێگیرەكانو گۆڕانەكانداو جۆرەكانی وتارە گەیاندنییەكانو وتاردانە پەروەردەییەكاندا دروست نەبێت.

## تێکشکانی فیکری پەروەردەیی پاشکۆی تێکشکانی فیکری یاساییە

لەگەڵ دیارنەبوونی زانیارییە کۆمەڵایەتییەکانو نەبوونی هۆشیاریی، بەسروشتی بەرنامەی پێغەمبەرێتی پەروەردەیی، ئیتر دیارنەمانی زانستی پەروەردەو لێکۆڵینەوەکانی نامۆ نییە لە مێژووی فیکری ئیسلامییدا، وێنە ڕاستەکەی – ڕاڤەی ئەو بارە دەکات، کە تواناو وزەی ئوممەتی تێکەوتووە– لە حوجرەکانی خوێندنی منالاَندا بۆ ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە ڕەنگدەداتەوە، ئەو بارەی، کە ئەم حوجرانەی تیا بووە، باری خراپی مامۆستاکانو بەرنامە فێرکارییە سەرەتاییەکەی، کە تەنها فێرکردنی خوێندنی کەمی قورئان بوو، لەگەڵ حیساب، هۆکارە پەروەدەییەکانیش هۆکاری لێدان بوو، ئەوەش –لە هەندێ لایەنەوە– دواکەوتنی شارستانیمان دەردەخاتو پێشکەوتنی گەلانی تر، ئەگەر وردبینەوە، دەبینین فێرکردنی منالاَنی خەڵکەو پەروەردەکردنیان، لە لایەن زاناو بیریارەکانەوە، گرنگییەکی کەمی پێدراوە، بارودۆخی حوجرەکانو شێوازو هۆکارو تواناکانو ڕۆشنبیری مامۆستاکان تیایدا کەم زانستییان، باری ژیانی خوێندنی ڕۆڵەکانی نەتەوەی ئیسلام دەردەخات لەو سەردەمەدا، کە چەند خراپ بووەو هیچ دەنگێك نەبووە بۆ چاککردنی پەروەردەو فێرکردنو چاکسازیی لەڕژێمی حوجرەکاندا، هۆکاری پێویستو پارەدانی گشتیی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی حوجرەکان نەبووە، ئەمەش لەبەر هۆکاری فیکرو ڕۆشنبیرییو بەرنامەکانیان لە ڕووی زانستو کەموکورتییو دەستەوسانیان، هەروەها دەسەلاَتو دەزگاکان هیچ گرنگییەکی نەداوە بە کاروباری خەڵکیی، دەزگاکانیش وێرانو ستەمکاربوون، ئەوەش وای کرد، کاروباری خوێندنی منالاَنی خەڵکیی پشتگوێ بخرێ، گرنگی شیاوی پێنەدرێت، تێچوونی خوێندن لە حوجرەکاندا لەسەر باوکی منالاَن بوو، کە باوکانیش لە بنەڕەتدا باری بژێویان زۆر خراپ بوو، دەیاننالاَند بەدەست باج، کە لەلایەن میرو دەسەلاَتدارەکانەوە دەسەپێنرا بە سەریاندا، لەبەرئەوە هەڵەیە، کە وێنەی پەروەردەو فێرکردن لە ئوممەتدا لە ئامۆژگاریی چەند کەسێکی کەم لە گەورەو میرەکان، کە منالەکانیان مامۆستای

**تایبەتیان هەبووە، بکێشینو ئەم فێرکردنەش لە ماڵەکانی خۆیاندابووە، یان لە هەندێ وردبوونەوە لە هەندێ پیاوانی فیکرو زانست دەربارەی پەروەردەو فێرکردن، چونکە هەموو ئەوانە پەیوەندیی بارو شوێنی خوێندنو فێرکردنەوە نەبوو لە بەشەکانی دوایی مێژووی ئوممەتی ئیسلام.**

**باری تێکشکاویی پەروەردەو فێرکردنو بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری لە نێوان ڕۆڵەکانی ئیسلام بە گشتیی، درێژبووەوەی هەڵسوکەوتەکانی مێژوو و ئەو عەقڵییەتە دەسەڵاتییە ڕەگەزییە چینایەتییە گەلیە دەنوێنێ لە ناو ئوممەتدا.**

**بڵاوبوونەوەی ئەم لادانە ڕامیاریی و فیکرییە لە هەڵسوکەوتی سەرکردەکانی ئوممەت، باری خوێندنی تایبەتیو بیانیی دەردەخاتو ئەوبارە تێدەگەیەنێ، کە خوێندنی تیابووە، بەمەش ڕۆشنبیریی گشتیی خەڵکیی تێکشکا، لە ئێستاشدا، تواناکانی لە جیهانی ئیسلامییدا لە دەستداوە[١].**

---

[١] عەقڵیەتی خۆسەپاندن و لوتبەرزیی کەمینەیەکی تایبەت، کە هەموو جۆرە خاڵێکی جیاوازییان هەیە کە لە ئوممەت جیایان دەکاتەوە، هەروەها زمینەیەکی ڕەتێنراوی سووکایەتی پێکراوی فەرامۆشکراوی پێشێلکراو، جیهانی ئیسلام زیاتر دوادەخات کە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ گرنگترین رووخساری دواکەوتنو لاوازییەتی و کاری درزتێکردنی و کۆنترۆڵکردنی ئاسان دەکات.

بڵابوونەوەی دیاردەی (خزمەتکاران) و جۆری مامەڵەیان کە لە دنیای ئیسلامدا بڵاوە، وێنەیەکی دزێوی دیکەی ئەم عەقڵیەتەیە، سەبارەت بەم توێژە لای زۆر خەڵکیی بە بێ ویژدانیی، زۆر مافی مرۆڤایەتیی وەکو رێزو دەرامەتو پشوودان ئەتوانین بڵێین هیچ بوونی نییە، لە روانگەی لوتبەرزییەوە وەك چەند هەبوویەکی پەست تەماشا دەکرێن، تەنانەت هەندێك کەس ئەو خزمەتکارانە تەنها بە رەگەزێکی تر دادەنێین کە تەنها شایانی توندیو سووکایەتیی پێکردنن.

بێگومان هیچ رەواو پەسەند نییە کە ئەم سووکایەتیی و دڵڕەقییە بگاتە ئەو ئاستەی مامەڵە لەگەڵ ئەم بێنەوایانە بکرێت، تەنها لەبەرئەوەی زۆر ئاتاجن بەو پاشماوەیەی بۆیان فڕێ دەدرێت، تاوەکو بژین.

پێویستە چارەسەری ئەم عەقڵییەتو هەڵسوکەوتو ناشیرینکردنو لادانانە لە پرانسیپو چەمکەکانی ئیسلام بکرێ، ئەویش لە برادەری مرۆڤانەو لە برادەری ئیسلامەتییو لە دادگەرییو بەخششو پێشخستنی ئەواندا، لە دڵو دەروونو لە کولتوور و کۆمەڵگاکانماندا.

## له نێوان ڕابووردوو ئێستادا: بنەماکانو سەرچاوەکانی پەروەردە

### پێشەنگ (القدوة): بەرنامەی پێغەمبەریی لە پەروەردەدا

هەتا مانای ئەوەی پێی گەیشتووین، تێبگەین، دەبێ تێڕوانینو وردبوونەوەی بابەتییانەی بەرنامەیی هەبێ، لەوەی دەستمان پێکردووە پێی، بەمەش ڕاستیی ئەو هەڵانە دەردەکەوێت، کە تێی کەوتووین، ئەو هۆکارانەی، کەوایکرد بەرەو دوا بگەڕێینەوە، پەندو ئامۆژگاریی لێوەرگرین، ئەگەر وتاری قورئانی بنەمای فیکرو بەرنامەی ژیانمان بێتو بەرنامەی پێغەمبەریی لەپەروەردەدا، دەبێت قورئانو ڕەوشتەکانی پێغەمبەر بناغە بێتو لەم سەرچاوە بنەڕەتییەوە، بەرنامەی کرداری وەربگرن، لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) تێکڕای ئاڕاستەو پێشەنگە کەسایەتییەکەیو شێوازی هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵكو دەورووبەری، تێگەیشتنمان بۆ ماناکانی بە دەقی قورئان بچەسپێتو بە مەبەستو بەهاو ڕێبازەکانی، هەروەکو ئەمە لە وەسفەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەستپێدەکەین، کەسایەتیی، ڕەوشتەکانی، پەیامەکەی، قورئان نیشانەکانی کەسایەتیی پێغەمبەری دیاریکردووە، بەزەییو خۆگرییو ڕەوشتجوانیی ناوی دەرکردووە:

(وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ) (الأنبياء: ١٠٧ ).

(وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) (القلم: ٤ ).

---

پێویستە بەهێزو ئازایەتی رووبەڕوویان ببینەوە لە پێگەیاندنی رۆڵەکانماندا، لە پێکهاتەی بڕواییو ویژدانیاندا، تا نەتەوەیەکی بەهێز پێکبهێنینو زاڵ ببین بەسەر دەردی پەرتەوازەییو نەزانکردنی جەماوەری گەلو زۆرینەیان، هەروەها دەردی یەخسیرو لاوازکردنیان و سەرەنجام دەردی لاوازکردنی نەتەوەو زاڵبوونی دوژمنانی، هەروەها دەردی یەخسیرکردنی زۆرینەو بژاردەی نەتەوە سەرکوتکردنیان. خوێندنەوەی مێژووی قۆناغەکانی دواکەوتنی ئوممەت، بە شێوەیەکی دەستەبژێر یارمەتییمان نادات بۆ تێگەیشتن لە دەردەکانی قەوارەی خۆمانو تێگەیشتن لە هۆکارەکانی لاوازیی و لادان، کە ئەم قەوارەیان لە ناوەوە رزاندووە، بەبێ ترس و باك.

(فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ) (آل عمران: ١٥٩ ).

ئيمام موسليم له عائيشەوه (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕێتەوە: قالت "ماضرب رسول الله (ﷺ) بيده إمرأة قط ولاخادما، ولاضرب شيئا قط الا أن يجاهد في سبيل الله" و أصحاب صحيحين دەگێڕنەوە، لەئەنەسەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) وتویەتی "خدمت رسول الله (ﷺ) عشرين فما قال لي أف قط، ولاقال لشيء صنعته لم صنعته، ولا لشيء تركته لم تركته" له گێڕانەوەیەکی تردا "فما سبني (ﷺ) قط ولاأمر في أمر فتوانيت في فعاثني عليه، فأن علاتبني عليه أحد من أهله قال: دعوه لو قدر شيء كان" ئیمامی ترمزی له ئەبوهریرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی "أكمل المؤمنين أحسنهم فلقا، وخياركم خياركم لنسائهم" وە ئیبنو ماجەو حاکم له پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە "خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي".

بوخاریو موسلیم له عائیشەوه دەگێڕنەوە، کە وتویەتی "ما خير رسول الله بين أمرين الا أخذ أيسرهما مالم يكن إثما، فما كان إثما كان أبعد الناس منه، وما انتقم رسول الله (ﷺ) لنفسه شيء قط الا أن تنتهك حرمة الله فينتقيم لله تعالى".

بوخاریو موسلیم له عائیشەوه دەگێڕنەوە، کە وتویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەروویەتی "إن الله رفيق يحب الرفق في الأمر كله".

ئیمامی (ترمذی) له ئەبو زەڕەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی "قال رجل لرسول الله (ﷺ) أوصيني قال"إتق الله حيثما كنت" قال: زدني قال "أتبع السيئة الحسنة تمحها" قال زدني، قال "خالق الناس بخلق حسن". ئەبوداود له پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەروویەتی "الراحمون يرحمهم الرحمان، إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء". ئیمانی ئەحمەد له (أبي درداء) دەگێڕێتەوە، وتویەتی: "ما رأيت أو سمعت رسول اللم (ﷺ) يحدث حديثا الا تبسم". ئیمام ئەحمەدو حاکمو بەیهەقی له ئەبوهوڕەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی "إنما بعثت لأتمم مكارم الاخلاق".

ئەمەیە، بنەماکانی پێشەنگی کەسایەتیی پەروەردەکەری یەکەمی ئوممەتی ئیسلام، ئەمەیە پێشەنگی بەرنامەو وتاری پەروەردەیی دیاریدەکات، کە ئەمەش وتاری خۆشەویستییو بەزەییە، بەرنامەی ئاسانکردنە، هەموو ڕەوشتە جوانەکان، سیفەتە بەڕێزەکانە، هێزی پشت بەخوا بەستنە، چاکەو جوانکارییە، ئەمەیە کەسایەتییو ڕەوشتو بەرنامە، کە زۆر دوورە لە دلڕەقیو ستەمکارییو زۆرداریی.

کەواتە، کامەیە پێشەنگەکانی ئەم بەرنامەو ئەم وتارە پێغەمبەرییە پەروەردەییە بۆ پێغەمبەرێکی کرداروو ڕەوشتجوان؟ جێگیرو وتارەکانی ئەم بەرنامەیە کامەیە؟ کامەیە سەرچاوەکانیان؟

## خۆشەویستییو قایلبوونو ئازایەتیی سەرچاوەی وتاری پەروەردەیی پێغەمبەرییە

خۆشەویستییو بەزەیی دواندنو نەرمونیانییو ڕێزگرتنی هەست، بنەمایەك بوو، کە ڕێبازو وتاری پەروەردەیی پێغەمبەریی بۆ جێگەیاندنی منالٚو بنیاتی دەروونیان، قەوارەی ویژدانیانو سەرچاوەی هەڵقوڵانیان بوو، بە بێ هەستکردن بە لایەنەو گرنگییەکەی، لە بیناکردنی قەوارەی دەروونییو ویژدانیی منالٚ، ناتوانین کەموکورتییەکان هەستپێبکەین لە پڕۆژەی چاکسازیی ئوممەتدا، ڕوون کردنەوەی هۆیەکانی نەتوانایی لەسەر بەدیهێنانی هەموو ئامانجە گەورەکان، بیناکردنی بەرەی بە توانا لەسەر هەڵگرتنی قورسایی ئاستەنگەکان، کە ڕووبەڕووی ئوممەت دەبێتەوە.

بینیمان چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئیبن عەباسی بە منالٚی دەدواند، چۆن لە نێوان ئەو منالەو خوادا پەیوەندیی خۆشەویستییو چاودێریی دروست دەکرد، چۆن لە دەروونیدا ئازایەتییو متمانە بەخۆی دروست دەکرد، چۆن سووربوو، کاتێ نوێژی دەکرد لەسەر چاودێریی کردنی دەروونی منالٚی بچکۆلە، کە چووە سەرپشتی، پێغەمبەریش (ﷺ) ساتێك وازیلێهێنا بۆ ئەوەی یاریی بکاتو دەرینەکردو داینەگرتە خوارەوە بە پەلەو پیایەلٚنەشاخا.

پێغەمبەر (ﷺ) شێوازەکانی پەورەردەیی پێویست بۆ گەشەی منداڵو چاودێریی قەوارە دەروونییەکەی، گەشەی قەوارەی ویژدانیەکەی هەست پێدەکرد، لەبەرئەوە، بەرنامە پەروەردەییەکەی، تەنها کورت نەکرابووەوە لە ماناکانی خۆشەویستیو بەزەیی، کە بناغەی پەیوەندیی ڕاستو دروستە لە نێوان باوکانو ڕۆڵەکانیاندا، کە لەمەوە هەموو پەیوەندییەکانی تر پەیدا دەبێت، هەتاکو ئەگەر تێپەڕیبا بەلای منداڵاندا وەکو گەورە سەلامی لێدەکردن، وەکو گەورە هەواڵی دەپرسین، هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردنو ڕێزی هەستیانی دەگرتو گرنگیی پێدەدان، لە کۆڕەکانیدا هەرگیز منداڵی پشتگوێ نەدەخست، قسەی خۆشی لەگەڵ دەکردن، هەمیشە ڕاسپاردەی خەڵکی دەکرد تا چاك بن لەگەڵ منداڵانو ڕێزیان لێبگرن، خەڵکی هاندەدا، کە لە نێوان منداڵەکانیاندا دادپەروەربن[1].

[1] عەبدوڵلای کوڕی حاریس ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا عەبدوڵلاو عوبەیدوڵلاو زۆرێك لە کوڕانی عەبباسی ریز دەکردو دەیفەرموو: ئەوەی زووتر بگاتە من ئەوەو ئەوەی دەدەمێ، ئەوانیش پێشبڕكێیان دەکرد بۆ لایو دەکەوتن بەسەر پشتو سینەیدا، ئەویش ماچی دەکردنو باوەشی دەگرتن. (أحمد ـ مسند ١٧٣٩).

ـ بوخاری لە ئەنەس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو کەس رەفتاری جوانتر بوو، منیش برایەکم هەبوو ناوی: ئەبو عومەیر بوو، وتی: وابزانم لە شیر بڕابووەوە، ئەگەر پێغەمبەر بهاتایە دەیفەرموو: ئەی ئەبوعومەیر، ئەوە چۆلەکەکە چی بەسەرهات؟ چۆلەکەیەکی هەبوو یاریی پێدەکرد، رێدەکەوت کاتی نوێژ دەهاتو پێغەمبەر لە ماڵمان بوو، فەرمانی دەدا ئەو بەڕەیەی لە ژێریدا بوو گسکیان دەدا و ئاوپڕژێنیان دەکرد، ئینجا هەڵدەستا بۆ نوێژو ئێمەش لە پشتییەوە نوێژی بۆ دەکردین. (صحيح البخاري: ٥٧٣٥).

ـ سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی دەگێڕێتەوە: کە شەربەتێکیان بۆ پێغەمبەری خودا هێنا، ئەویش لێی خواردەوە، منداڵێك (ئیبن عەبباس) لە لای راستییەوە بوو، لە لای چەپیش چەند ریش سپییەك بوون، فەرمووی بە منداڵەکە: ئایا رێم رێم پێدەدەیت کە لە پێش تۆ بیدەم بەوانە؟ منداڵەکەش وتی: نە بە خوا، بەشی خۆم لە پاشماوەی تۆ نادەم بە کەسی تر. موسلیم گێڕاویەتییەوە: ٣٧٨٦.

**خۆشەویستی، ئەگەر دادپەروەریی‌و ڕێزداریی تیا نەبێت، ئەوە بناغەی ڕێبازی پێغەمبەرییە، کەوا دەکات وتارو ئاڕاستەکانی بۆ منداڵ کاریگەربێت، هێزی خۆشەویستیی‌و پاڵنەرە چاکەکانی، نەك ترساندن‌و تۆقاندن، خۆشەویستیی گەورەترین یارمەتیدەریبووە، بۆ ئەوەی منالآن بە گوێی بکەن‌و سووربوون لەسەر ڕازیکردنی، خۆڕازاندنەوە بەو سیفەتە چاکانەی، کە دەیڕواند لە**

---

ـ لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرمووی: هەرکەس بە منداڵێك بڵێت: ها و نەیداتێ، ئەوە درۆیەکە.... (ئەحمەد لە موسنەددا گێڕاویەتییەوە ٩٤٦٠).

ـ لە رافیعی عەمری غیفاریی دەگێڕێتەوە کە وتی: منداڵ بووم بەردم دەگرتە دارخورمای یەکێك لە ئەنسار، هێنایان بۆ خزمەتی پێغەمبەر و فەرمووی: رۆڵە بۆچی بەرد دەگریتە خورما؟ وتم: دەخۆم، فەرمووی: بەرد مەگرە دارخوماو لەو خورمایە بخۆ کە دەوەرێتە خوارەوە. ئینجا دەستی هێنا بەسەر سەرمداو فەرمووی: خوایە سکی تێر بکە. ئەحمەد گێڕاویەتییەوە لە موسنەددا: ١٩٤٥٣.

ـ لەو شتانەی سەرنجیان رادەکێشام‌و پێیان سەرسام دەبووم، مامەڵەی دایکانی ئەمەریکا بوو لەگەڵ منداڵە گچکەکانیان کاتێك دەیانبردن بۆ شوێنە گشتییەکانی شەقام‌و باخەکان‌و یاریگاو بازاڕەکان، ئەگەر دایکەکە بیویستایە قسەی لەگەڵ منداڵەکەی بکات‌و شتێکی بۆ روون بکاتەوە، سەرزەنشت، یان لۆمەی بکات لەسەر کردەوەیەك، رێك نەدەوەستا تا لە سەرەوە قسە لەگەڵ منداڵەکەی بکات، بەڵکو خۆی نزم دەکردەوەو چۆکی دەنوشاندەوە، تا لە ئاستی بالآی ئەودا بێت‌و رووبەڕوو قسەی لەگەڵ دەکرد.

لە بیرم ناچێ ژنێك لە بازاڕێکدا عەرەبانەکەی دەستی پڕ کردبوو لە کەلوپەل، دوای ئەوەی پارەکەی دا و چووە بەر دەرگای بازاڕەکە بۆ ئەوەی بچێتە ناو ئۆتۆمبێلەکەی، دەبوو لە جادەی دەوروبەر بپەڕێتەوە تا بگاتە گەراجی ئۆتۆمبێلەکان، دەستێکی بە عەرەبانەو دەستێکی بە منداڵەکەیەوە بوو، لای کردەوە بۆ منداڵەکەی‌و لێی پرسی حەزی لە سواری عەرەبانەیە، یان بە پێی خۆی بڕوات بۆ لای ئۆتۆمبیلەکان؟ ئەویش وتی بە پێ دەڕۆم، ئینجا ژنەکە پاڵی بە عەرەبانەکەوە دەناو بە دەستێکیش منداڵەکەی گرتبوو، لەگەڵ ئەوەدا کە بۆی سەخت بوو، کەچی بڕیاریدایە دەستی منداڵەکەی و ڕێزی لە ویستی ئەو گرت، لەم رەفتارە پەروەردەییەوە هیچ سەیر نییە کە نموونەی ئەم منداڵە کاتێك گەورە دەبێت ڕێز لە خۆی بگرێت و پشت بە خۆی ببەستێ‌و خاوەنی ئازایەتی بێت‌و داکۆکی لە مافی خۆی بکات‌و رێگە بە پێشێلکردن‌و دەستدرێژیی لەسەری نەدات، کەواتە ترس‌و لەرزو پشت نەبەستن بە خۆ، زەوییەکی بە پیتە بۆ یەخسیربوون و دیکتاتۆریی.

دەروونیاندا بەحەزو خۆشەویستییەوە، بەقایلبوونەوە لەوەی، کە لێی دەدوێن، ئەمەش وایکرد پەروەردەی پێغەمبەرێتی بەرزترین نموونەی سەرکەوتووبێت، ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) کە لە هەموو ڕوویەکەوە گەیشتبووە پلەی تێروتەواویی، هەرگیز پێویستی بە توندوتیژیی دەست، یان زمان نەبوو، هەرگیز لە منالّی نەدەدا، هەرگیز قسەی ناشیاوو ناشیرینی بە منالّ نەدەوت.

هەڵەیە ئەو کەسەی، کەوا بزانێت قسەوتنو لێدان، هۆکارێکی پەروەردەیی دروستە، چونکە پەنابردن بۆ لێدانو ئازاردانی جەستەیی، لە ڕاستییدا بەڵگەی بێدەسەڵاتییو کەموکورتیی پەروەردەیی باوكو دایکە، شکاندنی کەسایەتییو ڕێزو بەرزێتی دەروونو متمانی منالّە، چ بارێکی سەختە، کاتێ نەریتی هەندێ لە گەلانو کەلەپووریان، سیفەتی یاسای دارستانی لێدەبینی، گیانی ئیسلام تیایدا لاوازە، لێدان لە لایەن گەورەو بەهێزەکانەوە، دیاریدەیەکی باوە، نەك هەر بەرامبەر بە منالّ، بەڵکو بووە بەمافی هەموو خاوەن دەسەڵاتێ، کە بدات لەو کەسانەی، کە لە ژێردەستیدایە، هەندێ جار هەرزەکاریش بە دەستیان لێدان دەخوات، ڕێزو کەرامەتی مرۆڤایەتی پێشێل دەکەن، کە ئەمەش لە ڕاستییدا، هێماو بەرجەستەکردنی ڕووخانی باوەڕو شارستانیو پەروەردەییە، کە تووشی ئوممەتی ئیسلام هاتووە، ئەو ئوممەتەی، کە پێغەمبەرەکەی، ئەگەر بیبینیایە، کە ژێردەستەیەك لێی بدرێت تووڕە دەبوو، دانەدەمرکایەوەو لێی خۆش نەدەبوو، مەگەر بەئازادکردنی نەبوایە، لەبەر ئەوە توندوتیژیی بە بێ مافی پێویست، هەرگیز ڕەوشتی مسوڵمانو ڕێبازی مسوڵمان نییە، ئەی ئیتر چۆن توندوتیژیی لە پەروەردەدا بەکاردەهێنێ؟! چونکە توندوتیژی لە پەروەردەدا بەڵگەی نەزانینو بێدەسەڵاتییە، خێری تیا نییە، بەڵکو بەرەنگاربوونەوەو بێگوێیی لێدەکەوێتەوە، هەندێجار بەرەنگاربوونەوەو بە گوێنەکردن، شۆڕشو لادان دروست دەکات[1]، پێغەمبەر نەفرینی دەکرد لەو کەسەی ئازاری ئاژەڵ،

[1] موسلیم لە ئەبو عەلی سویدی کوڕی موقرین (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە ئێمە حەوت برا بووین، هیچ خزمەتکارێکمان نەبوو، کارەکەرێك نەبێ، کە برا بچووکەکەمان زللەیەکی لێدا، پێغەمبەری خودا فەرمانی پێماندا کە ئازادی بکەین.

بەبێ پێویست بدات[1]، هەندێجار توندوتیژیی — لە باری توندیدا بێدەسەڵاتیی منداڵ، کە لاوازەو ناتوانێ بەرەنگاری بکات – تێکشکانی کەسایەتیی لێدەکەوێتەوە، بە بۆیاخی لاوازیی‌و ترسنۆکی‌و ڕقلێبوونەوە، حەزکردن لە کینەو ئازارو درۆو پیسیی‌و دووڕوویی بۆیاخ دەکرێت.

## خۆشەویستیی هێز و پاڵنەرە: خاکی پەیوەندییە کاریگەرە بە بەرهەمەکانە

خۆشەویستیی، متمانەو دڵنیایی‌و ئازایەتیی بەرهەمدەهێنێ، یەکێ لە سیفەتەکانی پەیوەندیی، کە لەسەر خۆشەویستی بێت، ئەوەیە ترسی ئیجابی دروست دەکاتو منداڵ خۆشەویستەکەی ڕازیی دەکات (پەروەردگار، ئاین، پێغەمبەر، باوكو دایكو مامۆستا) ئەو خۆشەویستییە دەپارێزێ، هیچ هەستێکی خراپی لادروست نابێ، لە ترسی سلبی‌و تاڵی‌و ئاستەنگو وەرنەگرتن، کە

هەروەها موسلیم لە ئەبو مەسعود وتی: بەدری دەگێڕێتەوە بە قامچی لە خزمەتکارێکی خۆمم دەدا، گوێم لە دەنگێك بوو لە پشتمەوە، بزانە ئەبو مەسعود، لە توڕەییدا نەمزانی دەنگی کێیە، کە لێم نزیك بوویەوە، گوێم لێبوو دەیگوت: بزانە ئەبومەسعود کە خوا لە تۆ بە توانـاترە لەسەر ئەم خزمەتکارە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا: ئەو ئازاد بێ، لەبەر خوای گەورە. جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: دە بزانە ئەگەر ئازادت نەکردایە ئەوە بڵێسەی ئاگرت بەر دەکەوت. (صحيح مسلم: ٣١٣٦).

[1] بوخاری و موسلیم لە ئیبن عومەر دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا فەرمووی: ژنێك لەسەر پشیلەیەك سزا درا، چونکە زیندانی کردبوو تا مرد، لەبەر ئەو پشیلەیە چووە دۆزەخەوە، نە خۆی خۆراك و ئاوی پێ دابوو کە بەندی کردبوو، نە هێشتبووی بۆ خۆی بچێت لە مارو مێرووی زەوی بخوات. (صحيح مسلیم: ٤١٦٠). بوخاری و موسلیم دیسان لە ئیبن عومەر دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا نەفرینی کردووە لە هەر کەسێك کە گیانلەبەر بکاتە نیشانە. (صحيح مسلم ٣٦١٧). هەروەها موسلیم لە ئیبن عەبباس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا گوێدرێژێکی بینی کە ناوچەوانی داغ کرابوو، فەرمووی: نەفرینی خودا لەو کەسەی داغی کردووە. (صحيح مسلم: ٣٩٥٣).

توندوتیژی لێبکەوێتەوەو ونکردنی هەستی خۆشەویستیی‌و ڕێزگرتن‌و متمانە بە دەروون هەروەها نەبوونی هەستی دادپەروەری هەڵسوکەوتی ڕێزدارانە.

لەبەر کەمیی گوێنەدانە خوێندنەوەو بەئاگابوون لە لایەنی پەروەردەیی‌و لەبەرکەمیی بواری زانستیی‌و پەروەردەیی‌و کۆمەڵایەتیی لەتێڕوانینی ئیسلامەوە، لە لایەن مسوڵمانەوە، باوکان‌و دایکان‌و پەروەردەکاران تێکەڵیی دروستدەکەن لە نێوان چەمکەکانی ئازادیی‌و خۆشەویستی‌و ڕژێمدا، ئەم چەمکانە لە لایان، وەك شتی پێچەوانە بەیەکتر وایە، کە لە ڕاستیدا پێچەوانەی یەکتر نین، بەڵکو پێویستیی‌و یارمەتیدەریی یەکترن.

خۆشەویستیی مانای ڕۆچوون نییە لە نازدان بە منالْ، مانای ئەوە نییە کە منالْ داوای هەرچی کرد بۆی جێبەجێبکرێت، مانای ئەوە نییە چاوپۆشی بکەین لە هەڵەکانی، بەڵکو خۆشەویستیی ڕاستەقینە بریتییە لە کاکڵەی پەیوەندیی کە لە نێوان منالْ‌و پەروەردەکاردا بنیاتدەنرێ‌و ڕەنگدانەوەی منالەکەیە، ئامادەکردنی هەموو هۆکارێکیش بۆ حەسانەوەو چاودێریکردن‌و گەشەدان بە توانای‌و بنیاتی دەروونی لەسەر بنەما ئیسلامییە چاکە دروستەکان، ئەمەش مانای هەوڵدان‌و خۆگرییە بۆ تێگەیشتن لە دەروونی منالْ‌و ئەو قۆناغەی، کە پیایدا تێدەپەڕێ، ناسینی شێوازی پەروەردەیی، کە بەهەند وەربگیرێ لەگەڵ منالْ لە کاتی هەڵسوکەوتکردنیدا لەگەڵیدا، بە جۆرێك کە منالْ هەنگاو هەڵگرێ بەرەو ڕەفتاری دروست‌و پێکهێنانی ژیریی‌و دەروونیی ڕێکوپێك بە قایلبوون‌و حەزی منالەکە، بەبێ پەنابردنە بەر ترساندن‌و توندوتیژیی‌و لەغاوکردن کە بێسوودە، ڕقبوونەوە بەرەنگاریی لە منالدا دروستدەکات، کە بەپێی بارودۆخ کە تیای دەژی، یان دەبێتە منالێکی لارو سەرپێچیکار، یان گۆشەگیر دەبێت‌و متمانەی بە خۆی نامێنێت، هەمیشە ڕقی لادروست دەبێت‌و فرت‌و فێڵ دەکات.

## ئازادیی هێزە: سنوورو چوارچێوەکەی

زۆر کەس وا لە ئازادیی تێدەگەن —بە هۆی نەزانین لە لایەن دایك‌و باوکەوە دەربارەی چەمکە پەروەردەییەکان، کەموکورتیکردنی ڕۆشنبیریی‌و بیریارو پەروەردەییەکان لە گەیاندنی ڕۆڵی زانستییدا— کە لابردنی پەتی ملەو چی دێت

بە ئەندێشەدا بکرێت، دەروون‌و ئارەزوو حەزی لە چییە بیکات، ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەو لاوازە، بەمجۆرە تێگەیشتنە، تاک‌و کۆمەڵگە بشێویی‌و وێرانەو بەرەڵایی‌و ڕووخان سەرەنجامی دەبێت.

ئازادیی مرۆڤایەتیی دەبێ سنوورو یاساو ڕێسای لە سرووشتی مرۆڤ و کۆمەڵگەوە هەڵقوڵێ، دەبێ ئازادیی لێی تێبگەین‌و سنووری بزانین، کە هەموو زیندووەکان چۆن یاساو ڕێکخستنیان هەیە بۆ ژیانیان، مرۆڤ و کۆمەڵگەکەی ڕێکخستنێکی تێکەڵە لە کۆمەڵێ سنوورو ڕێساو یاسا، کە دەبێ چاودێریی بکرێ‌و نەشێوێنرێ، ئەگەرنا هەموو ڕێکخستنەکە دەڕووخێ، کە لەم ڕێکخستنەدا کۆمەڵگەی مرۆڤ یەکسانە بە ڕێکخستنی گەردیلەو خانەو کەشکەشان، ئەمەش مانای وایە، کە بوار هەیە بۆ ئازادیی‌و هەڵبژاردن، بەڵام لە سنووری سروشتی ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مرۆڤیدا، کە سنوورو ڕێساکانی ئەم ئازادییە گونجاو بێت لەگەڵ پلەوپایەو ڕۆڵی مرۆڤ لە جێنشینایەتیی‌و ئاوەدانیی‌و پەرستن‌و بەرپرسیارێتیی، ئازادیی مافی خۆیەتی، دەبێ ڕۆڵ‌و گرنگییەکەی لە ژیاندا بەرپا بکات.

هیچ مرۆڤێ بۆی نییە کەسیتر بێبەش بکات لە مافی هەڵبژاردن‌و بەرپرسیارییەتیی، بەڵام دەبێ کۆمەڵگە ئەرک‌و بەرپرسیارییەتی بخاتە بەردەم ئەندامەکانی‌و فێریان بکات‌و هۆشیاریان بکاتەوە، ڕێگا واڵا بکات لە بەردەمیاندا بۆ جێبەجێکردنی ئازادیی دروست‌و هەستان بە ئەرک‌و بەرپرسیارییەتیی، دەبێ کۆمەڵگە مرۆڤ پابەند بکات بەمافەکانی کۆمەڵگەو سنووری ڕێکخستن‌و جێگیرەکان‌و ڕێساکانی کۆمەڵگە، کە یاسای کۆمەڵگەو شەریعەت بڕیاری لەسەرداوە، بەگوێرەی ڕێبازەکانی ڕاوێژکردن‌و دانایی کۆمەڵی ئوممەت، چونکە ناوەڕۆکی ئازادیی برتییە لە توانا –بە بێ ڕێگر– لەسەر گەیاندنی ئەرکەکان‌و هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی، توانا لەسەر ڕاهێنانی دەروون بۆ حەق‌و هەڵسان بە ئەرکی جێنشینایەتی‌و ئاوەدانکردنەوە، لەسەر ڕێگای دادپەروەریی‌و چاکە، هەنگاونان بەسەریان‌و کەلێن دروستکردن لە مافەکان‌و بەرپرسیارییەکاندا ئازادیی نییە، هەوڵدان لە زەویدا بۆ ستەمکردن‌و زۆرداریی ئازادی نییە، ڕێگا بۆ دامەزراندنی یاساکانی ئازادەو بە جوانی جێبەجێکردنی بە پەروەردەو خوێندن‌و

هۆشیاریی‌و بەئاگایی بەرپرسیارییەتیی سنووردارییی قایلکراو بۆ خەڵکیی دەبێت لەسەر بنەمای ڕێککەوتن لەسەر جێگرەکان‌و سنوورەکان، ڕێگەنەدان بە ئازادیی ستەمە، لە پەتدەرچوونیش وێرانییە، کۆکاری ئوممەتی ئیسلامیی بریتییە لەشەریعەتی ڕاوێژکردنی ئیسلامیی لەکۆمەڵگەدا.

لەبەرئەوە، هەروا بێهودە نییە، کە لە ئایین‌و بیروباوەڕو فیکری ئیسلامییدا ئازادی هەیە، هەروا بێهودە نییە، کە لە شەریعەتی ئیسلامدا خەڵکیی تار نانرێت‌و نهێنی‌و تایبەتییەکانی بۆ کەس نییە بەدوایدا بگەڕێ، بەتایبەتی ئەوەی، کە پەیوەندیی بەسروشت‌و ئارەزووییەوە هەیە، ئەوە دادەنرێت بۆ ویژدان‌و پەروەردەی دەروون‌و چاوپێخشاندنەوەی هەڵەکان، تەنها کاتێ کە لەسەر شتی ئاشکراو ئازاردانی خەڵکانی ترو دەرخستنی هەڵەو ناموسی خەڵك‌و نهێنی خەڵك ئاشکرا بکات، سزا دەدرێت، چونکە ئامانجی ئیسلام دابینکردنی ئازادیی کاری چاکەو هەوڵدان لە زەویدا بۆ چاکسازیی کردن، ئەمە بە هیچ شێوەیەك نابێت وا ڕاڤەبکرێت، یان لێك بدرێتەوە کە ئازادیی مافی هەموو مرۆڤێکەو دەتوانێ ستەم‌و دوژمنکاریی‌و وێرانە بکات، ئەمە ئیسلام پێی ڕازیی نییە، سروشتی دروست لێی بەرییە، هیچ کات پەیوەندی بە مەبەستی ژیانی مرۆڤ و هەڵسوکەوتی بەرپرسیاریەتی جێنشینایەتییەوە نییە[1]، (فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيّاً) (مريم: ٥٩ ).

ئیسلام لەگەڵ هەموو کەسە ژیرەکاندا یەکدەنگە، لەسەر ئەوەی، کەمەبەست لە ئازادیی بوارکردنەوەیە بۆ هەموو مرۆڤێ، تا بەرژەوەندییەکانی بەدیبهێنێ، بەو پێیەی کە خۆی قایلەو زیانی بۆ خەڵکی ترنییە، یەکسانە لەمەدا، لەگەڵ لایەنەکەی تر بۆ پەیوەندیی یان کۆمەڵگە، لە مەودای نزیك، یان مەودای دوور، واتە مەبەست لە هەڵسوکەوتی ئازادییانەی مرۆڤ بریتییە لە مەبەستی چاکە لە سنووری بەرژەوەندیی هاوبەشی گشتییدا، کە یاساکان بڕیاری لەسەر دەدەن بە گوێرەی قایلبوونی کۆمەڵ‌و تێڕوانینە کۆمەڵییەکەی، کە لەسەر بنەمای

---

[1] أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. قانون العقوبات الاسلامي، مجلة إسلامية المعرفة، المعهد العالمي للفكر الاسلامي، السنة الرابعة، العدد الرابع عشر، ص ١٧٧-١٧٨.

ڕاوێژککردنی ئیسلامییە، هەروەها ڕێزگرتنی مافی هەموو هاونیشتمانییەك لە دەربڕینی ڕای خۆی، دەربڕینی ئەوەی کە ویژدانی پێی قایلە، ئەمەش بۆ بەدیهێنانی ڕێبازی ڕاوێژکردنو دەوڵەمەندکردنی ئەو ڕێبازە (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى: ٣٨ ). چونکە کارەکە لە کۆتاییدا پەیوەندیی بە ژیانی هەموو تاکێکەوە هەیەو لەگەڵ مافی هەڵسوکەوتی ژیانو بەرپرسیارییەتی.

ئەوەی ئیسلام جیا دەکاتەوە لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکانی تر، ئەوەیە، کە تاکە ئایینێکە خاوەنی پەیامێکی خوایی پارێزراوەو بڕیاردەدات —لە زانیاری خوایی گشتی بێسنوورەوە– لەسەر جێگیرە چاکەکانو چاکسازیی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییو گشتیەتی لە تۆڕی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکاندا، لە مەودای ئێستاو داهاتوودا، ئەمەش لە بەدیهێنەری بوونەوەرو ڕووخان زانستێکی گشتییەوە لەو شتانەی، کە دایهێناوەو دروستی کردووە نەبێت، نابێت، ئەم ڕاستییەش نیشانەی پێغەمبەرێتی شایەتی لەسەر دەداتو ڕاستییەتی ئەم پەیامە لەمەودای کاتو شوێن بەڵگەی ئەم ڕاستییەیە[1] (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٣ ). لەبەرئەوە، هیچ چارێك نەبوو لەبەردەم ئەو کۆمەڵگانەی، کە پەیامەکانیان شێوێنرابوو تێکەڵیو نەتوانایی دروست بکەن لەسەر ناسینی سنوورەکانی ئازادییو ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی، بە هۆی ئەوەی جێگیرەکانیان نەبوو، بەهۆی ئەوەش، کەبەش ناتوانێ هەموو (کل) بزانێت، هەموو هەوڵەکانیان لە ناسینی ئەم سنوورانەو ئەم جێگیرانەدا بێئەنجام بوو، ئەوروپا دەستەوسان بوو لە گۆڕینی پەککەوتە کەلەپوورییو نەریتییەکانی، کە پێشتر گاورو ئیسلام کاری لێکردوون، خوای هەموو تاکێك لە ئەوروپا ئارەزووەکەیەتی، بۆچوونو قایلبوونەکانیان شێوا، پەتی پەیوەندییان بچڕا، لە نێوانیاندا بەرەڵایيو لە پەتدەرچوونو بەدڕەوشتی بڵاوبووەوە، خێزان ڕووخا، هێزی توندوتیژییو ئارەزووبازیی لە پەتدەرچوو، هەموو کەسێك —بەپێی

---

[1] أبو سليمان، عبد الحميد أحمد. تأملات في ظاهرية ابن حزم وإعجاز الرسالة المحمدية، مجلة التجديد، الجامعة الاسلامية العالمية بماليزيا، السنة الثانية، العدد الثالث، ص ١٩٩٨م.

زانستو ئارەزووی– خۆی بڕی ئەوەی دەدا، کە چی دەکاتو چی ناکات، بە بێ پێویستی بە زانست یان بەڵگە، بەبێ توانا لەسەر ناسینی بە متمانە بە پاشەڕۆژ، یان حیساب کردنی شوێنەوارەکانی ژیرمەندەکان –پێش خەڵکی تر– هەموو ڕۆژێ ڕایەکیان هەبوو بە بێ ڕێنموونیو پێنجیان دەکوتا بە شەشا.

خۆرئاوا هەوڵیدا بۆ دەرخستنی چەمکی یاسای سروشتیی، بەڵام نەیانتوانی چونکە ئەوە باسێکی گشتییە، تێڕوانینی بەش لێی تێناگات، لەبەرئەوە تا ئەمڕۆ هەموو ڕۆژێك تیۆرێك دەردەکەن، لە هەموو ڕۆژێکا هەست بە شتی تر دەکەن، هەموو ڕۆژێ ڕێبازو قوتابخانەی تر دەردەکەوێ، ئەوەی کە بە دیار کەوت بریتییە لە هەڵوەشانەوەو توندوتیژییو تاوانو بێدەسەڵاتی لە ناسینی جێگیرەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییو سنوورەکانی ئازادیی مۆرڤ، ئەوەی، کە کۆمەڵگە پێویستە پابەندبێ پێی بۆ پاراستنی ئەو ڕێکخستنەی کۆمەڵایەتییەو پاراستنی لەهەڵوەشانەوەو ڕووخان، کە هەرگیز ناتوانن بەریلێبگرن بە گرمەی ئامێرو زۆری کەلوپەلو چەکی لەناوبەرو جبەخانەکانیان:

(أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ) (الروم: ٩ ).

(وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ) (يونس: ١٣ ).

(وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِداً) (الكهف: ٥٩ ).

(قُلْ سِيرُواْ فِي الأَرْضِ ثُمَّ انظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ) (الأنعام: ١١ ).

ئەگەر ئەوەمان سەلماند، کە ئازادیی مرۆڤ پێویستی بە یاساو سنوور هەیە، ئەوە ئیتر داڕمانو خراپە ڕوونادات، هەموو کۆمەڵگەیەك پێویستە سنووری ئازادییەکانی دیاریی بکرێت، یاسای گشتیی بۆ دابڕژێ تا –لە ڕاوێژکردنی گشتییو تێڕوانینی گشتیی بابەتیانە– سنووری ئازادیەکە دیاریی بکات تاکو پشێوییو خراپەکاریی بڵاونەبێتەوە، دەبێ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە پابەندبن بەم سنوورانەوە، لەبەر ئەوە، ئەمڕۆ دەبینین خۆرئاوا –لەسەر ئەو بارە کۆمەڵایەتییو ڕەوشتەی کە تیایەتی– زۆر پێویستی بە نیگای ئیسلامیی

پارێزراو هەیە، تا یارمەتی بدات لەسەر ناسینی سنوورەکانی ئازادیی لە کۆمەڵگەدا، واتە زۆر پێویستیی بەوە هەیە، کە چوارچێوەیەك بۆ ئازادیی دابنێ.

بەڵام ئوممەتی ئیسلامو فیکری ئیسلامیی، کە تا ئەمڕۆ، هەردووکیان پەیوەندییان بە دابەزێنراوو گشتییەکانەوە هەیە، وەستانی فکرو کەلەپوریانو ئەوەی ئەمڕۆ ئوممەتی تیایە لە کۆیلایەتییو ستەمو وەستان، چەمکی شووراو ئازادی لە کۆمەڵگاکانیاندا نەماوە، فیکری وەسییەتو دەروونی کۆیلە دایگرتوون، کە ئەمەش وایان لێدەکات زۆر پێویستیان بەوەبێت خۆیان ڕزگاربکەن لە ڕووی فیکرییو پەروەردەییەوە لەئەم بیری ستەمکارییە بۆ ماوەییە، بۆ گەڕاندنەوەی هەستی ئازادیی پێگەیشتوو ئازایەتی وێژەیی پاڵنەر، بنیاتنانی کۆمەڵگەو دەزگای ڕاوێژکردن، واتە گەلانی ئیسلامیی زۆر پێویستیان بە ئازادیەکی چوارچێوەدار هەیە لە ڕووبەڕووبوونەوەکاندا پێویستی خۆرئاوا بۆ چوارچێوەکردنی ئازادی.

## ناوەڕۆکی ڕژێمو ئینزیبات: خۆڕاهێنانو هەستی ڕێزو بەرپرسیارێتییە

ڕژێمو سنوور بۆ دانا —لە ڕووی پەروەردەییەوە— مانای زۆرکاری ملشۆڕکردنو ترساندنو پاشکۆیەتییو گوێڕایەڵیی کوێرانە نییە، ڕژێمو سنوور بۆدانان لە ڕووی پەروەردەییەوە بە پلەی یەکەم مانای ڕاهێنانی دەروونو پەروەردەکردنییەتی لەسەر گەیاندنی مافەکانو هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتەکانو گرتنەوەی ویستی مرۆڤایەتی بەڕەشۆی هێزو دەروونەوە، پاڵنانی لەڕووی ڕاستو چاکسازیی کە شیاوی ڕێزی مرۆڤایەتی بێت.

ڕژێمو سنووداری لە قۆناغەکانی منداڵیدا لەناوەڕۆکدا ڕاهێنانی مناڵە لەسەر گەیاندنی ئەرکەکان، کاریگەریی بنیاتنەرانەی چاکی لەگەڵ دەوروبەری مرۆڤایەتییو ژینگەکەی کە تیا دەژی، لەگەڵیدا ڕادێت، نەریتو چەمکە دروستەکانی پێدروست دەکات بۆ گەیاندنی چاکە لە پەیوەندییە جیاوازەکاندا، ڕژێمو سنووردانان مانای زۆرکردن نییە لە ویستی منداڵو ترساندنو ناچارکردنی

لەسەر ڕەفتارێکی دیاریکراو، بە بێ قایلبوونی ڕاستەوخۆ لێیەوە، ئەوە کۆیلەکردن‌و بە سووك سەیرکردنە، لە بەردەم پرۆگرامی پەروەردەیی دروستدا، هیچ ڕێگرێك نییە کە نەهێڵی دەروون ڕابهێنرێت لەسەر هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی، گەیاندنی ئەرکەکان، خۆشەویستی خەیرو چاکەو هەق‌و هەستکردن بەڕێزو خۆشەویستیی لە خراپەو خراپەکاری، حەزکردن لە دوورکەوتنەو خۆلادان لێی.

لە بارە نەخۆشەکاندا، کەوا دەخوازێ لێدانی مناڵ بکرێ لەڕووی جەستەییەوە، ئەوەش دەبێ لە چوارچێوەی بەرنامەی چارەسەری پەروەردەیی بێت‌و هەڵسوکەوتی لەگەڵ هۆکارەکانی بارەکەو نەهێشتنی کەموکورتییەکان بێت، لەوانەش کە پەیوندییان بە ژینگەی چواردەوری منالڵ‌و ئەو هۆکارانەی، کە بوونەتە هۆی ئەوبارە نەخۆشییە، شێوازی لەپێشە لە هەڵسوکەوتکردنی لەسەر پەروەردەکردنی، لە بارەی پێویستی لێدانی جەستەیی، دەبێ تەنها باوك‌و دایك، یان ئەوکەسەی، کە دایك‌و باوکی مۆڵەتیان پێداوە لێدانەکە بکرێت، یان لەلایەن خاوەن مناڵەکەوە، کە لەو پلەوپایەی باوکدایە لای مناڵەکە، چونکە تەنها ئەوانە ڕێپێدراون لە ڕووی دەروونییەوەو دەسەڵاتی لێدانی مناڵیان هەیە، ئەگەر وا پێویست بوو لێی بدرێ، دایك‌و باوك دەسەڵاتی دەروونیی‌و پەروەردەیی پێکدێنن‌و دەتوانن ئەمجۆرە تۆڵەلێکردنەوەیە پیادە بکەن، بە کەمترین زیانی جەستەیی‌و دەروونیی، ئەوەش دوای ئەوەی، کە هەموو شێوازە پەروەردەییەکانی تر گیرابێتەبەر، دەبێ وردە وردەو پلە بە پلە، لە پشت هەڵکردن، سەرنجڕاکێشان، گلەییکردن، ئەگەر ئێمە سووربین لەسەر سەلامەتیی دەروونی مناڵ‌و پارێزگاریی کردن لەسەر ڕێزی مرۆڤایەتییەکەی.

پلەوپایەی مناڵ لە بارەی لێدانی جەستەیی، وەك تۆڵەکردنەوەی هەرزەکار وایە، هەرگیز نابێ کاری مناڵ بە بچووك تەماشا بکرێ‌و بە لاواز دابنرێ، گاڵتەی پێبکرێ‌و لێدانی بکرێت لەگەڵ هەر هەڵەیەکدا، کە بیکات، بچوك بێت، یان گەورە لەسەر هەمان باری هەڵسوکەوت لەگەڵ هەرزەکاردا، ئەم کارە لە تەرازوی ئاسەوارە دەروونیی‌و ڕێزی مرۆڤایەتیی لە باری منداڵیدا کاریگەرترو توندترە،

چونکە ئەو تۆڵەکردنەوەیە لە دەروونو کەسایەتی منداڵدا لە قۆناغی گەشەکردندا تێکچوونو شوێنەواری خراپی وێرانکاری لە داهاتوودا لێ دەکەوێتەوە.

منداڵ، ئەگەر سووکایەتی پێبکرێت بە لێدان لە زۆربەی کاتدا –لە ترسی تۆڵەو هۆکارەکەی– ترسنۆك دەبێت، متمانەی بە خۆی نابێت، هیچ هەوڵێکی نابێ، ئەوەش لە سیفەتی سەرشۆڕییو درۆو دووڕوویی‌و ڕاکردن لە بەرپرسیاریەتییەوە نزیکە، لەبەرئەوە، لەپێناوی پارێزگارییکردن لەسەر مافەکانو ڕێزگرتنی مرۆڤایەتیی بۆ نەوەکانی خۆی، ئیتر منداڵ بن، یان هەرزەکار، نابێ لێدانی جەستەییان بکرێت –لەکاتی پێویستدا– مەگەر لەلایەن دایكو باوکەوە بێتو بە شێوازێکی ڕەمزییو نزیك لە پیاکێشانو شەپازلە لێدان بە سووکی، کە ئەوەش دەربڕینی تووڕەییو ناڕازیبوون بێت لە هەڵەی گەورە، ئەگەر هەرزەکاربوو دەبێ لێدانەکە بەپێی یاسا بێت، بەپێی دەسەڵاتێ، کە لەدادوەرەوە دەردەچێ، لەلایەن لایەنێکی ڕێپێدراوەوە ئەو تۆڵەیە جێبەجێبکرێ، ئەوەش بۆ پاراستنی ڕێزی مرۆڤ، سەلامەتیی بنیاتی دەروونیی، پارێزگاریی لەسەر مافەکانی، یارمەتیدانی لەسەر گەڕانەوەی تەندروستیی دەروونییو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی، کە تیایدا منداڵو هەرزەکار یەکسانن، کە لە تۆوی چاکەوە درەختی بەهێزو باش دروست دەبێو بەرووبوومی شیرینی دەبێ.

لەبەرئەوە، دەبێ بزانین کە تۆڵەی جەستەیی، ئامێرێك نییە لەئامێرەکانی پەروەردەیی دروست، بەڵکو هۆکارێکە لە هۆکارەکانی چارەسەری بارە نەخۆشییەکان کە لە بێپەروەردەییەوە دروستبووە، ئەو هەڵسوکەوتە خراپەی، کە تێگەیشتنی تیا نەبێ بەرامبەر بە دەروونی منداڵ، پێویستە منداڵ لەسەر بناغەی خۆشەویستییو خۆگرییو ڕاهێنانو بیناکردنو هاندان هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ، بەکارهێنانی ئامێرەکانی تەمێکردنو گرتنبەری ڕێگاو شێوازە دەروونییە دروستەکان بۆ گەشەی منداڵ، تا منداڵ نەکەوێتە باری نەخۆشیی، کە دواتر وابخوازێت لێدانی جەستەیی، یان ناجەستەیی لەگەڵ بکرێ، دەبێ ئاگامان لە شوێنەوارە خراپەکانی لێدانو ئەنجامە سلبییەکەی بێت.

تێگەیشتنی ڕاستو دروست بۆ ماناکانی خۆشەویستییو ئازادیی لای پەروەردەکار (المربي) یارمەتیی کاری پەروەردەکردن دەداتو مەبەستو

شێوازە جێبەجێکارییەکان، لە پەروەردەی تازەپێگەیشتووەکاندا ئاسان دەکات، بەها باڵاکانی تیا دەڕوخێنێ، ڕایدەهێنێ لەسەر ڕەوشتی جوان، ڕێڕەوی بۆ دەکات لە بنیاتناندا لە وتارو کرداردا، شوێنەواری ڕەفتاری جوانو ڕەوشتی بەرزی لێپەیدا دەبێ، بەبێ پەنابردنە بەر توندوتیژییو شێوەکانی ئازاردانی جەستەیی تێکشکێنەری کەسایەتییو ڕێزی مرۆڤایەتیی، ئەمەش دەبێتە خاکێکی بەپیتو لەوەڕگایەکی ترسناك بۆ نەخۆشییەکانی (دەروونییەتی کۆلەکان) کە لە گرنگترین ئەو نەخۆشیانەیە، کە ئوممەتی ئیسلام گیرۆدەی بووە.

بۆ ئەوەی پەروەردە سەرکەوتووبێت، دەبێ پەروەردەکار (المربي) تێبگات لە سروشتی منداڵو ئەو قۆناغەی، کە منداڵی پیادا تێدەپەڕێ، لەگەڵ سروشتی هەستکردن بە هەموو قۆناغێك لەو قۆناغانە، زانینی ئەو ئەندازەی، کە منداڵ تێدەگات، تاوەکو لە توانای منداڵە، کە زیاتر نەخاتە سەرشانی، یان وازلێبێنێتو پشتگوێی بخاتو دەرفەتی گەشەو ڕاستکردنەوەکەی لە کیس بچێ، بەبێ هەوڵدانو هەستکردنو ئاڕاستەکردنو ڕێنماییکردن، بەمەش دەرفەتێ لەدەست دەچێ کە هەرگیز قەرەبوو نابێتەوە لە پێکهاتەی ژیرییو دەروونو وێرانی منداڵدا، ئەوەش چونکە هەموو وەرزێ تۆوی خۆی هەیە، هەموو ڕاوێ وەرزی خۆی هەیە، هەموو کشتوکاڵێ دروێنەی خۆی هەیە.

زاڵبوونی گرنگیدانی زانیارییانەو پڕکردنی مێشکی منداڵی تازەپێگەیشتوو بە زانیارییو لەبەرکردنی، لەگەڵ لاوازیی گرنگیدان بە لایەنی دەروونیو ویژدانی، نەبەستنەوەشی لە نێوان لایەنی زانستییو دەروونییو ویژدانیی، لاوازی چاودێریی کردنی ئاسەواری زانستیی دەروونیو ویژدانیی لە پێکهاتەی ژیریی تازەپێگەیشتووەکانداو لە دەروونو ڕەوشتیاندا، وەك کەسێك وایە، ئاوی خاوێن بکاتە عەمباری سووتەمەنی، کە جووڵە دەستێنێتو وزە بەفیڕۆ دەچێتو تینوێتی ناشکێنێ.

خۆشەویستیی زەمینەی پەروەردەیە، ئەو خاکەیە، کە پەیوەندیی کاریگەریی بە بەرهەمی تیا گەشەدەکات، تیایدا متمانەو پەیوەستبوون لە نێوان منداڵو پەروەردەکاردا دروست دەبێ، بە ئەندازەی سووربوونی پەروەردەکار لەسەر

سوودگەیاندن بە منداڵو خۆشەویستی بۆی، نەرمونیانیش لەگەڵیدا، هاندانیو ڕێزگرتنی هەوڵەکانی بە ئەندازەی ئەوە پەیوەست دەبێ بەو کەسەوە کە پەروەردەی دەکاتو متمانەی پێدەبێت، سووریشە لەسەر ڕازیی کردنو وەرگرتنی متمانەی، ئەمەش وا دەکات کە منداڵ ببێتە زەوییەکی بەپیت، کاری پەروەردەکاری ئاقڵو ژیریی ئاسان دەکاتو دەستی منداڵ دەگرێت، بەرەوپێشەوەی دەبات بەسەر پلەکانی توانای لە هەوڵدان بۆ چاکترو بەرزو شیاوتر.

## قۆناغەکانی گەشەی بنەڕەتیی منداڵییو سەرچاوەکانی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا

پەروەردەکەری بەتوانا ئەو کەسەیە، کە پێش هەمووشتێ بتوانێ سیفەتو توانا ژیرییو دەروونیو ویژدانییەکانی منداڵ بناسێت، تا بتوانێ لەو قۆناغەدا دەستیبگرێ، گەشەبدات بەو توانایانەو ژیرییو بنیاتی دەروونیو ویژدانی پێکبهێنێت، لەپێناوی: چاندنی بەرزترین بەها، تەقاندنەوەی بەرزترین وزە، گەشەکردنی چاکترین توانا، لەسنووری تایبەتمەندو تواناکانی مێشكو دەروونو لاشەی منداڵ، بەشێوەیەك بەپێی تواناکەی زۆری لێبکات، نەهێڵێ وزەکانی بەفیڕۆ بڕوات.

بنەمای سروشتی منداڵ لە خواری حەوتساڵییەوە، بریتییە لە گڕوگاڵو خۆڕاهێنان، سیفەتەکانی ئەم قۆناغە بریتییە لە پێویستییەتی منداڵ بۆ دروستکردنی سادەترین شارەزاییو دووبارەکردنەوەی، ئەم قۆناغە تواناو چاودێریکردنو بیرکەوتنەوە تیادا لاوازە، هەر لەبەر ئەوەیە کە بنەڕەتی پەروەردەکردنی ئەم قۆناغە بریتییە لە گڕوگاڵ پێکردنو قسەلەگەڵ کردنو یاری لەگەڵ کردنو خۆگرتنو دووبارە کردنەوەی شتەکان، گرنگ ئەوەیە لەم قۆناغەدا، منداڵ خوو بگرێ بە پەروەردەکەرەکەیەوە، خۆشی بوێتو متمانەی پێی هەبێ، جێگیربوونی نەخشەی پەروەردەکەرەکەو زانینی دەبێتە هۆی بەدیهاتنی هەستی ئارامی منداڵەکە، دەرفەتی خۆڕاهێنانی بۆ دەڕەخسێ، ئەمەش

له کاتێکدا دەبێت، که ئاڕاستەکردنەکانی پەروەردەکەرەکە پێچەوانەو دژی یەکتر نەبن، تاڵیی ڕاهێنانەکانی نەپچڕێو تا مناڵەکە هەست بە ئارامی بکاتو بزانێ چی لێ داوا دەکرێ، دووبارەکردنەوەو چاودێریی کردنو هاوڕێیەتیکردنو یارمەتیدانی بە بەردەوام دەبێتە هۆی ئەوەی، کە مناڵەکە هەرچی لێ داوا بکرێ بیهێنێتەدی، لەمەشەوە دەگاتە پێکهێنانی چەمكو نەریتە چاکەکان لە ڕەفتاریدا، لە پەیوەندییو هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەسانیتردا.

لەگەڵ گەیشتنی تەمەنی مناڵ بە دە ساڵ –بە جیاوازییەوە– کە قۆناغی گەشەی جەستەییو دەروونییە لای مناڵ، ئیتر لێرەوە، خاوەن مناڵ دەبێ هەوڵبدات بە ڕاهێنانی مناڵەکە لەسەر هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی، ئومێدی چاکەی تیا دروستبکات، ئاسۆی زانست لە بەردەم دەروونیدا بکاتەوە، کە هەمیشە حەزی لە شتزانینو دۆزینەوەی شتی ترە، حەزی لە دەستکەوتو داهێنانە، حەزی تیا دروستبکاتو هەوڵبدات خۆگربێ لەکاتی ناڕەحەتیدا، بۆ بەجێهێنانی ئەم ئامانجە، دەبێ هۆکاری بە نەخشەیی بۆ دابنێ، سوور بێ –لە هەمانکاتدا– لەسەر دووچارنەکردنی مناڵ –بەهۆیەوە– بۆ شتێ، کە بۆی دانەنرابێتو لە شتی تر ترسناكو تێکشکانەکان لە ژیاندا.

بەمجۆرە، خۆشەویستیی لە هەموو قۆناغەکانی مناڵیدا، کۆڵەکەی پەروەردەی دروستو سەرکەوتووە، ڕاهێنانی مناڵو ڕێکوپێك کردنی بەرنامەی پەروەردەیی مناڵ دەبێ پشکی شێری هەبێت.

قۆناغی هەرزەکاریش، حەزکردنی زانینی شتو داواکردنی قایلکردنو حەزی سەربەخۆییو دۆزینەوەی ڕێگا بە گیانی دۆزینەوەو بەرزی بەسەر دەروونی مناڵدا زاڵ دەبێ، لەم قۆناغەشدا تووشی گۆڕانی لاشەییو دەروونیو ویژدانیی دەبێت، کە پێشتر هیچ شارەزاییەکی تیا نەبووە، شێوازی دروستی بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم بارەدا نییە، ئەمەش پشێویی دەروونیی تیا دروست دەکات، لە پەیوەندییەکانیو ململانێ هەستییەکانی، هەروەها پاڵیپێوە دەنێ بۆ چوونەیەكو هەستکردن بە شەرمەزاریی، یان بەپێچەوانەوە پاڵی پێوەدەنێ بۆ سەرپێچیکردنو خراپەکردنو لە پەتدەرچوون، بە هۆی هەڵسوکەوتو

سنگفراوانیی‌و بوارکردنه‌وه بۆ هه‌ستی سه‌ربه‌خۆیی‌و ده‌ستکه‌وت‌و دۆزینه‌وه‌و گه‌ڕان به‌دوای زانین له سێبه‌ری چاودێریکردندا، فه‌راهه‌مهێنانی که‌ش‌و هه‌وای پاك‌و خاوێن، چاودێریکردنی به به‌زه‌ییانه، ئاڕاسته‌کردنی ژیرانه، تێکه‌ڵیکردنی دروست، ده‌توانرێت ئه‌نجامی باش به‌ده‌ستبهێنێت، به هۆیه‌وه کرانه‌وه‌و ده‌سه‌ڵاتکردنی به‌سه‌ر وزه‌و هێزه ته‌قیوه‌کانیدا له‌قه‌واره‌ی منداڵدا دروست ده‌بێ.

له‌گه‌ڵ پێگه‌یشتن‌و چوونه ته‌مه‌نی لاوی، وزه‌و حه‌زه‌کانی‌و ئازایه‌تیکردن له ڕه‌فتاره‌کانی ڕێگاکانی ژیاندا، ئه‌وا متمانه‌و هاندان، به‌رپرسیاریه‌تی خستنه سه‌رشانی گه‌نجه‌کان، گرنگترین شته، که گه‌نج پێویستی پێیه‌تی تا شاره‌زاییه‌کانی پێکبهێنێت‌و ڕێگای ژیان ببڕێت، ئه‌ندامێکی به‌تواناو سوودبه‌خش، مرۆڤێکی داهێنه‌ر، که سیفه‌تی ده‌ستپێشخه‌ریی کردن‌و وزه‌ی ویژدانی تیا بێت‌و توانای به‌رپرسیارییه‌تی بگرێته ئه‌ستۆو به‌هێزو ده‌ستپاك‌و شیاو، وه‌ك مسوڵمانێکی جێنشین وابێت.

ڕه‌گه‌زی قایلکردن‌و هاندان‌و ڕێزگرتن‌و بواردان بۆ ده‌ستپێشخه‌ریی‌و داهێنان‌و به‌رپرسیارییه‌تی، ئه‌مانه بنه‌مای لایه‌نی کۆمه‌ڵکارییه له بنیاتی که‌سایه‌تی ئیجابیدا، ئه‌گه‌ر په‌روه‌رده‌کاران ده‌روونی منالاّن بۆخۆیان ڕابکێشن‌و چاودێریی گه‌نجه‌کان بکه‌ن‌و گرنگییان پێبده‌ن له‌م قۆناغه‌دا، ئه‌وا سه‌رکه‌وتنیان به‌ده‌ستهێناوه له بنیاتی مه‌چه‌کی هێزو تواناو ده‌ستپاکیدا، هه‌روه‌ها مه‌چه‌کی چاکه‌و چاکسازیان دروستکردووه، ئه‌گه‌ر وانه‌بێ، ئه‌وا بوار نییه بۆ له‌دایکبوونی به‌ره‌یه‌کی هه‌ڵگری په‌یامی ئیسلامیی شوێنیش نابێته‌وه بۆ کۆمه‌ڵگه‌ی به‌هێزو هاوکاریی یه‌کترو ڕاوێژکردن‌و ڕێزگرتنی یه‌کتر.

## سیفه‌ته‌کانی په‌روه‌رده‌کاری سه‌رکه‌وتوو

ئه‌و په‌روه‌رده‌کاره‌ی، که بیه‌وێ له کاره‌که‌یدا سه‌رکه‌وتوو بێت ده‌بێ خۆی پڕچه‌ك بکات به زانیاریی‌و خۆشه‌ویستیی‌و ڕێزداریی‌و ڕێزگرتن، دادپه‌روه‌رو خۆگرو به‌خشه‌ر بێت، چونکه ئه‌مه، ئه‌و بنه‌مایانه، که ده‌بێ هه‌بێت بۆ

پەروەردەكردنی ژیریی‌و دەروونەكان، ئامادەكردنی بۆ لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارییەتی، هەرئەمەش كانزای دەروونەكان دروستدەكات، لە هەموو گەل‌و لە هەموو زەویەكدا، "تجدون الناس خيارهم في الجاهلية خياركم في الاسلام إذا فقهوا"[١].

پەروەردەی ڕاست‌و دروست‌و كانزای گران بەهاو بنیاتی دەروونیی دروست، ئەمە لەگەڵ بنەمای سروشت‌و فیترەتی مرۆڤدایە، بە بێگوێدانە ئەوەی، كە ئەم مرۆڤە لە نەفامیدایە یان لە ئیسلامدایە، ئیسلام‌و تێگەیشتن لەمەبەستە باڵاكانی ئەو وزەیە ئاراستە دەكات‌و دایدەمەزرێنێت بەرەو چاكەو دەستكەوتی باش، بەڵام ئەگەر ئەو بنیاتە دەروونی‌و وزەو ویژدانییە ئامادە نەبوو، ئەوكاتە زانست‌و تێگەیشتن بێسوود دەبێ لە پاڵنانی زانست بۆ كاركردن، پاڵنانی فیكر بۆ قوربانیدان‌و بەخشین، مەگەر بە كەمێكی زۆر كەم نەبێ.

بە بێ خۆشەویستیی‌و پوختەكردنی خۆشەویستی‌و سوربوون لەسەر بەرژەوەندی مناڵ، حەزو خۆگرتن لەسەر ناخۆشییەكانی‌و پەروەردەكردنی منداڵی بچوك، ئەوا پەروەردەكار سەركەوتوو نابێت لە هەڵگرتنی قورسی پەروەردەكردندا، هەرگیز ناتوانێ متمانەی منداڵ بۆخۆی ڕابكێشێ‌و خۆشیبوێ‌و سووربێت لەسەر وەرگرتنی ئاڕاستەكانی‌و وەرگرتنی ڕەزامەندییەكانی.

- دادپەروەرییش بناغەیەكی بەهێزە، كە خۆشەویستیی‌و ڕێزو كاریگەرییەتی ئاڕاستەكردنی لە نێوان منداڵ‌و پەروەردەكاردا دروست دەكات، چونكە دادپەروەری تەرازووی ڕاستەقینەی هەستەكانی پەروەدەكارە بەرامبەر بە منداڵ،

---

[١] بوخاری‌و ئەحمەد گێڕاویانەتەوە، لە ریوایەتێكی تری بوخاریدا دەڵێت: كەوا بێت لە كان‌و گەوهەری عەرەب دەپرسن، باشەكانیان لە سەردەمی نەفامییدا، باشەكانیانن لە ئیسلامدا ئەگەر لە ئایین شارەزابن (صحيح البخاري: ٣١٠٤ـ مسند أحمد ٩٢٠١).

لە ریوایەتی تەیالیسی‌و ئیبن مەنیع‌و عەسكەریی دا هاتووە كە پێغەمبەری خودا فەرمووی: مەردووم لە باش‌و خراپییدا وەك كان‌و گەوهەر وان، باشەكانیان لە نەفامییدا، باشەكانیانن لە ئیسلامدا ئەگەر لە دین شارەزا بن. (مسند احمد: ١٠٠٦٥).

منداڵ ناتوانێت گوێبکرێ بۆ دەربڕینەکانی پەروەردەکارەکەی‌و ڕێزلێگرتنەکانی، ئەگەر ئەو منداڵە هەستنەکات بە دادپەروەریێتی پەروەدەکارەکە، جیاکردنەوەو خۆنەدانە پاڵ هیچ منداڵێ لەسەر حسابی منداڵێکی تر، یان تاقمێکی تر، کوڕ بێت یان کچ، لەبەرئەوە، دەبێ پەروەردەکار سووربێت لەسەر دادپەروەریی لە نێوان منداڵاندا، کرداری لە گوفتاری لەپێشتر بێت لە چەسپاندنی ئەو هەستەدا لای منداڵ، لەبەرئەوە، دەبێ نەرمونیان بێت‌و هەڵسوکەوتی جوان بێت لەگەڵ منداڵان، کاتێ بارودۆخێکی بابەتی ئەوە دەخوازێ، کە جیاوازیی بکات لە کاتی هەڵسوکەوتدا لە نێوان منداڵان‌و براياندا، تێگەیشتن نیشان بدات بۆ هەستی منداڵەکە، کارەکەشی بۆ ڕۆشن بکاتەوەو ئەو سیفەتانە باس بکات کە ئەو هەیەتی بە بەراورد لەگەڵ کەسانیتردا، تا لەوەدا، متمانە لای منداڵەکە دروستببێت بەرامبەر بە پەروەردەکارەکەی، دانێ بۆ ئەو بارەی، کە پەروەردەکارەکەی بۆی دادەنێ لە هەست‌و خۆشەویستیی، هەستەکانی خۆشەویستیی ڕاستەقینەی ڕاستگۆیانە، ئەوە بەتواناترین زمانە لەسەر بەردەوامبوونی خۆشەویستی‌و قایلکردن.

خۆگرتن‌و پەروەردە، دوانەن‌و لەیەکتر جیانابنەوە، چونکە بێدەسەڵاتیی‌و کەموکورتیی، ئەزموون‌و هەڵە، حەزی خۆدەرخستن، تاقیکردنەوە، لە سیفەتەکانی منداڵییە، کە دەبێ پەروەردەکار بە گیانێکی ئیجابییەوە مامەڵەی لەگەڵ بکات، ئەوەش ئەو نرخەیە، کە هەر دەبێ پەروەردەکار بیدات، تاوەکو منداڵەکە گەشە دەکات، ئەویش بە دووپاتکردنەوەی هەوڵەکان‌و فێربوونی هەڵەکانی‌و دۆزینەوەی وزەو چواردەورەکەی، بە بێ نەرمونیانیی‌و خۆگرتن‌و خۆشەویستی بەرینابێت، ئاڕاستە سوودی نابێت، نەرێت جێگیر نابێت، ڕەفتاری ڕاست نابێتەوە، توانا گەشە ناکات.

بە بێ بەخشین‌و سووربوون لەسەر چاودێرییکردنی منداڵ‌و ئامادەکردنی پێویستییەکانی، نە خۆشەویستی‌و نە ڕێزگرتن‌و نە دادپەروەریی هەیە، بە

خۆشەویستیی‌و بەخشین‌و خۆگرتن بەهەشت کەوتە ژێر پێی دایکان[1]، دایك‌و باوك پلەوپایەی چاك‌و هاوڕێیەتی باشی دەستکەوت[2].

پەروەردەکارو مامۆستا، کە خاوەنی سیفەتی زانست‌و خۆشەویستی‌و بەخشین‌و خۆگرییە، ئەم سیفەتانە لە هەڵهێنجراوی سیفەتی مامۆستای نمونەیی، کە پێغەمبەرە (ﷺ)و جێی خۆشەویستیی‌و گەورەیی‌و ڕێزداریی‌و یادی چاکەی ڕۆڵەکانییەتی، لە قوتابییەکانی‌و لە هۆزەکەی، هەڵبژاردنی مامۆستای چاك بۆ نەوەکان‌و ڕێزدانان‌و ڕێزگرتنیان لە گرنگترین ئەرکەکانی باوکان‌و کۆمەڵگەیە، ئەو گەلانەی، کە دایکان تیایاندا پەروەردەی چاك دەزانن‌و پلەو پایەیان شکۆمەندە، مامۆستاکانیان بەرزو بڵندە، پیاوان‌و بەرەی ئەو گەلە ناودارەن، هەر گەلێ پلەوپایەی ئافرەت تیایدا نزم بێت، پەروەردەکردنیان نزم بێت، جۆری مامۆستاو توانایان ڕوو لە خواری بێت، ڕێنەگیرێت لێیان، ئەوا ڕۆشنبیری نەوەکانی ئەو ئوممەتەو ڕەوشت‌و توانایان لاواز دەبێت، باوکان‌و گەلان هیچ شتێکیان وە بەرنەهێناوە، سوودەکەی گەورەترو شیاوتربێت لە وەبەرهێنان (استثمار) لە بواری پەروەردەو فێرکردن بە هەموو جۆرو بوارەکانیەوە، لەسەر ئاستی خێزان‌و باوکایەتی، لەسەر ئاستی دایەنگەو قوتابخانەو زانکۆ، لەسەر ئاستی کتێبخانەو هۆکارەکانی ڕاگەیاندن‌و یانەکانی زانست‌و گەشەی تواناکان.

---

[1] لە حەدیسی موعاویەی کوڕی جاهیمەدا ریوایەت کراوە کە ئەو هاتە لای پێغەمبەر و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەمەوێت غەزا بکەم و هاتووم راوێژت پێبکەم، فەرمووی: دایکت هەیە؟ وتی: بەڵی، فەرمووی: دە لای ئەوبە، چونکە بەهەشت لە ژێر پێی ئەو دایە.

نەسائی لە سوننەدا: ٣٠٥٣، حاکم لە موستەدرەکدا هێناویەتی، بە دروستی زانیوە، زەهەبییش بەلایەوە دروستەو مونزریش بەهەمان شێوە.

[2] بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، چ کەسێك شایستەترە بەوەی لەگەڵی باش بم، فەرمووی: دایکت: وتی: ئینجا کێ؟ فەرمووی: دایکت، وتی: ئینجا کێ؟ فەرمووی: دایکت، وتی: ئینجا کێ؟ فەرمووی: باوکت. (مسند احمد: ٧٩٩٤).

پێغەمبەر (ﷺ)، مامۆستاو پێشڕەو بوو لە ماڵەکەیدا، لە مزگەوتو وتارو ئاڕاستەکانو ڕێنماییو هاوڕێیەتییەکەیدا، جێی خۆیەتی کە مسوڵمانان لە وانەکانی بەرنامەو وتاری پەروەردەیی پێغەمبەر (ﷺ) تێبگەن دەربارەی ئافرەتو منداڵ، بۆ گێڕانەوەی بنیاتی بەرەکانی مسوڵمان لەسەر بەرزێتی باوەڕو هێزی باوەڕ، لەسەر خەباتی کاری چاکەو پاککردنەوەی.

# بەشی پێنجەم
# خێزانی مسوڵمان سەرچاوەی ویژدانە

ئەگەر ئامانجەکانی پەروەردەی بەرزی ئیسلامیی، بریتی بێ لە: بنیاتنانی (باوەڕداری ڕاستگۆ)و (جێنشینی شوان)و (بەهێزو دەستپاکی)، ئەوا ئەم ئامانجانە نایەنەدی بەوزەی قایلبوونی باوەڕو هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی جێنشینایەتییو ئازایەتی دڵو بەدەستهێنانی ڕاستگۆیی، دەستپاکی، چاکگەیاندن، جوانکاریی لەکاردا، ئەم پێشەنگانە لە منداڵیدا بنیات دەنرێ، لەبنەڕەتی پێکهاتەی مرۆڤە بەویژداندا دروست دەبێ، لەبەرئەوە، خێزانو سەلامەتی پەیوەندی خێزان بنەمای بنەڕەتی بەرنامەی پەوەردەی پێغەمبەرییە بۆ منداڵ، مەبەستی وتارەکانییەتی، چونکە خێزان یەکەم دایەنگەو گرنگترین شتە بۆ منداڵ، لە ڕووی دەروونیو مادددییەوە، منداڵ کە لە دایك دەبێت، ناتوانێ پێویستییەکانی خۆی دابینبکاتو پارێزگاری لەخۆی بکات بەبێ چاودێریی خێزان، کە هەموو پێویستییەکانی ماددییو دەروونی بۆ فەراهەم دەهێنێتو چاودێری منالییەکەی دەکات، لەبەرئەوە، بیناکردنی خێزانو جۆری پەیوەندییەکانی، لە گرنگترین لایەنەکانی پەروەردەی مرۆڤایەتییە، کە بنیاتی کەسایەتیی مرۆڤایەتیی لەسەر دەوەستێت، خێزان ناوکی بنەڕەتییە لەپێکهێنانی تاكو کۆمەڵگەدا، لەبەرئەوە، ئیسلامو پێغەمبەری ئیسلامو قورئانی پیرۆز، زۆر گرنگیانداوە بە خێزان، بۆیە زۆر گرنگە تێڕوانینی ئیسلامیی لە بیناکردنی خێزانو پەیوەندیی تاکەکانی شارەزابین، تابتوانین کۆڵەکەکانی لەسەر بنەمای دروست دابمەزرێنین: کە دایەنگەی پەروەردەیی دروست پەیدادەکات بۆ بنیاتنانی منالّی مسوڵمان، زۆر لەو لادانانە لادەبات کە بە هۆی نەریتەوە دروستبووە، بارودۆخو لێڵی ڕوانینو وشکیی فیکر یارمەتیدەری بووە، بەتایبەتی لەم قۆناغەدا، کە ئوممەتو ئاستەنگەکانی پیاتێدەپەڕێتو ئەمڕۆ ڕووبەڕووی دەبێتەوە، خوای گەورەو پەروەردگار دەفەرموێت:

(وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الروم: ٢١ ).

(وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَاماً) (الفرقان: ٧٤ ).

(وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ* وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ* وَإِن جَاهَدَاكَ عَلى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ* يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ* ا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ* وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ* وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ) (لقمان:١٣- ١٩ ).

(الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاء* رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاَةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاء* رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ) (إبراهيم:٣٩- ٤١ ).

(إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ* وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ) (البقرة:١٣١- ١٣٢ ).

(وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَاناً حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً وَوَضَعَتْهُ كُرْهاً وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْراً حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ* أُوْلَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَنَتَجاوَزُ عَن سَيِّئَاتِهِمْ فِي أَصْحَابِ الْجَنَّةِ وَعْدَ الصِّدْقِ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ) (الأحقاف:١٥- ١٦ ).

وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً* وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً) (الإسراء:٢٣– ٢٤ ).

(وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ* قَالُواْ تَاللّه تَفْتَأُ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّى تَكُونَ حَرَضاً أَوْ تَكُونَ مِنَ الْهَالِكِينَ* قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ* يَا بَنِيَّ اذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلاَ تَيْأَسُواْ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ) (يوسف:٨٤– ٨٧ ).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "إن من أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا وألطفهم باهله" رواه احمد، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت "خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي" رواه ابن ماجه والحاكم.

(مسلم)یش لە ئەبوهریرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە، کە فەرمویەتی (تنكح المرأة لأربع، لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينيها، فاظفر بذات الدين تربت يداك). هەروەها (ترمذي) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: (إذا جاءكم من ترضون دينه و أمانته فزوجه، الا تفعلوا تكن في الارض فتنة وفساد كبير"، احمد وأبوداو والنسائى وحاكم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویانەتەوە، کە فەرمویەتی (تزوجزا الودود الولود فإني كاثر بكم الأمم يوم القيامة) هەروەها شیخان لە ئیبن عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته، الإمام راع ومسؤول عن رعيته، والرجل راع في اهله ومسئوول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها، فكلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته".

ئەم گرنگیدانە بەخێزان لە ئیسلامدا، کە یەکەمو گرنگترین دایەنگەیە لە بیناکردنی مرۆڤ، هیچ نامۆ نییە چونکە مرۆڤ بەڕێزترینی دروستکراوەکانە، مرۆڤ جێنشینە لەسەر زەوی، لەبەرئەوە، زۆر پێویستی بەپەروەدەو ئامادەکردنو منداڵیەتی دەروونیو جەستەی دوورو درێژە، بەڵکو درێژترین منداڵیە لەناو دروستکراوە زیندووەکاندا، نزیکەی دوو گرێی تەمەن دەخایەنێت، پێش ئەوەی

گەورەبێتو خۆی بگرێ، بنیاتی دەروونیو لاشەیی دروست بێت، منداڵ لەم ماوەیەدا، چەندین جۆر چاودێرییو گوێپێدانو پەروەردەو هەڵسەنگاندنو ئاراستەو فێرکردنو ڕاهێنان وەردەگرێت.

خێزان ئەو بنکە پەروەردەییە مرۆڤایەتییە کە منداڵ دەگرێتە خۆییو پێویستییەکانی بۆ پەیدا دەکات، لەبەر ئەوە خێزان گەورەترین کاریگەری بووە لە ئاراستەکردنو ڕۆشنکردنەوەی بنیاتی دەروونیو ویژدانی بە چاکەو بەخراپە، ڕێکخستنی منداڵ بەو ئەندازەیەی کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێ یان بەچۆنییەتی ڕێدان بەخەڵکانی تر کە هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵیدا لەپێناوی بنیاتی منداڵو کاریگەریی کردن لەسەری.

لەبەرئەم هۆیانە، دەبینین بۆچی شەریعەتی ئیسلام ئەوەندە گرنگیداوە بە بنیاتی خێزان، بۆچی بنیاتو ڕێنمونیو ئاراستەی خێزان وەستاوە لەسەر فیترەتو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان لەباوکایەتیو دایکایەتی؟ کاتێ، کە خێزانی ئیسلامی بنیاتنراوە لەسەر بنەماکانی فیترەت لەدەروونی مرۆڤایەتیی کە جێگیرە، لەبەرئەوە، شەریعەتی ئیسلامی بە دوورو درێژی بڕیار دەدات لەسەر بنەما جێگیرەکانی بنیاتی خێزان، پەیوەندی تاکەکانی دیاریی دەکات، کەلەسەر جێگیرەکانی ئەم بنیاتە فیترییە وەستاوە.

## نهێنییەکانی شەریعەت لە بیناکردنی خێزان: بنەماکانو بەرنامە

لەبەرئەوە یاسا ئیسلامییەکانی خێزان لێی تێناگەینو داناییەکەی نازانین، ئەگەر لایەنە فیترییە یاساییەکەی کە لێی پێکهاتووە نەزانین، کە ئەو یاسانە ئەرکی ئەندامەکانی دیاریدەکات، سروشتی ڕۆڵی تەواوی ناو خێزانەکە، پشتگوێخستنی لایەنی لێکۆڵینەوەی یاسایی (السننية) فیتری لە پێکهاتنی خێزاندا کە شەریعەتی ئیسلام هاتووە، پتەوتری بکات، زیاتر بەدەمییەوە بڕوات، ئەوە ڕاڤەی ئەو بارە دەکات کە یاسا ئیسلامییە هاوچەرخەکان چەند کەموکورتیان هەیە لەگەڕان بەدوای گۆڕانەکاندا، شوێنکەوتنی مەودای کاریگەرییەکەی لەسەر شێوازێ، کە بەهۆیەوە تاکەکانی خێزان ڕۆڵی خۆیان دەگێڕنو لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە کاری لێدەکەن.

ئەرکی خێزان لە چاودێریکردنو تەواوکردنی ڕۆڵی تاکەکانی، ئەوە بناغەیەکی فیترییی زیندوو دەروونییە بۆ پەیوەندیی ئەندامانی خێزانی مرۆڤایەتی، هەستنەکردن بە ڕێبازی ئیسلامیی لە تەواوکاری تاکەکانی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بە گشتیو ڕۆڵی ئەندامانی خێزان بە تایبەتی، دەبێتە هۆی تێنەگەیشتنی بنیاتی خێزانی مسوڵمانو تێنەگەیشتنی ڕۆڵی هەموو ئەندامێك تیایدا، لەبەرئەوە، هەرکەس وابزانێ ئەندامانی خێزان هەرکەسەی ڕۆڵی خۆی هەیە لەسەر پەیوەندییە خێزانییەکان، ئەوە لەڕووی ڕاستییەوە، هەڵەیە، تێکدانی فرمانی خێزانە، ستەمە لەسەر پێویستیی لایەنەکانی پەیوەندییو مافەکانیان، کە ئەمەش خراپە لەگەڵیدا، بەبێ تێگەیشتنێکی دروست بۆ ڕۆڵی فیترەت لە بنیاتی خێزانی مسوڵمان ناتوانن هەست بەسروشتی شەریعەتی ئیسلامیی، کە لەسەر داوا فیترییەکان دامەزراوە بکەینو ئەو داوا سروشتییەی، کە لە پێکهاتەی خێزانی مرۆڤایەتیو پێویستییە فرمانییەکانی خۆی حەشاردراوە.

ڕێککەوتنو تەواوکاری دەبنەهۆی بەدیهێنانی هاوکاریو چاودێرییو خۆشەویستی لەنێوان دایكو باوکدا —نێرو مێ— بناغەیەکە خێزانی مرۆڤایەتی لەسەر بنیات دەنرێ، ئەگەر پەیوەندیی تەواوکارییو هاوکارییو خۆشەویستی لەنێوان دایكو باوکدا نەبێ، ئەوا بناغەی پەیوەندی دایكو باوك بەڕۆڵەکانیانەوە هەڵدەوەشێتەوە، چونکە کەسێ شتی نەبێ هیچ نابەخشێ، منداڵ ئاشتیو ئاسایشو چاودێریو پەروەردەی پێویست بۆ بنیاتی دەروونیو زانستی تەواوی دەست ناکەوێت، ئەمەش دروست نابێت تا هەموو تاکێکی ناو خێزان پێویستی خۆی بەدەستنەهێنێ، ڕۆڵی خۆشی ببینێ بە گوێرەی توانای، ئەمەش کەشو هەوای دەروونی دروست دەڕەخسێنی بۆ ئەندامانی خێزانو منداڵەکانیان، تا هەست بکەن بە ئارامیو ئاسایشو وزەو توانایان گەشە بکات.

لاوازی جەستەییو نەرمیی سۆزی ئافرەت، بەبەراورد لەگەڵ پیاودا، لەگەڵ گەرموگوڕیی پەیوەندی منداڵ بەدایکەوە، ئەوە وا دەخوازێ کە منداڵ هەمیشە پێویستی بەکۆمەكو پشتگیری ببێت، لەبری ئەمەو لەبەرامبەر لاوازیی پیاو لەڕووی ڕەگەزەوە، بە بەراورد لەگەڵ ئافرەت، چونکە دەسەڵاتی ئافرەت بەرامبەر بە حەزەکانی خۆیو منداڵەکەی دەپارێزێت، لەبەرئەوە ڕەشۆی بڕیاری

جنسیی بەدەست ئافرەتە، ژیرێتییەکەی پیاو کاریگەریی نییە لەسەر بڕیاری ژیرانە لە پەیوەندی ئافرەت بە پیاو ئامادەبوونو ڕواڵەتی، بەڵکو ئافرەت خۆی دەتوانێ ئەو بڕیارە بدات کە ژیرانەیە، لەگەڵ پەیوەندییەکەدا بەکاریگەریی سۆز، نەك بە بڕیاری ژێر دەڕوات، بە پێچەوانەی پیاوەکەو —لەبەر لاوازیی جنسیی بەرامبەر ئافرەت— دیمەنی ئافرەت کاری لێدەکات، بەڵکو تەنها بە ئەندێشە — هەندێ جار کاریگەریی دەبێ— ئافرەت توانای هەیە بەسەر پیاودا، تابڕیاری ژیرانەی لێوەربگرێت، ئەمەش وا دەکات کە پیاو بەرامبەر بە ژن لاواز بێت، بە ئاسانی لێی بخوڕێت، شوێنی بکەوێ، منداڵەکەشی شوێن دیکەکە بکەوێ بەهۆی شوێنکەوتنی پیاوەکە بۆی، لەبەر ئەم ڕاستیانەی کە قەوارەی پیاو و ئافرەتدا هەیە، لەسەر ئەم بنەمایە، لەبەر ئەو بەرژەوەندییەی کە تیایدایە، شەریعەتی ئیسلامیی پەیوەندی ژنو ژنخوازییو خزمایەتیی لەسەر بناغەی تایبەتی ڕێکخستووە، ئەم ڕێکخستنە دانایی بە پیاو —بەوەی کە خوا پێی بەخشیوە من توانای کارو هەڵگرتنی نارەحەتی— هەموو قورسییەکانی مێینەو منداڵییەت دەگرێتە ئەستۆی خۆی لەسەر ئەم بناغە تایبەتییەو ئەم خۆشەویستییە پەیوەندیی نێوان ژنو پیاو لەسەر خۆشەویستیو بەزەیی بنیات دەنرێت، تا خێزان ببێتە دایەنگەی خۆشەویستیو ئارامی بۆ ڕۆڵەکانی ژنو پیاوەکو.

هێزو توانای پیاوو خەریکبوونە بە دایکایەتیو مێینەییەوە ئەوە لە پەیوەستیەتی خێزانە —هێزێکی ئاسانکراوە بۆ بەدەستخستنی پێویستییەکانی ژنو منداڵو چاودێریکردنیان، نەرمیو سۆزی ئافرەت ئیسراحەتو بەزەییو ئاسوودەبوونی منداڵی لاوازو پیاوی ماندووە، لەبەرئەوە ماڵ بەخێوکردن زیاتر پەیوەندی بە پیاوە هەیە و ئافرەت بەویستی خۆی نەبێت کار ناکات، بەپێی بارو وزەو ئەو قۆناغەی کە پیای تێدەپەڕێو سروشتی ئەو کارە کە دەیکات، هەر ستمەێك لەسەر ئافرەت لەو بارەوە ئەوە پێشێلکردنی مافییەتی کە دەبێ یارمەتی بدرێتو چاکەی لەگەڵ بکرێت، مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامو بناغەی فیترەت هاوکاریو تەواوکاری تیایە، بەڵام نابێ ستەم لە ئافرەت بکرێتو مافی لەناو ببرێت.

ئەم فیترەتە ڕاڤەی چەمکی ئیسلامیی دەکات لەبری عەورەتی پیاو و عەورەتی ژن‌و داناییەکەی دەردەخات، ئەوەش ستەم نییە لە ئافرەت، بەڵکو چاودێریکردن‌و پاراستنی هەردوو لایەنی خێزانەکەیە، سنووردارییەتی عەورەتی پیاو بۆ ئاسانکاریی کاری پیاوە بەبێ ترس لەسەر فیتنەی ئافرەت، یان ڕۆچوونی لە مافەکانی پەیوەندی دایکایەتی لە خێزاندا، چونکە ژیرێتی بڕیاری ئافرەت بنیات نراوە لەسەر بنەمای سروشتەکەی، کاتێ هەموو جەستەی ئافرەت بە عەورەت دادەنرێ ئەوە بۆ پاراستنیەتی لە دوژمنکاری پیاوان لەسەر ڕۆڵی دایکایەتییەکەی ئەمەش لەبەر لاوازی فیتری پیاوە لەکاروباری جنسدا، هەڵسوکەوتی سۆزدارانەی ئافرەتیش ئەگەر هەموو لاشەی داپۆشراو نەبێ ئەوا ئافرەت دەبێتە سەرچاوەی فیتنە بۆ پیاو و زیان بە خێزان‌و مافەکانی ئافرەتیش دەگەیەنێ.

ئەم ئامانجە بەرزانە ئەوە دەردەخات کە مەبەست لە جیاوازی لە نێوان عەورەتی ئافرەت‌و عەورەتی پیاودا، ئامانجی بەرزە، ئەو ئامانجە لە فیترەتی هەریەکەیانەوە هەڵدەقوڵێ، وەڵامی پێویستییەکانی دەداتەوە، سروشتی ڕۆڵی پەیوەندیدار بە هەریەکەیانەوە دەردەخات، لەبەرئەوە تایبەتمەندی بۆ لایەنەکانی داوای ژنکردن لە ڕوانین بۆی بۆ کەسی تر نییە، هەرئەمەش ئەو داناییە دەردەخات کە بۆچی ئافرەت ناتوانێ چەند پیاوێکی هەبێ؟ چونکە خێزان دەڕووخێت‌و خزم‌و کوڕو باوکێتی دەفەوتێ، ڕۆڵی باوک نامێنێت، هیچ بەروبوومێك نابێت، چونکە ئافرەت یەکجارو لەیەك پیاو نەبێ سکی پڕ نابێ، ئەمەش حیکمەتی فرەژنیی بۆ پیاو دەردەخات لە کاتی پێویست‌و توانا بەمەرجی بەرپاکردنی دادپەروەریی، چونکە فرەژنیی بۆ پیاو نەسەب هەڵناوەشێنێتەوە، خێزان ناڕوخێنێ، بەڵکو خێزانەکان زیاتر دەکات، هەموو منالێ دایکی هەیەو باوکی هەیە کە خۆشیان دەوێ‌ت‌و دڵنەوایی دەکەن‌و چاودێریی دەکەن، بەڵام فرەژنیی کە شەرعی ئیسلام حەڵاڵی کردووە ئەگەر پێویستی نەدەکرد ئەوا خۆشەویستی‌و ئارامی خێزانی تیا بەدیناکرێ، لەوانەیە ببێتە هۆی ڕق‌و کینە لە نێوان ژنەکان‌و منداڵەکانیاندا، بەتایبەتی ئەگەر تواناو پێویستیی‌و دانایی‌و دادپەروەری نەبێت لە فرەژنیدا، ئەوکاتە پیاو —لە هەموو

ڕوویەکەوە– قازانجی دەروونییو خێزانیی ناکات، بەڵام ئەگەر فرەژنی پێویستییەکی ڕاستەقینە بوو کە پەیوەندی بە ژیانی تاك یان قەوارەی ئوممەتەوە هەبێت ئەوا بوار هەیە، ئەوەش بە مەرجی دادپەروەرییو چاودێرییکردنی هەموویان لە هەموو بوارەکانداو پشتگوێنەخستنی هیچیان.

ئابەم شێوەیە خێزان لەسەر خۆشەویستییو بەزەیی بنیان دەنرێ، لە هەستەکاندا خۆشەویستی دروست دەبێ، لە ئەرکەکاندا بەزەیی بنیات دەنرێ، مێرد زۆر ناکات لە ژنەکەی بەپێی توانای نەبێ، ئافرەتیش سەرپێچی مێردەکەی ناکات و زۆری لێناکات، لەبەرئەوە زۆر ناکرێت لەهیچ کام لە لایەنەکانی ژنو مێردایەتی بۆ مانەوە بەبێ ویستو حەزی خۆی، لەبەرئەوە ئیسلام تەلاقی حەلاڵ کردووە بۆ پیاو، (خلع)[1]یش بۆ ژن، ئەگەر کێشە کەوتە نێوانیانو پەیوەندیی سۆزو خۆشەویستییان بۆ یەکتر نەما، چونکە نەمانی خۆشەویستیو بەزەیی لەنێوان ژنو پیاودا، زیان بە خۆیانو نەوەکانیان دەگەیەنێ، نەبوونی باوك یان دایك بۆ منداڵ لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا سوکترە لە ژیانی لە نێوان دووکەسدا کە هەمیشە لە ململانێو کێشەو ڕق لەیەکتربوونەوەو دڵڕەقی بەرامبەر بە یەکترو هەرای بەردەوامبووندا.

لەبەر ئەوە ئیسلام گرنگی داوە، قورئانیشی ڕوون کردووەتەوە، ئامۆژگاری دەکات، ژنو پیاو تێدەگەیەنێ لە سروشتی پەیوەندی نێوانیان، مافی هەریەکەیانو ئەرکیان بەرامبەر بە یەکتر، بەم ڕەزامەندیو خۆشەویستی نێوانیان سەربەستی کردوون لەخۆیاندا، لە ماڵو سامانیاندا، بەبێ هیچ ناڕەحەتییەك، بەو مەرجەی گوناهو فێڵو ڕۆژوونی تیا نەبێت لە ئەرکەکانیاندا، هەروەها فێری کردوونو ڕێنموونیی کردوون کە چۆن کێشەکانیان چارەسەر بکەنو کۆسپەکانی بەردەمیان لادەن، پێش پەنابردنە بەر جیابوونەوەو تەڵاقداندان، تاخێزان نەڕووخێ، منداڵ بەو جیابوونەوەیە ئازاری پێناگات، دانایی ڕەزامەندی –کە لەوەزیاتر نەبێ پیاو داویەتی بە ژن لە مارەیی بۆ خولعی ئافرەت لە پیاو کە ژنەکە حەزی لە ژنو مێردایەتی نییە لەگەڵ پیاوەکەدا وە

[1] ئەو بڕە پارەیەیە کە ژن دەیدات بە پیاو بەرامبەر تەڵاقدانی پیاوەکە بۆ ژنەکە.

داوای تەڵاق لە پیاوەکە دەکات، ئیتر لەبەر هەر هۆیەك نەبێت- یان کاریگەریی کەسێکی نزیکی ژنەکە تاوای لێبکات ژنەکە داوای جیابوونەوە بکاتو خێزانەکە بڕوخێت، ئەوا ژنەکە هەرشتێکی لە پ٤یاوەکە وەرگرتووە دەیداتەوە، ئیتر ئەو کاتە جیابوونەوە کە هۆکاری دەستکەوت بەدەستهێنان نییە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی تەڵاق بدات ئەوا پیاوەکە هیچ جائیزەیەکی ماددیی بۆ نییە، ئەم تەڵاقە هیچ سوودێکی ماددی پێناگەیەنێ، بەڵکو تۆڵەی لێدەسەندرێ بەوەی مارەیی لەدەست دەچێتو دەبێ نەفەقە بدات بە ژنەکە، ئیتر جگە لەوەی کە تووشی دەبێت لە ناڕەحەتیی تا خێزانێکی تازەتر دروست بکات.

خێزان لە ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئیسلامدا، ئەو دەزگا کۆمەڵایەتییەیە کە هۆکارەکانی بوونی بنەڕەتی بۆ مرۆڤ ساز دەکات، ئیسلام ڕژێمێکی تایبەتی بۆ خێزان بنیات ناو، کە گونجاو بێت لەگەڵ کارەکانیدا، بۆ هەموو ئەندامێکی خێزان کارو پلەو پایەی گونجاو ڕۆڵو پێویستی خۆی بۆ دیاری کردووە کە لەسەر خۆشەویستیو بەزەییو ڕێزگرتنی یەکتر دامەزراوە.

## ڕۆڵی تاك لە نێوان خێزان و کۆمەڵگەدا

تێکەڵکردنی ڕۆڵی تاکەکانی بەو سیفەتەی کە ئەندامی خێزانێکن لەلایەکەوەو ڕۆڵیان هەیە لە کۆمەڵگەو دەزگاکانی تردا لە لایەکی ترەوە خراپ تێگەیشتن دروست دەکاتو دەبێتە هۆی ململانێو بەفیڕۆدانی وزەو دەستگرتن بەسەر مافی خەڵکدا.

پلەو پایەی باوكو شوێنو مەڵبەندی لە خێزاندا، پلەو پایەی دایكو شوێنو مەڵبەندی لە خێزاندا، پلەوپایەی کوڕو شوێنو مەڵبەندی لە خێزاندا، هەریەك لەوانە لە دەزگاکانی کۆمەڵگەدا نییە، پەیوەندی باوکایەتی بە کوڕایەتییەوە لە خێزاندا پەیوەندی بە باوکایەتیو پلەو پایەی باوکایەتییەوە لەدەرووندا هەیە، ئەو خۆشەویستیو ڕێزدارییەی کە هەیەتی، بەڵام شوێنی هەر ئەندامێك لەو ئەندامانەی خێزان لە کۆمەڵگەدا ئەویش پەیوەندیی بەتواناو وزەی ئەندامەکەوە هەیە، کە لە هەندێ جاردا تواناو وزەی کوڕ لە تواناو وزەی باوك یان دایك زیاترە، هەروەها پلەو پایەی ژن، یان کچ، تواناو وزەیان لە دەزگاکانی

کۆمەڵگەدا، بە بەراورد لەگەڵ پلەو پایەی خەڵکانی تر، باوك، یان دایك، برا، یان خوشك، پەیوەندی بە توانای هەریەك لەوانەوە هەیە، تێکەڵکردنی لەم کارەدا تێگەیشتنی خراپ دروست دەبێت، هەروەها وزە بەفیڕۆ دەڕوات، ململانێ پەیدا دەبێ، ماف دەخورێ، خێزان جێگیر بوونی نامێنێ، پەیوەندیی‌و گەیاندنەکەی سەلامەت نابێ.

پلەو پایەی پیاو کە مێردە لە خێزاندا پلەو پایەو مەڵبەندێکە پەیوەندیی بە پێناسی خێزان‌و لایەنداریێتی ئەندامەکانییەوە هەیە، چەسپاندنی خۆیەکلاکردنەوەی پیاو بۆ ژن‌و مناڵەکانی خێزان، سازکردنی هەستی ئارامیی‌و دڵنیایی بۆ مناڵ‌و ئەندامەکانی تری خێزان، زۆر گرنگە، چونکە خۆیەکلاکردنەوەو لایەنداریێتی بۆ خێزان‌و ژن‌و مناڵ لە ناوەرۆکدا لە بنەمادا وەستاوە لەسەر مەودای خۆیەکلایی کردنەوەی ژن‌و دڵسۆزی پەیوەندییەکەی بە پیاوەوە، بەمەودلای بەخشینی هەستی ئاسایش‌و متمانە لە پەیوەندیی پیاو بە ئافرەت‌و بە باوکایەتی مناڵی ژنەکەوە، بە مەودای دەسەڵاتداریێتی لە بەڕێوەبردنی پەیوەندی بەلایەنی بیانیی لە پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی خێزانی، کە ئەمەش ڕەنگ دەداتەوە لە نەسەبی مناڵەکان‌و خۆیەکلاییکردنەوەی باوکەکە بۆیان، هەروەها متمانەی ڕۆڵەکان بۆ لایەنداریێتی باوکیان بۆیان‌و یەکێتیی لەگەڵیاندا، هەموو ئەمەش پەیوەندیی بە تایبەتمەندێتی بنیاتی خێزان‌و پەیوەندییەکانییەوە هەیە، ئەمەش هەمووی بە توانای تاکەکانی خێزان‌و ڕۆڵیان لە کۆمەڵگەدا نییە.

گرنگە کە بزانین سروشتی ئافرەت بەشێوەیەکی گشتی —لە زۆربەی قۆناغە بەرهەمدارەکانی ژیانیدا– جیاوازە لە سروشتی پیاو، هەندێ لایەنی شاز ئەم یاسایە لانابات، سروشتی ئافرەت وایە کە ئەرك‌و گرنگییەکانی‌و تواناکانی دوو لایەنەیە، بە پێچەوانەی پیاو کە یەکلایەنەیە لە سروشتیداو لە گرنگیدان‌و توانایدا، ئافرەت —بە ئەندازەی ئەوەی کە توانای هەیە بۆ کارو بەرهەم هێنان‌و هەوڵی جوانکاری دەدات، هەمیشی چاوی لە دایکایەتی‌و ئەرك‌و داواکانی دایکایەتییە (هێلانەو بێچوو)، ئافرەت نە دەتوانێت‌و نە ئارەزووی هەیە، لە ڕۆڵی سۆزداریی‌و ڕۆڵی زیندەیی لە هەڵگرتنی مناڵ‌و چاودێریکردنی کە شتێ لە بری دانێ، ئەگەر ویستمان ژینگەیەك ساز بکەین بۆ مناڵ کە بە بەختەوەریی گەشە

بکات کە گرفتی بێبەشیو لادانو کێشەی توانی بۆ دروست نەبێ، ئەوا داواکانی ڕۆڵی دایکایەتی دەبێ بۆشاییەکی گەورەی دەروونیو ماددی گەورە لە ژیانی ئافرەتدا داگیر بکات، پێویستی دەبێت بە یارمەتییو پشتگیریی پیاو، گەورەترین ستەم کە لە ئافرەتو منالّ بکرێ داماڵینی ئافرەتە لە خۆیەکلاییکردنەوەی پیاو و یارمەتیدانیو پاراستنیو پشتگیریکردنی ماددییو دەروونیی بۆ ژنەکەو منالّەکانی ژنەکە.

پیاو یەك ڕۆڵی هەیە، تواناو گرنگیدانەکانی پەیوەندیی بە ناوەڕۆکی کارو بەرهەمهێنانەوە هەیە، چونکە پیاو لە ڕووی جەستەییو دەروونییەوە بۆ ئەم بارە ئامادەکراوە، لەبەرئەوە دەبێ هەموو مەرجەکان ساز بکرێ بۆ ئەوەی تواناکانی بۆ کار بخاتە گەڕ، بۆ خزمەت کردنی لاوازی ئافرەتو منالّو پێویستییەکانیان، بەشداریکردنیان لەو بەروبوومەی کە بەرهەمی دەهێنێ بۆ پڕکردنەوە پێویستییەکانیان، سازکردنی کاتو هەوڵی پێویست بۆ دایك، تا گرنگیی بدات بە منالّەکانی، تا دەگەنە قۆناغی پێگەیشتن، لە ژینگەیەکدا کە گرنگی دانو چاودێریو ئاراستەکردنو پەروەدەی دروستی تیا سازکرابێ.

ئا ئەمە بنەماو سەرچاوەیە، هەر لادانێك لە ڕێڕەوی گەیاندنی هەر یەکێك لە دایكو باوك دەبێ بە جۆرێك بێت، کەلێن دروست نەکات لە ئەركو بەرپرسیارییەتی بنەڕەتییەکان بۆ هەریەك لە دایك یان باوك.

لەبەرئەوە بوار نییە بۆ جیاکاریو لوتبەرزیو ململانێ لەنێوان ڕۆڵی پیاوەتیو مێینەیەتی، هەریەك لەو دوو لایەنە ڕۆڵی تەواوکاریی دەبینێ، گرنگییو پلەوپایەی خۆی هەیە لە بنیاتی خێزانو کۆمەڵگەدا، ئافرەت لە بنیاتی کۆمەڵگەی مسوڵماندا –بە پلەی یەکەم– دایکە، دایکایەتیی هەقە یارمەتیو چاکەو پارێزگاریی لێ بکرێت، هەورەها پیاویش کە هێزی هەیەو خاوەنی وزەو بەخشینە، پاراستنی ئەو هێلانەو شەونخونی لەسەرە بۆ ئەوەی ئەو هێلانەیە ئیسراحەت بێت، هەموو یاساکانی ئیسلام هەوڵ بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجو مەبەستە دەدەن، هەر تێگەیشتنێك بۆ ڕۆڵی پیاو و ژن لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا پێچەوانەی ئەم ئامانجو مەبەستە بێ، ئەوە لادانە لە ئامانجەکانی ئیسلامو فیترەتی ڕاستو دروست، ئیتر ڕووەو ئاڕاستەی خۆرئاوا بێت کە ئافرەت ماندوو

دەکاتو ناچاری دەکات کار بکات، بازرگانی بەسێکسەوە بکات، بیکاتە ئامێری ڕابواردنو بەدڕەفتاری سوكو هەرزان، یان بە ئاڕاستەی ملشۆڕکردن بۆ دابو نەریتی ناشیاو لە هەندێ لە وڵاتەکانی جیهانی ئیسلامیی بە ئازاردانو لێدانو بەندکردنو نەفام کردنی کە دەبوو فێری بکردایەو ڕۆشنبیری بکردایەو بیکردایەتە هاوبەشی خۆی لە هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتییدا، ئامادەی بکردایە بۆ بەجێهێنانی ئەرکی چاودێری کردنی خێزان، چاك پێگەیاندنی منداڵەکانی سازکردنی ڕێگاکانی دڵنەوایی دانەوەی مێرد، بەڵکو بەرهەمهێنانی وزەو توانای زیادەی بۆ خزمەتی ئوممەتو کۆمەڵگە، بەتایبەتی کە ئەمڕۆ لەم جیهانەدا خزمەتو وزەی زیاد دەکات کە دەکرێ بەرهەمهێنرێ لە بەرزکردنەوە ئاستی زانستو تواناکانیدا، سوود بە نەتەوەو کۆمەڵگەکەی بگەیەنێ، کە ئەوەش دەبێتە جێگرەوەی بۆشاییو خۆ خەریککردن بە شتی بچووکەوە، یان بکەوێتە داوی بێ تاقەتیو کاری هیچو پووچو نزمەوە.

دوورخستنەوەی ئافرەتی مسوڵمان لە بەشداریکردنی ڕۆشنبیریو ئایینیو کۆمەڵایەتی ئیسلامیی ئەمەش ئەوە ڕۆشن دەکاتەوە کە —لە زۆر ڕووەوە— لاوازی پەروەدەی ڕۆڵەکان، لاوازی ڕۆڵی ئافرەتی مسوڵمان لە بواری ئیسلامیی کۆمەڵایەتی بە بەراورد هەتا لەگەڵ ئافرەتی هیندۆسدا وەك نموونە لە بنیاتنانو یارمەتی کەمیشی نییە لەو مافانەی کە ئیسلام بۆ ئافرەتی مسوڵمانی داناوە، بەڵام جیاوازییەکە لەمەدا ئەوەیە کە ئافرەتی هیندۆسی ڕۆڵی چالاکی هەیە، ئامادەبوونی هەیە لەچالاکی ئاینییو کۆمەڵایەتی هیندۆسی، ئەوە یاد دەخەمەوە کە لە ئیمامی دانا (شێخ موحەممەد غەزالی) خوا لێی خۆش بێت کە لە یادەوەرییەکانیدا باسی منداڵیو لادێ دەکات، دەڵێ ئافرەتم لە هەموو شوێنێکا دەبینی لە لادێکەدا، تەنها لە مزگەوتدا نەبێ.

جێگەی سەرسوڕمانە کە کاتێ ببینین کە زۆربەی مزگەوتی مسوڵمانەکان لەزۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا شوێنی نوێژکردنی ئافرەتی تیا نییە، نازانم —کاتێ لە پۆشاکدا داپۆشراون، هەموو ئەو کەسانەی کە لە مزگەوتەکاندا لە باشترین بارەکانی دەوروونیدا لە پاكو خاوێنی ئاراستەوە کاتێ ڕیزی ئافرەتان لەدوای ڕیزی پیاوانەوە دەوەستن— ئەوە چییە کە دەترسن لێی کاتێ ڕیزی کۆمەڵی

ئافرەت دەكەوێتە پشتی بەربەستو پەردەوە، هەموو پیاوانو ئافرەتان لەدوای تەواوبوونی نوێژ لە مزگەوتەوە لە شوێنی پەرستنو خاوێنییەوە ڕوو دەكەنە بازاڕی كار بە پیاو و ژنەوە! ئایا لە پێكەوەبوونو دەروونیان بۆ كۆبوونەوەی پەرستنو خاوێنی لەمزگەوتدا پێكەوە بوونی دەروونیان نییە لە هەڵسوكەوت لەدەرەوەی مزگەوت، لەبری ئەوەی ڕێزی ئافرەتەكان لە ڕووی دەروونییو ماددییەوە لە مزگەوت دیارنەبێ نە پیاو ببینرێتو نە ژن ببینرێت لە دەرەوەی مزگەوت مەگەر ئافرەتێ، یان پیاوێ كە پەیوەندیی نییە لە خەیاڵدا بۆ هیچكامیان لە ئەوەی تر كە هاوڕێی پەرستشو پاكو خاوێنییەتی!

چەند سەرسوڕهێنەرە كە كار بگاتە ئەوەی كە لە زۆربەی مزگەوتی مسوڵمانەكانداو لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا ڕێگە نادرێ ئافرەت ئامادەی نوێژو وتاری هەینی بێت، هیچ شوێنێكی گونجاوی بۆ ئامادە ناكرێ وەك ئەوەی كە وتارو ئامادەبوونو یادخستنەوەو خستنەڕووی كارو باری مسوڵمانەكان بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە ئافرەتەوە نەبێت، یان هیچ ڕۆڵو پلەو پایەیەكی لە ناو كۆمەڵگادا نەبێت، ڕێگرتن لە ئافرەت كە ئامادەی نوێژی هەینیو نوێژی كۆمەڵ نەبێت ئەوە تێگەیشتنێكی خراپە، گوایە بۆ ئەوەیە تا ئافرەت ناچار نەكرێ ئامادەی نوێژەكان بێت بە كۆمەڵ، چونكە سروشت ئەركی ئافرەت لە چاودێری كردنی خێزان وای لێدەكات كاتەكانی بۆ ڕێكناخرێت، دایك ناتوانێ، یان ئەو كەسەی كە لە جێگەی دایكە، شیرپێدانی منداڵ دوا بخات، یان گوێی پێنەدات، یان وازی لێبهێنێت بەبێ چاودێریی یان چاوەڕێكردنی گەڕانەوەی لە قوتابخانەكەی، زۆر شتی تر كە مەشغوڵی دەكات لە ئیشەكانی (هێلانە)و (بێچووەكان) لەبەرئەوە ئافرەت پابەند نەكراوە بە نوێژی كۆمەڵەوە، ئەمەش هەستكردنە بە ڕۆڵو چاودێریكردنی ئافرەت، بە تایبەتی لە نوێژی كۆمەڵی شەوو تاریكی، بەڵام ئەگەر شتێ نەبوو كە مەشغوڵی بكاتو بێتە ڕێگر لەنێوان ئافرەتو ئامادەبوونی بۆ نوێی كۆمەڵ، بە تایبەتی نوێژی هەینیو وتاری هەینی، ئەوا پیاوو ژن ئەندامی كۆمەڵگەن، هەردووكیان وەك یەك بەرپرسن، بەرپرسیارییەتی ئایینیو كۆمەڵایەتییان بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەك جیاوازی نییە، كاریگەری

مامەڵەو وتاردان لێیەوە بۆ هەردووکیان لە ڕۆڵیاندا هەمان گرنگی هەیە، کارەکە ئاسانکاریو بواردانە، نەك ڕێگریو لابردن، "فلا تمنعوا إماء الله مساجد الله"[١].

## دایکایەتیی و کار لە سیستمی کۆمەڵگەی مسوڵمانی هاوچەرخدا

لە ترسناکترین ئەو شتەی کە مسوڵمانان گیرۆدەی بوون لە دواکەوتووییو شارستانیو ماددی لەبەردەم خۆرئاوا بریتییە لە شوێنکەوتنی خۆرئاوا لە هەموو کارێکدا بەبێ ئاگایی لە تایبەتمەندیی "خذوا القذة بالقذة".

خۆرئاواییەکان تایبەتمەندیی ئێمە بە مەبەستەکانی یاساکانیانو مەبەستەکانی شەریعەتەکەمان، لەوانەش مامەڵەکردن لەگەڵ ئافرەت لای ئێمە لەسەر شێوەی مامەڵەکردنی ئەوان بۆ ئافرەتان، لەگەڵ ئەوەی کە شەریعەتی ئێمەو دەروونی ئێمە هەر کارێ ببێتە هۆی هەڵوەشانەوەی خێزان قبوڵی ناکات، هەرکارێ پەیوەندی بە ناموسو ماندووبوونو کۆسپ بێت لە بەردەم ڕۆڵی دایکایەتییدا ئیسلام قبوڵی ناکات.

کردنەدەرەوەی ئافرەت بۆ کار لەسەر هەمان مەرجی داواکراوی پیاوان، بەهەمان داخوازیو ڕێكو پێکییەوە، لەسەر ئەو شێوەیەی کە خۆرئاوا مامەڵەی پێ دەکات لەگەڵ ئافرەتدا بووە هۆی هەڵوەشانەوەی خێزان، ماندووکردنی ئافرەت، کەمڕەوی لە خستنەڕوویدا، بازرگانی کردن پێیەوە، ئافرەتی خستە بەردەم هەموو جۆرەکانی لادانو دەستبەسەردا گرتن.

ئافرەت هەرگیز وەك پیاو نییە، هەریەکەیان سروشتو تایبەتمەندیی پێویستی خۆی هەیە، تەواوکەری یەکترن نەك هاوتای یەکتر، مامەڵەکردن لەگەڵیاندا لەسەر ئەوەی کە هاوتای یەکن —بە پێویست— ناڕێکیە بەرامبەر بە هەردووکیان، پێشێلکردنی مافی پیاوە لە ڕووی دەروونیو باوکایەتییەوە لە پەیوەندییو ڕۆڵی (قوامییەت) لە ژیانی ئافرەتو خێزانو سازکردنی ئاسایشو

---

[١] روى البخاري في صحيحه: ٨٤٩٠ وفي رواية لمسلم: ٦٧٣ "لاتمنعوا النساء حظوظهن من المساجد".

خۆشیی بۆیان، پێشێلکردنی مافی ئافرەتە، بە تایبەتی لە ڕۆڵی دایکایەتیدا لە ژیانو گەشەی مرۆڤ و گەشەی منداڵدا، لە شەونخونییەکەی لەسەر ماڵی خێزانو خۆشییو ئیسراحەتیدا.

لەبەرئەوە، پێویستە لەسەر کۆمەڵگەو بیریارو سەرکردەو مسوڵمانان، کە لە خۆیان بپرسن دەربارەی سروشتی ڕۆڵی پیاوو ئافرەت لە شەریعەتو کۆمەڵگەی ئیسلامیی هاوچەرخدا، چۆن کۆمەڵگەی مسوڵمان دەتوانێ پارێزگاریی لەو تایبەتمەندییەتە بکاتو مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی بەدیبهێنێ، لەگەڵ بەدیهێنانی بەتوانیی، ژێربارکردنی وزەکانی پیاوو ئافرەت بە چاکترین شێوە بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە، بەوەی، کە مەبەستەکانی بەدیدەهێنێ، بەشێوازێکی هاوسەنگانە وای لێبکات، تا سوود لە وزەی بکاتو ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان ببێتەوە بە باشترین شێواز.

لێرەوە، تا ئێستاش ڕۆڵی ئافرەتو ڕۆڵی خێزان گرنگە، کە دەبێ بپارێزرێن لە هەموو چەشنە هەڵوەشانەوەو وێرانبوونو بەرەڵڵاییەك، لە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا لەپێشەوەبن، بە ڕێگایەك، کە جیاواز بێت لە ڕێکخستنی خۆرئاوا، ئەوەش لە جیاوازییە لە نێوان خۆرئاواو ئیسلامدا، لە ڕووی مەبەستو نیازەوە.

لەبەرئەوە، دەبێ بازاڕی کار ڕێکبخەین، بەجۆرێك کە بەتوانایی بەدیبێتو بارودۆخ سازبکرێت بۆ گەیاندنی هەموو جۆرە ڕۆڵێ لە ئەندامانی کۆمەڵگە —بە پیاوو ژنەوە— لە کارکردنو بەرهەمهێنانو بەدەستخستنو بەدیهێنانی خود، لە بنیاتنانی خێزانو بەجێهێنانی ڕۆڵی دایکایەتیو چاودێریکردنی بە وێژەییو ماددیەوە.

بۆ بەدەستهێنانی ئەم کارە، دەبێ لێکۆڵینەوە بکەین لەسەر بازاڕی کار، ئامادەکاریی بۆیو ڕێکخستنی، ئاسانکردنی شتە لە پێشەکان تیادا لەبەر ڕۆشنایی پێویستییو تواناکانو ڕۆڵ، کە تاكو تاقمەکانی کۆمەڵگە جێبەجێی دەکەن، بەپیاوو ژنەوە، ئەوەی، کە دەگونجێ لەگەڵ مەبەستەکانی کۆمەڵگەداو تایبەتمەندییەکانی بەدیدەهێنێ.

لەبارەی ئافرەتەوە، ئەوا ڕۆڵی دایکایەتی دادەنرێت بە بناغەیەکی گرنگ بۆ کۆمەڵگە، مانەوەو بەردەوامبوونی بە شێوەیەکی کاریگەر، گرنگترین شتە، کە

دەبێ جێبەجێ بکرێتو ڕێکبخرێت لەسەر بنەمای بازاڕی کار لە کۆمەڵگەی مسوڵماندا.

ئافرەت لە ڕۆڵی دایکایەتییدا، پێویستیی بەچاودێری مادديی هەیە، تا بتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ لە خزمەتکردنی خێزانو شەونخونی بۆ ئیسراحەتی خێزان، هەروەها پێویستی بە چاودێریکردنی مەعنەویی هەیە بۆ پارێزگاریکردن لەسەر جەوهەری دایکایەتییەکەی، ئەویش بە پاراستنی پاکییەتیو ڕێزدارییەکەی.

ئەم دوولایەنە لە ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مسوڵماندا، دەبێ بێنەدی لەڕێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو لەڕێکخستنی بازاڕی کار، هەروەها لە دامەزراندنی مەرجەکانی ئیشپێکردنو وێنەی ڕێکخستنەکەیدا.

لە بواری کارکردندا لە کۆمەڵگەی مسوڵماندا، ئەوا بواری زۆر هەیە کە دەبێ ئافرەت لەو بوارانەدا کار بکات، لە چاکترین نمونەکانی، وەك بواری فێرکردن لە قۆناغی باخچەی ساوایان، لە قۆناغی فێرکردنی سەرەتایی، چونکە ئافرەت بە سروشت بەتواناترە لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ مناڵ، ئەم جۆرە کارەش پەیوەندیی نییە بە خەریك بوونەکانی لە دەرەوەی سەعاتەکانی دەوامی کارکردن.

لەبەرئەوە، زۆر لە ئافرەتان حەز دەکەن —بە ئارەزووی خۆیان— لە کاری نیوە دەوام، بە نیوە بەرپرسیارییەتی فەرمانبەرێتی، یان وانە وتنەوەیی بەنیوە مووچە، ئەوا سازکردنی نەرمێتی هەڵبژاردن بۆ سەعاتەکانی دەوامی کارکردن بە شێوەیەکی گشتی، بە تایبەتی بواری وانە وتنەوەی گشتیی، بەوەی کە گونجاو بێت لەگەڵ ڕۆڵی دایکایەتیدا، ئەوا یارمەتیان دەدەن لەسەر خەریکبوون بەکارکردنو بەدیهێنانی خود، پێشکەشکردنی خزمەتی چاکتر لە کارکردنو لە ماڵەوە، سازکردنی دەرفەتی کاری گەورە بۆ خەڵکانی تر، لەگەڵ بەشداری کردن —لە هەمان کاتدا— لە ناخۆشییەکانی خێزانو ژیانی خێزاندا، ئافرەتی زۆر هەیە لەکۆمەڵگەکاندا، کە پێویستی زۆریان بەماددە نییە، ئەمەش وا دەخوازێ کە دەست بگرین بەم جۆرە ڕژێمەوە، لەبەرئەوە ڕوون نییە، بۆچی دەستناگیرێ بەمجۆرە ڕژێمەوە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەوەش ڕژێمێکی هەڵبژاردەیە بەسەر کەسدا ناسەپێنرێت، زۆر لە ئافرەتانیش داوای دەکەن لە وڵاتاندا، کە

بارودۆخێکی ئابوریی گونجاوی هەیە، ئەوەش لە هەمانکاتدا ڕژێمێکە بۆ ئەم کۆمەڵگانە توانای بەرهەمهێنان‌و جۆرێ باشتر بەدیدەهێنێ، دەکرێت بە بێ توانای بەرهەمهێنان‌و جۆری باشتر بەدیبهێنێ، دەکرێت بە بێ ناڕەحەتیی ڕێکبخرێت، چونکە کاری قوتابخانەیی لە شێوەی خشتەی ڕۆژانەداو بۆ هەموو ماددەیەك دابەش دەکرێت بەسەر مامۆستایانی پیاوو ژندا، زۆر کار هەیە، کە دابەشکردن وەردەگرێت‌و نۆرەی تیا دەکرێت لەلایەن کارمەندەکانەوە، بەتوانایەکی گەورەترو بێ هیچ ڕێگرییەك کە هەبێ.

لە ڕوانگەی سروشتی ئافرەت‌و ڕۆڵی کۆمەڵایەتییەوە، کاتێ ئافرەت دەگاتە تەمەنی بیستساڵ، ئەوە بەکالۆریۆس یان دبلۆمی تەواوکردووە، یان نزیکە لەوەی، کە تەواوی بکات، ئافرەتیش لەم تەمەنەدا زیاتر ئامادەیی هەیە کە ڕۆڵی دایکایەتیی ببینێ، توانای زیاتری هەیە —لە لایەنی بۆماوەیی‌و وزەی جەستەیی‌و دەروونییەوە— لەسەر منداڵبوون‌و بەشێوەیەکی تەندروست، توانای هەیە لەسەر پەروەردەکردن‌و چاودێریی کردنی منداڵ لە ڕووی دەروونیی‌و جەستەییەوە.

لەبەرئەوە، زۆر گرنگە دەرفەتی کاری نەرم‌و گونجاو سازبکرێت بۆ خەریکبوونی ئافرەت بەدایکایەتییەوە لەم قۆناغەدا، کە تا تەمەنی چل ساڵی درێژ دەبێتەوە، کاتێ. کە بچوکترین منداڵی دەتوانێ پشت بە خۆی ببەستێ، ئیتر ئەو کاتە شلۆقانەی بڕیوە لەڕووی لاشەیی‌و دەروونییەوە، کە تیایدا منداڵ پێویستی بە چاودێری بەردەوام‌و ماندووکەر هەیە، کە دایك —لە باری خێزانی سەرکەوتوو— بەڕۆڵی خۆی هەڵدەستێ لە شەونخونی لەسەر سازکردنی ئیسراحەت‌و چاودێریی‌و ئاراستەکردن‌و شوێنکەوتن‌و بەدواداچوون.

بەڵکو بە شێوەیەکی بنەڕەتیی، دەبێ لە کۆمەڵگەی مسوڵماندا تەمەنی چوونە ناوەوەی ئافرەت بۆ کارکردن‌و بازاڕی کار چل ساڵیی بێت، پاش ئەوەی، کە ڕۆڵی دایکایەتیی تەواوکردووە، شارەزایی کرداری بەدەستهێناوە لەبەڕێوەبردن‌و پەروەردەو ڕۆشنبیریی‌و پێگەیشتندا، لە پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکاندا، کە دەیبینین لە ئافرەتی دایکدا ئەوانەی، کە ئەرکی دایکایەتیان بەجێهێناوەو جێپەنجەیان دیارە لەسەر دڵی ڕۆڵەکانیان‌و لەسەر دەرفەتەکانی سەرکەوتنیان لە ژیانی کردارییدا، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە

دەستخۆشیان لێبکرێت، لەم تەمەنەدا لە مەیدانی کاردا، پێشتریان بدرێتێ، ڕێزیان لێبگیرێ، بەڵکو دایکایەتییەکەیان بە خزمەت بۆ دابنرێ، هەردوو یان سێ ساڵ دایکایەتیی بە ساڵێك خزمەتی کار دابنرێت، بە گوێرەی خزمەتو شارەزایی لە تەرازووی دامەزراندندا، بەتایبەتی کە ئافرەت —بە شارەزاییەکەی لە لایەکەوەو بە سروشتی گۆڕانە بیۆلۆجییەکانی کە لە تەمەنی چلوپێنج ساڵییدا پێیدەگات، بەهۆی دابڕانی خولی مانگانەی کۆتایی هاتنی توانای لەسەر منداڵبوون —زیاتر پتەوترو چاکتر دەبێ بەهۆی گەڕانە دواوەی هۆڕمۆنەکانی مێینە تیادا، بە پێچەوانەی ئەوەی، کە لە پیاودا ڕوودەدات لەم تەمەنەدا، کە تیایدا حەزی لە نەرمییو ئیسراحەتو نەرمیی سۆزە، لەبەرئەوە وا گونجاوە، کە مافی خانەنشینی بدرێتە ئافرەت لە تەمەنی شەستو پێنج یان حەفتا ساڵیی، ئەوەش نهێنی نییە، کە ئافرەت تەمەنی درێژترە لە پیاوو بنیاتی پتەوترە لەم تەمەنە کۆتاییەدا.

ئێمە لەبەر ڕۆشنایی شوێنکەوتنی خۆرئاوا، کە بازرگانیی بە ئافرەتو مێینەییەکەیەوە دەکات، ڕۆڵی دایکایەتیەکەی کەم دەکاتەوە، هەوڵ دەدەین ماندووی بکەین لە تەمەنی لاویدا، پەکیبخەین لە دایکایەتیی لە سەرەتای لاوییەوە، لە بەهاری تەمەنییەوە، لەگەڵ کردنەوەی گوڵەکەیدا، پاشان دەرگای لە بەردەم دابخەین، کاتێ پێیدەگاتو دەستی بەتاڵ دەبێت لە دایکایەتی.

لە لایەکی ترەوە، ڕێکخستنی بازاڕی کار —کە تیایدا کەرتی کاری ئافرەتان سەربەخۆیی خۆی هەبێ لەکەرتی کاری پیاوان— کارێکە دەکرێت لەسەر شێوەیەکی سەربەخۆ کەرتە هەمەچەشنەکانی تری کار، ئەمەش لە ناوەرۆکدا کرداری ڕێکخستنیی پێکهاتەی دەروونیو بەهای مرۆڤ و کۆمەڵگەی مسوڵمان یارمەتیدەدات، چونکە گرنگ ئەوەیە ئافرەت سەرشۆڕنەبێ لە بازاڕی کاردا بۆ دەسەڵاتی پیاوی بیانی بە ڕاستەوخۆ، بەشێوەیەك کە ڕێگە نەدات بۆ گەشەی پەیوەندی کەسایەتی تایبەتی گەرموگوڕ لە لایەكو لە لایەکی ترەوە ڕێگەنەدات بەئارەزووەکانی کارو ماددە تابخرێتە ژێربار بە ئامانجی کارلێکردن یان پەستان خستنەسەر ئافرەت، چونکە ئێمە ئەگەر وردبینەوە لەپەیوەندییەکانی دەسەڵاتی سەرۆکایەتییو ژێردەستایەتی —هەتاکو لە نێوان پیاوانیشدا— دەمانترسێنێ، کە

چەند کاریگەریی هەیەو بە زۆر پاڵ بە پیاوەوە دەنێ بۆ ملشۆڕیی و دووڕوویی و سەرپێچی کردن بە مەبەستی ڕازیی کردنی سەرۆکەکان، بۆ خۆدوورخستنەوەو دووربوون لە تووڕەیی و دەسەڵاتیان، داواکردنی سوودیان لە مەڵبەندەکان و پلەوپایەو بەرزبوونەوەدا.

سروشتی لاوازیی مرۆڤو درێژیی هاوڕێیەتی کردن لە نێوان پیاو، کە سەرۆك بێتو ئافرەت، کە ژێردەستەبێ، شارەزابوون لە خاڵەکانی هێزو لاوازیی لەنێوانیاندا، ئەوەی دێتە ڕێگای ژیانی تاك لەناخۆشیو پەیوەندییە خێزانییەکان لەماندووبوون، لەوەی کە لە دەستی سەرۆکدایە لە دەسەڵاتی چاكو خراپ، هەموو ئەمانە وا دەکات، کە ناموسی ئافرەت گرنگترین شتبێت، سەرۆك حەزی لێبکات، لە کاتی لاوازیدا، ئەمە سووکترین شتە، کە ئافرەت ژێردەستەیە، بیخاتە بەردەستی گەورەکەی، کە پیاوە سەرۆکەکەیە.

ئەوەی ئەمڕۆ ژیان دەیخاتەڕوو لە خۆرئاوادا لە هەڵسوکەوتی ناشیرینو سێکسیی، دەبێ ترسێنەر بێت بۆ ئێمە، بە تایبەتی، کە شەریعەتو بەهاو تایبەتمەندییەکانی ئافرەتو ئەو ئاسەوارانەی، کە لێی دەکەوێتەوە لە قەوارەی ئێمەدا -لەگەڵ ئەوەی کەلای ئەوان زۆر خراپە- گەورەترو ناشیرینترە لە ڕووی کاریگەرییەوە تالای ئەوان.

ئەرکی سەرشانمانە، گرنگی بدەین بە نەخشەدانانی کۆمەڵایەتیی، هەروەکو چۆن گرنگی دەدەین بە نەخشەدانانی ئابووریی تاکۆتاییمان پێنەیەت، پێش ئەوەی دەست پێبکەین، چونکە چاکی نەخشەدانانی کۆمەڵایەتیی و کاریگەرییەکەی -هەتا لەلایەنی ماددییەوە- کارێکی ئاسان نییەو بەس، بەڵکو قازانجی ئابووریشی دەبێت، لە زۆر باردا دەبێتە هۆی چاك بەکارهێنانی دەرامەتەکان و بەدیهاتنی توانای بەرهەمهێنان.

ئەرکی سەرشانمانە، کار بکەین بە هەموو تواناوان بۆ پاراستنی خێزانو ئافرەت، بەدیهێنانی توانا لە کارو بەرهەمهێناندا، بە شێوازو ڕێکخستنی بنەمایی، کە بە هۆیەوە مەبەستو ئامانجەکان بەدیبێتو وامان لێبکات دەرچینو یارمەتیدەرمان بێت لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی کۆسپو ئاستەنگەکان.

لەسەرمانە کار بکەین لە پێناوی داهێنانی تەواوکاری لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا، لەسەرمانە چاودێریی ڕۆڵەکانمان بکەینو ڕێزی ئافرەتانمان

بپارێزینو بازاڕی کار ڕێکبخەین، تا سوود وەربگرین لە تواناکانی ئافرەت، بێ بەفیڕۆدانی ئەرکەکەی، کە دایکایەتییە، ئەوە بەڕێکخستنێك، کە گونجاو بێت لەگەڵ شەریعەتو تایبەتمەندییەکانماندا، بەباشترین هۆکاری بەردەست، بەگەورەترین ئەندازە لەتوانایی، بەکەمترین ئەندازە لەزیان.

## پێشەنگی ڕێ لە (سیناء)ی چەرخدا

### ڕۆڵی خێزان

لە پێشەوە بۆمان ڕوونبووەوە، کە منداڵو گرنگیدان بە پەروەردەکردنیو پێشخستنی پرۆگرامەکانی ئەم پەروەردەکردنەو پوختەکردنی ڕۆشنبیریو چەمکەکانی، کە شیرەکەی لە تەمەنی منداڵییدا پێدەدرێ لە بیری گرنگیپێدانی زانستییو پێشکەوتنی کرداری خەڵکە ژیرو خاوەن زانستو بڕیاردانەبوو لەجیهانی ئیسلامیدا، بەڵکو لەوانەیە نزیکتر بوو لە کاریگەری —بە هۆشیاریو ناهۆشیاری— هەڵسوکەوتو بۆماوەی ڕەگداکوتانو لەناخی گەشەکردنو بۆچوونەکاندا، لەبەرئەوە وزەی ویژدانیی لەم ئوممەتەدا کوژێنرایەوەو شێوێنرا، بوو بە لاشەیەکی بێگیان، کە پێویستی بە چارەسەرو بووژانەوە بوو، ئەوەش بە خستنەکاری ڕۆڵی ئافرەتو خێزان، گەڕانەوەی ماڵو گەشەکردنی پەروەردەیی، بەو سیفەتەی هۆکاری بنەڕەتیە لە نەخشەکانی گۆڕانو چاکسازییدا.

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە، چۆن ئوممەت دەتوانێ ئەم مەبەستە بەدیبهێنێ، منداڵ "لایەنی نادیار" بگەڕێنێتەوە؟ چۆن ئوممەت دەتوانێ جەنگی پەروەردەیی منداڵو گەشە ئیسلامییەکەی بباتەوە؟ لەکاتێکدا ئوممەتێکە گرفتاری تێکچوونو بۆماوە ڕۆشنبیرییەکانە، لە ڕووەکەشی ڕۆشنبیریی تایبەتیو تاکیەتیو نامۆیەتی لە کاتو شوێندا، لەگەڵ کەموکورتی ڕۆشنبیری گشتیو تێکشکانی، ئەوەش لە هەمانکاتدا گرفتاری هێرشی جەنگی فیکری بیانیو ڕاگەیاندنی جیهانیی بووە، لە سەرسوڕمانی هەڵبژاردەی ڕامیارییو شارستانییەتی بەتواناکانی شارستانییەتی تەکنەلۆجی خۆرئاواوە ڕازاوە ماددییو ئاوەدانییەکەی، لە بارێکی وادا، کە وای لێدەکات ملشۆڕ بکات بۆ

ڕامیارییەکانو مەبەستە داگیرکارییەکانو هۆکارە داپڵۆسێنەرەکەی، کە ئەو پێشکەوتنە شارستانییەو نەفامیی مسوڵمانان، خراپەی ڕامیاریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و جیابوونەوەیان لە هەستەکانی گەلانو ئوممەت بەکاردەهێنرێ تاوەکو ئوممەت بە نەفامی بمێنێتەوە، دواکەوتوو بێت، لاواز بێ لەڕووی دەروونیی‌و زانستییەوە.

وەڵام دەربارەی پرسیاری پێشوو —لە هۆکارو شێواز— کە بە هۆیەوە لەوانەیە گۆڕان بەدیبێت بەبردنەوەی جەنگی منالّ، لە ڕووی مەبەستو هۆکارەوە بۆ چاکسازیی‌و گۆڕانکاریی— لە تێگەیشتنی ڕۆڵی خێزانو پەروەردەکردنی منالّی مسوڵمانو دروستبوونی ویژدانو داڕشتنەوەی ویژدانو پێکهێنانی بنیاتی دەروونی منداڵدا خۆی حەشارداوە.

## رژێمەکان و دەزگاکان: رۆڵی پاشکۆیەتیی

ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەیە کە کەرتی چاکسازیی ئیسلامی لەئوممەتدا دەربڕی ناخو ویژدانیەتی، بەدەستەوەیە —لە ڕاستیدا— کلیلی بزوێنەرەکانو وزەی پێیە، توانای هەیە لەسەر وتاردان بۆ گیانی ئوممەت، پێشکەشکردنی پڕۆژەیەکی سەرکەوتوو بۆ چاکسازیی، گێڕانەوەی بنیاتنان، گێڕانەوەی پەیوەندیکردن بە سەردەمی پەیامی ئیسلامیی، لەگەڵ تێڕوانینە بوونەوەرییە فراوانەکەو گیانی خەباتی چاکسازیدا، ئەم کەرتە ناتوانێ بە شێوەیەکی لێبڕاوانە پشتببەستێ بە ڕژێمەکانو هەڵبژاردەکانی ڕامیاریی بۆ چاکسازیی پەروەردەو فێرکردن، بە گوێرەی تێڕوانینی ئیسلامیی، چونکە بەرژەوەندیی ڕژێمەکان —بە کاریگەری سروشتو هێزەکاریگەرەکان تیادا— بریتییە لەمانەوە لەسەر ئەو بارە وەستاوە، کە تیادا هەموو بەرژەوەندیی‌و شتە چاکەکان لە دەستیاندایە، سووربوون لەسەر داواکردنی مانەوەی ئەوە، بەڕاکێشانی ڕازییکردنی هێزە جیهانییە گەورەکان، کە دەسەڵاتیان بەسەریدا سەپاندووە، نابێ بەرژەوەندییانو ڕژێمیانو سامانە کەڵەکەبووەکانیان بکەوێتە ترسەوە، بەمەش هەموو ڕژێمەکان شوێنکەوتەو وەڵامدەرەوەی ئوممەت دەبێ، ئەوە بنەما نییە لە دەستپێشخەریی لەم چەشنە پڕۆژەدا، ئەمەش مانای وانییە، کە وتاری ڕژێمەکانو سەرکردەکانیان پشتگوێ

بخرێ، هەوڵ نەدرێو ئامۆژگارییان نەکرێو قایل نەکرێن، هاوکارییان لەگەڵدا نەکرێ لە سنووری تواناداا، کۆشش نەکرێ بۆ کەمکردنەوەی بەرەنگاربوونەوەیانو دوژمنایەتیان بۆ هەوڵە بەخشراوەکان لەرێگای چاکسازیدا.

هەمان قسەش دەربارەی ڕاگەیاندنو بازنەکانی ڕاگەیاندن دەوترێ، جۆری رۆشنبیریی‌و بەرژەوەندییەکان، کە زاڵە بەسەر ڕاگەیاندنو دەزگاکانداو بەڕێوەی دەبا –بەسروشتی خۆی– وای لێدەکات حەماسی دادەنێتو هیچ ئارەزووەیەکی نابێت بۆ پرۆژەی پەروەردەی ئیسلامیی‌و بەدیهێنانی ئامانجەکانی، ڕووبەرێکی فراوان بۆ بیریارو ڕۆشنبیرە دڵسۆزەکان هەیە، تا سوود وەربگرن لە چەسپاندنی هەوڵەکانی چاکسازی ئیسلامیی شارستانی لە ئوممەتدا، سوود وەربگرن لەهۆکارەکانی ڕاگەیاندنو پەیوەندیە ئەلیکترۆنییەکان، کە بواری فراوان دەبەخشێ بە تاكو ڕێکخراوەکانو توانای پەیوەندیی ئازادییان دەبێت بەجەماوەرەوە، بەوەش هەموو جۆرەکانی سنوورو بەربەستەکان تەخت ئەبێت.

ئەگەر لەتوانا نەبوو ڕژێمەکان بەشێوەیەکی کاریگەر –لە سێبەری بارودۆخێ کە دەسەڵاتی هەیە بەسەریدا– بخرێنە کار لە پێناوی بەگەڕخستنی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامی، جگە لەوەی کە بانگخوازانی چاکسازی پەروەدەیی کە لە ئوممەتدا بەدیناکەن "سیناء" دروست پەروەدە بکرێن، بەو جۆرەی، کە ئومێدو ئاواتی بۆ دەخوازن، هەروەکو چۆن موسا (علیه السلام)و هارونی برای (علیه السلام) لە (سیناء)ی دوورگەی عەرەب لەپێشدا کردیان، چونکە ئەو کاتە –لەدونیا بەجیهانیبوونو پەیوەندی ئاسمانو ئەلیکترۆنیو ڕۆکێت– شوێنێك نەبوو بۆ پاراستنی ڕۆشنبیریی‌و گومرگی چونکە –لەم بارەدا– دەبوایە پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی ڕووبەڕووی واقیع ببێتەوە –بە هەموو شتێ، کە بەرامبەر هەیەتی لە سەرکەوتوویی ماددیو توانای هێرشی ڕۆشنبیری خۆرئاوا– ڕووبەڕوو، جۆر بە جۆر، توانا بە توانا، ڕۆشنبیریو شارستانییەت بە ڕۆشنبیریی‌و شارستانییەت، دەبوایە گۆڕان لەسەر زەویدا ڕووی بدایە، لە کۆمەڵگەدا، لەژێر چاودێریی ڕژێمەکاندا، دوژمنایەتیکردنی هێزەکانی بەخۆرئاواکردنو لاساییکردنەوەی ڕۆشنبیریی‌و فیکریی وەك یەك.

ئەو چارەسەرەی، کە لەم بارودۆخەدا دێتەدی، دەبێ پشت بە پاڵنەرێکی خودی کاریگەرەوە بدات، ئەو پاڵنەرەش لە خودی خۆیدا دەبێ کلیلی خستنەگەڕی ئامێرەکان بێت، واتە ئامێری، بوونیەتی لە مرۆڤدا شتێکی فیترییە، ئەم پاڵنەرە فیترییە تاکە پاڵنەرە، کەوا لەمرۆڤی مسوڵمان دەکات حەزی لە بەجێهێنانی بێتو بە توانا بێتو (سینا)ی خۆی هەڵبگرێ، بێ گوێدانە بارودۆخی ماددیو کۆمەڵایەتیی، خۆی پێدروستبکاتەوە، پەروەردەی بەرەکانی بگێڕێتەوە پێی، دەروونیان پێکبهێنێتەوە، وزەو توانای شارستانیی چاکسازیی ئیسلامیی ببەخشێ، کە ئوممەتەکەی پێیهەڵدەسێتەوە، نموونەی خۆیان بخەنەڕوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکانو چاکسازییەکەی ئوممەتو شارستانییەتی مرۆڤایەتیی هاوچەرخ، دەی ئەو پاڵنەرە فیترییە چییە؟ کامەیە کلیلی خستنەگەڕی گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگەدا؟

## پاڵنەری فیترەتی باوکایەتیی کلیلی خستنەگەڕی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییە

کۆتی ڕزگارکردنو (سیناء)ی چەرخی بەجیهانیی بوون، پاڵنەری خودی مسوڵمان، کلیلی خستنەگەڕ لەپێناوی گۆڕانکاری ئیجابی لەئوممەتدا، دەبێ لەدەروونی مسوڵمانەوە هەڵبقوڵێ، پشت بە کەس نەبەستێ بە خوا نەبێ، پاشان بە خۆی بە بێ فرمانو مۆڵەتی هەڵبژاردەی ویستو لێزەوتکراو، نە لە بەرژەوەندییە دژبەیەکەکان: ئەم کۆتە، ئەم کلیلە، ئەم (سینا)یە، ئەمە لە خێزاندا دەردەکەوێت، کە دایەنگەی گیانی منداڵو ویژدانییەتی، کارگەی بنیاتی دەروونییەتی، کە لەسەر کۆڵەکەی پاڵنەری خودی فیتریی بنیات دەنرێ، پاڵنەری (باوکایەتیی) کە هەمیشە ئامانجی بەرژەوەندیی منداڵەکەیەتی بە تەنها، لەسەر بنەڕەتی چەمکی ڕوونی باوکان، قایلبوونیان بەوەی، کە بەرژەوەندیی ڕۆڵەو جگەرگۆشەکانیان بەدیدەهێنێت.

پاڵنەری فیتریی باوك، کە بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانی تیایە، تاکە کلیلە، کە لەم چەرخەدا مابێتەوە، دەکرێ ببێت بە سەرچاوەی چاکسازیی ڕۆشنبیریی‌و

پەروەردەی ئیسلامیی، کارەکەش لەو کاتەدا، پشت دەبەستێ بە بیریارو پەروەردەکارو چاکسازی مسوڵمان لەخودی خۆیدا بەهەوڵێ، تا هەستێ بە ئەرکی خۆی لە ناردنی یارمەتی بۆ باوکان بە ڕۆشنبیریو وێژەیی پەروەردەیی زانستی ئیسلامیی دروست، بۆ بەدەستهێنانی قایلکردنی ئەو باوكو دایکانە بەوەی کە بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانیانی تیایە، چۆنییەتی دانانی بنیاتی دەروونیو ویژدانی لەسەر بنەمای ئیسلامیی دروست، کە بەختەوەریی هەردوو دونیای بۆ سازبکات، لە ڕووی باوەڕو تواناو ڕێزدارییەوە، لەبەرئەوە برِیارو پەروەردەکاری مسوڵمان لە مەڵبەندی سەرکردایەتییدایە، دەتوانێ کلیلی ئیشپێکردن بجولێنێو چاکسازیی کۆمەڵگە بکات، ئەگەر بە ڕۆڵی خۆی هەڵسێ، لەبەرهەمهێنانی پاڵنەریەتی پێویست بۆ دەستپێکردنی جولەی خستنەگەڕی ئەم ئامێرەو بزواندنی.

لە توانای قوتابخانەدا هەیە —ئەگەر بیەوێ ڕۆڵێکی گرنگ ببینێو چالاك بێ لە خزمەتکردنی ئوممەتو پێشکەوتنی جۆری بەرەو تواناکانیان— کە پرۆگرامی پەروەردەیی بخاتە بەردەستی باوکانو ئامادەیان بکات بۆ گەیاندنی ڕۆڵی خۆیان بەو برە پێشکەوتنەی، کە بارودۆخی کۆمەڵگە لە ڕووی کۆمەلأیەتییو شارستانییەوە ڕێی پێدەدات، وا بکات بە ڕۆشنبیرکردنی باوکانو هۆشیارکردنەوەو پێدانی چەمكو توانای پێویست، ببێتە بەشێکی بەشبەشنەکراو لە پرۆگرامەکانی کاری قوتابخانەو ڕۆڵی لە کۆمەڵگەدا.

خوێندنی باڵا دەتوانێ بەشداربێت لەم کارەدا لە ڕووی پرۆگرامەکانی خوێندنی بەزۆر بۆ لاوان، ئامادەیان دەکات بۆ دروستکردنی خێزانی ئیسلامیی سەرکەوتوو، هەستان بە ڕۆڵی خۆیان لە پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیانو ئاڕاستەکردنیان ڕووەو ئیسلامیی شارستانیی کاریگەریی دروست.

قوتابخانەو زانکۆ تایبەتییە ئیسلامییەکان بریتین لە —لە کەمترین شێوەدا— دەزگا بەتواناکان لەسەر بەشدارییکردن لە هەستان بەم ئەرکە، کۆسپەکانیش نامێنێ، کە ڕێگرە لە بەردەم توانا لەسەر وێنەکردنی پرۆگرامە تەواوکارییەکان، کە دەبێت وا بکات گرنگییەتی کاری ئامادەکردنی باوکان، کە بزانن چاك ڕۆڵەکانیان پەروەردەبکەن بۆ خزمەتی داهاتووی ئەم ئوممەتەو بەرزکردنەوەی

جۆرەکەی، بە تایبەتی باوکی منالآن لەم قوتابخانەدا ڕۆشنبیرنو بەتوانان لەسەر هەستان بەم ئەرکەی سەرشانیان، ئەگەر بزانن چاك ئاڕاستەی پەروەردەییان بکەن لە تێڕوانینی زانستی ئیسلامیی لە شێوەی خوێندنو کۆڕو وەرشەی کاردا، ئامادەکردنی باوکانو کاریگەرییان لەگەڵیدا، مەرجێك بێت لە مەرجەکانی وەرگرتنی قوتابی لە قوتابخانە تایبەتییەکاندا لە خزمەتی قوتابیانو ئوممەتی ئیسلامدا.

## رۆڵی پەروەردەیی و ویژدانیی دایك و باوك

چالاکبوونی هەموو لایەنەکان لە پەروەردەکردنی منالّو هەرزەکاردا، لەقوتابخانەو ڕاگەیاندنو کۆمەڵگە، هەمووی پاڵدەدات بەهەڵوێستی دایكو باوکەوە، دایكو باوك هەردووکیان، هەموو هێزێ دەبەخشن بە دەزگا کۆمەلآیەتییەکان، تا بتوانن بگەنە منالّ، کاریان لێبکەن، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو هێزانە شەرعییەتی پێویستیان هەیە لە ویژدانی منالّدا، بەچاکە یان خراپە، لە ڕێی هەستان بەو ڕۆڵەی، کە پێی دراوە بۆ سەرپەرشتیاریکردنی پەروەردەیی چاك بۆ منالّ، هەروەها ئامادەکردنی ڕۆڵەکانی بۆ ئەو ڕووەی کە دەیانەوێت، یان خراپییەتیو وازهێنان لە لایەنە پەروەردەییەکەیان، بەدەستەوەدانی ڕشۆی ڕۆڵەکانیان بۆ ئەم دەزگایانە بەبێ چاودێر، تا ئاڕاستەیان بکاتو بە گوێرەی ئەو نەخشانەی کە دانراوە بۆی بەشداریکردنی لە زۆربەی بارە نەخۆشییە کۆمەلآیەتییەکاندا دایانڕێژێت، بەهێزکردنی شوێنکەوتنی فیکریی، پەککەوتەیی تەکنیکیی، ترساندنو زاڵبوونی دەروونییو زەوتکردنی ڕۆشنبیرییو ویژدانیی.

خێزان، هێزو کاریگەرییو شەرعییەتی بەدەستە، کە جۆری کاریگەرییەکە دیاریی دەکات دەبێ ئەو دەزگایانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات، لەگەڵ هێزەکانی تری کۆمەڵگە لەسەر منالّ، لەسەر بنیاتی دەروونیی منالّو ویژدانی، لەسەر توانا زانستییەکانی، خێزان وەك چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگە لە چاوی منالّدا، بەو ڕەنگە بۆیە دەکرێت کە لە دەوری منالّدایە لە بوونو ژینگە، لە ڕاستیدا، گرنگ ئەوەنییە کە منالّ چی دەبینێتو چی دەبیستێ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە منالّ چۆنو چی تێدەگات؟ چۆن ئەو شتەی، کە دەیبیستێ، یان دەیبینێ، لێی

تێبگات؟ لەبەرئەوە منالآن لە زۆر ڕووەوە —لەودیو توانا سروشتییەکانەوە— لەیەکتر جیاوازن‌و جۆری کانزاو ڕەفتاریان، لەکاتێکدا لە یەك قوتابخانەدا دەخوێنن، هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ —لە پلەی یەکەمدا— کاریگەریی خێزان‌و ژینگەی ماڵ‌و جۆری هاوڕێکان— ئەوانەی کە پێویستە باوکان بەشدارییبکات لە هەڵبژاردنیاندا —لەسەر بنیاتی دەروونی منداڵ‌و وزەو ئاڕاستەکان‌و ویژدانی.

## کەموکورتیی پەروەردە و فێرکردن لە ئوممەتدا

ئەگەر گرنگی منالیەتی‌و پەروەردەکردنمان زانی لە ڕوودانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی زانستی‌و ویژدانی یەکەم شتێ کە بە ئەندێشەدا دێت‌و گرنگیپێدان ڕووی لێدەکات، بریتییە لە قوتابخانەو فێرکردن، لە کاریگەرییدا ڕاگەیاندن بە پلەی دووەم دێت، کەچی خێزان پلەی کۆتایی هەیە، ڕۆڵی خێزان خەریکە تەنها بریتی بێت لە خۆراك پێدان‌و ئامادەکردنی پێویستی‌و داوا ماددییەکانی منالٚ لە خانوو خواردن‌و پۆشاك.

ئەگەر گرنگیدان بە قوتابخانەو فێرکردن بکەین بە پێوەر —لەگەلٚ ئەوەی کە جۆرو بڕو ڕێژەکەی کەمە لە ولآتانی جیهانی ئیسلامییدا— لەگەلٚ ئەو بڕەی، کەسەرف دەکرێ بۆ ڕاگەیاندن، بە بەراوردکردنی ئەوەی، کە بۆ خێزان سەرف دەکرێ لە ڕووی پەروەردەیی‌و بەرزکردنەوەی ڕۆڵی خێزان‌و ڕۆشنبیرکردن‌و ڕێنماییکردن‌و پێدانی چەمکی پێویست‌و هۆکارەکانی گەیاندنی پەروەردەیی چاك، دەبینین ئەو بڕە ئەوەندە کەمە کە هەر باس ناکرێ، جگە لەهەندێ فەرموودەی دانراوو ئامۆژگاریی، دەربارەی گرنگی ڕۆڵی دایك‌و باوك، بەو سیفەتەی سەرمەشقن بۆ منالٚ‌و تازەپێگەیشتووەکان، کارەکە لەم سنوورەدا کۆتایی دێت، ئیتر باوکان هێزیان نییە کە کانزا بگۆڕن، نازانن چۆن وابن —بە شێوازە زانستییەکە— کانزای ڕۆڵەکانیان چاك بکەنەوە، داڕشتنەوەی لەسەر شێوەکەیان نەبێ، لەگەلٚ ئەوەی، کە لەڕووی فیترییەوە سوورن، لەسەر کارکردن بە هەموو توانایان بۆ بەرژەوەندی ڕۆڵەکانیان‌و بەرزکردنەوەی جۆریان، ئەوەی جێیداخە ئەوەیە، ئێمە دەبینین باری بیروبۆچوونیان بۆ داهاتووی ڕۆڵەکانیان لەبەر ڕۆشنیایی ڕۆشنبیری‌و شارەزاییان‌و ئەزموونی ئێستایان، کە کاریگەرە بە

ئاڕاسته ماددییه تاكییه بەكاربەریه ڕووتەكەی ڕۆشنبیری خۆرائاوا بەسروشتی تایبەتمەندییەكان، ئەو قۆناغەی كە پیا تێدەپەڕیٚو پێویستییەكانی، مەبەستو بۆچوونەكان، كە دەسەڵاتی بەسەریدا هەیە، ئەم بارەش لای ئێمە، لەسەر شێوەی خۆرئاوایە، سەرباری نەخۆشیی چەرخەكانی دواكەوتوویی ڕۆشنبیریمان، لای باوكان هیچ نییە، جگە لەزیاتر لەحەزی خۆخۆییو سووربوون لەسەر پارووی ژیانو بەكارهێنانو كۆكردنەوەی سامانو ئەوەی دەرفەت بۆی ڕەخساندووەو باری باش كردووە، بەڵام كۆمەڵگە، برایەتیی ئیسلامییو مرۆڤایەتیی، ڕژێمی گشتی، بەرژەوەندیی گشتی، هاوكاریی كۆمەڵایەتیی، ڕێزی مرۆڤایەتی، مافەكانی جێنشینایەتیی، كۆمەڵگەی یاساو بەهاكانو دادپەروەرییو چاكەو چێژی زانستو داهێنان، هەموو ئەمانە، بووە بە باسێكی ڕەوانبێژیو جوانی مانا وشك لەجیهانی دووڕوویی و ململانیٚو ستەمو زۆردارییو وێرانەو بە فیڕۆدانو سەركوتكردن.

هیچ نامۆ نییە، كاتیٚ دەبینین قوتابخانەو دەزگاكانی فێركردنو ڕاگەیاندن — نابێتە هۆی— لەجیهانی ئێمەدا جێی ئومێد نییە، لەدەركردنی بەرەی بەڕێز لەهاونیشتمانی بەهێزو دەستپاك، لەوانەی كە تواناو دەستپێشخەرییو گەیاندنی جوانكارانەیان هەیە لەسەر ئاستی چەرخو ئاستەنگەكانی.

ئەگەر تەماشای دەزگاكانی فێركردنی باڵاو بەشداریكردنەكانی بكەین، لە ئامادەكردنی ئامێرو شارەزایی پەروەردەیی دەبینین كە بەشدارییەكی هەژارو سنوورداره، كە تەنها دەركردنی چەند كەسێكە لە مامۆستایان، ئەوانیش بیٚ ئامێرو بیٚ بەرنامەو لێكۆڵینەوەو وزەی چالاكی پێویست بۆیان لە فێركردنەكەیانو ڕاهێنانەكەیاندا.

بەڵكو سووكیی پلەوپایەی مامۆستاو نزم بوونەوەی ئاستی بژێوییو خزمەتگوزارییە فێركارییەكان، كە لەبەردەستدایە (ئامێرەكان)، وادەكات لەسەركەوتووەكانی ئەم چینە، كە مامۆستایی نەكەنو ئەو پیشەیە هەڵنەبژێرن، هەروەها بە خراپیی كاریكردە سەر لایەنكاری ئەوانەی ئەو پیشەیە یان هەیە، كاریكردە سەر حەزیان لەجوانكاریی تیایدا.

بەمشێوەیە، دەبینین کۆمەڵگە لە کۆتاییدا –هەتا ئەمڕۆش– ڕۆڵی مناڵ نازانێ لە پەروەردەکردن‌و لە بەرزکردنەوەی کۆمەڵگەو ئاستەکەیدا، نازانێ چۆن وزەی شاراوەو ویژدان‌و زانستە داهێنانییەکەی برەو پێبدات، پڕۆژە چاکسازییە ئاوەدانییەکەی بەدیبهێنێ.

ئەگەر بەراوردی بکەین لەسەر بڕی وەبەرهێنراوی گەلانی زیندووی پێشکەوتوو لە دەرامەت لە بواری پەروەردەو فێرکردندا، بۆکۆی داهاتی نەتەوایەتیی ئەو کاتە دەبینین کە جیهانی ئیسلامیی لەم بوارەدا ئەو بڕە دەرامەتەی کە تەرخانی دەکات بۆ پەروەدەو فێرکردن، زۆر کەمە لەداهاتی نەتەوەیەتیدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خراپیی ئاڕاستەکردنی فێرکردن‌و نزمی چالاکییەکەی، کە ڕێزی مامۆستا دێتە خوارەوە، لایەنکاریی دەڕووخێ، گیانی بەخشین لەدەروونیدا دەمرێت، پاڵی پێوە دەنێت هەندێ هەڵسوکەوتی نەخۆش‌و ماندوانە بنوێنێ، تاوەکو ڕزگاری ببێت‌و هەندێ لە داهاتەکەی پێ تەواو بکات لە باوکی قوتابیان لە خۆشەویستی نواندن‌و وانەوتنەوەی تایبەتی، ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە دەرامەتە دانراوەکان بۆ بواری فێرکردن لەبەشەکانی ڕووە فەوتاوەکاندا سەرف دەکرێ، کە دەستی بەرزبوونەوەو پێشکەوتن ناناسێ.

ئەگەر تەماشای پڕۆگرامەکان‌و هۆکارە پەروەردەییەکان بکەین، مەودای نزمیی هۆشیاریی بە گرنگییەتی بنیاتی دەروونیی‌و ویژدانیی مناڵ، گونجاوی بۆ قۆناغەکان‌و ئاستەنگەکان، کە مناڵی پیا تێدەپەڕێ‌و ڕووبەڕووی ئوممەت دەبێتەوە، ئەوکاتە هۆی خراپی گەیاندنی پەروەردەیی دەزانین، خراپی هەڵسوکەوت‌و پڕۆگرامەکانی خوێندن، کە هەمووی لەسەرماندووکردن‌و ترساندن‌و لەبەرکردن وەستاوە، مناڵ بێبەش دەکات لەگەشەی ویژدانیی‌و زانستیی‌و جەستەیی، بێبەشی دەکات لە گەشەکردنی ئارەزووەکانی بە ئاستێ کە بۆی سازدەکرێ‌و ئەم چەرخە دەیخوازێ‌و لەگەڵ گیانی چەرخ‌و ئاستەنگەکاندا بێت.

ئەگەر تەماشای باوکان بکەین –بە پیاوو ژنەوە– بزانین بەشیان لە ڕۆشنبیریی‌و ڕۆشنبیرکردنی پەروەردەیی چەندە ئەوا ڕووبەڕووی نەخوێندەواریی پەروەردەیی دەبێتەوە، کە خەریکە نەخوێندەواریە پەروەدەییەکە ڕەهابێت، هەتا لە نێوان ڕۆشنبیرەکانیشدا بەهۆی کەمی ڕۆشنبیرییان، خراپی شارەزاییان

لە هەڵسوکەوتی پەروەردەیی، کە لەسەر گەشەیان کردووە لە خێزانو قوتابخانەدا، کە وەستاوە لەسەر دەسەڵاتییەتو ترساندنی دەروونییو لێدانی جەستەیی، ڕێگای بەدواداچوونو لەبەرکردن، کە ئەمەش هەموو هیوایەکی زانستییو ڕەخنەییو داهێنانی دەکوژێت، کە لە ناخی منداڵدا گرێدەگرێت بە فیترەت، ئەمە لەلایەکە، لە لایەکی ترەوە، بە هۆی کەمی وێژەکانی زانستی پەروەردەیی ئاڕاستەکراو بۆ باوکان، کە دابەش دەبێ لە نێوان لایەنی فیقهی یاسایی، لایەنی ئامۆژگارییکردنی لاساییکارانە، وەرگێڕانی بیانی، کە پەیوەندیی نییە بە بیروباوەڕو ڕۆشنبیرییو ژنگەیانەوە، هەڵناسێ بە لێکۆڵینەوەو وانە وتنەوەو گەڕان بە دوای شتی بنەماییدا، کە لێکۆڵینەوەی زانستی کرداریی لە کەسایەتی مسوڵماندا پێشکەش دەکاتو ڕۆشنبیری مسوڵمان پێشکەش دەکات، لێکۆڵینەوە لە ئاسەواری دابو نەریتو هەڵسوکەوتی پەروەردەییو فێرکاری لە ژینگەدا بکات، کاربکات لەسەر هۆشیارکردنەوەی باوکان بە ڕووەکانی کەموکورتی تیایاندا، ڕێنماییان بکات بۆ چەمكو هۆکارو هەڵسوکەوتی پەروەردەیی دروست، کە کەسایەتی مسوڵمانی لەسەر بنیات دەنرێ لەسەر بنەما ئیسلامییە جێگیرەکان، لەگەڵ پێدانی چەمکی چاکەو ژیریی زانستیو ویژدانی زیندوو، کە دەتوانێ جیاکاریی بکات، جوانکاریی بکات لە گەیاندندا، ڕووبەڕووی ئاستەنگەکانی چەرخو ڕۆژگار ببێتەوە[1].

---

[1] بۆ خۆم ڕووداوێکم دیوە کە ئەندازەی دواکەوتوویی‌و پاشکۆیی هزری ئیسلامیی، سەبارەت بە ڕۆڵی ئافرەتو دایك لە کۆمەڵسازییو هاوکاریی تەواوی کارەکانیدا نیشان دەدات، ئەم ڕووداوە نموونەیە لە زۆر حاڵەتی کورتهاتنی ئەم هزرەو پاشکۆبوونی وێنا دەکات، لەو حاڵەتانەدا کە ڕووبەڕووی گۆڕاوەکان دەبێتەوە، مەبەستیەتی ڕەهەندەکانو ڕێگای بەرەنگارییان و ئامادەکردنی مسوڵمان بۆیان بزانێت، لە هەردوو ئاستی کۆسپەکانو تواناکاندا.

لە منداڵییدا ڕۆژێك گوێم لە ڕادیۆ بوو، کە لەو کاتەدا شتێکی تازەو خۆش بوو، بەیانی ڕۆژ هەینی بوو، خوومان گرتبوو بە گوێگرتن لە دەستپێکی بەرنامەکانی بەیانی بە قورئانی پیرۆز، بۆ ئەوەی دواتر گوێ لە وتاری زانایەکی ناوداری مەککە بگرین، کە ناوبانگی بە قسەی جوانو وتاری خۆش دەرکردبوو، ئەو بەیانییە قسەی لەسەر فێرکردنی ئافرەت بوو، لە پڕ گوێم لە دایکم بوو خوا لێی

خۆش بێ گوتی: ئەوە دین گۆڕاوە؟ منیش وتم: بۆچی؟ وتی: مەگەر ئەوەی قسە دەکات فلان زانا نییە؟ گوتم: بەڵێ ئەوە، گوتی: هەر ئەو بوو کە زووتر فەتوای دابوو کە حەرامە کچان فێری نووسین بن، چونکە فێری نامەی عیشقو دڵداریی دەبن، تەنانەت دایکم خۆی بەو فتواو ئامۆژگارییە داویەتی لە پەنجەکانی کچە گەورەکەی کە فێری سەرەتاکانی نووسین بوو بوو لە مەکتەبخانەی ئەوکاتە، بۆ ئەوەی نەنووسێتو درێژە بە خوێندن نەدات، ئینجا گوتی: چۆن ئەمڕۆ ئامۆژگاریی بە خوێندنی کچان دەکاتو هانیان دەدات؟ بۆیە بە سەرسوڕمان و نکوڵیو داخەوە پرسی ئایا دین گۆڕاوە؟

نموونەی ئەم فەتوایانە و بارگەی حەڵاڵو حەرام کردنو تۆقاندن لە پیرۆزیی، بە بێ هۆشیاریی و تێگەیشتن لە گۆڕاوو کۆسپو توانستەکان. لە گرنگترین هۆکارەکانی دواکەوتنی هزری زۆر لە زاناو بانگبەرەکانن، کە ناتوانن هزرێکی دروستی مەنهەجیانە پێشکەش بکەنو لە ئاستی مەترسییەکاندا گفتوگۆ بەڕێوەببەن، تا سەرەنجام هزری ئیسلامیی پێشەنگ بێت و کاروان بەرەو راستیی ببات، نەك رایبکێشێت بەرەو وێرانە بە هۆی وەستانو تێنەگەیشتن لە گۆڕاوەکانەوە.

نموونەیەکی تر لە سەر نەتوانینی مەنهەجییانە لە بەکارخستنی گشتگەراییو شیتەڵکارییدا، بەخاتری تێگەیشتن لە گۆڕاوەکانو بەهێزبونی ئوممەت لە مامەڵە لەگەڵ مەترسییەکان، بریتییە لە بابەتی فۆتۆگراف، کە تاماوەیەکی زۆر موفتییەکان تا بە ئەمڕۆش سوور بوون لەسەر حەرامبوونی، کاتێکیش کەسێك ویستی پاساو بۆ فەتوای حەڵاڵبوونی بهێنێتەوە، پاساوێکی رواڵەتیی بێ ناوەڕۆکی هێنایەوە، کە یەك سەدە دواکەوتبوو، واتە تازە سوودی نەبوو، ئەوەی کە بە حەڵاڵی دانا لەسەر ئەو بناغەیە بوو کە ئەم کارە لاساییکردنەوەی کاری خوا نییە؟ بەڵکو هێشتنەوەی سایەیە، من نازانم بۆ ئەبێ مرۆڤ رێگە بە خۆی بدات کارێکی وا بکات کە وێنەیەك لە سێبەری زیندەوەرێك دروست بکات، بەڵام ئەگەر خودی شتەکە بگوێزرێتەوە، بەڵام بە هونەری دەستی، ئەبێ حەرام بێت؟

جا ئەگەر بزانین کە وێنەکانی کۆمیوتەر هێشتنەوەی سایە نین، رۆژ بە رۆژ لە زانست و فێرکردنو راگەیاندندا گرنگتر دەبن، تێدەگەین کە ئەم فەتوایە درەنگ وەخت دراوە و ئیتر توانای چارەسەری کێشەی نییە و موسڵمانان بارناهێنێت بۆ بەکارهێنانی ئامرازەکانی سەردەم لە پێشبڕکێی شارستانێتی و هێزو دەسکەوتدا، وەڵامی دروست بە بۆچوونی من ئەوەیە کە مەنهەجێکی گشتگیرو شیکاریی بەکاربهێنێ.

چونکە ئەگەر لە رووی ناوەڕۆکەوە سەیری بابەتەکە بکەین، تێدەگەین کە حیکمەتی رێگرتن لە وێنەگرتنی زیندەوەر لە سەردەمەکانی پێشوودا، واتە پێش پیشەسازیی زانست و تەکنەلۆژیی و پێش

## گرنگییەتی وێژەکانی باوکایەتی پەروەردەیی

**گرنگترینی ئەم ئەڵقانە لە زنجیرەی هۆکارەکانی چاکسازیی —لە کاتی ئێستادا، لە بەرەنگاربوونەوەی ئەم بارە، دەستگرتنی گورجو گۆڵانە بەهۆکارەکانی گۆڕانکاری ویژدانیو چاکسازی شارستانی— کە پێویستە بیریارەکانو ڕۆشنبیرەکان گرنگی پێبدەن، بریتییە لەئەڵقەی خێزانو باوکایەتیی: باوکانو دایکان، ئەمەش لەبەرچەند هۆکارێك:**

---

داهێنانی فۆتۆگراف ئەوە بووە، چونکە وێنەگرتن، هیچ ئامانجێکی نەبووە، جگە لە لایەنی ئایینی و بتپەرستن.

بەڵام دوای شۆڕشی پیشەسازیی، زانست و تەکنەلۆژیاو داهێنانی فۆتۆگراف و وێنەی ئەلکترۆنی، ئامانجەکە ئایینی نەبوو، بەڵکو بە پێی سروشتی خۆی ئامانجی زانستییو پەروەردەییو ڕاگەیاندنی و تەکنیکیی بوو، هەر بۆیە ئەمانەی ئەمڕۆ تەنها پەیوەندیی لە یەکچوونی زمانەوانیی هەیە بەوەی فەرمانو ڕێگرتنی پێغەمبەری لەسەر بووە.

چونکە ئەو وشەیەی بەکارئەهێنرا بۆ مەبەستە ئایینییەکان، ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت بۆ مەبەستە زانستیی پەروەردەییو هونەرییەکان، وەکو لە زۆر حاڵەتی تردا هەمانە، بۆ نموونە وشەی (سیارە) لە قورئانی پیرۆزدا بەکاردەهێنرێت بۆ ئەو کاروانە بازرگانیانەی ئاژەڵیان بەکاردەهێناو ئەمڕۆ لە لای خەڵکی نیوەدورگەی عەرەب بە مانای ئۆتۆمبیل دێت، کەواتە "سیارە"ی دوێنیو "سیّارە"ی ئەمڕۆ تەنها لە وشەو کۆی مانای زووتنو گواستنەوەدا یەك دەگرنەوەو هەڵەیە بە یەك چاویلکەوە یان وەکو یەك شت سەیر بکرێن، ماناو نرخی یەکێکیان بۆ ئەویتر دابنرێت.

کەواتە بەو جیاوازییەی لە نێوان "وێنەگرتن"ی دوێنێو "وێنەگرتنی" ئەمڕۆدا هەیە پێویستە تەماشای وێنەگرتنو وێنەکێشان بکرێت، ـ ئایا دەستی بن، یان هەتاوی بن، یان ئەلکترۆنیی بن یا هەر شتێکی تر کە ڕەنگە زانست و تەکنیك لە دوارۆژدا پێی بگەن ـ واتە تەماشای سروشتی خودی خۆی و بەکارهێنانەکانی بکەن بە پێی بارودۆخ، واتە لە هەلومەرجی باش بەکارهێناندا پەسەندبێو لە خراپ بەکارهێنانیدا ڕەت بکرێتەوە، بە بێ ئەوەی دەقی پیرۆزو شکۆی پیرۆزییەکان نابەجێ رابکێشن.

بە عیبارەتێکی تر، خۆمان بخەینە سەر میتۆدە دروستو گونجاوەکانی لێکۆڵینەوە، لە گەوهەری بابەتە باسکراوەکانو ماناو ئامانجو مەبەستەکانیان شارەزا ببین.

یەکەم: خێزان گرنگییەکی گەورەی هەیە لە پێکهێنانی دەروونی منداڵو ژیرییەتی منداڵ، خۆسازاندنو ئامادەکارییەکانی، چونکە شوێنی گەشەو لانکەو پەتای منداڵە: لەسەر بناغەی تێڕوانینی خێزانو دەوروبەرو ئاڕاستەکانی —چاك بێت یان خراپ— منداڵ پێکدێتو سروشتو چەمكو تێڕوانینەکانی دروست دەبێ، خێزان وەك چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگی چاوی منداڵ وایە، بەڕەنگی چاویلکەکەش دەبینێ، بینراوو بیستراو هیچ شتێ لە منداڵ پێکناهێنێ، بەڵام چوارچێوە ئەندێشەییەکەیو دەروونی، کە خێزان بۆی دروستدەکات، ئەوە سروشتی هەستی منداڵو چەمکی منداڵ دیاریدەکات، کاتێ شت دەبینێ، یان کاتێ شت دەبیستێ.

دووەم: فیترەتو پاڵنەری دایكو باوك، کە هەردووکیان بەپلەی یەکەم سوورن بە پاڵنەری فیترەت لەسەر بەرژەوەندیی نەوەکان، بەرزکردنەوەی جۆری ژیانیانو ئاستی گەیاندنیان، ڕۆڵی دایكو باوكو خێزان گرنگترین ڕۆڵە، کە مەودای کاریگەری پاشماوەی ڕۆڵەکانی ترو کاریگەرییەکانو دەزگا فێرکارییو پەروەردەییەکان دیاریدەکات لای منداڵ، خێزان ئاڕاستەو ڕێککردن دەکات —بە بەشداربوونە ئیجابیەکەی— بۆ ڕێڕەوی ژیانی منداڵو ڕێڕەوی کاریگەریی ئەو دەزگایانەو چالاکییان.

سێیەم: بیریارو نووسەر توانای چاکسازی قسەو وتاردانی هەیە بۆ دایكو باوك، تێکچوونی ئەمەش لەبەردەستدایە، فیترەتی باوکانو دایکانیش یارمەتی دەدەن لەسەر ئەمە لە هەوڵیاندا لەوەی، کە دەیبینن بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانیانی تیایە، هەوڵدەدەن بۆ بەدەستخستنی، بەپێچەوانەی لایەنو دەزگاکانی تر، کە بەرژەوەندییو ئاڕاستەی تایبەتی خۆی هەیە، سوورە لەسەر مانەوەی کاری واقیعو جێگیرییەکەی، هەر گۆڕانکارییەك دەبێ لە چوارچێوەی پاراستنی لەسەر بارە وەستاوەکە بێت، بۆ پاراستنیو کەلێن دروستنەکردن بە هاوسەنگییە ئاڵۆزەکان، بە بەرژەوەندییەکانی خاوەن دەسەڵات لە ناو کۆمەڵگەدا، هەر گۆڕانکارییەك لەلایەن دەزگاکانەوە دەکرێت بۆ پاراستنی ئەو دەزگایانەو بۆ مانەوەی ئەو بارودۆخە، کە بەرپابووە، بە چاکترین شێوە وەڵامی داواکانی گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکان لەلایەن جەماوەرەوە بدرێتەوە، بەڵام ئەو ئەو لایەنە

نییە، کە گۆڕانکاریی دەستپێبکات، یان دەستپێشخەریی بۆ بکاتو وزەکانی بتەقێنێتەوە.

لەبەرئەوە دەبێ لە لایەن بیریارو چاکسازانەوە گرنگیی بە خێزان بدرێت، بە ڕۆڵە پەروەردەییەکەی، بەرهەمهێنانی وێژەیی پێویستو قایلکەری کرداریی بۆ هۆشیارکردنەوەی باوکانو دایکان، فێربکرێن کە چۆن دەبنە باوكو دایکی بە توانا لەسەر گەیاندنی ڕۆڵی پەروەدەییان، چۆن هەستدەکەن بە زانیارییەکانو توانا شارەزاییو گرفتەکانو ئاستەنگەکان کە بەرەنگاریان دەبێتەوەو وایان لێدەکات کە بتوانن دەروونی منالێ پێکبهێنن، ژیرییو کانزاکەی دابڕێژن لەسەر بنەما زانستییە دروستە ئەزمون کراوەکە، لەسەر ڕێسا جێگیرە بەهاییەکانو ڕۆشنبیرییو ویژدانی ئیسلامیی دروست.

دەبێ وا تەماشای خێزانو دایكو باوك بکرێت، کە وەك (سیناء)ی ئوممەتو چەرخە، چونکە بیریارەکانو پەروەردەکاران لە تێڕوانینی چاکسازیی شارستانیی ئیسلامیی دەتوانن —بە قوڵێ لێهەڵماڵینو دڵسۆزی لەسەر زانستو زانیاریی بنیاتنراوە— وتار بۆ باوکانو دایکان بدەن، چونکە ئەوانە گرنگترین لایەنە پەیوندیدارەکانن بە پلەی یەکەم لە پەروەدەکردنی ڕاستەوخۆی منالّدا، بە بێ پەردەو ڕێگر، بەکەمترین تێچوون، بەڵکو باوکان —ئەگەر بزانرێ چاك وتاریان بۆ بدرێو قایل بن بەوێژەکانی ئاڕاستەکراو بۆیان، لەوەی، کە پێشکەشیان دەکرێ لە هۆکارو شارەزایی کرداریی— لەدواییدا حەزیان لە هەوڵدانە بۆ وەدەستخستنی ئەو پەروەردەیە، ئامادەن بۆ هەرتێچوونێكو بەدەست خستنی هەر وێژەو ڕێنماییەکی پەروەردەیی، دانانو جێبەجێکردنی لە چوارچێوەی خێزاندا، لەژیانی بەرەی ئێمەدا نمونەو وێنەی زۆر هەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن باوکانو دایکان توانیویانە هەنگاو هەڵبگرن بە ڕۆڵەکانیانو بەسەر ڕێگرەکاندا بازیان پێبدەن، بە بازدانی شارستانیی فراوان لە مەودای یەك بەرەدا، چونکە قایلبوون بەو چەمكو بۆچوونانەی، کە بەنرخن لە گۆڕانکاریی داواکراودا، هەندێ هۆکاری پەروەردەو زانیارییان لەگەڵ شارەزایی داواکراو بۆ بەدیهێنانی ئەو کارە پێشکەشکرا.

به قایلبوونی باوکان‌و دایکان، کاریگەرییەکە بەرزتر دەبێتەوە لەگەڵ پەستانی کرداریی لەسەر هەموو جۆرە دەزگا کۆمەڵایەتیی‌و پەروەردەیی‌و فێرکارییەکان، بۆ باشکردنی ئاستی گەیاندنیان‌و وەڵامدانەوەی لەگەڵ زۆر لەهیواکانیان، کە ئەمەش بەشدار دەبێ لە چاککردنی گەیاندنی ئەو دەزگایانە لە پەروەردەی بەرەکاندا.

نەخشەکێشانی چاکسازیی پەروەردەیی لە خێزانەوە دەستپێدەکات، چونکە دایەنگەی مناڵە، ئەوەش بە لێکۆڵینەوەی بارو وتاردان بۆ کۆڵەکەکانی خێزان (دایك‌و باوك)، چونکە ئەگەر پەیوەندیی ژن‌و مێردایەتیی خراپ بوو، ئەوا ڕۆڵ‌و کاریگەریی دەبێ لەسەر مناڵ، لەبەرئەوە بنەمای گرنگیدان بە مناڵ‌و پەروەدەکردنی لە گرنگیدان بە سەلامەتی بینای خێزان‌و پەیوەندییەکانی لە ژن‌و مێردایەتیی‌و باوکییەوە دەست پێدەکات.

خێزان‌و پەیوەندیی ژن‌و مێردایەتی، دەبێ خۆشەویستیی‌و بەزەیی تیا بێتەدی، ئەگەر خێزان ئەم دوو سیفەتەی تیا بێت، ئەوا ژینگەی ئارام‌و ئاشتی‌و خۆشەویستی‌و بەزەیی بۆ دروست نابێت لە خێزاندا، بێ ئەم هەستە لەنێوان دایك‌و باوکدا، ئەوا پەروەردەی ئیجابی خێزانی دروست نابێ، گەشەی ویژدان‌و ئازایەتیی وێژەیی دروست نابێت، گیانی داهێنان‌و دەستپێشخەریی پەیدا نابێ.

خۆشەویستیی‌و بەزەیی‌و چاودێریکردن‌و ئاسایش لە مەرجە بنەڕەتییەکانن، بۆ سەرکەوتنی هەوڵی زانستی پەروەردەیی‌و بەکارهێنانی وزەی خۆشەویستی لە ئاڕاستەکردنی ئیجابی مناڵدا، خۆشەویستیی‌و بەزەیی دایك‌و باوك هەستی خۆشەویستیی‌و پەیوەندی‌و هیوا دروستدەکات لای مناڵ بەرامبەر بە دایك‌و باوکی، هەروەکو چۆن کە پەیوەندیی خۆشەویستی لەلایەن باوك‌و دایکەوە چاودێری‌و گرنگی پێدانی مناڵ بەرهەمدەهێنێ، ئەوا پەیوەندیی خۆشەویستیی مناڵ بۆ دایك‌و باوکی حەزی لا دروست دەکات بۆ وەرگرتنی ئاڕاستەکانیان نەوەك تووڕە بێن، وزەی خۆشەویستیی —بە هەردوو بەشەکەی ئیجابی، ئەوەش حەزکردنە لە وەرگرتنی خۆشەویستیی دایك‌و باوك، سەلبی: ترسان، یان ترسانی ئیجابی لەزیانکردن لەوەی خۆشەویستی یان متمانە لەدەست بدات لای دایك‌و

باوك– پاڵپێوە دەنێ بۆ وەڵامدانەوەو هەوڵدان بۆ ڕازیكردنیان، بەخشینی هەوڵو دروستكردنی وزە، تا لای دایكو باوكی جێگەی گومانی باش بێت.

كەسی خۆشەویستو بە حەزو متمانە، ئەو كەسەیە دەروونی دەبەخشێو خۆی دەگرێ لەسەر ناڕەحەتییەكانیو پێویستییەكانی، بەڵام زۆرلێكراو یان ترسنۆك پشت هەڵدەكاتو كەمترین هەوڵ پێشكەش دەكات، لە گۆڕەپان پاشەكشە دەكات، كە ئەمەش ئەو سیفەتەیە، كە زۆربەی ڕۆڵەكانی ئوممەتی ئێمە هەیەتی، كەواتە بەبێ وتاری خۆشەویستیو هەستی سۆزدارییو هەستكردن بە ئاسایش، هیچ بوارێك نییە بۆ قسەكردن دەربارەی پەروەردەی سەركەوتوو گەیاندنی چاك، چونكە خۆشەویستیی ڕاستەقینە، ئەو ماددە بنەڕەتییەیە، كە هەموو هەوڵە پەروەردەییە پێویستەكان بۆ چاكسازییو گۆڕانكاریی لەسەری بینا دەكرێ.

لەبەرئەوە، دەبێ هۆشیاریی لە نێوان ژنو مێردا بڵاوبكەینەوە، ئامادەیان بكەین بۆ تێگەیشتنی ڕۆڵی ئیجابییان، بنیاتنانی پەیوەندیان لەسەر خۆشەویستییو بەزەییهاتنەوە بە یەكتردا، ئەگەر بیانەوێ سیفەتەكانی خۆیان لە ڕۆڵەكانیاندا دەربكەوێ، چونكە كەسێ هیچی نەبێ چی ببەخشێ، ماڵی هەڵوەشاوەو ڕووخاو، كە لەسەر ڕقلەیەكبوونو ململانێو كێشە بنیاتبنرێ، ئەوا دەبێتە ئەو دایەنگەیەی، كە هیچ ئومێدێكی چاكەی لێ بەدیناكرێت بۆ پەروەردەكردنی منداڵی بچوك، ژینگەیەك پەیدا نابێت بۆ گەشەی دەروونو ویژدانو مانای چاكەو بەخشینو داهێنان لای منداڵ، بەڵكو نموونەی ئەم چەشنە ژینگەیە لەوەڕگای بەپیتە بۆ ڕق لەیەكتربوونو كینەو خراپەو وێرانە، كە دەبێتە هۆی لادانو تاوانو ڕقو كینە دروستكردن لەسەر كۆمەڵگە.

لەبەرئەوە، پێویستە گرنگیی بدرێت بە وێژەكانی بنیاتی ژیانی خێزانی، گرنگی بدرێت بە لێكۆڵینەوەی زانستیی، كە خزمەتی خێزان دەكات، لەسەر بناغەی مەبەستەكانی ئیسلام، لە لایەنەكانی دەروونییو كۆمەڵایەتییو ئابوورییەوە، چونكە چاك بنیاتنانی خێزان كارێكی گرنگە، كە بنیاتی قەوارەی ئوممەتی لەسەر دادەمەزرێت، چونكە خێزان خشتی بنەڕەتییە لەبنیاتی

قەوارەی ئوممەتدا، هەروەها دەبێ ئەم هۆشیارییکردنو گرنگیدانە بە وێژەکانی بنیاتی خێزان بەشێکی گرنگ بێت لە هەوڵەکانی بیریارانو چاکسازان، لە پرۆگرامەکانی پەروەردەو هۆشیارکردنەوەو فێرکردن لە ئوممەتدا، بە جۆرێك، کە نەخوێندەواریی بە ڕێساکانی پەیوەندیەکانی خێزانو بەرپرسیارییەتیو تێگەیشتنەکانی قایلبوون پێی لەسەر بنەما زانستییەکان لەوانەش پێشکەشکردنی پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی پەیوەندیدار پێی، لە سەرەتاوە لە پرۆگرامی قوتابخانە دواناوەندییەکانەوە، لە پرۆگرامی زانکۆش، هەروەها دەبێ کار بکرێ بۆ ئاسانکارییکردن لەڕێگاکانی هاوسەرگیریی بۆ لاوانو بنیاتنانی خێزان، بەڵکو دەبێ یارمەتی تایبەتی بدرێ بە خوێندکارانی زانکۆ، ئەو یارمەتییەی، کە پەیوەندی بە دروستکردنی خێزانو پەیوەندییەکانییەوە هەیە، سەرکەوتن تیایدا ئامادەکارییە بۆیان، بۆ ژیانی خێزانی پەروەردەیی سەرکەوتوو، پشت ببەستێ بەوێژە زانستییەکان، کە بیریارانو تایبەتمەندانو مەڵبەندەکانی لێکۆڵینەوەی زانستیی بەرهەمی دەهێنن، بەسە، کە مرۆڤ تەماشایەکی خێرا بکات بەسەر ئەو برە لە لێکۆڵینەوەو پەرتوكو گۆڤارە وەرزییەکانو کۆنگرەو کۆڕەکان، کە هەموویان باس لەبنیاتی خێزانو پەیوەندییەکانیی دەکەن، لەگەڵ ئەو یاسانەی، کە پەیوەندیی بە گەشەو لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی منداڵەوە هەیە لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانداو بەراوردکردنیان بەم برە کەمە لاوازەی لەم بوارەدا هەیە لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا، بە تایبەتیی لایەنی زانستیی ئیسلامیی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا،، تا یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی دواکەوتن شارەزابین.

سۆزەکانی خۆشەویستیی بە تەنها، بەخشینی چاودێرییکردنی منداڵ بە بێزانینی یاساکانی دەروونییو کۆمەڵایەتیی لەسەر بنەما زانستییە نەخشە بۆ دانراوەکان، چاك پەروەردەکردنو سەرکەوتن تیایدا دابین ناکات، بەڵکو خۆشەویستی نەفامانە ئازاری لایەنەکان دەداتو زیانی توندی پێدەگەیەنێ، ئەگەر ببێتە هۆی زۆر نازپێدان، کە بەمەش بێدەسەڵاتیو خۆخۆیی پەیدا دەبێ، لەمەشەوە تێکچوون لە تواناکانی تازەپێگەیشتوو هەستەکانو نارەحەتییەکانی لێپەیدادەبێتو لە کۆتاییدا پاڵی پێوە دەنێت بۆ سەرکەشیی و خراپە و تاوان.

پەروەردەی سەرکەوتوو لە ناسینی زانستییەوە بە سروشتی گشتییو جەستەیییو دەروونی مناڵیی پەیدا دەبێ، ناسینی سروشتیی ئەو قۆناغانەی، کە منداڵیەتیی پێدا تێدەپەڕێ، ئیتر پێویستییەکانی بۆ سازدەکات، ڕێکیدەکات بەو جۆرەی لەگەڵ سروشتیدا دەگونجێ، دەستدەگرێ بەرەو سەرکەوتن، لەگەڵ چاودێریکردنی جیاوازیی تاکەکانو ئەو بارودۆخەی کەدەوری داوە، ئەوکاتە ئاڕاستەی دەکاتو هانیدەدات، پاڵیپێوەدەنێ بۆ جوانکارییو جیاکاریی، بێئومێد ناکات، یان ئەوەی کە لە توانایدا نەبێ نایخاتە سەرشانی.

## کاریگەریی زانینی پەروەردەیی: ئەزموونێکی خۆیی

لەوانەیە سوودبەخش بێ کە چەند نموونەیەك باس بکەم لە وانەی پەروەردەیی، کە من خۆم بینیومە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە باوکان دەتوانن نەوەکانیان، لە زۆر ڕووەوە وەك خۆیان نەبێت ئەگەر ڕەفتاریشیان لە زۆر لایەنەوە وانەبێت، کە پێی ڕازی بن بۆ منالەکانی خۆیان، دەتوانن ڕەفتاری جوانو دروست، کە زۆرجار باوك خۆی نییەتی بیخاتە دڵی منالەکەیەوە، واتە ئەو تۆوە لەدڵی منالەکەیدا دەڕوێنێت، کە لە خۆیدا ڕەنگینەداوەتەوە، دەشبێتە پێشڕەوی چاك بۆ منالەکەی.

من –سوپاس بۆ خوا– لە ماڵێکدا گەورەبووم، کە هەرگیز جگەرەم نەکێشاوە، ڕۆژێك لە ڕۆژانیش بەو هیوایەوە نەبووم، کە جگەرەبکێشم، لەگەڵ ئەوەی باوکم –خوا ڕەحمی پێبکات– جگەرەی قامیشی دەکێشا، دایکیشم – رەحمەتی خوای لەسەر بێت– جگەرەی سیغاری دەپێچایەوەو دەیکێشا، ئەڵبتە منالی بچوك چاو لە دایكو باوکی خۆی دەکات، ئەوەی زانراوە لە سروشتی مرۆڤدا، ئەوەیە کە منال هەمیشە حەزی لە لاساییکردنەوەی دەوروبەریەتیی بە تایبەتی دایكو باوك، پێش خەڵکیتر، بەڵام ئەوەی ڕێگری لە من کرد کە ئەم خووە ناپەسەندە –جگەرەکێشان– وەرنەگرم، بریتیی بوو لەدانایی پەروەردەیی باوکم لەم بارەوەو ئەگەر جگەرەکەی بە بێدەنگیو بێقسەکردن، بکێشایەو مژی لێبدایە، ئەوا منیش لە شوێنی ئەو دادەنیشتمو هەرکاتێ ئەو لەوێ نەبوایە، منیش مژملێدەداو جگەرەم دەکێشاو لاسایی باوکم دەکردەوە، یان ئەگەر باوکم

منی ببینیایە جگەرە بخۆم پیامداهەڵبشاخایە، یان دارێکی لێمبدایە، ئەوا زیاتر سوور دەبووم لەسەر جگەرکێشانو لاساییکردنەوەی باوکم، ئەوەش لەو بارەدا بە نهێنییەوە دەبێ، بەڵام هیچ شتێك لەوبارەیەوە ڕووینەدا، ئەوەش لەبەرکارێکی پەروەدەردەیی ئاسان، ئەوەش ئەوەبوو کە باوکم بە بێدەنگیو سەربەرزکردنەوەوە جگەرەی نەدەکێشا، بەڵکو هەمیشە قسەی بۆ دەکردمو دانیدەنا بەهەڵەی خۆیدا لە جگەرەکێشاندا، بەڵکو هەمیشە پەشیمانییو بێدەسەڵاتیی خۆی باس دەکرد، دەربارەی ئەم جگەرەکێشانە، بە دەردو نەخۆشییو بەڵاو نەریتی خراپی دەزانی، هەمیشە دەپاڕایەوەو داوای لە خوا دەکرد ڕزگاری بکات لە جگەرەکێشان، منیش مناڵ بووم ئەم نزاو پاڕانەوەو دانبەهەڵەدانانەی باوکمم گوێلێدەبوو سەرم دەسوڕما، جارێکیان، کە هەرگیز لە بیرمناچێتەوە، ئەوەبوو من دەستمکرد بەدروستکردنی جگەرەیەکی قامیش بۆ باوکمو سەبیلە زەردەکەی لە دەستمدا بوو، بۆم پاك دەکردەوە، کە (قەتران) پێوەی لکابوو، باوکم سەرنجی بۆ ئەو قەترانە ڕاکێشا، کە چۆن دووکەڵی جگەرە بە سەریەوە نیشتووەو وا ناشیرینی کردووە، کە هەمیشە باوکم پاکی دەکردەوە، تا ڕزگاری ببێت لەو پیسیەو نەچێتە ناو سکییەوە، بەمنی وت: کوڕم تەماشا بکە! ئەم قەترانە زیاتر لەمەش لە ناو سنگمدا نیشتووەو بووە بە هۆی (کۆکە) کە لە سنگمدا دروست دەبێتو بەردەوام دەکۆکم، ئەو دیمەنەی (قەترانەکە) هەرگیز لەبیرم ناچێت، کە سەبیلەکەی پیس دەکردو پەڵەی لێدروستدەکرد، هەرگیز لە مێشکمدا دیمەنەکەی لاناچێ، مرۆڤی ژیریش ئەوکەسەیە، کە پەند لە خەڵکی وەربگرێت.

بەمجۆرە، بێئەوەی دایكو باوك ببنە پێشڕەوی نمونەیی بۆ مناڵەکەیان لەم کارەدا، دەتوانن بە شێوازی پەروەردەیی کاریگەر، مناڵەکانیان بپارێزن لە کەوتنە ناو هەڵە، کەخۆیانی تێکەوتبوو، گرفتاری بووبوون.

ئەمە مانای بێبایەخیی پێشڕەوی چاك نییە، بەڵکو پێشڕەوی چاك ڕۆڵی پەروەردەیی گرنگ دەبینێ لە پەروەردەکردنی تازەپێگەیشتووەکاندا، زۆر لەسیفەتە ڕەوشتییەکانو ماناییەکان، پێشڕەوی چاك ڕۆڵی بنەڕەتی تیا

هەبووە، بەڵام لەهەمانکاتدا، پەروەردەکار، کە هەوڵدەدات، تا منداڵەکانی بە سیفەتی جوان بڕازێنێتەوە، هۆکارو شێوازە پەروەردەییەکان یارمەتیدەرێکی گرنگن بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، بە هۆیەوە منداڵ لە هەڵەو ڕەفتاری ناشیرین دوور دەکەوێتەوە، بەبێتێگەیشتنو پەیوەندیی پەروەردەیی، ئەو پێشڕەوە بەتەنها کاریگەریی داواکراوی نابێت، چونکە زۆر لەو کەسانەی کە لەخودی خۆیاندا ڕۆڵی پێشڕەو دەبینن، لە هەڵسوکەوتو سروشتی دەروونیاندا لە ڕووی پەروەدەییەوە تەواو نین لەگەڵ منداڵی خۆیاندا، ئەمەش ئەوە دەردەخات کەبۆچی منداڵی ئەو باوکانە لادەدەنو چاکیی خۆیان سوودی نییە بۆ منداڵەکانیان، لە چاك پەروەردەکردنی منداڵەکانیانو بە سەلامەنیی ئاڕاستەکردنیان.

نموونەیەکی تر لەسەر هەڵسوکەوتی بیناکراو، لەسەر تێگەیشتنی شێوازە پەروەردەییەکان، ئەوەیە کە بە چاوی خۆم دیتم، برایەکی بچوکم هەبووە، جارێکیان دەستیبرد بۆ جگەرەکەی دایکم، تا بیبات بۆ دەمیو لاسایی دایکم بکاتەوە، کاتێ یەکێ لە خوشکەکانم بە پەلە پڕیدایە تا لە دەستی وەربگرێتو قیڕاندی بەسەریدا، لێرەدا دایکم بینی –ڕەحمەتی خوای لێبێت– داوای لە خوشکەکەم کرد کە بێدەنگ بێت، واز لەمنداڵەکە بهێنێ بۆخۆی، ئیتر دایکم دەستی کرد بەپێچانەوەی جگەرەیەکی ترو پڕی کرد لە توتن بۆی، ئاگری پێوەناو دایگیرساندو دایە دەستی منداڵەکە، ئەو منداڵەی، کە وایدەزانی وەك پارچەیەك شیرینییەو تامی شیرینو خۆشە، بۆیە هەوڵی بۆ دەدات، منداڵەکە جگەرەکەی برد بۆ دەمیو دووکەڵی ناو جگەرەکە تاڵو ناخۆش هاتە دەمو قوڕگی، لێرەدا بە خێرایی جگەرەکەی فڕێدایە سەر زەوی، ئیتر جارێکی تر دەستی نەبردەوە بۆ جگەرە، هەتا ئەمڕۆش جگەرەی نەخستووەتە سەر لێوی.

نموونەیەکی تر، کە کاریگەریی وانە پەروەردەییەکان ڕوون دەکاتەوە لەسەر هەڵسوکەوتی منداڵ، ئەوەبوو، کە لە نێوان دایکمو –ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت– برا بچوکەکەمدا بینیم، کە جارێکیان ئەو برا بچوکەم بە پەلەو بە خۆشییەوە خۆی کرد بەماڵاو نەیدەزانی چۆن ئەو خۆشییە دەربڕێ، بەوشە، کاتێ بە هەردوو دەستی دەفرێکی هەڵگرتبوو، کە قاوەی عەرەبیی تیا

دەکولێنرا، ڕەنگاوڕەنگو جوان بوو، لە ڕێگادا دۆزیبووەوەو لە کەلوپەلی ئەو کاروانو بازرگانانە کەوتبوو، کە دەهاتن بۆ مەککە، زۆر بەو ڕێگایەدا هاتوچۆیان دەکرد، دایکم پێشوازیی لە منالەکە کرد، منیش تەماشامکرد، تا بزانم چی لێدەکات، ئەوەی جێی سەرسوڕمانم بوو، بینیم منالەکەی گرتە باوەشو هەڵیگرتو دەفرەکەش هەربەدەستی منالەکەوە بوو، دەستی بەرزکردەوە، منالەکەی بردەوە بۆ ڕێگاکەوە بۆی ڕوونکردەوە کە ئەو دەفرە هی ئێمە نییە، لەبەر ئەوە نامانەوێ، گەڕاندیانەوەو لە جێگەکەی خۆیدا دایاننایەوە، مەبەستی دایکم ئەوەبوو کە منالە جارێکی تر هیچ شتێ نەهێنێتەوە، کە هی خۆمان نەبێ، کاتێ لەم وانەیە وردبوومەوە، بۆم دەرکەوت ئیتر ئەم منالە جارێکیتر دەست بۆ هیچ شتێ درێژ ناکات، کە هی خۆی نەبێ، سیفەتی دەستدرێژکردنە سەر ماڵی کەسی تیا دروست نابێ، ئەوە لە دەروونیدا جێگیر دەبێت کە —بە زەمانێکی پەروەردەیی گرنگ— هەرگیز چاوی لە ماڵی کەس نەبێ، با لەسەر ڕێگاشدا کەوتبێ، زۆر منالّ بوو بە دز کاتێ، کە دەستی درێژ دەکرد بۆ ماڵی خەڵك شتە بێنرخو بێماناکانی دەهێنایەوە بۆ ماڵ، خێزانەکەی دڵخۆش دەبوون بەم دەستکەوتەو هەمووی درۆکانی منالەکەیان بە ڕاست دەزانی، ئیتر منالەکە خۆشی تیا دروست دەبوو، ڕاهات —لە پاکیی خۆیەوە— لەگەڵ دزییو درۆکردندا، بە هۆی نەزانییو بێئاگایی خێزانەکەیەوە، بەدوادانەچوونی ڕەفتاری منالەکەیان، یان خۆشیان بەو شتە (دزراوە)، کە منالەکە هێناویەتی، وایان لێدەکات، کە وردبوونەوە نەکەن لە ڕاستی ئەم کارە، ئەمەش پاڵدەنێت بەمنالەکەوە —ڕۆژ لە دوای ڕۆژ— بۆ زیاتر لادان، بێ مەبەست، یان گوێنەدان بە سروشتی هەڵسوکەوتو ئەنجامە خراپەکانی ئەم جۆرە کارە.

شارەزانەبوون لەم کوڕە کە کەشو هەوای خۆشەویستییو ڕێکییو چاودێرییو ئاسایش لە ماڵدا، لەپشت وەڵامدانەوەی بوو بۆ دایكو باوکی، کە توانیبوویان کار بکەن —بە چاکە— لە دەروونی ئەم بچکۆلەی ماڵە، کە بە هەموویانەوە لەگەڵ دایكو باوکیاندا خۆشگوزەران دەژیان، دوور لە هاوڕێیەتی خراپەکارانو دەسەڵاتی هاوڕێی خراپ، توانییان، کە هەنگاوی گەورە بە

منداڵەکانیان بنێن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازە پەروەردەییە لەتوانا لەسەر چاکسازیی‌و گۆڕانکاریی.

له ئەزموونە کەسییەکانداو لە بینینی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن، دەبینی، کە زۆربەیان ئەوەی، کە کەناڵەکان بڵاوی دەکەنەوە شتی باش نییە، هەندێ جار شتی ڕوخێنەرە، لەم بەرنامەوە برەو دەدەن بەوەی، کە چۆن بچنە ناو دەروونی گوێگرەکان، بە تایبەتی منداڵان، بە لێزانانەو خۆ خۆشەویستکردن بە شێوازی کاریگەرو ناڕاستەوخۆ، بێئەوەی ئەو منداڵانە هیچ هۆشیارییەکیان هەبێت بەمجۆرە پەیام‌و ئامانجانە، بەڵام کار دەکاتە سەر دەروون‌و سۆزیان، بەهاو ئامانجەکان لە تێڕوانینیاندا تێکەڵ دەکات، پاڵیانپێوە دەنێ بۆ وەرگرتنی شتی وەها کە هەرگیز وەریان نەدەگرت‌و بە سووکیان نەدەگرت، ئەگەر بە شێوەیەکی ژیریی ژیربێژیی ڕاستەوخۆ بڵاوبکرایەتەوە.

بەرنامەکانی تەلەفزیۆن، بە هەموو شێوەکانییەوە، بووە بەیەکێ لە پێویستییەکانی ئەم سەردەمە، کە بە شێوازێکی ئاسان زۆر لەبەرنامە ڕۆشنبیریی‌و فێرکاریی‌و برەودارەکان دروست دەکات، کە لە ڕووی کردارییەوە ناکرێ وازیلێبهێنرێ، لەسەرم بوو ڕێگایەك بدۆزمەوە، کە بە هۆیەوە ئەو بەرنامە لاببەم، یان ئاسەوارەکانی، کە خراپ بوو کەم بکەمەوە، کە زۆرجار کتوپڕ ئەو بەرنامانە دەخرانە ڕوو دەبینران، بەڵام بێئەوەی وابکات لە منداڵ، کە حەزی لێنەکەن‌و نەگەڕێن بەدوایدا.

من لە رووی پەروەردەییەوە ئەوە دەزانم، کە هەمیشە منداڵ گرنگە بەلایەوە بزانێ دایك‌و باوکی ڕایان چییە لەم جۆرە فیکرەیە، ئەوەی کە لە لای دەوروژێت لە پرسیارکردن، ئەو هەڵوێستانەی، کە بەرەنگاری دەبنەوە، لەبەرئەوە من هەمیشە سوور بووم لەسەر ئەوەی، کە لەگەڵ منداڵەکاندا تەماشای ئەو بەرنامە تەلەفزیۆنیانە بکەم، لە کاتی تێبینی کردنمدا بۆ یەکێ لەوپەیامە خراپانە خێرا ڕێنماییم پێشکەش دەکردو بە شێوازێکی گونجاو هیچ‌و پووچی ئەو بەرنامە خراپانەم، بەکورتیی‌و بەپەلە دەخستەڕوو، ڕەتم دەکردەوەو هەڵەکانیم ڕاست دەکردەوە، بێئەوەی کە منداڵەکان بێبەش بکەم لە گوێگرتن‌و بینینی ئەو چیرۆکە یان ئەو بەرنامەیە، ئەگەر زیاتر ڕوونکردنەوەی پێویستبوایە ئەوا دوای بەرنامەکە

گفتوگۆی زیاترمان لەسەر دەکرد، بە شێوازی گفتوگۆی کراوە بۆ تاووتوێ کردنی گرنگترین ئەو شتانەی کە لەو بەرنامەدا بووە بەئامانجی ڕۆشن کردنەوەو ڕاستکردنەوە، ناساندنی منداڵ بە ڕاو بۆچوونی دایكو باوکیشی، بە جێهێشتنی کارەکە، تا لە مێشکی منداڵەکەدا بسوڕێتەوە، تا بەهێوریی‌و ئارامییەوە بچێتە ناخی. ئەم شێوازە لە ئەزموونی ژیانی خۆم، کاریگەری چالاکی هەبووە لە بەرەنگاربوونی زۆر لە ئاسەوارە خراپەکانی بەرنامە خراپەکانی تەلەفزیۆن، کە دەبێ پەروەردەکاران بیدەن بە باوکان‌و ئامۆژگاری پەروەردەییان بکەن، بۆ چاك مامەڵەکردنی کرداری کاریگەر، لەگەڵ ئەوەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لە هەڵوێستە پەروەردەییەکان لە ژیانی منداڵدا، هەروەها لەگەڵ ئەوەی کە دەبینین، لە هەڵوێست‌و ئاستەنگەکان، وەك ئاستەنگەکانی ئینتەرنێت‌و بەرنامەکانی کۆمپیوتەر.

گرنگترین ڕەگەزەکانی ئەم پرۆژە پەروەردەییە کە ئەم پەرتوکە بانگەوازی بۆ دەکات بریتییە لە چەسپاندنی بەشێکی گرنگ لە هەوڵی بیریارو پەروەردەکارو چاکسازە ئیسلامییەکان، سازکردنی پشتگیریکردنی مانایی بۆ هەوڵە زانستییەکان کە وتاری زانستیانەی ئیسلامیی قایلکەرو کاریگەر ئاڕاستەی باوکان‌و دایکان دەکات، لە ڕووی پەروەردەییەوە ڕۆشنبیریان دەکات، ڕووەکانی تێکچوونی ڕۆشنبیریی‌و کەموکورتی پەروەردەییيان پێدەناسێنێ، کاریگەریی ئەمە لە بنیاتی ڕۆڵەکان‌و ئوممەتەکەیاندا، لە ڕووی ئایینی‌و دەروونیی‌و زانستیی‌و شارستانیەتەوە، هەروەها چاوکراوەیان دەکات بەزانیاری ڕێگاو هۆکارەکان کەوایان لێدەکات بتوانن ڕۆڵیان هەبێ لەپەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیاندا، کە لەمەشەوە هەموو وزەکانی خۆشەویستیی‌و دادپەروەریی‌و بەخشین‌و خۆگریی، کەهەموو گیانی دایكو باوکی پڕکردووە بەرامبەر بە ڕۆڵەکانیان‌و سووربوون لەسەر ئەوەی کە بەرژەوەندییانە، پەیدادەبێت.

نەنگییە، کتێبخانەی نەتەوەکان پڕ بێت بە سەدەهاو هەزارەها کتێب‌و لێکۆڵینەوەی زانستیی‌و پەروەدەیی کە ڕێنوێنی باوکان‌و دایکان دەکات، بە چەمك‌و زانیاریی‌و ڕێگاو هۆکاری ڕۆشنبیریی پەروەردەیی، کە یارمەتی دایك‌و باوك دەدات لەسەر هەستان بە ڕۆڵیان بەسەرکەوتوویی، لەپەروەردەکردنی

ڕۆڵەکانیان، بەدیهێنانی حەزو ئاواتەکانیان، کەچی کتێبخانەی ئیسلامیی لەکارو باری خێزانو پەروەردەکردنیدا، خەریکە بەتاڵ بێت لەپەرتوکو لێکۆڵینەوەی زانستی، ئەوانەش کە هەبن زۆر کەمن، کە چەند دەستنووسو وتاری ئامۆژگاریىو دەسەڵاتییەوە هەندێکیشیان دووبارەن، یان پەرتووکی یاساین، یان فیقهین، کە پەیوەندییان بە حوکمەکانی گرێبەستی هاوسەرگیریىو حوکمەکانی تەلاقەوە هەیە، یان چۆنییەتی وەسیتکردن لەسەر منداڵو دابەشکردنی میرات، زۆربەی ئەم کارانەش، پەیوەندی بە ناوەڕۆکی پەروەردەکرنو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانەوە نییە، هیچ زانستێکی یاسایی ناخاتە ڕوو لەم بارەوە، هیچ زانیاریىو زانستێکی ڕۆشنبیریی پەروەردەیی تیا نییە، ئەمش چەند شتێکە، کە خەڵکی پێویستی پێی نییە بە دوورو درێژیىو بەوردی بیزانێ، چونکە ڕێپێدراوو قازیو دادوەر، دەتوانن بەوردی فێری ببنو لایەنە یاساییەکانی بزاننو لە کاتی پێویستدا هەڵدەستن بەجێبەجێکردنیو دەرکردنی یاسای پێویست لەو بارەیەوە.

چارەسەرەکانو ڕۆشنبیریی داواکراو، کە دەبێ بەرهەم بهێنرێت، لە پێناو بەرزکردنەوەی کاروباری خێزانو پەروەردەو فێرکردنو پێشخستنی، دەبێ ئەو چارەسەرانە زانستیو یاساییو ئیسلامیىو کۆمەڵایەتیىو شارستانیی بێت، مامەڵە لەگەڵ ناوەڕۆکی چەمکەکانی بکات، تێبگات لە شارەوەیی پەیوەندییەکانو هۆکارە کاریگەرەکان تیایدا، چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا، بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەی کە دەمانەوێ بێتەدی، لە لافاوێکی بەردەوامی بێبڕانەوە لە لێکۆڵینەوەو ئەزموون، بەدواداچوون بۆ ئاستەنگەکان، بۆ گۆڕانەکانی پەیوەندییو بارودۆخو تواناکان، بۆ داهێنراوە زانستیو زانیارییەکان، لەوانەش لێکۆڵینەوە دەروونییەکانو لێکۆڵینەوەکانی مێشکی مرۆڤایەتیو جینەکان، چەندین بواریتر لە بوارەکانی زانستی تەقێنراوە کە درێژدەبێتەوە بۆ ئاسۆکانی شێوازە پەروەدەییو فێرکارییەکان، تاوەکو هەوڵەکان لە ڕووی زانستییەوە بە چاکترین شێوە بێت، لە پەتی پێشبڕکێی نەتەوەکانو شارستانییەتەکاندا.

## مامۆستا پشتگیریی خێزانە

ئەگەر پاڵنەری فیتریی لای باوکانو سووربوونیان لەسەر بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانیانو سازکردنی ئەو بارودۆخەی، کە بەرژەوەندییانی تیایە، بنەمای یەکەمو بەهێز بێت، کە دەبێ هەموو هەوڵەکان بۆ چاکسازیی کانزای مرۆڤی مسوڵمانو داهاتووی بەرەکانی ڕووی تێبکات، ئەوا مامۆستا خاوەنی ڕۆڵێکی گرنگە، چونکە پشتگیرو تەواوکاری بواری یەکەمە، بۆ ڕۆڵی خێزان لە پەروەردەکردندا، چونکە ئەو ڕەگەزەیە، کە کۆمەڵگە پشتی پێدەبەستێو کاری فێرکردنی مناڵانی دەخاتە بەردەست، چاودێرییو ئاڕاستەکانیان بۆ مناڵانو گەشەو توانایانو سافکردنی پێبەخشراوەکانیان، دەگرێتە ئەستۆ.

ڕۆشنبیریی مامۆستاو بەرنامە پەروەردەییەکانو هۆکارە بەربەستەکان، گرنگی گەورەی هەیە لە گەشەکردنی منداڵو زانستو ویژدانی منداڵ، هەتا چەمکەکانی باوکانو مامۆستایان وەك یەك بنو هەوڵەکانیان ڕێکی یەکتر بێت، ئەوا هەوڵەکان زیاتر چاكو ئەنجامەکان زیاتر ئیجابی دەبێ.

زۆربەی هەڵەکانو ڕووەکانی کەموکورتیی لە گەیاندنی مامۆستایانو قوتابخانەکانو نەخشەکانی پەروەردەکردنو فێرکردن، لە زۆربەی وڵاتانی (تازەگەشەسەندوو)دا، لە ئەنجامی خراپیی بەرنامە، یان مەبەستی خراپی نییە، بە ئەندازەی ئەوەی، کە هۆکەی لەکەموکورتیی باوكو دایکەوەو بەدواداچوونی بەخۆرئاواکردنی کوێرانە لە بنیاتنانی نەخشەکانو دانانی بەرنامەو چالاکییە فێرکارییەکان.

گرنگیدان بە باسەکانی مامۆستاو ئامادەکردنو دڵنەواییکردنی، هەوەها گرنگیدان بە باسەکانی فێرکردنی گشتییو پڕۆگرامو هۆکارو ڕووەکانی کەموکورتیی تیایدا، ئەم باسە دەخاتە بەردەمی ئوممەت، دەبێتە یارمەتیدەرێکی زۆر لەسەر ڕاستکردنەوەی ڕوانینی لایەنە بەرپرسەکان، لە پەروەردەو فێرکردن، کە هیچ —لە زۆربەی کارەکاندا— کەموکوڕییەك ناکات لە چاکسازییدا، لەوەبەرهێنان لەم بوارەو لە بەرەکانی داهاتوودا، بە شێوازێکی پەروەردەیی هاوسەنگ، بە تایبەتی ئەگەر لە لای ئوممەتو لە لای

سەرکردایەتییەکان هۆشیاریی بە گرنگیەتی ئەم چاکسازییە دروست ببێت، هەروەها بە تایبەتی ئەگەر ئوممەت هەست بە ئاسەوارەکانی ئەم چاکسازییو بەرنامانە بکات، لە گەشەی تواناکانی تازەپێگەیشتوو چاککردنی گەیاندنیاندا.

مامۆستا وەك باوکە —لە زۆر ڕووەوە— لە سووربوونی لەسەر بەرژەوەندیی منداڵ، لەسەر سەرکەوتنی لە کارەکەیدا، مامۆستا ناتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ، ئەگەر هۆشیار نەکرێ، قایلبکرێتو بارودۆخی بژێویی چاك بکرێت، پشتگیری مامۆستاو ڕۆڵی پەروەردەیی لە لێکۆڵینەوە پەروەردەییە زانستییەکاندا، بە کتێبو ماددەی قوتابخانەییو بەرنامەیی کاریگەری پێشکەوتوو، بە بیریارانو دەزگا فیکرییو پەروەردەییە فەرمییو نافەرمییەکانو هەوڵی چاکسازان، دەتوانێت بەشداریی بکات بە بەشێکی زۆر لە پشتگیرییکردنی مامۆستاو پێشخستنی فیکرییو هۆکارە پەروەردەییەکان، کە نابێ تەمەڵیو کەموکورتی تیا بکات لە گەیاندندا.

## وتاری پیرۆزیی ئایینیی: پەیوەندیی لە نێوان زانستییو ویژدانیی

زانیارییەکان بە هەڵقوڵانو تازەبوونەوە، کۆتایی نایەت، داوای زۆرترکردنی زانیاریی، هەرگیز ناوەستێ، چاوپیاخشاندنەوە پێشکەوتنی تیادا ناوەستێ، مادام گیان لە ناو دەمارەکانی مرۆڤدا هاتوچۆ بکات، زانست داوا دەکرێو تازە دەبێتەوە لە لانەکەوە تا ناو گۆڕ، بەڵام لایەنەکانی ویژدانی دەروونی پەروەردەیی، ئەوا کاتو مەودای لەقۆناغەکانی تەمەنو گەشەی مرۆڤایەتیدا، کە لێی تێپەڕناکات، لەبەرئەوە دەبێ ویژدانی دەروونیی بناغەبێت، کە هەموو جۆرە زانستێكو شێوازێکی فێرکردنی لەسەر بنیات بنرێ، هەتا لە بواری فێرکردنی باوەڕو بەهاکانو ڕەوشتدا —هەتا لە بواری فێرکردنی قورئانی پیرۆزدا— دەبێ ئاگامان لە ئاسەواری بێت لەکاتی پێکهێنانی ژیرییو بنیاتی دەروونی ویژدانیی منداڵ، لە هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی منداڵیی، چونکە "لکل مقام مقال" بۆ هەموو شوێنێك قسەیەك هەیە.

گرنگترین بوارێك، کە دەبێ پەیوەندیی زانستیی بەویژدانیی تیا ڕوون بکرێتەوەو چاودێریی پەیوەندیی کاریگەریی ئاڵوگۆڕ لەنێوانیاندا دەربخرێت،

بریتییه له‌بواری فێرکردنی ئاینیی —له‌وانه‌ش فێرکردنی قورئانی پیرۆز به منالآن— که ده‌بینین به‌رنامه‌کانی ئاسایی له فێرکردنی منالآندا بۆ قورئان خوێندن به شێوه‌یه‌کی کوێرانه، شتێکی لاساییکارانه‌یه، ئه‌وه‌ش فێرکردنی مناڵه له‌سه‌ره‌تای گه‌شه‌یه‌وه، به‌فێرکردنی جوزئی سییه‌م (عم) له قورئانی پیرۆز، له‌وانه‌یه ئه‌وه‌ش به هۆی ئه‌وه‌وه بێت، که گوایه سوره‌ته کورته‌کانی ئه‌م جوزئه ئاسانتر له‌به‌رده‌کرێت له سوره‌ته درێژه‌کان، چونکه زۆربه‌ی سوره‌ته‌کاکانی ئه‌م جوزئه مه‌ککییه و باس له نادیار و باوه‌ڕ ده‌کات[1]، ئه‌م به‌رنامه‌یه —له ڕای ئێمه‌دا— ده‌بێ ڕاست بکرێته‌وه‌و قورئان فێرکردنی مناڵ، له‌سه‌ر بنه‌مای به‌رنامه‌ی زانستی په‌روه‌رده‌یی بێت.

جوزئی (عم)، زۆربه‌ی وتاره‌کانی ڕوو له بێباوه‌ڕان‌و سته‌مکاران‌و سه‌رپێچیکاره‌کان ده‌کات، ڕووبه‌ڕوویان ده‌وه‌ستێته‌وه‌و خراپیی سه‌ره‌نجامی بێباوه‌ڕیی‌و سه‌رپێچی کردنه‌که‌یان ده‌خاته‌ڕوو، توانای خوای گه‌وره‌و ئه‌و ڕۆژه‌ی، که قیامه‌ته چاوه‌ڕێیان ده‌کات، هه‌ڕه‌شه‌و سزاو پاشه‌ڕۆژی خراپیان، به هه‌موو شێوه‌یه‌ك، که زمان بیخاته‌ڕوو له ڕه‌وانبێژیی‌و هێز له ترساندن‌و هه‌ڕه‌شه‌کردندا نیشانیان ده‌دات، داوا له‌و لوتبه‌رزانه ده‌کات، که هه‌ستبکه‌ن ئه‌وه ڕاستیی حاڵیانه‌و خراپیی دوا ڕۆژیانه، که ئه‌م جۆره وتاره‌ش، له‌گه‌ڵ پێگه‌یشتووی لوتبه‌رزدا گونجاوه، تا به‌رپرسیارییه‌تی خۆیان بزانن، پاشه‌ڕۆژیان‌و چاره‌نووسیان ببینن، باری کۆتایی خۆیان بزانن، بگه‌ڕێنه‌وه بۆ ژیریی‌و ڕاستی خۆیان، ئاسه‌واره‌کانی ئه‌م وتاره بۆ تازه‌پێگه‌یشتووه‌کان، نایانکاته پیاوی ترسنۆك، بنیاتی ده‌روونیان ناهێنێته‌یه‌ك‌و شاراوه‌کانی هێزو ئازایه‌تییان له ناو نابات، به‌ڵکو ڕێڕوونیی‌و ڕێنوێنیان ده‌کات‌و ڕێگه‌یان

---

[1] ژماره‌ی سوره‌ته‌کانی جوزئی سی، سی‌و حه‌وت سوره‌ته، هه‌موویان مه‌ککین، ته‌نها سێ سوره‌تیان نه‌بێ، ئه‌وانیش: (النصر، الزلزلة، البيّنة)ن، هه‌روه‌ها سێ ئایه‌تی یه‌که‌می سوره‌تی (الماعون)یش. بڕوانه: کتێبی (صفوة البيان لمعاني القرآن)ی شێخ حه‌سه‌نه‌ین مه‌خلوف، چاپی سێیه‌م، ده‌رچووی وه‌زاره‌تی ئه‌وقاف و کاروباری ئیسلامیی کوه‌یت. کوه‌یت ١٤٠٧ کۆچی.

نیشاندەدات، داوایان لێدەکات، کە ورد سەرنج بدەن، بیربکەنەوەو وردبین بن، پاشەڕۆژی خۆیان بزانن، بزانن چی هەڵدەبژێرن.

بەڵام هەمان وتار، ئەگەر ئاڕاستەی منداڵی بچووکو تازەپێگەیشتوو تەمەنی منداڵ بکرێ —کە حەزی لەوەیە تۆ لێت دەوێت، هەوڵدەدات بە گوێت بکات، دەستپێوەبگرێ لەتێگەیشتنی مانای ژیانو بوونەوەر لە دەوروووبەری— هیچ کاریگەرییەکی نییە، چونکە منداڵی بچوك پێویستی بە هەڕەشەو ترساندن نییە، ئەگەر هەڵەمانکردو وتارمان بۆدایەوە بەو وتارەی، کە قورئان ئاڕاستەی بێباوەڕەکانی دەکات، ئەوا کاریگەری دەروونییو ویژدانیی —لە باری ئەو بچوکە بێتاوانەدا— جیاواز دەبێتو دەبێتە ڕوخێنەری بنیاتی دەروونیی، چونکە ترسو بیمی بۆ دروست دەکات، هێزو ئازایەتیی تیا دەمرێنێ، ژیان لەبەردەمیدا دەبێتە چۆڵەوانییەك لێی دەترسێ، هەڵوێستی خراپی دەبێتو بەرامبەری دەجوڵێ، بەڵام بەگیانی جێنشینایەتی نا، بەڵکو بە گیانی ترسو حەزی مانەوەوە، هەرگیز لە دەروونی کەسی ترسنۆکدا داهێنانو توانای بەخشین دروست نابێ، هەرگیز چاوەڕێی لێناکرێت پەیوەندیی بە خواو بە ژیانو بە ڕۆژی دوایی، لەسەر هەستی خۆشەویستییو حەزو وزەی ئیجابیی بنیات بنرێ، ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە بۆچی لە سەردەمی تێکشکاندا دەروونی مسوڵمان سلبییە، ئەویش ئەوەبوو، کە خۆشەویستی خوا لاوازبوو، گورجوگۆڵی ژیان ونبوو، نمونەی ئەم جۆرە دەروونە لە وێنەی ڕۆژی دواییدا، تەنها لەوەدا دەبینرێت کە ئاگری دۆزەخە، بێ گوێدانی ئەوەی، کە پاشەڕۆژی مسوڵمان —بە بەزەیی خوا— بۆ بەهەشتە، با زیناشی کرد بێت، یان دزی کردبێت[1]، چونکە خوای گەورە لەسەر گشتییەتی کردەوەکانی مسوڵمان مامەڵە دەکات، نەك لەسەر ئەو هەڵانەی کە کردوویەتی،

---

[1] ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا (٢٦٢١٩) گێڕاویەتییەوە: کە ئەبو دەردا وتوویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس وتی (لا إله إلاّ الله وحده لا شريك له) ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە. وتی: منیش وتم: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ فەرمووی: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت. وتمەوە: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ فەرمووی: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت. جارێکی تر وتم: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ فەرمووی: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت، با ئەبو دەرداش پێی ناخۆش بێت).

چاکەو خراپەکانی دەهێنرێت: (إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّـيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ) (هود: ١١٤ ).

زۆربەی خەڵکیی چاکەی ژیانی زۆرترە لە خراپەی ژیانو دەروونی، ئیتر هیچ پێویست نییە هەستی ترسو بیم زاڵ ببێ لەچەرخەکانی دواکەوتن بەسەر دەروونی زۆربەی مسوڵماناندا لە هەموو شتێکدا، چونکە ئێمە ئاسەواری وتاری پەروەردەیی هەڵە، کە ئاراستەی مسوڵمان دەکرێت بۆمان ڕوون نەبۆتەوە، بە تایبەتی مناڵ، کە لەسەر ترساندنو تۆقاندنو تۆڵەکردنەوە بنیاتنراوە، نەك لەسەر خۆشەویستیو حەزو ڕێزگرتنو متمانەو هاندانو ڕێڕوونیو بەرپرسیارییەتی لە هەڵگرتنی سپاردەکاندا.

دەبێ پەروەردەکار —لەسەر بنەمای ڕێنمایی وتاری پێغەمبەریی بۆ قۆناغی منداڵییەت، لێکۆڵینەوەی زانستی پەروەردەیی بنیاتنراو لەسەر بنەمای تێڕوانینی قورئانو بەهاو مەبەستەکانی— ئەو هەڵبژاردنە قورئانییە بخاتە بەردەستی منداڵ، کە دەگونجێ لەگەڵ سروشتی منداڵ لەو قۆناغە دەروونیانەی پیا تێدەپەڕێ، بەوەی لە خوای نزیك دەکاتەوە، لە دەروونی منداڵدا هەستەکانی خۆشەویستیی ئیجابیی گەشە پێدەکات، بەهاکانی ئیسلامو ڕێبازەکانی لا خۆشەویست دەکات، تا دەگاتە قۆناغی جیاکردنەوە، هانی دەدەین —لە ڕێگەی هەڵبژاردە قورئانییە گونجاوەکانەوە— بۆ گەڕان بەدوای ڕاستو دروستدا، دوورکەوتنەوەش لە خراپەو ئازاردان، ئیتر لەدەروونیدا ڕێبازو بەهاکانمان چاندووە، لەهەمانکاتدا، لە خودیدا کەوتەڕوو ناسکەترسو بیم لادەبەین، کاتێ دەکەوێتە هەڵەی بچوکەوە، لەهەندێ درۆ، یان ئازاردانی هاوڕێ، یان وردەخراپەی حەزی خۆدەرخستن، بەمەش لە بەردەمیدا —بە هەڵبژاردە قورئانییە گونجاوەکان— ڕێگاکانی پیاچوونەوەی دەروون دەکەینەوە، پاکی دەکەینەوە بە ماناکانی تەوبەو لێخۆشبوونو بەزەیی خوایی، ئیتر هەست بەتێکشکان، کەدەبێتە هۆی ڕاکردنی دەروونی خۆبەدەستەوەدان بۆ هەڵەکانو شوێنکەوتنی هەڵە ناکات، تا ئەوکاتەی منداڵ دەبێتە پیاو ئیتر لەبەردەم —بە هەڵبژاردە قورئانییە گونجاوەکان— بەرپرسیارییەتدا دادەنرێت، چارەنووسی پاشەڕۆژی خۆی دەزانێت، هەروەکو چۆن پیاوە عەرەبە هێزو ئازادە هاوڕێکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) —باوەڕیان

هێنابوو بە پیاوی– خرانە بەردەم بەرپرسیارێتیان‌و ڕێنوێنیان بۆ کرا، دەربارەی سەرەنجامی کردەوەکانیان، ئیتر بەهێزەوە شانیاندایە بەر بەرپرسیارییەتی گەورە، ئەوەش بە هێزی کانزایی دەروونیان، کە ئازایەتیی‌و نەبەردیی‌و چاونەترسی بوو، ئەو پاکیەتییەی کە لەسەری گەشەیانکرد، هەر لە منالّییەوە لە کۆشی بە پیتی فراوان‌و سەربەستدا، چاکسازیی ڕۆشنبیریی پەروەردەیی دەبێ هەموو لایەنەکانی پێکهێنانی زانستیی‌و دەرونیی‌و ویژدانیی منالّ‌و تازەپێگەیشتوو بگرێتەوە، دەبێ بخرێتە کار بۆ خزمەتکردنی پێکهاتنی دروستی ژیریی‌و دەروونی منالّ، لایەنی ئاینیی‌و باوەڕی بریتییە لە گرنگترین پێکهێنەرەکان، دەبێ وتاری سۆزدارانەی پێغەمبەرێتیی لەسەر بنەمای تێگەیشتن‌و وردبوونەوەو تێگەیشتنی زانستیی‌و یاسایی بێت، کە ئەوەش بەڵگەو بناغەیە لە بنیاتی پرۆگرامە پەروەردەییە زانستیی‌و دەروونیی‌و ویژدانییەکانی منالّ، کە ماناکانی هێزو بلّندیی‌و سەربەرزیی‌و ڕێزداریی‌و دەستپێشخەریی تیا دەڕوێنێت‌و گەشەی پێدەدات، نەك پرۆگرامی لەبەرکردن‌و ڕق‌و توندوتیژیی‌و ترساندن بێت، کە دەبێتە هۆی چەسپاندنی ملشۆڕیی‌و ترس‌و لاساییکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە.

دەبێ بزانین، کە پەیوەندیی زانستیی بە ویژدانیی‌و دەروونییەوە، کاتێ منالّ فێردەکەین، هەتاکو لەوەشدا، کە لە قورئاندا دەیزانین، گومانم نییە کە شوێنکەوتەبین تیایدا لە بەرنامەی پەروەردەیی دروست، لە هەڵبژاردندا بۆ هەموو قۆناغێ لە قۆناغەکان، کە لەگەڵ منالّدا گونجاوە، لەگەڵ گەشەو بنیاتی دەروونیدا دەگونجێ، کە دەبێ لەخۆشەویستی خواو ئاین‌و ئوممەت‌و پەیوەندیی بە پەروەردگارو باوەڕەکەی، چاکتێگەیشتن لێی، کۆتایی هەموو کردارەکانی بەرامبەر بەخۆی‌و ئوممەتەکەی بگونجێت، وتار بدات، ئەوکاتە، بەوجۆرە وتار دەدات، کە بەرپرسیارییەتی تیایە، بە ئاگایە لێی، ڕێبەری —بە ئامۆژگاریی خۆشەویستیی– دەکات بۆ ئەو شتانەی کە لە سەر کارەکانی دەکەوێت، لە پاشەڕۆژو چارەنووس‌و بەرپرسیارییەتەکانی، پێگەیشتنی تەواو دەبێت، دارەکەی توندوتۆڵ دەبێ، بەرووبوومەکەی بەتام دەبێ —بێئەوەی کە بنیاتی

دەروونیی لاواز ببێت، ئازایەتیی دڵی پەکی بکەوێت، هێزی ئەندامەکانی کەم بکاتەوە- تا ببێتە مسوڵمانێکی چاكو بەهێزو ڕێکوپێك لە ئوممەتێکی بەهێزو زاڵی بەتوانا.

ئەم چەمکە پەروەردەییە بەسەر هەموو ئەو شتانەدا، کە دەخرێتە بەردەستی منالْ لە فیکرو ڕۆشنبیریی‌و زانست جێبەجێ دەبێ، کە تیادا چاودێریی ئاسەوارە دەروونییەکان بکرێ، ئەوەی بخرێتە بەردەست لە ڕووی پەروەردەییەوە گونجاوبێت، لەگەڵ ئەو قۆناغەی، کە گەشەی تازەپێگەیشتووەکەی پیا تێدەپەڕێ، دەبێ کاریگەرییە دەروونیی‌و ویژدانییەکەی بۆ منالاْن‌و تازەپێگەیشتووان، کە دەبێ لە ڕووی زانستییەوە، هەموو لایەنەکانی تێبگەیەنرێت، گرنگی بە بنەماو بۆچوونەکانی بدرێت لەبنیاتی نەخشەکان‌و پرۆگرامە پەروەردەییەکان بۆ هەموو تازەپێگەیشتوانی ئوممەتی ئیسلام.

هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان تاقمێكو تاقمێکی تردا، هەڵبژاردەو خەڵکی گشتیی هەموویان بران، هەموویان سەربازی ئوممەتی مسوڵمانی بەهێزو بەڕێزن.

پێویستە لەسەر هەموو چینەکانی ئوممەت، بە بیریارو چاکسازانەوە، بە باوکان‌و دایکانەوە، بە پەروەردەکاران‌و مامۆستایانەوە، بە تاكو دەزگاکانەوە، کە گرنگیی‌و هەوڵی تەواو لە بواری کاروباری پەروەردەو فێرکردندا بدەن‌و پێشی هەموو شتێکی بخەن، بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی ڕێساکانی قەوارەی ئوممەتو تەقاندنەوەی وزەکانی لە منالْییەتی نەوەکانیدا، گەشەپێدانی دەرامەتە مرۆییەکانیش لەسەر بنەماکانی زانستییەتو ویژدانی ئیسلامیی زانستیی دروست.

ئەگەر چاکسازان‌و بیریاران‌و ڕۆشنبیران‌و پەروەردەکاران، گرنگیبدەن بە ڕۆشنبیریی باوکان‌و مامۆستاو خێزان‌و قوتابخانە، وێژەی زانستیی نەخشە بۆ دانراویان بخەنە بەردەست بۆ سازکردنی تێڕوانینی باوەڕیی دروست، ڕۆشنبیریی پوختە، پەروەردەی ئیسلامیی ڕێکوپێك، ئەوا ئوممەت دەست دەگرێ بە لایەکی دەزووەکەوە، قاچی دەخاتە سەر ڕاستە ڕێگای گۆڕانکاریو چاکسازیی، بەمەش پەنای بردووەتە بەر -لە ڕووی زانستییەوە- پاڵنەرە فیترییەکان بۆ ئیشپێکردنی جوڵەی گۆڕان‌و چاکسازیی، ئەگەر تاك گۆڕا، باری چاکبوو لە ڕووی

باوەڕو زانستو ویژدانەوە، ئیتر ئەوە ڕێگای چالاکە بۆ چاکبوونی کۆمەڵو کۆمەڵگە، دووبارە بنیاتنانەوەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگەو دەزگاکانی لەسەر ئیسلامیی ڕاستو بەهێز، وەڵامی جۆری ڕێسایی ڕامیاریی چاکو دروست دەداتەوە.

تاوەکو قسەی بگۆڕێ بۆ کردەوە، فیکر بۆ کار، دەبێ بەخێرایی دەستبکەین بە دانانی نەخشەی کاری چالاکو فراوان، کە هەموو دەستە دڵسۆزەکان هاوکاریی تیا بکەن، تا بە کرداریی دەست پێبکات —بە ئیزنی خوا— تا لەوەزیاتر دوانەکەوینو بەرەی باوەڕو تواناو سەربەرزییو چاکسازیی بڕوێنین.




ڕەگەزپەرستیی و دەمارگیریی: پیتۆڵی خۆ بەباڵازانین
ململانێی مرۆیی و شارستانیی چەند نێزەیەکی بەرامبەر بەیەکتر

شێوەی (٩)

# بەشی شەشەم
# نەخشەی کار

## بەرەکانی کار

بنەما لە هەموو نەخشەیەکی کاردا، ئەوەیە کە هەمەلایەنبێت، کارکردن تیایدا لە چەند بەرەیەکی هاوسەنگو تەواوکارو ڕێکەوە بێت، تا ئەو بەروبوومەی، کە ئومێد دەکرێت هەیبێت، بە دەستبکەوێت.

مەبەست لەم نەخشەیە، دەربارەی کاروباری منالّییەتی، بریتییە لەگۆڕانی دەروونییو ویژدانیی، تا دەروونی مسوڵمان بەهێزو کاریگەرو بنیاتنەرو داهێنەربێت، ئەوەش دووبارە گەڕانەوەی بنیاتی ژیریی مسوڵمانە، تا ببێتە ژیرییەکی دروستو باوەڕدار، بەهێزو زانستییو چالاك بێت.

هەتاکو ئەوەبێت، دەبێ دووبارە تێڕوانینی ئیسلامیی بوونەوەریی قورئانیی بۆ سەردەمی پەیام بگەڕێتەوە، ئەوەش بە هۆی تەکنیکی ڕۆشنبیرییەوە کاتێ تێڕوانینو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی لەسەردەمەکانی پارچەپارچەییو ستەمو دواکەوتن، تووشی جیابوونەوەو زۆرداریی‌و پڕوپوچو نەفامی هات، لە ڕێگای گێڕانەوەی وتاری پەروەردەیی پێغەمبەریی بۆ تازەپێگەیشتووەکان، تا ببێتە بنەمای چاکسازیی پەروەردەیی، ئەوەی کە تۆوی چاکسازیی زانستییو ویژدانیی لە خاکی منالّیدا لەسەر بنەمایەکی پتەو دەڕوێنێت، (لایەنی نادیار)ی ئوممەتیش بگەڕێتەوە لە پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی شارستانیی.

## هۆشیارکردنەوەی ڕۆشنبیرانو بیریاران

هەنگاوی یەکەم لەم پلانەدا، بریتییە لە هۆشیارکردنەوە بە سروشتی گرفتەکەو لایەنە ڕۆشنبیرییە مێژووییەکەی، لەگەڵ دڵسۆزی زۆردا کە ڕۆشنبیرانو بیریاران پێی ڕازاوەن، ئەو هەوڵە زۆرە ماندووکەرە، کە لە مەودای چەرخەکاندا

دراوه له چوارچێوەی بارودۆخو ئاستەنگەكانی ئوممەت، بەڵام ئەو هەوڵانە كاریگەریان سنووورداربوو، بەرووبوومی نەبوو، مەبەستەكانی لە گێڕانەوەی وزەو توانای ئوممەت نەهێنایەدی، ئەوەش لەبەر نەبوونی ڕوانینی فراوان، نادیاربوونیی ڕۆڵی ژیریی یاسایی دروست لە ڕوانین‌و لێكۆڵینەوەو وانەی دەروونیی كۆمەڵایەتی، ئەوەش بەهۆی ئەو شتانەی، كەكەوتنە ناو ژیریی مسوڵمان لە بیری میتافیزیكی وێنەیی ئیغریقەكان، كە زاڵ بوو بەسەر فیكری ئوممەتی ئیسلام‌و ئاسۆ زانستییەكانی، لەگەڵ لایەنی توندوتیژی ململانێی ڕامیاریی كە زۆر لە زانایان ناچاربوون ڕووبەڕووی هەڵبژاردە ڕامیارییە ستەمكارەكە ببنەوە، بە بەرگرییكردن لە پیرۆزییەكان‌و باری ژیان، بۆ پاراستنی بۆماوەش، كە تا ئەمڕۆش ئاسەوارەكانی زاڵە بەسەر فیكری ئایینیی لاساییكارییەوە.

بنیاتی دەروونیی‌و وزەی ویژدانیی ئومەتی ئیسلام لاواز دەكات، كەش‌و هەوای فیكریی‌و ڕامیاریی وەك خۆی مایەوە لە جیابوونەوەو ململانێ‌و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی شوێنكەوتەو لایەنگر، كەس لای نەكردەوەو بەئاگا نەهات بۆ ڕۆڵی منداڵیی‌و پەروەردەو فێركردن لەڕوودانی گۆڕانكاریی‌و گێڕانەوەی بنیاتی گەلاندا، كاروباری منداڵ بە پشتگوێخراوەیی مایەوە، لەبەرئەوە لێكۆڵینەوەی قۆناغی منداڵییەت‌و وێژەكانی‌و لێكۆڵینەوە زانستییە ئیسلامییەكەی، تا ئەمڕۆ هیچ گرنگییەكی پێنەدرا، هیچ بەخشینێكی فیكریی نەبوو، كۆكردنەوەی توانا هونەریی‌و زانستییەكان پشتگوێخرا، هەروەها وێژەكانی بینای خێزان، تەنها لایەنی شێوەكانی فیقهی یاسایی دەگرتەوە.

بەمەش ناوەڕۆكی بنیاتی دەروونیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و زانستیی، لە پەیوەندییەكانی خێزان، كاروباری پەروەردەكردنی منداڵ‌و گەشەكردنی لەسەر بنەما زانستە ئیسلامییە پتەوەكان پشتگوێ خرا.

كەواتە هۆشیاركردنەوەی بیریارو پەروەردەكارە ڕۆشنبیرەكان بە گرنگیەتی (منداڵ)و چاودێریكردنی پەروەردەیی لە بنیاتی دەروونیی ویژدانیی‌و ناسینی زانستیی لەسەر بنەمای ڕێسا باوەڕیە یەكتاپەرستییە جێنشینایەتیە ڕوون‌و جێگیرەكە، بریتییە لە گرنگترین بنەماكانی ڕاپەڕینی ئوممەت، ئەمەش مانای

**هۆشیارکردنەوەیە –بە هەمان ئەندازە– بە گرنگییەتی (خێزان)و بنیاتەکەی، تا ببێتە خاکێکی بەپیتو کۆشکی بنەڕەتیی بۆ بیناکردنی ژیریی منداڵو دەروونو ویژدانی.**

**ئەگەر هۆشیارکردنەوەی سەرکەوتوو بوو، لە ئاراستەکردنی ئەندازەیەکی گونجاو لەگرنگی پێدانی بڕیارانو پەروەردەکارانو چاکسازان بۆ گرنگیی منداڵو خێزان لە ڕووی پەروەردەییەوە، هەروەها هەوڵدانی پێویست بۆ پوختەکردنی ڕۆشنبیرییو پێشخستنی چەمكو هۆکارە پەروەردەییەکانو چڕکردنەوەی لێکۆڵینەوەی پێویست لەم بوارانەدا، دەرکردنو چاپکردنی وێژە داواکراوەکانیش، ئەوا ڕوودانی گۆڕانکاریی لە یەك بەرەدا کارێکە، دەکرێت پەیدا ببێت، ئەمەش بەرنامەی پەروەردەیی موسا (علیه السلام) سەلماندی لە ئازادکردنی نەوەی ئیسرائیل[1]، کە سەرشۆڕکرابوونو بووبوونە کۆیلەی**

---

[1] گرنگە سەرنجی ئەو جیاوازییە بدەین کە لە نێوان گەلی موسا (درودی خوای لەسەر بێت)و گەلی هەڵگری پەیامی ئیسلامدا هەیە و پاشان سەرنجی کاریگەریی ئەو جیاوازییە بدەین لەسەر ئەو ڕەوشتەی حەزرەتی موسا لەگەڵ گەلەکەی هەیبوو، هەروەها ئەو گوتارەی پێغەمبەری ئیسلام بۆ گەلەکەی دەدا، کە دیارە بۆ خۆی دەمانباتە سەر ئەو ڕەوشتو گوتارەی پێویستن بۆ قسەکردن لەگەڵ گەلانی موسڵمان.

حەزرەتی موسا نێردرا بۆ سەر بەنی ئیسرائیل، کە لە میسر بە کۆیلە کرابوونو بە چەشنی ئەسپی ڕەتێنراوی بە ئومێدی زۆربوونیان لێهاتبوو، بۆیە ڕێبازی حەزرەتی موسا بە فەرمانی خوا ئەوەبوو کە نەوەیەکی ئازادو بەخشندە و ئازا لە ماوەی چل ساڵدا لە بیابانی سینادا پەروەردە بکات، بەڵام حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) لەناو گەلی عەرەبدا دەستی بە گوتار کردو شەرەفی هەڵگرتنی ئەو پەیامەی پێ بەخشین بۆ خەڵکی جیهان، ئەم گەلەش کۆمەڵە هۆزێکی دەشتەکیی ئازاد و بەخشندە بوون، کە ملیان بۆ قەیسەرو خەسرەوان نە نەواندبوو، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی گوتاری کردە بڕوادارەکانیان بە مژدەو بە بەرپرسیارێتیو ڕووی هەڕەشەو وریاکردنەوەش کردە ئەوانەی دژو بێباوەڕو نەیار بوون، ئینجا ئەو عەرەبە ئازادو ئازایانەی وەکو ئەسپی چەمووش بوون، پەیامەکەیان بەوپەڕی هێزو ئەمانەتەوە هەڵگرتو ئاڵای ئیسلامیان شەکاندەوەو بنەماکانی ژیاری ئیسلامیان بەرزکردەوە.

**فیرعەونەکان، ئەو کارەش، کە گەورەمان موسا (علیه السلام) کردی، بریتیی بوو لەبردنی نەوەی ئیسرائیل بۆ (بیابانی سینا)و بۆ ماوەی چل ساڵ پەروەردەی کردنو کۆیلایەتیی لە مێشکیاندا سڕییەوەو بەرەیەکی نوێ پەیدابوو، کە کۆیلایەتییان قەبوڵ نەدەکردو سەرشۆڕییان نەدەکرد، پێغەمبەریشمان (ﷺ)هەمان ڕێچکەی موسای گرتو وتارەکانیو پێڕەوەکەی، پەروەردەی تازەپێگەیشتووەکانی دەکرد، ئەمە سەربارەی ئەو ئەزموونانەی، کە گەلانی هاوچەرخ جێبەجێیان کردووە، هەروەکو زۆربەمان دەزانین لە دەروونماندا گۆڕان ڕوویداوە لە چەمکەکانو زانیارییەکاندا، لەو چەمكو زانیاریانەی، کە لەبەری باوکانماندا بووە، لە ماوەی یەك بەرەدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە وەك ئەو گۆڕانە یان زیاتر لەوە لە بواری قووڵتردا دەکرێت، گۆڕان لە تەمەنی بەرەیەکدا لە دوای ئێمە ڕوو بدات ئەگەر –ئێمە هەوڵبدەینو کۆشش بکەین لە ماوەی چل ساڵ، یان پەنجا ساڵی داهاتوو –بە ئیزنی خوا– ئەمەش لای خوا شتێکی قورس نییە.**

---

کاتێکیش پاشاو سوڵتانەکان سەری گەلانی موسڵمانانیان شۆڕ کرد، بۆ جاری دووەم لەسەر دەستی هۆزە ئازادو ئازاکان کە تازە موسڵمان بوو بوونو دەوڵەتی عوسمانییان دامەزراند، بەخۆدا هاتنەوە.

ئەمڕۆش کە حاڵی موسڵمانان بەو جۆرەیە کە زۆرربەی زۆریان یەخسیری دەستی دیکتاتۆرییو سەرەڕۆیین، لە ناخیاندا گیانی کۆیلایەتیی پەیدابووەو دواکەوتوون، دەبینین ڕێبازی پەروەردەیی حەزرەتی مووسا بەسەر حاڵی گەلانی مسوڵمانو نەوەکانی ئەم دواییەدا دەچەسپێتو چارەیەکیان جگە لە دووبارە بنیاتنانەوەی یاساو ریفۆرمی دەستپێکەکانی عەقڵی مسوڵمانو کانزای هەستی لاوەکان لەسەر ئەو ڕێبازەی کە جارێکی تر نیشانەکانی گوتاری پێغەمبەری بۆ منداڵانو لاوان دووبارە بکەینەوە.

وەك چۆن پێویستە لەسەرمان سەرنج لە کانگای ڕۆڵەکانی گەلانی تازە هاتوو بۆ ناو ئیسلام بدەین، ئەو گەلانەی ئازادو پێشکەوتوونو لە هێزو ئازایەتیی بەهرەمەندن کە ئەوانیش هێزێکی دیکەن بۆ ئیسلام، تاوەکو سیفەتەکانی هێزو ئازایەتییان بپارێزنو هەوڵبدەین ئەو کولتووره ئالودەییەی کە دەیاندەینێ نەبێتە ئامرازێکی نێگەتیڤ، کە وزەکانیان کۆت بکاتو هەستی لاوەکانیان بڕووخێنێت.

## گەشەکردنی فیکری ئیسلامیی کۆمەڵایەتیی ڕەخنەگران

هەوڵی زۆر بەخشرا، پرۆژەی زۆر پێشکەشکرا، بە مەبەستی چاکسازیی فیکریی‌و تەواوکاریی زانستی، لە نێوان ڕێنموونی نیگاو ئایەتەکانی قورئان‌و لە لایەك‌و ڕوانینی ژیری‌و نیشانەکانی بوونەوەرو پارێزگاریکردن لەسەر جێگرەکان خستنە کاری گۆڕاو لە لایەکی ترەوە، بەڵام دوورەپەرێزی خاوەنی زانستی قوتابخانەییەکان، هەڵسوکەوتکردنی زانستی وانە وتنەوەی لاساییکارانە، وایکرد کە خاکی ڕۆشنبیریی‌و فیکری ئیسلامیی یارمەتیدەربێت لەسەر گەشەکردن‌و خستنەگەڕ تا ئەمڕۆ، بێئەوەی خەڵکی خاوەن پیشەی زانستیی‌و چاکسازان‌و خەڵکی بەگشتی، هەست بکەن بە ترسناکی ئەم لایەنە.

بۆ خستنەکاری ژیریی دروست‌و بەپیتکردنی خاکەکەی، دەبێ هانی فیکری ئیسلامیی زانستیی کۆمەڵایەتیی ڕەخنەگر بدرێت، ئەوەی ئامانجە، بریتییە لە گەڕانەوەی تێڕوانینی گشتییی فراوانی ئیسلامیی، بۆ تەواوکاری سەرچاوەکانی مەعریفەی ئیسلامیی —لە سەر بنەمای ئەم تێڕوانینەو ئەم پرۆگرامە— نە لەو شتانەی کە پیسی کردووە، پێشخستنی بەرنامەکانی پەروەردەیی بۆ گەڕانەوەی بینای دەروونیی‌و ژیریی ئیسلامیی جێنشینایەتیی، بە ئامانجی گەڕانەوەی بنیاتی بەرەکانی ئوممەت لەسەر ئاستی توانای گەیاندنی داواکراو، بۆ چارەسەری گرفتەکان، بەدیهێنانی مەبەستەکانی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی شارستانیش، هەروەها بەرەنگاربوونەوەی ئاستەنگە هاوچەرخەکان.

هەوڵی گرنگ‌و زۆر بەخشراوە بۆ چاکسازیی کە سەرکەوتوو نەبوون لە بەدیهێنانی ئامانجەکان‌و هەستانەوەی ئوممەتدا، چونکە گرنگی نەدەدا بە گۆڕانکاریی پەروەردەیی مناڵ، بەڵکو وەك وتارێکی ترساندن‌و بانگێکی زانستیانەی هەمیشەیی ئاڕاستەکراو بۆ هەرزەکارەکان مایەوە، لەگرنگترینی هەوڵەکان لە مێژووی ئوممەتی ئیسلامدا، هەوڵەکانی پێشەوا (ئەبی حامدی غەزالی)یە کە لە ساڵی ٥٠٥ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی ١١١١ زایینی کۆچی دواییکردووە، پێشەوا غەزالی، هەر خێرا بۆی دەرکەوت کە پێویستە چاکسازیی زانستی بکرێت، لە پەرتووکی (تهافت الفلاسفة) ئەوەی باسکردووە، بە ئامانجی

جۆرە ڕێکخستنێك لە نێوان ئایین‌و ژیریدا، ئامانجیشی لە نووسینی پەرتووکی (إحیاء علوم الدین)دا ڕێکخستنی نێوان زانیاریی شەرعیی ژیریی‌و ویژانیی بوو، بەڵام ئەم بانگەوازەو ئەم ئاڕاستەیە سەرنەکەوت‌و لە ڕوودانی گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی زانستیی، کە دەبێتە هۆی کارلێککردن لە نێوان بەهایی‌و یاساییدا (القیمی والسننی)، چونکە سەرکەوتنەکەی مەرجداربوو بە بنیاتەکەی لەسەر بنەما زانستییە بەرنامەییەکە لە یاساکان‌و زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەك، لەلایەکی ترەوە، سەرکەوتنی چاکسازیی ویژدانیی پەروەردەیی مەرجدار بوو بەوەی، کە ئاڕاستە دەکرێت بۆ منداڵ، بەشێوەیەکی زانستیی نەخشەبۆدانراو بۆ قۆناغی منداڵییەت‌و ڕوودانی گۆڕانکاری لە بنەمای بنیاتی منداڵیەتدا.

هەروەها پێشەوا ئیبن تەیمییە، کە لە ساڵی ٧٢٨ی کۆچی، بەرامبەر بە ١٣٢٨ زاینیی، کۆچی دوایی‌کردووە، هەستی بە کارێکی گرنگ کرد لەبنیاتی کەسایەتیی مرۆڤایەتییدا، ئەویش باوەڕو سەلامەتیی باوەڕبوو، بەڵام لەئەنجامی زاڵبوونی فیکری تیۆری کێشمەکێشم –کە لەو بارودۆخ‌و چەرخەدا باوبوو– ڕێگە نەبوو ئەم لایەنە زانستییە جێگای خۆی بکاتەوەو ڕێگا بگرێتەبەر بۆ لایەنی پەروەردەیی‌و وەبەرهێنانی لە پڕۆگرامەکانی پەروەردەیی کرداری چاك، لە پێناوی گۆڕانکاریی‌و بنیاتنانی منداڵییەت، بەڵکو زۆر کەس لەوانەی، کە کاریگەربوون بە فیکری ئیبن تەیمییە، لەهەموو کەس دوورتربوون لەهەستکردن بەهۆکارە دەروونیی‌و ویژدانیی‌و پەروەردەییەکان یان گرنگی پێدانی.

پێشەوا ئیبن حەزمی ئەندەلوسیی، کە لە ساڵی ١٠٦٤ی زاینی، کۆچی دوایی‌کردووە، بەشدارییکرد لە بنیاتی بنەماکانی بەرنامەی زانستیی یاسایی کۆمەڵایەتیی، هەورەها ئیبن خەلدون، کە ساڵی ١٤٠٦ زاینیی کۆچی دوایی‌کردووە، ڕێساکانی ئەم بەرنامەی دامەزراند، بەڵام فیکری ئەم دوو پێشەوایە پەراوێزخرا، هەروەکو چۆن فیکری کەسانی داهێنەری زۆر لە سەردەمەکانی لاساییکردنەوەو وەستانی فیکرییدا پەراوێز خراون.

فیکری ئیبن حەزم ڕواڵەتیی بوو، پەرتوکەکانی ئیبن خەلدونیش گرنگی نەبوو لای زانایانی چەرخی لاساییکاریی‌و نەدەخوێنرانەوە، لەبەرئەوە، ئەم فیکرە لە بنیاتی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکاندا دانەمەزرا، بەشداریشی نەکرد لە

پێشخستنی لێکۆڵینەوەی زانستیی پەروەردەیی بۆ ڕوودانی گۆڕانکاریی خوازراو لە بنەمای بنیاتی منداڵیەتی مسوڵماندا.

لە زانایانی چەرخی دوایی، دەبینین پێشەوا موحەمەد عەبدە، کە لە ساڵی ١٩٠٥ی زاینی، کۆچی دوایی کردووە، لەدوای خۆی پیاوە گەورەکانی قوتابخانەی (المنار)و قوتابییەکانی، ئەوانەی کە هەستیانکرد بەگرنگییەتی لایەنی باوەڕی، بەهێزکردنی ژیریی زانستیی، هەروەها پوختەکردنی ڕۆشنبیریی ئیسلام لە چەمکەکانی ئەفسانەو شتە پڕوپوچەکان، هەروەها شێخ عەبدوڕڕەحمان کەواکبی، کە لە ساڵی ١٩٠٢ی زایینیی کۆچی دوایی کردووە، هەستی بە گرنگیی لایەنی گشتییو ڕامیارییو پێویستی چەسپاندنی لەسەر بنەڕەتێکی بەهێزو پتەو لەڕێبازەکانی ئیسلامو بەهاکانی کردووە، باوەڕیشی وابووە کە پێویستە زاڵ بوون بەسەر زۆرداریێتی لە کۆمەڵگەدا بکرێت، بەڵام ئەم چاکسازیە نەگەیشتە قووڵیی داواکراو، ئەو مەبەستانەی کەهەشیانبوو نەهاتەدی، چونکە لە بازنەی مەعریفییو بازنەی وتاردان بۆ هەرزەکارەکاندا مایەوە، بە فیکرو لێکۆڵینەوەکانیان ڕوویاننەکردە منداڵو پەروەردەکردنو گۆڕانکاریی لە بناغەی بنیاتی کەسایەتیی مرۆییدا، هەروەها داڕشتنەوەی کانزای ویژدانیی مرۆڤایەتیی، لەسەر بنەما زانستییەکان لە قۆناغەکانی منداڵییدا.

هەموو ئەم هەوڵانەو ئەوەی کە لە دوای ئەم هەوڵانەوە هات، گۆڕانکاریی داواکراوی بەرهەمنەهێنا، چونکە فیکری وشکو وەستاوی قوتابخانەییو لاساییکردنەوە، هەموو ئەم هەوڵانەی پەراوێزخستنو سنووری بۆ ئاسۆکانی دانا، ڕێی پێنەدا گەشە بکاتو کاریگەر بێت لە داڕشتنی فیکری زانستی ئیسلامیی کەلەسەر تەواوکاریی بەرنامەیی زانستی بەرپا بێت، ڕێی نەدا بەبنیاتی زانستی دەروونیی کۆمەڵایەتییو پێشکەوتنی بەرنامەی پەروەردەیی.

لە لایەکی تر فیکری هێنراوو بەخۆرئاواکردن لە ویژدانی ئوممەتدا هیچ وەڵامدانەوەیەکی بۆ نەکرا، دەروونو بنەماکانی بنیاتی باوەڕی وەڵامدانەوەی بۆی نەبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەمیش پەراوێزبخرێت، –بە شێوەیەکی خۆییو هۆکارە بابەتییەکان– کاریگەری لە ویژدانی ئوممەتدا دروست نەکات، ناخو ویژدانی ئوممەت پێی کاریگەرنەبوو، وەڵامی بانگخوازانو

هەوڵی شوێنکەوتوانی خۆرئاوای نەدایەوە، لە گۆڕانکاریی‌و جوڵاندنی وزەی شاراوەی ئوممەتی ئیسلام.

دەبێ هەست بەم وانانە بکەین، دەبێ بزانین، کە پێویستە کاری ئیسلامیی چاکسازیی بە شێوەیەکی خۆیی‌و کوێرانە بەردەوام نەبێت، بە تایبەتی لە بواری فیکرو ڕۆشنبیریی‌و پەروەردەدا، بەڵکو دەبێ کاری چاکسازیی بگۆڕێت بۆ فیکری بەرنامەیی، بە ئامانجی بنیاتی تەواوکاریی زانستی لە نێوان زانستەکانی ڕێنموونی خوایی گشتیی‌و زانستەکانی ژیریی یاسایی، هەروەها پێشخستنی زانیارییە کۆمەڵایەتییە مرۆییە ئیسلامییەکان، بە پێشکەشکردنی جێگری باش بۆ بنیاتنانی تەواوترین مرۆڤ و چاکترین شارستانییەت.

## چاکسازیی ڕۆشنبیریی

بۆ داهێنانی چاکسازیی ئیسلامیی، دەبێ بنکەی فیکریی چاکسازیی بکرێ بە چاکسازییکردن‌و پوختەکردنی ڕۆشنبیریی چونکە هۆکاری چاکسازی پەروەردەییە، گەڕانەوەی بنیاتی مسوڵمان لە ڕووی زانستیی‌و دەروونیی‌و ویژدانییەوە لەسەر بنەمایەکی دروست.

چاکسازیی ڕۆشنبیرییش هەوڵی بەردەوامیی ئیسلامیی دەوێ، کە لەسەر مەبەستەکان‌و ڕێکخستنی ئیسلامیی‌و چەمك‌و بەهاکانی بنیات بنرێ، بگەڕێتەوە سەر بنەماکەو پوختە بکرێ، ئەم هەوڵانە چووەتە —بە چاکسازیی فیکریی‌و ڕۆشنبیریی— قۆناغێکی پێشکەوتوو لە پێگەیشتن، بە کارکردن لەسەر چاکسازیی کردنی لایەنی بەرنامەیی، کە دەبێتە هۆی گێڕانەوەی یەکێتیی سەرچاوەکانی زانست‌و ڕۆشنبیری ئیسلامیی لە ڕێنمونی نیگاو ڕێبازەکانی ژیریی‌و یاساکانی بوونەوەر، دانانی ئەم بەرنامە زانستییە ئیسلامییە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو شتانەی، کە تووشی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی بووە لە تێکچوونەکان‌و پارچەپارچەیی بە بەرەنگاربوونەوەی ئەم تێکچوون‌و لادانانە، پوختەکردنی ڕۆشنبیریی‌و ژیریی مسوڵمان لە ئاسەوارەکانی، تا ڕۆشنبیریی ئوممەت، بتوانێ یەکێتیی‌و گشتیی ببنەوە بەیەك، بەمەش بەسەر ئەو شتانەی کە تووشی ڕۆشنبیریی ئوممەت‌و لایەنە گشتییەکانی بووە سەربکەوێ، لەو تێکچوونانەی کە

زاڵ بووە بەسەر گیانی زانستیی یاساییو زاڵ بووە بەسەر لایەنی گشتییو کۆمەڵکاریدا، بووەتە هۆی جێگیرکردنی سلبیاتی ژیریی تاکەکانیو ژیریی خورافەتو چەواشەکاری.

پوختەکردنی ڕۆشنبیریی، بریتییە لە گرنگترین بناغەکان، کە گیانی ئاوەدانیو ژیری زانستی دەگەڕێتەوە بۆ ئوممەت، زاڵ دەبێ بەسەر فیکری ڕەگەزپەرستییو خورافەتدا، چونکە ڕێگوزەرە ڕۆشنبیرییەکان بناغەو دەرگان بۆ بنیاتی فیکری پەروەردەیی دروست، ئەمەش شێوازە زانستییە پەروەردەییەکان، لە کرداری گێڕانەوەی بنیاتی کەسایەتیی مسوڵماندا دادەمەزرێت، لە لای منداڵی مسوڵمان لە ڕووی زانستییو ویژدانییەوە، لە هەردوو لایەنی تاکییو کۆمەڵیی، گیانییو ڕەوشتیی، ماددییو بژێویی، هەرکەسێ مەبەستێکی گیانیی ئاوەدانیی ڕەوشتی دوورتر لە خودی ماددیی نەبێت، ئەوە مرۆڤێکە تەمەڵو لەرزۆکە، ناتوانێ لە کاروبارەکاندا بەرنگاری ئاستەنگەکان ببێتەوەو هەنگاو بنێ بەسەر ناڕەحەتییەکاندا، کۆسپەکان تەخت بکات، ئەوە سەرەنجامی خۆییو ئوممەتەکەی بریتیی دەبێ لە هەڵهاتنو خۆکوشتنو کەوتنو لەناوچوون، ئەوەی بووەتە هۆی مانەوەی ئیسلام، خۆگری ئیسلامو ئوممەتەکەیەتی، بەپێچەوانەی باری زۆربەی نەتەوەکانی تر —لەگەڵ ئەو هەموو هەڵەو ناخۆشیانەی، کە ئوممەت هەیەتی— هەمیشە بەردەوامەو لە ناو ناچێتو ناسوێت، بەردەوامە لە ڕاوەستاوییو گیانی خۆگریی تیایدا لە چەند سەدەوە، ئاواتەکانی تازە دەبێتەوەو ناکوژێتەوەو لەناو ناچێ، بەردەوام دەگەڕێ بە دوای ڕاپەڕینو تازەبوونەوەدا.

## چاکسازیی پەروەردەیی

زانست بە تەنها بۆ گۆڕانکاریی بەس نییە، دەبێ چاودێریی لایەنی دەروونی ویژدانی بکرێ، بۆ ڕووداوەکانی گۆڕانکاریی لە مرۆڤدا، مرۆڤ ژیرییو سۆزو ویژدانە، ئەگەر بە شێوازێکی زانستیی دروست، مامەڵە لەگەڵ ئەم دوولایەنەدا بە یەکەوە بکرێت، ئەوا گۆڕانکاریی لە زۆربەی بارەکانداو لە گرنگترینیانا نایەتەدی، ئەگەر بمانەوێ کەسایەتیی ئیسلامیی ئیجابیی بێتو لەگەڵ پێویستییەکانی

ئوممەتدا بێت، وەڵامی داواکانی بداتەوە، ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان ببێتەوە، ئەوا لایەنی زانستیی بە تەنها بەس نییە بۆ بەدیهێنانی ئەم کارە، بەڵکو دەبێ لایەنی دەروونییو ویژدانیش بگرێتەوە، تاوەکو زانست بگۆڕێ بۆ کردارو بەخشینو خۆگرییو قوربانییدان، ئەگینا زانستی تاك بەوەی، کە لە دەوروبەریدایە، لە بارەکانو وەڵامدانەوەی بۆ ئەو شتانەی، کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە ئاستەنگەکان، وەك ئەو گوێدرێژە وایە، کە بارێك کتێبی هەڵگرتبێو ناتوانێ سوودی لێوەر بگرێ، یان وەك ئەو پزیشکە وایە، کە جگەرەدەکێشێ، لەکاتێکدا لە هەموو کەس زاناترە بە زیانەکانی جگەرەکێشان، بەڵام ئەوە بەس نییە، بۆ ئەوەی ئەو و هاوشێوەکانی جگەرە نەکێشن، چونکە کارەکە بە تەنها زانستو مەعریفە نییە، بەڵکو لایەنی دەروونیشی هەیە، کە دەبێ حیسابی بۆ بکرێ، تا زانست ڕۆڵی خۆی بگەیەنێ، ئاسەوارەکانی بهێنێتەدی، نموونەی ئەمەش وەك کەسێکی تلیاکخۆر وایە، ئەو کەسە حاڵی خراپی خۆی دەزانێ، بەڵام ناتوانێ وازی لێبهێنێ، لەبەرچەند هۆکارێکی دەروونییو زیندەیی کە بەتەنها زانینەکەی بە زیانەکانی، سوودی بۆی نییە، بەڵکو دەبێ چارەسەری دەروونیو ویژدانیی بۆ دابنرێ، کە لە ناخیدا گیانی بەرەنگاربوونەوەو هێزی ویست گەشە بکات، هەروەها نمونەی ئەمەش وەك شاعیرێك وایە، کە شیعری ئازایەتییو حەماسەتی زۆری لەبەرە، بەڵام لە بەرەنگاربوونەوەو جەنگدا، لە کەروێشك ترسنۆکترە، لە ڕاکردنو هەڵاتندا لەئاسك خێراترە.

لەبەرئەوە، دەبێ بەرنامەی زانستیی دابنرێت بۆ لێکۆڵینەوەی قۆناغی مناڵی، ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوانە بۆ گەشەکردنی شێوازەکانی پەروەردەیی بۆ گەشەی بەرەکان (الاجیال) لە ڕووی دەروونییو ویژدانییەوە، بەوەی سیفەتە ئیجابیەکان بەدیدێت، کە باوەڕو —لە بنەمای پێکهاتەی کەسایەتیی مسوڵماندا— سپاردەو ئازایەتییو هێزو داهێنانو دەستپێشخەری لەسەر بنیات دەنرێ، چونکە پێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤایەتییو کۆڵەکەکانی بنیاتی دەروونییو ویژدانیی لە قۆناغەکانی منداڵییو هەرزەکارییدا دروست دەبێتو تەواو دەبێت، بەڵام ئەگەر لەم قۆناغەدا دەرفەتی بنیاتی منالیی لەدەستبچێ، دارەکە لاردەبێ، ئیتر زانستو زانین سوودی نابێ، ترساندنو تۆقاندن بێکەڵك دەبێت، مەگەر لە

**دەرخستنی ڕووی ناشیرینی دووفاقەیی کەسایەتیی لە نێوان ڕواڵەتو هەواڵپێدراودا، لە نێوان گوفتارو کرداردا، دەرخستنی باری خراپو کەموکورتیی گەیاندن، "الناس معادن، خيارکم في الجاهلية خيارکم في الاسلام إذا فقهوا".**

**ئەگەر پوختەکردنی ڕۆشنبیریی ئەو تۆوە بێت کە سروشتی دارو بەروبووم دیاریی دەکات، ئەوا پەروەردەکردن ئاوی شیرینەو خاکی بەپیتە، بۆ گەشەکردنی ئەو دارە، بۆ شیرینکردنی بەروبومی دارەکە، بە بێ خاکو تۆو و ئاو درەخت، گەشەناکاتو بەروبووم شیرین نابێت.**

## وێژە پەروەردەییەکانی خێزان[1]

[1] یەکێك لە لایەنەکانی گرنگیدانی قوتابخانەی (بە ئیسلامییکردنی مەعریفە) بە لایەنی پەروەردەو ئەدەبیاتی پەروەردەیی بۆ خێزانی مسوڵمان، کە پەیمانگای جیهانیی بۆ هزری ئیسلامیی ژمارەیەك کتێبی گرنگی دەرکردووە و سیمینارگەلێکی زانسیتی سەبارەت بە پەروەردەی لە ماوەی دە ساڵدا ساز داوە.

لەوانە پەڕاوی (ڕێنمایی کتێبخانەی خێزانیی موسڵمانی) دووجار چاپ کردووە، کە نووسەر کاتێك سکرتێری گشتیی نەدوەی جیهانی لاوانی موسڵمان بوو (١٩٧٣- ١٩٧٩) پێشتر پلانی بۆ دانابوو، هەروەها سەرپەرشتی ئامادەکردنی دەکرد، هەنووکە (دەزگای گەشەپێدانی منداڵ) دەیەوێت بۆ جاری سێیەم چاپی بکاتەوە.

بابەتی ئەم ڕێنماییە ناساندنی باشترین کتێبو ئەدەبیاتی ئیسلامیی بەرجەستەیە، بۆ قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنی ئەندامانی خێزانو ڕۆڵە جیاوازەکانیان لە خێزاندا، لە پاشکۆی ڕێنماییەکەدا پێرست گەلێك هاتووە کە یارمەتیی خوێنەر دەدەن بۆ گەیشتن بە داواکارییەکەی لەم ئەدەبیاتەدا، بەپێی قۆناغەو ڕۆڵی ویستراو و پسپۆڕیی، زۆر بە ئاسانی وێڕای ناساندنی نووسەرەکانیان ئەگەر توانرابێت.

ئەم دەزگایە حاڵی حازر ئامادەکاریی دەکات بۆ ئەنسکلۆپیدیایەکی گشتگیر کە ئەویش (ڕێنمایی چیرۆکی ئیسلامی)یە، بۆ ئەوەی خزمەت بە خێزانی مسوڵمان بکات، بە ناساندنی گێڕانەوەی پاك، کە خۆشییەکی پاك فەراهەم بکاتو یارمەتییدەری گەشەی کۆمەڵایەتیی بێت و بایەخە بەرزەکان بچێنێتو بەهێزیان بکات، لای ئەندامانی خێزان، لە هەموو قۆناغەکانی تەمەنو کەلتووردا، ئەم

ئەگەر ئێمە هەستمان بە گرنگیی پوختەکردنی ڕۆشنبیریی‌و بەرنامەی پەروەردەیی منداڵ کردبێ، گرنگ ئەوەیە کە بیریارو کۆمەڵناس‌و زانایانی دەروون‌و پەروەدە وێژەی زانستیی پێشکەش بکەن، ئەوەی باوکان فێر دەکات، کە چۆن باوکی ڕاستەقینەبن، چەمکی ئیسلامیی زانستییان بۆ ساز بکات، چەمکی کۆمەڵایەتیی‌و پەروەردەییان بۆ دروست بکات، کە یارمەتیی بنیاتنانی خێزانی دروست‌و پاراستنی تا ببێتە کۆشکێکی پەروەردەیی چالاك بۆ گەشەکردنی منداڵ، دانانی شێوازی دروست بۆ پەروەردەی منداڵ لە ڕووی زانستیی‌و دەروونیی‌و ویژدانییەوە، بۆ هێنانەدی مرۆڤی جێنشین‌و باوەڕدارو بەهێز، کە هەموو سیفەتەکانی سپاردە پاراستن‌و ئازایەتیی‌و دەستپێشخەریی‌و داهێنانی تیا بێت، چەکدار بێت بە عەقڵییەتی زانستیی پاکوبێگەردبێ، لە نەنگییەکانی تاکیی‌و سلبییەت، لە فیکری پڕوپوچ‌و چەواشەکار.

ئەوەی گرنگە لێرەدا –ئێمە دەربارەی وێژە بە شێوەیەکی گشتیی، چیرۆك‌و وێژەی منداڵ بەشێوەیەکی تایبەتیی قسە دەکەین– ئاماژەی پێبکەین، ئەوەیە کە وێژە لە گرنگترین هۆکارە هونەرییە کاریگەرەکانە لە تازە پێگەیشتووەکانی گەلاندا، وێژە سیفەتەکان‌و ڕۆشنبیریی نەتەوەکان دەردەخات، هۆشیاریی بەم تایبەتمەندیی‌و سیفەتانەو هێماکانی، گرنگییەکی گەورەی هەیە لە بەیەکگەیاندنی لەگەڵ گیانی شارستانیدا، خراپ حاڵیبوون لە سیفەت‌و هێمایانە، –بە تایبەتی لەسەردەمەکانی تێکشکاندا– بە گرنگترین کار دادەنرێ، کە بە بەشێکی فراوان بەشداربووە لە تێکچوونی فیکریی‌و لایەنی ڕۆشنبیریی گەلاندا،

---

ڕێنماییە هەموو چیرۆکەکان دەگرێتە خۆو هەموو جۆرە نووسەرێکیش، بەبێ ڕەچاوکردنی بابەتی چیرۆك یان شناسی نووسەر، چونکە پێوەرەکە بریتییە لە جۆری هونەریی چیرۆك‌و نرخەکەی، کاریگەریی برەوپێدان‌و پەروەردە کردن تێیدا و تا چ ئەندازەیەك پشکیی هەبووە لەسەرخستنی پڕۆژەی ریفۆرمی ویستراودا، بە یارمەتی خودا.

وێڕای ئەوەی ئەم دەزگایە هەڵبژاردەیەکی ئەدەبیی بەرزو ناوازەی سروودە ئیسلامییەکان ئامادە دەکات بە مەبەستی جیاوازیی کۆمەڵایەتیی‌و ویژدانیی، چونکە شیعرو سروود کاریگەرییان هەیە لە بنیاتنانی لایەنە ویژدانیی‌و جوانییەکانی گیانی مرۆڤ بە گشتیی و گیانی مسوڵمان بە تایبەتی.

لەوەش ڕووداوی خراپ حاڵیبوون لە هێما ئیسلامییەکان، کە لە چیرۆکە کەلەپوورییەکاندا خرانەکار، بە تایبەتی چیرۆکی (ألف ليلة وليلة)و هاوشێوەکانی، کە زۆرجار هێمایەکی خراپو شەڕەنگێز لەمرۆڤ و دەعباو خشۆکەکان، وەك مارو شێر وێنە دەکێشێ، ئەوەش هێمای شەڕەنگێزییە، کە گرنگییەکەی لەم چیرۆکانەدا ئەوە ڕێگا نادات مرۆڤ دەستی بگاتە گەنجینە شتەگرانبەهاکان، بەڵام ئەو هێزە خراپانە لە هەوادا لە ناو دەچێت، لە بەردەم ئازایەتیی پیاوانی هەڵبژاردەو ئازا لەوانەی کە دەگەڕێت بۆ گەنجینەکان، چونکە ئەم هێمایانە لە ڕاستییداو لە چوارچێوە ئەندێشەییە ئیسلامییەکەیدا، بریتییە لە هێما بۆ هێزە خراپەکانو سەرکەشەکانو وێرانکارەکان، کە بووە ڕێگر لە بەردەم گەنجینەکانی حەقو چاکەو بەرەنگاری دەبێتەوە، چۆن ئازایەتیی داواکارانی حەقو چاکەو ڕاوەستاوییو خۆگرییان توانی هێزەکانی خراپەو سەرکەشی بشکێنێ، دەسەڵاتی هێزی خراپە لە ڕاستیدا ئەندێشەو تراویلکەیە کە دەبێ هەر هەڵبێتو ڕاکات لە بەردەم داواکارانی گەنجینەکانی حەقو ڕاستییو خۆگرییو ئازایەتیاندا.

ئەوەی جێیداخە، ئەوەیە کە تایبەتمەندییەکانی ڕۆشنبیریو شارستانیی ئیسلامییو هێما وێژەییەکانی بە هۆی نەزانینو نەفامیی ڕۆڵەکانییەوە، بگۆڕێنو ببنە ڕێگوزەرو خاك بۆ فیکری خورافەتو پڕوپوچو شتی بێماناو ئەندێشەی درۆ، کە ترسو بیم دەخاتە دڵی ڕۆڵەکان لەو بابەتانەی کە باسی جنۆکەو دەعباو شت دەکات، هێما ڕۆشنبیرییە ئیسلامییەکان دەگۆڕێت، لە ئەندێشەکانو هێما وێژەییە داهێنەرییەکانەوە، وێنە هونەرییەکان، ئامێرەکانی ڕابواردن، کە پشتگیریی وزەکانی باوەڕو ئازایەتیی دەکات، گەشەدەدات بە وزەکانی بەرنگاربوونەوەی ستەمو خراپە لای لاوانو گەنجان، تا ببێتە —بە نەزانیو دواکەوتوویيو پیسبوونی ڕۆشنبیری— ئامێرەکانی خورافەت، ئیتر وزە شارستانییە ئیجابیەکان بکات بە زەنگی ڕووخاندنو دواکەوتن، یارمەتیدەربێت لەسەر برەودان بە فاڵچێتییو سیحربازییو خورافاتو شتی بێماناو پڕوپوچ.

## وێژە پەروەردەییەکانی قوتابخانە

گرنگیدان بە لێکۆڵینەوەو وێژە پەروەردەییەکان، کە ئاڕاستەی قوتابخانە دەکرێتو ڕۆڵی زانینی پەروەردەییەکەی، ئاڕاستەی مامۆستا دەکرێتو یارمەتی ڕۆڵی زانستییو پەروەردەیی مامۆستا دەدات، یارمەتی زانستیی پێشکەش دەکات، بە بەرنامەو پەرتووکی قوتابخانەیی بنیاتنراو لەسەر چاکترین بنەماو هۆکارە زانستییو پەروەردەییەکان، ئەمەش کارێکی گرنگە دیسان، چونکە مامۆستا بە زانست ڕۆڵی خێزان دەخاتەکار، لە گەشەپێدانی کەسایەتیی منداڵو زانستو تواناکانی، مامۆستا هەوڵدەدات بۆ ئەو شتەی، کە بەرژەوەندیی قوتابی تیایە، ئەگەر زاڵبوون بەسەرکاریدا پەیدا نەبێ، ئەگەر کارەکەی بۆ ئاسان بکرێ، وێژەو هۆکاری داواکراوی بۆ ساز بکرێت، لەبەرئەوە، دەبێ گرنگی بە مامۆستاو قوتابخانەو بەرنامەو پرۆگرام بدرێ، چونکە لە هۆکارەکانی تەواوکاریی ڕۆڵی خێزانن لە پێگەیاندنو پەروەردەکردندا، لە ئامادەکردنو جێگیرکردندا.

## چاکسازییکردنی خوێندنی باڵا

بۆ سەرخستنی پرۆژەکانی چاکسازیی بەرنامەیی فیکریی ڕۆشنبیریی، پێویستە چاکسازیی خوێندنی باڵا بکرێت، بە تایبەتی زانکۆ تایبەتییە خێرخوازییەکان، کە لەوانەیە سەربەستییەکی زیاتری هەبێتو پاڵنەرێتی تیا بێ بۆ تازەکردنەوەو گۆڕانکاریی، هەروەها زانکۆکانی ئەو وڵاتانەی، کە ئازادییو سەربەخۆیی بڕیاریان هەیەو ڕێزی گەیاندنی ئەکادیمیانە دەگرن، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە خوێندنی زانکۆیی ئەو لایەنەیە، کە ئامێری (ئامێرەکان) ڕۆشنبیریی زانستییو تەکنیکییو مرۆڤایەتیی پێسپێردراوە، بە تایبەتی لە بواری زانستەکانی باوەڕییو یاساییەکانو فیقهیدا، لە بواری کۆمەڵایەتیی مرۆڤایەتیدا، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستانە، دەبێ پرۆگرامی زانستیی، کە لە قۆناغەکانی خوێندنی باڵادا دەخوێندرێت، چاکسازیی بکرێت، یەکخستنی ئەم بەرنامانەو سەرچاوەکانی مەعریفەت تیایدا تەواوکاریی ئیسلامییو یاسایی، تاوەکو –بە کردار– ڕۆشنبیرو تایبەتمەندیی ئیسلامیی جێگر دابنێ، لە هەموو

بوارەكانی زانستییو مرۆڤایەتییو فیزیاییدا، تاوای لێبێت، كە بتوانێ فیكرو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی بە ئامانجو جێگر بەرهەمبهێنێ.

جیهانییەتی پەیوەندیی بەیەكترکردنو ئەو توانایانەی، كە هاتوونەتەدی لە هۆكارەكانی پەیوەندییو فێركردنی ئەلەكترۆنیی، لەگەڵ كردنەوەی لایەنی بوار بۆ خوێندن لە بەردەم هەوڵەكانی چاكسازانو پیاوانی كاركەری دڵسۆزو پڕۆژەكانیان، بواری فراوانی كردووەتەوە بۆ بەشداربوون لەچاكسازیكردنی خوێندنی باڵادا، هاندانی لێكۆڵینەوەی زانستییو پشتگیریكردنیو چاككردنی ئاستەكەی لە ڕووی بڕو چۆنییەتییەوە، بەمەش (ئامێر) سازدەكرێ، لێكۆڵینەوەو وێژەكان پەیدا دەبنو وەڵامی پێویستییەكانی ئوممەت دەدەنەوە، ڕووبەڕووی ئاستەنگەكانی سەردەم دەبنەوە، كاردەكات لەسەر پوختەكردنو لابردنی تێكچوونەكان، زاڵبوون بە سەر بەخۆرئاواكردن و وەستاویی و پارچەپارچەیی ڕۆشنبیریی[١].

---

[١] لێرەدا ڕەنگە سوودبەخش بێت، ئەگەر ئاماژە بكەین بۆ گرنگی فێركردنی هەموو جۆرەكانی زانستیی مرۆڤایەتیی، بە كۆمەڵایەتیی بە فیزیكەوە، لە وڵاتە عەرەبییەكاندا بە زمانی عەرەبیی، چونكە ئەمە لایەنێكی ڕیفۆرمی خوێندنی زانكۆیە، لەبەرئەوەی زمانی عەرەبیی یەكەمین زمانی نەتەوەیی عەرەبی ئیسلامییەو پێویستە دەوڵەمەند بكرێت، بەو دەسكەوتە زانستییو یاسامەندییەی ژیاری مرۆڤایەتیی بە دەستی هێناوە، ئەمەش لەبەرئەوەی داهێنان تەنها لە زمانی یەكەمدا دەكرێت، كە ئەویش لەم دۆخەدا زمانی عەرەبییە.

بێگومان یەكێك لە هۆكارەكانی شكستمان لە ڕووبەڕووبوونەوەی كۆسپی زانستیی و تەكنەلۆژیی لە ماوەی دوو سەدەدا ئەوەبوو كە ئێمە تا بە ئێستاش زانستی فیزیكو تەكنەلۆژیا لە زانكۆكاندا بە زمانەكانی بێگانە دەڵێینەوە، لەو حاڵەتانەشدا كە زانستە مرۆڤایەتییەكان بە زمانی یەكەم، واتە عەرەبی دەڵێینەوە، نەهاتووین ڕەگو ڕیشەی كەلتوورو دەزگا زانستییەكانمان بە بەروبوومی ژیاری مرۆڤایەتییو هۆڵە زانستییەكانی ئەم ژیارە ببەستینەوە، لە ڕێگەی وەرگێڕانی ئەو وەرزنامەزانستییە گرنگانەوە كە باسو لێكۆڵینەوەی زانستیی نوێ بڵاودەكەنەوە، تەنها ئەوەندەمان بەس بووە كە هەندێك كاری ئەدەبی كلاسیكیی و ڕۆمانی بازرگانیی وەربگێڕین.

**کارکردن، گورجوگۆڵ بۆ بەدیهێنانی ئەوەی، کە خراوەتە ڕوو —بە تایبەتی گرنگییدانی خێرا بە بەرهەمهێنانی وێژەکانی ڕۆشنبیریی خێزانیی مسوڵمان، بنیاتنراوە لەسەر تێڕوانین‌و چەمکە ڕۆشنبیریی‌و پەروەردەییە ئیسلامییە زانستییە دروستەکان، هەروەها سازکردنی بە ئاسانترین ڕێگا، چاپکراوو بیستراوو بینراوە ئەلەکترۆنییەکان، پاڵنان بە لاوانەوە بۆ ڕووکردن لێیان‌و وەرگرتنیان‌و خوێندنەوەیان‌و جێبەجێکردنیان، کارێکە دەبێ هەوڵی بۆ بدرێ، بیریارو پەروەردەکاران‌و ڕۆشنبیران‌و ئەوانەی، کە ڕۆشنبیریی بڵاودەکەنەوە، ئەوانەی کاروباری پەروەردەییان بە دەستە، هۆشیار بکرێنەوە بە ئەوپەڕی گرنگیەتی لەم قۆناغەدا، تا ببێتە بەشێکی دانەبڕاو لە گرنگیپێدانەکانی ئوممەتی**

---

فێرکردن لە هەموو قۆناغەکانیدا، ئەگەر بە زمانی یەکەم بێت، کارێکی گرنگە، بەو مەرجەش پشت ببەستێت بە وەرگێڕانی زانستیی‌و هەموو باس‌و داهێنانێکی زانستیی نوێ، لە ڕێگەی دەزگای پسپۆڕی زانستیی‌و ئەو خوێندکارو مامۆستایانەی خوێندنی باڵاو ناوەندەکانی باسی زانستیی، کە مەرجە لە بارەی زمانە جیهانییەکان‌و بوارە زانستییەکان باش ئامادە کرابن، بە فەراهەمکردنی بەرنامەی دڵخواز و جددیی بۆ ئەو کەسانەی حەزیان لە خوێندنیانەو ئامادەکردنیان بۆ ئەوەی بێنە هەژماری ئەو دەستەبژێرە زانستییەی دەتوانن باسی زانستیی بکەن‌و ناوەڕۆکەکەشی لەسەرچاوە جیهانییەکان وەدەست بهێنن، پێویستە تێبگەین لەوەی کە خوێندنی زمانی بێگانە لە سیستمی گشتییدا بە شێوەی زەبر هیچ بەرهەمێکی نابێت، بەڵکو تەنها یەك مانای دەبێت کە ئەویش ماڵ‌و سەرچاوە تیابردن‌و بە فیڕۆدانی وزە مرۆییەکانە، ئومێدەوارم کۆلیجەکانی تەرجەمەو دەزگا میلییەکانی تەرجەمەو بڵاوکردنەوەی زانستیی دابمەزرێنیّ، بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی کەلتووری نەتەوەو فراوانکردنی جوغزی کەلتوری زانستیی، بۆ ئەوەی دەرامەتێکی بارزگانیی هەبێت کە پیاوانی کار هان بدات بۆ بەشداریی فراوان لە دەوڵەمەندکردنی کەلتووری نەتەوەدا.

هەروەها هیوادارم ڕوو لە کار بکەین وەدەست هەڵگرین لە جەدەلی وەهمی بزانین، سەبارەت بە توانای زمانی عەرەبی لە وەرگرتنی زانست و زانیاریی، چونکە زمانی عەرەبی پێشتر ئەم کارەی کردووە، وەك چۆن ئەمڕۆ گەلانی هەستاو لە خەو دەیکەن، هەرچەند کە ئەو دەوڵەمەندیی و هێزو بنیاتەیان نییە، پێویستیشە کۆڕی زانیاریی‌و میدیاکان ڕۆڵی خۆیان ببینن لە زاراوەسازی‌و یەکخستنی‌و برەوپێدانیان، لە پرۆسەی فێرکردنی ڕۆڵەکانی گەل‌و هەواڵپێدانیان.

ئیسلام چاودێریکردنی بۆی، هەتا لە بنەمای ڕۆشنبیرو هەڵسوکەوتەکانی ژیانی، کە ئامادەی دەکات بۆ پێشەنگیی‌و پێشکەوتن دانەبڕێن، ئینشەئەڵڵا.

## نەخشەی قوتابخانەیەکی ئیسلامیی زانیاریی بە بنەماکردنی فیکری ئیسلامیی

تێگەیشتنمان بۆ تەوژمە فیکرییەکانی جیهانی ئیسلامیی هاوچەرخ‌و هەستکردنمان بۆ ئەو هەوڵانەی کە بەخشراوە بۆ چاکسازی شارستانیی‌و گێڕانەوەی بنیاتی ئوممەت‌و خستنەکاری ڕۆڵی شارستانی تەواو نابێت، ئەگەر هەستنەکەین بە سروشتی قوتابخانەی (ئیسلامەتیی زانیاریی)و ئەو ئامانجانەی، کە هەوڵدەدات بۆ بەدیهێنانی، ئەو هەوڵانەی کە دراویشە لە سەدەکانی ڕابردوودا تا ئەمڕۆ، بۆ پاڵنانی لایەنی فیکریی‌و ڕشنبیریی‌و پەروەردەییەکان لە بواری چاکسازیی شارستانیی ئیسلامییدا، ئەم هەستکردنە یارمەتیمان دەدات لەسەر بەردەوامبوون لەڕێگاکەو هاندانی هاوکاری لە نێوان هەموو چین‌و توێژە چاکسازییەکان، بۆ تەواوکاری لەپێناوی سەرخستنی پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی.

بە هەرحاڵ ئەوەی، کە باسی دەکەین، دەربارەی قوتابخانەی ئیسلامییەتی زانیاریی، مەبەست لە درێژەدان بەلایەنەکانی ئەم هەوڵ‌و ئەزمونانەیە، بەڵکو مەبەست لێی بریتییە لە بەخشینی فیکرەیەکی کورت لە لایەنەکانی ئەم هەوڵانەو ئەو ئاسۆیانەی، کە ئومێد هەیە دەرکەوێت لەم بارەیەوە.

### گەشەکردن و ڕێڕەو

ئەم قوتابخانەیە لەسەر دەستی کۆمەڵە لاوێك بەرپابوو، کە خاوەنی هەردوو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی‌و دانراو بوون، سەرەتای ئەم بیرۆکەیە لە چالاکیی‌و پەرتووکەکان‌و نامەکانی ماجستێرو دکتۆراکانیاندا دەرکەوت، پێش ئەوەی هەموویان کۆببنەوەو هەوڵەکانیان یەکبخەن‌و ڕۆڵەکانیان تەواو بکەن، لە بواری کاری ئیسلامییداو خزمەتکردنی ڕاپەڕینی ئیسلامیی، لەو نۆبەرانەی، کە

پێشکەشیانکرد بریتیی بوو لە پەرتوکی (نظرة الاسلام الإقتصادية، الفلسفة والوسائل المعاصرة) کە خاوەنەکەی نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە، کە لە (دار الخانجي) لە قاهیرە چاپکراوە لە ساڵی ١٩٦٠[١]، نووسەر لەم پەرتوکەدا، دەستی خستە سەر بنەماکانی فیکری ئیسلامیی داواکراو، گرنگییەکەیو تواناکانی لە زیندووکردنەوەی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا.

تێڕوانینەکانی ئەو لاوانە گۆڕا بۆ بەرنامەی کار، کاتێ دەستەی یەکەمی ئەو لاوانە چوونە ئەمریکا بۆ بەدەستهێنانی زانست لەڕێگەی نێردراوە زانستیەکانەوە بۆ خوێندنی تایبەتی لە زانکۆکانی ئەمریکادا، خوێندکاربوون لە بەشەکانی خوێندنی باڵا، ئەوەش لە شەستەکانی سەدەی ڕابووردوو، لە ناو شەپۆلی نێردە (البعثات) خوێندکارییەکان بۆ ئەمریکا لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامییەوە، ئەو وڵاتانەی، کە تازە سەربەخۆییان وەرگرتبوو، سەرەتای کۆبوونەوەی ئەم کۆمەڵە، بریتیی بوو لە کارکردن بۆ دروستکردنی دەزگایەکی خوێندکارانەی ڕۆشنبیرانەی ئیسلامیی، کە لاوان بگرێتە کۆشی خۆی لە وڵاتانی غەربیبیدا، بە ئامانجی پارێزگارییکردن لە پێناسی لاوانی مسوڵمانی نێردراو بۆ ئەو جێگایانە، بەوەی کە خزمەتی ئوممەتەکەیان دەکەنو ئامانجەکانیان بەدیدەهێنێو هیواو ئاواتەکانیان جێبەجێ دەبێ، بەویستی خوا.

کۆبوونەوەی ئەو کۆمەڵە لاوەو بە هۆی فراوانی ئاسۆی ڕۆشنبیریشیان، خێرا هەستیانکرد بە گرنگی لایەنی فیکریی لە قەیرانی دواکەوتنی زانستی شارستانیی ئوممەتی ئیسلام، هەستیانکرد بە گرنگی لایەنی فیکری لە قەیرانی دواکەوتنی

[١] لە ئەنجامی ئەوەی نووسەر دەرکی بە گرنگیی داهێنانەکەی کرد لە میتۆدا، هات بابەتی باسە زانستییەکەی بۆ وەرگرتنی دکتۆرا لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا لە زانکۆی بنسلڤانیای ویلایەتی فیلادلفیا کردە (تیۆری ئیسلامیی سەبارەت بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان) ١٩٧٣، کە تیایدا لایەنەکانی نوێگەریی لە میتۆددا راڤەکردووەو بەڵگەی هێناوەتەوە کە ئەم میتۆدە توانای نوێگەریی هزریی لەم باسەدا هەیەو هزری ئیسلامی لەم بوارەدا گەشە پێدەدات.

پرۆفیسۆری زانستە سیاسییەکانی زانکۆی شاسعود لە ریاز لە عەرەبستانی سعودی د. ناسر ئەلبرێك هاتووە ئەم کتێبەی وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبییو پەخشی کردووە.

زانستی شارستانیی ئوممەتی ئیسلام، بەرنامەکانی پەروەردەیی پێش بخرێن، لەگەڵ شێوازە زانستییەکاندا، بۆ گەشەپێدانی وزەی دەروونیی ویژدانیی، توانای زانستییو تەکنەلۆجی پێویست بۆ هەڵگرتنی قورسی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامییو گۆڕانکاریی شارستانیی[1].

بە هەوڵو هیمەتی ئەو لاوانەو تێڕوانینیان لە ساڵی ١٩٦٣، یەکەم (یەکێتی قوتابیانی مسوڵمان لە ئەمریکاو کەنەدا) پێکهات، ئەم کۆمەڵە خوێندکارییە لە ماوەی یەك گرێی کاتدا (١٠ ساڵ)، بوو بە گەورەترین کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی لە خۆرئاوا، کە هەزارەها ئەندامی هەبوو لە هەموو ڕۆڵەکانی جیهانی ئیسلامیی کە زۆربەیان نێردرابوون بۆ خوێندنی باڵا، لەم ماوەیەدا لە (یەکێتی قوتابیانی مسوڵمان ژمارەیەك لە کۆمەڵەی پیشەیی زانستیی ئیسلامیی پسپۆڕ لێی هەڵقولا، کە گرنگترینیان بریتی بوو لە (کۆمەڵەی زانایانی کۆمەڵناسی مسوڵمان) کە لە ساڵی ١٩٧٢ بەفەرمیی دامەزرا، مەبەست لەم کۆمەڵەیە، کۆکردنەوەی هەوڵەکانی قوتابییە مسوڵمانەکان بوو لە خوێندکارانی خوێندنی کۆمەڵایەتییو مرۆڤایەتیی، بۆ دانانی زانستو شارەزاییە زانستییەکانیان لە بە بنەکردنی (تأصیل) فیکری ئیسلامیی، کە لەسەر مەبەستەکانی شەریعەت بنیاتبنرێ، لەگەڵ جێگیرەکانو چەمكو ماناکانی ئیسلام، هەروەها پەیداکردنی زمانێکی زانستیی هاوبەش لەگەڵ قوتابیانی زانستەکانی کۆمەڵایەتییو مرۆڤایەتیی هاوچەرخ، گیانی بەرگرییو لافوگەزاف زاڵبووبوو بەسەر پەرتووکە ئیسلامییەکاندا، بەهۆی نەبوونی پسپۆڕی زانستییو ڕووکەشییەتی زانستیی لای زۆربەی نووسەرەکان لە بوارە ئیسلامییەکاندا، ئەمەش وایکرد کەلێنێكو شکییەك دروستببێ لە نێوان پیاوانی

---

[1] لە رووی نەزانینەوە بێت، یان وا نیشان بدەن هەندێك کەس پێی خۆشە بپرسێت چۆن دەگونجێت زانست و بیرکاریی ئیسلامییو زانست و بیرکاری نائیسلامیی هەبێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین مەبەست لە ئیسلامبوونی زانستو تەکنەلۆژیا بریتییە لەوەی پەیوەستە بە فەلسەفەی زانستو ئەو ئامانجو نیشانانەی کارکردن لەم بوارانەدا هەیەتی و چۆنیەتی رەوت پێدانو سوودوەرگرتن لێیان، بە شێوەیەکی پۆزەتیڤو بە گیانی بەرپرسیارێتی جێنشینایەتییەوە، بۆ ئەوەی هەرگیز نەبێتە ئامرازێك بۆ سەرکوتکردنو ستەمو تێکدانی ژینگەو بە فیڕۆدانی سامانەکان.

فیكری ئیسلامیی‌و پیاوانی چاكسازی ئیسلامیی، قوتابیانی خوێندنی كۆمه‌ڵایه‌تیی خۆرئاوای هاوچه‌رخ له‌ لایه‌ك‌و له‌ لایه‌كی تره‌وه‌ پیاوانی ده‌سه‌ڵات‌و هه‌ڵبژارده‌ی ڕامیاریی‌و بانگخوازی گۆڕانكاری‌و پێشكه‌وتن‌و تازه‌كردنه‌وه‌، به‌ هۆی پێكهاته‌ی فیكری خۆرئاوایی‌و به‌رپرسیاریه‌تی كرداریيان.

له‌ گرێكانی دواییدا ژماره‌یه‌كی زۆر له‌ نێرده‌كان (البعثات) له‌ ویلایه‌ته‌ یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا جێگیر بوون، هه‌روه‌ها كۆچی فراوانی عه‌قڵه‌كانی مسوڵمان ده‌ستپێكرد بۆ ئه‌مریكا، به‌هۆی خراپبوونی باری ڕامیاریی كۆمه‌ڵایه‌تیی له‌زۆربه‌ی وڵاته‌ ئیسلامییه‌كاندا، له‌ یه‌كێتی قوتابیانی مسوڵمانه‌وه‌ (كۆمه‌ڵه‌ی ئیسلامیی باكوری ئه‌مریكا Islamic Society of North America (ISNA)) له‌ ساڵی ١٩٨٠دا دامه‌زرا، ئامانجیش له‌م كۆمه‌ڵه‌یه‌، بریتی بوو له‌خزمه‌تكردنی ڕۆشنبیریی‌و پێناسی ئیسلامیی بۆ كه‌مینه‌ی مسوڵمان له‌ ئه‌مریكای باكوورو كه‌نه‌دادا.

له‌گه‌ڵ سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی پانزه‌ی كۆچی (١٤٠١ك - ١٩٨١ز) (په‌یمانگای جیهانی بۆ فیكری ئیسلامی) وه‌ك ده‌زگایه‌كی زانستیی‌و ڕۆشنبیریی ئیسلامیی تایبه‌تمه‌ندی سه‌ربه‌خۆ به‌رپابوو، كاریده‌كرد بۆ خزمه‌تكردنی فیكری ئیسلامیی‌و گێڕانه‌وه‌ی بنیاتی به‌رنامه‌یی زانستی، پوخته‌كردنی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی له‌سه‌ر بنه‌مای ئیسلامیی زانستی دروست، به‌لابردنی ئه‌و شتانه‌ی، له‌ تێكچوونه‌كان كه‌ تووشی تێڕوانینه‌ گشتییه‌كه‌ی بووه‌، دوور له‌ فیكری خورافه‌ت‌و چه‌واشه‌كاریی، گێڕانه‌وه‌ی بنیاتی ده‌روونی ئیسلامیی، پوخته‌كردنی له‌ڕووی زانستی‌و ده‌روونی‌و ویژدانییه‌وه‌، گێڕانه‌وه‌ی لایه‌نی كۆمه‌ڵیی تیایدا، وزه‌ی ئاوه‌دانیی شارستانیی داهێنه‌رانه‌، له‌ هه‌موو ئه‌مه‌شدا هاوكاریی‌و ته‌واوكاریی ده‌كات له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵه‌ی زانایانی كۆمه‌ڵایه‌تیی مسوڵمان له‌ خزمه‌تكردنی فیكرو ڕۆشنبیری ئیسلامیی.

په‌یمانگای جیهانیی بۆ فیكری ئیسلامیی، هه‌نگاوی گرنگی ناوه‌ —له‌ ڕێگای ئاماده‌كردنی گۆڕه‌پانی ڕۆشنبیری‌و ئه‌كادیمیی بۆ هه‌ستان به‌ڕۆڵی خۆی له‌ بنیاتنانی به‌رنامه‌ی فیكری ئیسلامیی، پوخته‌كردنی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی —كه‌ بنه‌ماو بنكه‌كه‌شی چاكسازی به‌رنامه‌یی، ته‌واوكاری سه‌رچاوه‌كانی زانستی ئیسلامییه‌، زانستی ئیسلامییش له‌ چه‌مكی قوتابخانه‌یه‌كی زانستی ئیسلامیی،

تەنها قوتابخانەی لەبەرکردن نەبوو، بەڵکو زانستێکی فراوانو گشتگیرو تازەگەریی بوو، کە گرنگیی دەدا بە ژیانی ڕامیاریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و پەروەردەیی زانستیی، خۆی دەکرد بە قوڵایی سروشتی مرۆڤدا، ڕێنموونی ڕێڕەوی مرۆڤایەتیی شارستانیی دەکرد، لەسەر تیشکی جێگیریی نیگای خوایی ئیسلامیی‌و بەهاو مەبەستە باڵاکان.

ئەم پەیمانگایە، نزیکەی سێ سەدو پەنجا پەرتووکی تا ئەمڕۆ دەرکردووە، لەهەموو لایەنەکانی زانستیی ئاینیی، کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و پەروەدەیی، گرنگیی دەدات –تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە– بە چارەسەری چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەردا (ﷺ)و چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووردا، چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ بیری خۆرئاوا، چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییە یاساییەکان لە ژیانو بوونەوەردا، لەگەڵ چارەسەری لایەنی باس‌و بەرنامەکانی فیکرو ڕێگاکانی خستەنەکاری فیکری ئیسلامیی، ژێربارکردنی سەرچاوەکانی، بۆ بنیاتی زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان‌و زانیارییە مرۆڤایەتییەکان‌و پەروەردەییەکان‌و ئابوورییە ئیسلامییەکان[1].

هەروەها ئەم پەیمانگایە بۆ هەمان مەبەست، سەدەها کۆڕو کۆنگرەی زانستیی‌و دواندنی لە ژمارەیەکی زۆر لەشارەکانی جیهانی ئیسلامییدا ڕێکخستووە، بۆ ئەمەش ژمارەیەك لە نووسینگەی ڕۆشنبیریی کە سەربەم پەیمانگایەیە، ژێربار کردووە، یان ئەوانەی هاوکاریی دەکەن، لە پێناوی گەیاندنی نامەی پەیمانگاو خستنەبەرباسی باسە ڕۆشنبیرییە ئیسلامییەکان، گرفتەکانی فیکری ئیسلامیی، ڕێگاکانی چاکسازییکردنی، لە بەردەم بیریاران‌و

[1] بۆ خەملاندنی بیرۆکەیەکی گونجاو سەبارەت بە (بەئیسلامکردنی مەعریفە و سروشتی سیستمی مەعریفەی ئیسلامیی و میتۆدی مەعریفییانە و جیاکردنەوە و تەواوکاریی سەرچاوە مەعریفییەکانی لە سرووش و لە هۆش و لە یاساکاندا)، بڕوانە هەردوو کتێبی: (إسلامية المعرفة، المبادئ العامة وخطة العمل) و (أزمة العقل المسلم)ی نووسەر، کە هەردووکیان لە لایەن پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییەوە لە هرندن، ڤێرجینیا، ویلایەتە یەکگرتووەکان و (الدار العالمية للكتاب الاسلامي، الرياض، المملكة العربية السعودية (١٤١٢)) بڵاوکراونەتەوە.

ڕۆشنبیرانو مامۆستایانی زانکۆ، له هەموو لایەنەکانی زانستەکانو زانیارییەکانو پسپۆڕییەکان، پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی بۆ خزمەتکردنی خامەی ئیسلامیی له باسه ئیسلامییه زانستییەکاندا، لەچاکسازییکردنی بەرنامەکانی فیکری ئیسلامیدا.

له بیناکردنی زانیارییه کۆمەڵایەتییه ئیسلامییەکانیشدا دوو گۆڤاری وەرزیی جیهانیی دەردەکرد، یەکێکیان به زمانی عەرەبیی (مجلة إسلامية المعرفة) ئەویتریان به زمانی ئینگلیزی (گۆڤاری ئەمریکی بۆ زانسته کۆمەڵایەتییه ئیسلامییەکان) ( American journal of Islamic Social (Sciencos) (AJISS)، جگه له چەندین پەرتوکی تر، که لەنووسینگەکانی ئەم پەیمانگایەو هاوکارەکانی لەگەڵ چەندین بڵاوکراوەو وەرزییه ناوخۆییەکاندا تیایدا دەردەچوو.

## دەزگا پسپۆڕەکان له لێکۆڵینەوەکانی منالّیی و چاودێرییکردنی

ئەگەر ڕۆڵی بەئیسلامکردنی زانستو ڕۆڵی دەزگا ڕۆشنبیرییه فیکرییەکانو دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیی‌و خوێندنی باڵا، بکرێته بنەڕەت لەگێڕانەوەی بنیاتی گۆڕەپانی فیکریی‌و ئامادەکردنی ڕۆشنبیریی‌و بیناکردنی ڕۆشنبیریی‌و زانستیی ئامادەکراو، له ڕووی ئیسلامیی‌و زانستییەوە، تا ڕۆڵی خۆی ببینێ له ڕێکردن لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا، ئوممەت به شارەزایی‌و تواناکانی هاوکاریی بکات، پێویستی زۆرو پەلەیه بۆ چالاکی زانستیی پەروەردەیی چڕو پڕ له بواری باسەکانی پەروەردەیی ئیسلامییدا، ببێته هۆی ئەوەی، که باوکانو مامۆستایانو سەرکردەی ڕای گشتیی‌و بەرپرسەکان به لێکۆڵینەوەو وێژەکان، که تێڕوانین ڕووندەکاتەوە تا پێشکەشی ئوممەت بکات، شارەزایی ساز بکات، هۆکاره داواکراوه پێویستەکان، بۆ بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکارییەکانو ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان پەیدا بکات، باوکانو مامۆستایانو لێپرسراوان، به شته تازەکانو کاریگەرەکان ئاگادار بکات، به ئامانجی چاککردنی جۆری تازەپێگەیشتووەکان، له ڕووی ویژدانیی‌و مەعریفییەوە، هەروەها بەرزکردنەوەی ئاستی گەیاندنیان.

لێکۆڵینەوە تایبەتەکان لە کاروباری پەروەردەو فێرکردن، بازنەیەکی گرنگو بنەڕەتییە بۆ سەرکەوتنی هەوڵە چاکسازییەکان، چونکە نەتوانایی لەسەر گەشەکردنی فیکری پەروەردەیی، دامەزراندنو پێشخستنی هۆکارەو بەرنامەکانی پەروەردەیی پێویست بۆ بنیاتی تازەپێگەیشتووەکان، کە توانایان هەبێت لەسەر بەرەنگاربوونەوەی ئاستەنگە یەك لەدواییەکەکان، لەسەر تیشکی بارودۆخە گۆڕاوو توانا گەورەکان، دواکەوتنی فیکری پەروەردەییو پڕۆگرامە پەروەردەییەکان، ئەوە لە گرنگترین کۆسپەکانە لە ڕێگای سەرخستنی هەوڵە چاکسازییەکانو گۆڕانکاریدا، لەگۆڕنانی تۆوی تێڕوانینە فیکرییو ڕۆشنبیرییەکان، کە ئیتر ئاهەنگەکە کۆتایی دێتو فیکری چاکسازییو پیاوانی چاکسازیی پەراوێز دەخرێن، لەسەر ئەو شێوەیەی، کە بینیمان لەکۆتایی مێژووی ڕۆشنبیرییو شارستانییماندا.

لەگەڵ ئەوەی، کە ژمارەیەك لە لوتکەکانی فیکری شارستانیی ئیسلامیی، زۆر لە لایەنەکانی بێدەسەڵاتییو کەموکورتیو تێکچوونەکانیان خستەڕوو، لە فیکری ئوممەتەکەماندا بانگی چاکسازییان بۆ دەکرد، تێڕوانینی گرنگیان پێشکەشکرد بۆ چاکسازییکردن، بەڵام هەوڵەکانیان بەروبوومی نەبووە شێوەی پێویست، لە وەرگرتنی ئەم تێڕوانینەداو دانانی بۆ خزمەتی ئوممەت، پەیداکردنی وزە بۆ ڕوودانی گۆڕانکارییو چاکسازیی داواکراو، ئەوەش لەبەر هیچ نەبوو، ئەوە نەبێ، کە منداڵو لایەنی پەروەردەیی پەیوەندیدار بەمنداڵو بە ئافرەت، لایەنێکی نادیاربوو لە تێڕوانینو وتاری چاکسازیی ئیسلامیی، ڕۆڵی منداڵو ئافرەت لەگەیاندنی کۆمەڵگەو گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی نادیاربوو لەم فیکرەو لە چاکسازییدا.

بۆ دەرخستنی گرنگییەتی لایەنی پەروەردەییو ڕۆڵی لە چاکسازیی ئیسلامییدا، بۆ ڕاگەیاندنی هەڵمەتی جیهادی ئیسلامی پەروەردەیی بۆ کۆکردنەوەی وزە فیکرییە پێویستەکان بۆ خزمەتی فیکری پەروەدەییو گۆڕانکاریو تازەگەریی کۆمەڵایەتیی، بنیاتنانی دەزگا پسپۆڕەکان لە ڕووی زانستییو لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی، هەروەها کاردەکات لەسەر خزمەتکردنی لێکۆڵینەوەکان، پەیداکردنی وێژەی زانستیی لە بواری پەروەردەی

تازەپێگەیشتواندا، خزمەتی دەزگاکانی تازەپێگەیشتوان، (پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی) لەم ڕووەوە بەشدارییکرد لە —لەگەڵ ئەزمونی زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا— دروستکردنی دەزگایەکی ئیسلامی لێکۆڵینەوەیی پەروەردەیی سەربەخۆ، بۆ ئەم مەبەستە لەولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ناوینا (دەزگای گەشەپێدانی منالّیی) کارەکەشی —لە چوارچێوەی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییدا بوو— خزمەتکردنی باسەکانی پەروەردەیی منالّی مسولّمانە بوو، ئامانجەکەشی هۆشیارکردنەوەیە لەم بوارەداو دەرخستنی گرنگیی هەولّە پەروەردەییەکانە، کە خزمەتی ئامانجەکانی گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی ئیسلامیی کۆمەلاّیەتیی ئومێدپێکراو دەکات، واشی لێبکات بکەوێتە بەردەستی خوێنەران‌و پەروەردەکاران.

## دەزگای گەشەپێدانی منداڵ

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، دەزگایەکی تایبەتی بەکاروباری پەروەردەو گەشەپێدانی منالّ پێکهێنا، کە ئەویش (دەزگای گەشەپێدانی منالّ)ە، (Child Development Foundation) (CDF).

ئەمڕۆ ئەم دەزگاو پەیمانگایە، لەبەردەم باسی چاکسازیی پەروەردەیی‌و گۆڕانکاریی لە ڕیشەی کۆمەلاّیەتیی‌و ئامادەکردنی ئامێری پێویست بۆ بەدیهێنانی ئەم چاکسازییە، بە گێڕانەوەی بنیاتی تێڕوانینی ئیسلامی باوەڕداریی یەکتاپەرستیی جێنشینایەتی ڕەوشتیی، بنیاتنانی ژیری زانستیی ئیسلامیی‌و پاککردنەوەی ڕۆشنبیریی‌و کەلەپوور لە خورافەت‌و شتە پڕوپوچەکان، پاراستنی ژیریی مسولّمان لە خراپ بەکارهێنانی ئەو دەقە قورئانییانەی، کە دەربارەی نادیار هاتوون، ئەو شتانەشی کە شاراوەن لە جیهانی بوونەوەردا، هەروەها ئەوەی کە تێپەڕیووە لە قۆناغەکانی مرۆڤایەتیی‌و سەردەمەکانی موعجیزەی پێغەمبەران، بەجۆرێك ئەوانە نەبنە شوێنی خراپتێگەیشتن‌و خراپ ماناکردن، کە لە مەبەستەکانی شەریعەتدا ماناکەی وانەبێت‌و ئەوەی کە مرۆڤایەتیی پێیگەیشتووە لە توانای بەرپرسیارییەتی‌و

پێگەیشتن، بەمەش بگۆڕێت بۆ ڕێگوزەر بۆ تێکدانی ڕۆشنبیریی گشتییو ژیریی خەڵك، لە لایەن درۆزنو فێڵبازو فاڵچییو دوژمنەکانی ئوممەتەوە، لە پێشتریش نەفامو نەخۆشو بێئاگاکان، کە زۆربەیان، وادەزانن چاك دەکەن، کە ئوممەتیان لە ناو زەلکاوی لاوازییو نەفامیی سەلبییەتدا نوقمکردووە.

لەم قۆناغە گرنگەدا، دەبێ ئامانجی لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکان بۆ دەستکەوتنی جێبەجێکردنبێت، وابکات لە مەبەستەکانو گشتییەتەکانو ڕێبازەکانو چەمکەکانی قورئانی پیرۆز پێوەر بێت لەسەر فیکری ئیسلامیی، پاسەوانی ژیریی مسوڵمان بێت لە لادانو خورافەتو کەموکورتیی، پاڵنەر بێت بۆ کارو هەوڵدانو خەباتو گەیاندن، لە ڕێگای بنیاتنانی کۆمەڵگەی دادپەروەرییو چاکەخوازیی، هەروەها شارستانی ڕەوشتو زانستو ئاوەدانکردنەوەدا.

زۆربەی پێشوان (سلف) لە مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵگادا، لە گۆشەگیرییەکەیاندا، تەنها لەگەڵ دەقەکاندا هەڵسوکەوتیان دەکرد، زانیاریی دەبارەی دەقەکان فراوانبوو، ئاسانکارییان دەکرد لە گێڕانەوەو ماناکردنیان، ئەمەش بە هۆی گومڕابوونیان بە بۆیاخی تیۆری زانستیی، پێنەگەیشتنی ژیریی مسوڵمان بەزانستە یاساییە کۆمەڵایەتییەکانو بوونەوەرییەکان، دیارنەمانی پرۆگرامەکانی هەڵسوکەوت لەگەڵ دەقەکاندا، زانینی نهێنییە شاراوەکانی، ئەو مەبەستانەی، کە لە نیگاکەیدا ئاڕاستەی دەکات، بەڵام ئەمڕۆ بارەکە لەڕابوردوو جیاوازترە، چونکە ژیریی هاوچەرخ –بە جوانکاریی بەرنامەکانیو یاسا لێکۆڵینەوەکەی، ئاسانکردنی هۆکارەکانی کارەکەشی– توانای فراوانی زۆری بۆ بەدیهاتووە، کە بۆ مرۆڤو لێکۆڵینەوەی زانستیی لەپێشدا نەبووە، لەبەرئەوە ژیریی مرۆڤ –لەسەر تیشکی ئەو ئاستەنگانەی، کە بەرەنگاری ئوممەتی مسوڵمان بووەتەوە، بە توانا زانستییەکانی سەردەمەوە– دەتوانێت دوای ئەو وەستانو دابڕانە درێژە بە تێڕوانینو لێکۆڵینەوەو وانەکان دەربارەی جێگیرەکانو گۆڕانکارییەکان تازە بکاتەوە، پەندو ئامۆژگاریی ڕاستگۆیانە لە مێژووی ئوممەتی ئیسلام وەربگرێت، ئەوەش بە سوودوەرگرتن لە هەموو ئەو شتانەی، کە بەشداریدەکەن لە بینانکردنی شارستانیو بەرزکردنەوەی ئاڵای شارستانیی بە ئیجابییەوە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە، بەوریابوون

لەهەموو ئەو شتانەی، کە دەبنە هۆی دواکەوتنی شارستانییەتی ئوممەتو گەڕانەوەی بۆ دواوە، کارکردن بۆ خۆڕزگارکردن لە ئاسەوارەکانی.

دەبێ ژیریی مسوڵمان سوود وەربگرێ لە کەلەپووری شارستانیی مرۆڤایەتیی کە لەبەردەستیدایە، لەهەموو بوارەکانی زانستی مرۆڤایەتییەوە، لەزانیاریەکانی کۆمەڵایەتیی، مرۆڤایەتیی، فیزیاییی، شارەزاییی شارستانیی، ئاوەدانیی، دەبێ ژیری مسوڵمانی هاوچەرخ تێبگات لەو وانانەی، کە باجەکەیاندا بەگرانی، کاتێ کە عەقڵی مسوڵمانی پێشوو، کارلێکی کرد لەگەڵ کەلەپوورو فیکری مرۆڤایەتیی شارستانیی، بەتایبەتی فیکری فەلسەفیانەی ئیغریقی، بەڵام بەشێوەیەکی کوێرانەو بێبەرنامەی زانستیی دروست، نابێ مسوڵمانی هاوچەرخ ئەمە دووبارە بکاتەوە، نەوەکو کاریگەرییە کوێرانەکەی بیخاتە ناو سەرگەردانییە فەلسەفییەکانی مرۆڤایەتیی میتافیزیکی، چونکە دەبێتە هۆی ماندووکردنی وزەی ژیریی مسوڵمان، لە شتێکدا کە سوودی لەدواوە تیا نابینرێت، دەشبێتە هۆی دڕاندنی چنراوی یەکێتی ئوممەت، لای دەدات بۆشتی ئەندێشەو نادیاری گوماناوی، دوور لەخەباتی چاکەکردنو جوانکاریی ئیسلامیی لە مەبەستی چاکەکردندا، بنیاتی ژیانیش لەماڵی شایەتیدانو جێنشینایەتییدا.

لەبەرئەوە بەرنامەی گشتیی، کە هەموو مەبەستەکانی ڕێکخراوە شارستانییو تایبەتمەندییەکانیانو مەبەستو تێڕوانینە بوونەوەرییەکانیان دەزانێت، ئەو بەرنامەیەیە، کە دەبێ عەقڵی مسوڵمان خۆی پێپڕچەك بکات لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ڕێکخراوی فیکرو شارستانیەتیی خۆرئاوادا، لەبەرئەوە، ئەو بەرنامەیەی، کە ژیریی مسوڵمان لە ترسناکیەکانی هێرشی فیکرییو ڕوخاندنی یەکەم شارستانیی ئیسلامیی، بووشە هۆی هێواشکردنی سووڕانەوەی تایەکەی، —تا ئەمڕۆش— تا وای لێهات لە سووڕانەوەی خستو پەکی کەوت.

گومانی تیا نییە، کە پشتبەستنی بەرنامەکانی فیکری دروست، پشتبەستنی ژیریی یاسایی ڕەخنەگر، کە ئامانجی گێڕانەوەی بنیاتی ژیریی مسوڵمانو ژیرییە زانستییەکەیو گێڕانەوەی ڕۆشنبیرییو کەسایەتیی ئیسلامییە، تا دەگاتە ئاستی بەرەنگاربوونەوەی ئاستەنگەکانی هاوچەرخو تواناکانی گەیاندن، کارێکە دەبێ گرنگییەکەی لە پێشەوەی کارەکانی تربێت، لە گرنگییدانەکانی پیاوانی فیکرو

ڕۆشنبیریی مسوڵمان، پێویستیان بە سیفەتی (أولی العزم) هەیە لە بەخشین‌و خۆگریی‌و کۆششکردندا، بە تایبەتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕێگریی کاردانەوەکان لەو کەسانەی، کە ڕۆشنبیریی‌و ئەزموونیان کەموکورتبوو لە زانینی مەبەستەکانی ئەم هەوڵانە، گەورەیی ئاستەنگەکان، کە ئەو پێشەنگانە ڕووبەڕوویان بووەوە، لەگەڵ وزەی توانا تەکنیکییەکان، کە خرابووە بەردەستیان، کە دەبێ ئەو دەرفەتانە بەفیڕۆ نەچێ لە خزمەتکردنی ئوممەت‌و ئیسلامدا.

ڕۆشنبیری زۆر هەیە لە هەردوو لای ڕێگادا، کە ڕۆشنبیریی هەستکردنیان ئامادەیکردوون بۆ زانینی لایەنەکانی گۆڕانکاریی داواکراوو مەبەست‌و هۆکارەکانی، ئەبێ ئەوانە سیفەتی ئازایەتییان تیابێ، دابەزنە گۆڕەپان، قۆڵی گورج‌و گۆڵی لێهەڵکەن، بە تێگەیشتنی پیاوانی کار لەم قۆناغەدا، لەسەریانە کەبەرەی نوێی بەتوانا ئامادەبکەن، بە ئامادەکارییەکانی زانستی‌و دەروونیی، تا بتوانێ ببێتە هەڵگری پەیامی ئیسلام، ئاڵاکەی بەرز بکاتەوەو بەردەوام بێت لەم کاروانەدا.

## ئەزموونی بەئیسلامکردنی زانست لەئامادەکردنی (ئامێرە) جێگرەوەکان

ئەزموونی بەئیسلامکردنی زانست، لە زانکۆی ئیسلامیی جیهانی لە مالیزیا (١٩٨٨–١٩٩٩ز)، نەخشەی ئامادەکردنی ئامێری ڕۆشنبیریی‌و زانستیی‌و ئەکادیمیی ئیسلامی تیایدا، بە ئەزموونێکی زانستی کرداری پێشەنگ لەم بوارەدا دادەنرێت، کە سەرکەوتنی ئەم ئەزموونە دەسەلمێنێ، لەسەر تواناکانی بەخشینی فیکری چاکسازیی ئیسلامی.

ئەم ئەزموونە خرایە ئەستۆی یەکێك لە دامەزرێنەرانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ئەمەش وایکرد، کە ئەم ئەزموونە لایەنێکی گرنگ بێت لە قوتابخانەی بەئیسلامکردنی زانستدا، ئەمەش جێبەجێکردن بوو بۆ چەمکی بەئیسلامکردنی زانست‌و پرۆگرامەکەی‌و دەرەنجامەکانی ئەم ئەزموونە[١].

---

[١] بۆ تێگەیشتن لە هەندێك ڕەهەندی ئەم ئەزموونە و باکگراوندی هزرەکە، دەکرێت بگەڕێینەوە بۆ چاپەمەنییەکانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و هەندێك لە کارەکانی نووسەر لە: "نظرية

**دەزگای گەشەپێدانی منالْ (CDF) یان (گەشەپێدانی تازەپێگەیشتوو)، دەزگایەکی تایبەتمەندە لە کاروباری پەروەردەکردنی منالْو گەشەپێدانی، مەبەستیش لە منالْییەتو مانای منالْییەت، بە مانا فراوانو گشتگیرییەکەی، ئەوەیە کە لە ساتی سکپڕبوونەوە دەستپێدەکات، هەتا کۆتایی قۆناغی هەرزەکاریی، گەیشتنە روشدو پتەوبوونی جەستە، جێگیربوونی پێکهاتەی کەسایەتیی مرۆڤایەتیی لەڕووی دەروونیو ویژدانییەوە، تا تاك ئامادە بێت بۆ بە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارییەتی کۆمەلأیەتیی، بەمەش منالْیی، بە شێوەیەکی گشتی، درێژ دەبێتەوە تا کۆتایی قۆناغی فێرکردنی گشتییو دەستپێکردنی بە هاتنە ناوەوەی بازاڕی کار، یان پەیوەندیکردن بە دەزگاکانی خوێندنی بالأوە، کە تیایدا تاك بەرپرسیارە لەخۆی، ئیتر لە مالْ –لە هەموو بارەکاندا– دەردەچێت لە چواردەوری گەشەکردنو لە مالْ دێتەدەر، کە ئەمەش نیشانەی گەورەبوونو جێگیر بوونی کەسایەتییو سەربەخۆیی گەیاندنییەتی.**

---

الاسلام الاقتصادية: الفلسفة والوسائل ـ ١٩٦٠). (النظرية الاسلامية في العلاقات الدولية، اتجاهات جديدة في الفكر والمنهجية الاسلامية ١٩٧٢).

(السياسة والحكم) لە دیداری جیهانیی دووەمی نەدوەی جیهانیی لاوانی موسلْمان پێشکەش کرا، ١٩٧٣ لە دووتوێی کارەکانی ئەم دیدارەدا بلأوکرایەوە.

(إسلامية العلوم السياسية) پێشکەش کرا لە کۆنگرەی جیهانیی یەکەمی فێرکردنی ئیسلامیی لە مەککەی پیرۆز ١٩٧٧.

(إسلامية المعرفة: منهج جديد لإصلاح المعرفة المعاصرة) پێشکەش کرا بۆ کۆنگرەی جیهانیی دووەمی بەئیسلامییکردنی مەعریفە ـ ئیسلام ئاباد ـ پاکستان ١٩٨٢.

بلأوکرایەوە لە کارەکانی کۆنگرەدا لە لایەن پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، هەروەها کتێبی (إسلامية المعرفة: الخطة والإنجازات) کە لە بنەڕەتدا شەهید دکتۆر ئیسماعیل فاروقی خوا لێی خۆش بێت دایڕشتبوو، دوای لێزیادکردن و دەستکاریی، لە لایەن نووسەرەوە، پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، بە هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی بلأوی کردەوە.

(أزمة العقل المسلم) هی نووسەر، ١٩٨٦ چاپی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و (الدار العالمية للكتاب الاسلامي ـ رياض ١٩٩٢).

گرنگە بزانین، کە کاری (پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی)و کاری (دەزگای گەشەپێدانی مناڵ) لەناو ئەزموونی (قوتابخانەی بەئیسلامکردنی زانست)دا، کەهەردووکیان تەواوکاریی یەکترن، ئەگەر کاری (پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی) گۆڕەپانی کاری فیکری بەرنامەییو پوختەکردنی ڕۆشنبیریی بێت، ئەوا کاری (دەزگای گەشەپێدانی مناڵ) —بەهاوکاریی لەگەڵ پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی— کارێکی پەروەردەییە، کە ئامانجی دانانی چاکسازی ڕۆشنبیریە، لە بنەمای بنیاتی کەسایەتی مرۆڤی مسوڵمانو ویژداندار لە قۆناغی منالّیی، بە شێوازەکانی پەروەردەیی چالاك، شێوازی زانستیی چالاکیش، کە خزمەتی گۆڕانکارییو چاکسازیی دەکات، دەبێ لە پێناویدا ئەوپەڕی هەوڵدان بدرێ، ئەم قۆناغە لە قۆناغەکانی ژیانی ئوممەت، کە گرفتارە بەدەست کەموکورتیی وزەی ویژدانیی پێویست بۆ بەدیهێنانی ئاواتو ئامانجەکان، کە ئوممەت هیوای پێیەتی، ئەمەش لە هەوڵە پەروەردەییەکاندا خۆی حەشارداوە، کە تێڕوانینی کۆمەڵایەتی دروست بەرهەمدەهێنێ، بەهاو ڕێبازە دروستەکان لەتێڕوانیندا دەڕوێنێ، کار دەکات بۆ هاوسەنگکردنی لایەنە تاکیو کۆمەڵییەکان لە کەسایەتیی ئیسلامییدا، ئازایەتیی وێژەییش پێگەشەدەکات، لە بناغەکەیدا ژیریی زانستیی بنیاتدەنێ، گیانی دەستپێشخەریەکیو —لەگەڵ سەرەتای قۆناغی منالّی— هەستی ڕەخنەی داهێنەرانە دادەگیرسێنێ، سافو پاکی دەکات لە قۆناغە جیاوازەکاندا، هۆکەشی ئەوەیە، کە چاکسازیی ڕۆشنبیرییو بیروباوەڕییو فیکریی بەروبوومی نابێت، ئەگەر لە ڕووی پەروەردەییەوە نەچێنرێت لەبنەمای قەوارەی منالّدا، تا چاکسازیی زمانییو ویژدانیی یەکەمو بەهاو هیواو ئاواتەکانی بێت، ببێتە بنەمای بۆچوونو کۆڵەکەی بنیاتی کەسایەتییەکەی، تا کانزاکەیو نەخشی بەردەکە، لەسەر لاپەڕەی گیانو ویژدانی بێت، هیچ نەبینێ بەوەوە نەبێ، لەمەوە نەبێ نەوروژێ، ئەمە نەبێ هەست بەهیچ نەکا، کاروهەڵسوکەوتی بەرامبەر بەخۆیو کۆمەڵگەکەیو ئوممەتەکەی بەو پاڵنەرەوە بێت، لەسەر شێوەکەی، ئیتر ئەوە دەڵێ، کە دەیکات، ئەوە دەکات کە دەیڵێت.

وتاری هۆشیاریی زانستیی ئاڕاستەکراو بۆ تاکی پێگەیشتوو، کە لە بەردەمیدا ئاواتەکانی ئوممەت ڕاخراوە، پێویستییو ئاستەنگەکانی بۆ ڕاڤەکراوە، ئاواتو ئازارەکانی هاواری بۆ دەکات، ئەگەر ئەم وتارە بنەمایەکی لەپێکهاتەی دەروونی تاکداو لە بنیاتی ویژدانی لە منالەکەیدا نەبێ زمانی دووەم زمانی بۆچوونی بنەمایی نابێتو زمانی وروژاندنی ڕاستییو ویژدانی ڕاستگۆ نابێ، ئەمەش زمانێکە ئاسەوارەکانی لە قولآیی دەروونی تاکو وروژاندنەکانو ویژدانیو لە پێشەوەکانی قەوارەی "وەك نەخش یان هێل، یان ژمارەی سەرئاوە" کاریگەرییەکەی بە کۆتاییهاتنی وتارەکە کۆتایی دێت، یان هاتنە دەرەوەی لە مزگەوتو هۆلی وانە کۆتایی دێت، تا زۆربەی دەروونەکان بگەڕێتەوە بۆ بنەمای سروشتیان لە ویژدانو منالییاندا، کە ئەمەش لەئوممەتی ئێمەدا، ئەمڕۆ زۆرجار بە ترسو ترساندنو سلبییەتو لاوازیی ویستو دووڕوویی کۆتایی دێت.




نەخشەی چەمکی پەیوەندییە مرۆڤایەتییە ئیسلامییەکان
چوون بەناویەکو بەزەیی مرۆڤایەتی شارستانی
چەند بازنەیەکی بەناویەکدا چووە

شێوەی (١٠)

ئەگەر هەنگاوی یەکەم، بریتی بێت لە بەئیسلامکردنی زانستو بە چاکسازییکردنی بەرنامەکانی فیکرو پوختەکردنی ڕۆشنبیریی، ئەگەر هەنگاوی دووەم، بریتی بێت لەکارکردن لەسەر چاکسازی بنیاتی خێزانو پەیوەندییەکانی هاوسەرگیریی –دایكو باوك– لەسەر بنەما ئیسلامییە دروستەکان لە خۆشەویستیو متمانەو ئاسایش، سازکردنی کۆشی پەروەردەیی داواکراو بۆ گەشەکردنی منالْ بەکەسایەتییەکی تەواو، بەهێزو بەتواناو دەستپاك، ئەوا هەنگاوی سێیەم، بریتی دەبێ لە هۆشیارکردنەوەی پەروەردەیی کە تواناکانی خێزان دەگۆڕێ لەسەرچاوەی خۆشەویستییو متمانەو ئاسایش بۆ بەرنامەی پەروەردەیی ئیجابی چالاك، دەستی منالْ دەگرێتو چاودێریی گەشەی تواناکانو پێبەخشراوەکانی دەکات، ژیریی زانستییو ویژدانیی کۆمەلأیەتیی زیندوو پێك دەهێنی، هەنگاوی چوارەم، بریتی دەبێ لە سازکردنی هۆکارە زانستییەکانو پەروەردەییەکان بۆ مامۆستا، تا یارمەتییان بدات لەسەر کەساندنی کارەکەیان، ئەمەش بە پێدانی هەموو شتێکی نوێو سوودبەخش لە بواری پەروەردەییدا، بەرهەمهێنانی وێژەکانیش کە یارمەتییان دەداتو هەستیان قوولْ دەکات، هەروەها ئەو جۆرە بەرنامەیان دەخرێتە بەردەست لە زانستو زانیاریە گونجاوەکان، بۆ هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی منالْیی، بەهاو چەمکەکانو ڕەفتارە داواکراوەکان پشتگیریی بکات، کە لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی منالْیی جێی حەزیەتی، نابێ ئەوە بدرێتە منالْ، کە زیانی هەبێ بۆ بنیاتی دەروونییو هەستی ویژدانیی تاكو کۆمەلْ، هەروەها دەبێ سووربین لەسەر پێشکەشکردنی ئەو ماددە زانستییانە بەشێوازێکی پەروەردەیی کرداریی، کە ببێتە هۆی چاندنی بیروباوەڕی دروستو بەهای ڕەوشتییو هەلْسوکەوتی کۆمەلأیەتیی چاكو وزەی ویژدانیی زیندوو، بەرنامە زانستییو توانا زانستییە گرنگەکان، ئەم هەنگاوەی چوارەم، دەبێ هاوسەنگو هاوکات بێت لەگەلْ گێڕانەوەی لایەنی نادیار لە تازەگەرییو گۆڕانکاریی لەمێژووی فیکری ئوممەتو خەباتە شارستانییەکەی، لایەنی پەروەردەیی بنەڕەتیی منالْ پێکبهێنێ، بە شوێنکەوتنی وتارەکانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) لە بواری پەروەردەدا بۆ منالْ.

ئامانج لە دامەزراندنی (دەزگای گەشەپێدانی مناڵ) ئەوەبوو، کە ببێتە نمونەیەکی تایبەتیی لە کاری پەروەردەیی بۆ خزمەتکردنی خێزانو مامۆستا، ئەرکەکەش کارکردنە لەسەر هۆشیارکردنەوەی ڕۆشنبیرانو بیریارانو پەروەردەکارانو کارمەندانی ئیسلامییو هەموو ئوممەتی ئیسلام بە گرنگیەتی منداڵ، بەڕۆڵی پەروەردەیی داواکراویش لێیو بۆی، هەروەها پێشکەشکردنی یارمەتییو هاندان منارەیەکی پێویست بێت بۆ بیریارانو پەروەردەکارانو پیاوانی لێکۆڵینەوەی زانستیی بۆ خزمەتکردنی ئەم بوارە گرنگە، بە شێوەیەکی کاریگەر، هەروەها ئەم دەزگایە ئامانجی بەرهەمهێنانی کارە پێشەنگییەکانە لەوێژە پەروەردەییەکانو هاندانی خەڵکی تر بۆ بەرهەمهێنانو بەرهەمهێنانی هۆکارەکان بۆ بەدیهێنانی ئەو ئەرکە، ئەوەش لە ڕێگای وانەبێژییو کۆڕو کۆنگرەو خولو پەرتوكو هۆکارەکانی بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندنی ئەلیکترۆنییو بینراوو بیستراو، بە یەکسانیی.

لەو شتە گرنگانەی، کە پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییو دەزگای گەشەپێدانی منداڵ، لەم قۆناغەدا لە هەوڵو کۆشش دەیبەخشن، هاوکاریی یەکتر دەکەن لە بەدیهێنانیدا، بە هەوڵە زانستییە پەروەردەییە پێشکەوتووەکان، بریتییە لە کارکردن لەسەر پێگەیاندنی ئەم بوارە ڕۆشنبیرییە پەروەردەییانە، بۆ گەیشتنە بەرهەمهێنانی بەرنامەو پەرتوکی خوێندنو ڕۆڵی ڕاهێنان لەهەموو قۆناغەکانی پەروەردەو فێرکردن کە لەسەر تێڕوانینی قورئانیی بوونەوەریی دروست —بە بنەمایەکی زانستییانە— بنیات دەنرێ، لەگەڵ ڕۆشنبیریی ئیسلامیی دروست، لە هەموو بوارەکانی زانیارییدا، هەروەها قۆناغەکانی فێرکردن، بە تایبەتی بواری زانستەکانی باوەڕو ڕۆشنبیرییو کۆمەڵایەتییو بواری چالاکییەکانو پەروەدەکردنی بەخشراوەکانو تواناکان.

ئەوەی نەخشەی کاری (دەزگای گەشەپێدانی منداڵ) ئومێدی پێی هەیە، بۆ تەواوکردنی پرۆژە نموونەییەکەی، بریتییە لە کارکردن —لە کاتی گونجاودا— بۆ دامەزراندنی دەزگایەکی فێرکاریی جیهانیی کە لەسەر بنەمای ئەم دەزگایە، چەند قوتابخانەیەکی ئیسلامیی جیهانیی لەسەر دامەزرێت، تا ببێتە ناوکی فەلسەفەو بەرنامەو شێوازەکانو نموونەیەك بێت بۆ خستنەگەڕی ڕۆڵی خێزانو

قوتابخانە، یارمەتیدانیشیان لە گەیاندنی ڕۆڵیاندا، ئەو قوتابخانانە ئومێد هەیە کە بەرنامەکانی لە کارەکەیدا، لە سنووری منداڵو چالاکییەکانی لە ناوەوەی دیوارەکاندا نەوەستێت، یان لە سەعاتەکانی دەوامی قوتابخانە، بەڵکو ئەم قوتابخانانە کاریگەرییەکەیو گرنگیپێدانەکانیو چاودێریکردنەکانی بۆ خێزانو چەمکە پەروەردەییەکان درێژدەبێتەوەو وێژەی پەروەدەیی پێشکەش بە باوکانو دایکان دەکات، خولی ڕاهێنانیان بۆ دەکاتەوە، کە تیایدا چالاکی کرداریی پەروەدەیی لە ڕووی ویژدانیو زانیارییەوە باس دەکرێ، خێزان ئامادە دەکات پێش ئامادەکردنی قوتابیی، چونکە سەرکەوتنی بەرنامەی پەروەردەیی، تەنها بەقوتابیو ڕۆڵی قوتابییەوە ناوەستێ، بەڵکو پێش قوتابیی پێگەیاندنی خێزان دەگرێتەوە، لە ڕژێمی پەروەردەیی قوتابخانەدا، شوێنێك نییە بۆ خێزان، کە ڕۆڵی خۆی تیا نەبینێ، هاوکاریش نەبێت لەگەڵ قوتابخانەدا لەسەرکەوتنی کارەکەیو هەڵگرتنی پەیامەکەیدا.

ئەم دەزگایە، کە جێی ئومێدە، نەخشە پەروەردەییەکانو بەرنامەکانی خوێندن، چالاکیی قوتابخانەکان لە بوارەکانی ویژدانییو ڕۆشنبیرییو زانستییو جەستەییدا دادەنێت لەسەر بناغەی تێڕوانینی بوونەوەریی قورئانییو لەسەر بناغەی پێشڕەویەتیی پێغەمبەریی، ڕۆشنبیری ئیسلامی ڕاستو خاوێن، گرنگی دەدات بە بنیاتی دەروونییو ویژدانیی زانیاریی، لە تەواوکارییو ڕێکخستن، بوارو قۆناغ بۆ هەموو گەیاندنە پەروەردەییە گرنگەکان دادەمەزرێت، مەبەستی ئەم بەرنامەو قوتابخانانە، پاراستنی تازەپێگەیشتووەکانی مسوڵمانانە لەو هەموو شتانەی کە باوەڕی تێکدەدات، ژیریی زانستیی دەشێوێنێت، ویژدانی مسوڵمان ناشیرین دەکات، گۆڕەپان دادەخات لەبەردەم فیکری خورافەتو چەواشەکارییو، پاراستنی لاوازیی دەروونو تواناکانو هەستکردن بە بێدەسەڵاتییو کەمیی فرتوفێڵ.

## قوتابخانە ئیسلامییە جیهانییەکان

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، لەم بارەوە، کە ئەزموونی زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا هەیە، دەستیکرد بە بنیاتنانی مەڵبەندێك بۆ

لێکۆڵینەوە پەروەردەییەکانو فێرکردنی گشتیی، کارکردنیش لەسەر دروستکردنی قوتابخانەیەکی نمونەیی سەر بە زانکۆ، ئەم مەڵبەندە هەستا —لە ڕێی ژمارەیەك لە مامۆستایانی تایبەتیی پەروەردەییەوە، لەسەر تیشکی ئەو نەخشەیەی کە دانرا، بە سەرپەرشتییکردنی ڕاستەوخۆی زانکۆ، بە هاوکاریی لەگەڵ چەند لیژنەیەك کەتایبەتمەندبوو لە مامۆستایانی زانکۆ لە بوارە جیاجیاکانی ئەکادیمییدا— بە دانانی ڕەشنووسێکی سەرەتایی بۆ بەرنامە پەروەردەییەکان، بۆ هەموو قۆناغەکانی خوێندنی گشتیی، بە کردار قوتابخانەیەکی پاشکۆی زانکۆ بنیاتنرا، کە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی گشتیی تیابوو، ئەو بەرنامەنەی تیا جێبەجێکرا، کە ئومێد بوو بەردەوام بێت لە لێکۆڵینەوە پەروەردەییەکان لە پێشخستنی ئەو بەرنامانەدا، سەریشکەوێت لە دانانی پەرتوكو بەرنامەی تەواو لەسەر بنەمای ئەو بەرنامە پەروەردەییە پێشخراوانە.

بۆ ئەوەی پرۆژەی بەئیسلامکردنی زانستو چاکسازیی بەرنامەکانی فیکری ئیسلامیی تێرو تەواوبێت لە خزمەتکردنی پرۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی شارستانیی، گرنگ ئەوەیە (پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی)، کار بکات لەگەڵ (دەزگاکانی گەشەپێدانی منداڵ) و (دەزگای قوتابخانەی ئیسلامییە جیهانییەکان) لەژێر چەتری یەکێتییەکی گشتیی بۆ دەزگاکانی فیکری شارستانیی ئیسلامیی، هاوکارییکردنیش لەگەڵ مەڵبەندە فیکرییە شارستانییە هەمەچەشنەکان، کە بۆ هەمان ئامانج کار دەکەن.

ئەوەی گرنگە بۆ پرۆژەی گەورەی بەئیسلامکردنی زانست —لەو ڕووەو کێ بنیاتی تێڕوانینو بەرنامەکانی لە هەر شوێنێك لە جیهاندا دەنێت— هەتاوەکو کارەکەی تێرو تەواوبێتو ڕێسا فیکرییو بەرنامە ڕۆشنبیرییەکانی پرۆژەی چاکسازیی شارستانیی ئیسلامیی دامەزرێت، ئەو هەوڵانەش درێژ ببنەوە بۆ قۆناغی دووەم لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی فیکری شارستانیی، ئەوەش بەوەی ئەو چاکسازییە فیکرییە ڕۆشنبیرییە بەرنامەییە، بە شێوەیەکی کاریگەر بخرێتەکار، ڕەنگبداتەوە لەپەرتوکی بەرنامەییو لێکۆڵینەوەکان، لە ڕێی بڵاوکراوە وەرزییە زانستییەکان لەبوارەکانی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییو

مرۆڤایەتیی‌و ئابووریی‌و ستراتیژیی، ئەوە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، هەورەها دەبێ چالاكیی دەزگا زانستییەكانی، بە شێوەیەكی تایبەتی بواری فەلسەفەی زانیارییەكان‌و چاودێریی چالاكیی زانستیی‌و تەكنەلۆجیی بكات، ئاڕاستە شارستانییەكان بخاتەڕوو، تێڕوانینی ئیسلامیی تیادا پێشكەش بكات، هەروەها دەبێ لێكۆڵەرەوان باسەكانی مافی مرۆڤی مسوڵمان‌و باسە دادپەروەرییەكانی لێكۆڵینەوەی لەسەر بكات، گرنگی پێبدات، زانیاریی پێویست پێشكەش بكات، بە شێوەیەكی ڕاستگۆیی‌و سپاردەیی بیخاتە بەردەم ئوممەت‌و سەركردەكانی ئوممەت‌و هۆكارەكانی ڕاگەیاندن، بە بەرگریكردن لە مرۆڤی مسوڵمان‌و باسەكانی ئوممەتی ئیسلام، مافی گەلانی مسوڵمان لە ژیانێكی خۆشدا، بۆ خزمەتكردنی ڕۆڵی شارستانیی، پەیامە جیهانییەكەی لە خزمەتكردنی مرۆڤ و مرۆڤایەتییدا.

بۆ هەستان بەم هەموو لایەنە شارستانییانە، دەبێ بەردەوام كار بكرێت — لەلایەن باوەڕدارانەوە لەهەموو جێگاو شوێنێك لە جیهاندا— بە پەیامی بەئیسلامكردنی زانست‌و بەرنامە پەروەردەییەكانی‌و بڕواداران بە پیرۆزیی پەیامی ئوممەت‌و پێویستییەتی كاركردن لە پێناوی بەشدارییكردن لە ڕاپەڕینەكەیدا، داپۆشینی بە تۆڕێك لە مەڵبەندو دەزگای هاوكاریی یەكتر، بۆ هەمان مەبەست‌و هەمان تێڕوانین‌و لەسەر هەمان بەرنامە، تا چالاكییەكانی نێوانیان تەواوكاری یەكتربن، تێڕوانینی ئیسلامیی دروست، پێشكەش بە جەماوەری ئوممەتی ئیسلام‌و كادیرە كاراكانی لەهەموو چالاكیی‌و پڕۆژەیەكی چاكسازیی ئیسلامیی شارستانیی بكەن، مامەڵەو یارمەتییان بدەن، خەباتە شارستانییەكەشیان نیشان بدەن بۆ چاكەی ئوممەتی ئیسلام‌و مرۆڤەكان.

لە قەرەباڵغی ئەو باسە زۆرانەی، كە ئەم پەرتوكەو درێژەدانەكانی، كە چارەسەری كردووەو هەموو باسێكی ڕوونكردووەتەوە، كە كردنەوەی لایەنەكانی چەندین بەرگی دەوێ بۆ ئەوەی لە قوڵایی پەرتوكەكان‌و مێژوو و ژیانی ئەم ئوممەتە بچینە ناویەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو باسە زۆر درێژانەو ئەوتێڕوانینە درێژانەی كە خەڵكی لەهەندێكیاندا ڕای جیاوازیان هەیە، لەو گۆشەیەی، كە هەموو كەسێ لەلایەكەوە تەماشای دەكات، گرنگ ئەوەیە بنەمای باسە گەورەكەو ناوەرۆكەكەی بەڕوونیی لەبەردەم خوێنەردا بمێنێتەوە، بە شێوەیەك

درێژەپێدانەکان نەگۆڕێت لە نێوانیو نێوان شوێنکەوتنی ڕێڕەوی قەیرانەکەو شارەزابوونی ئاسەوارە گەورەکانی، کە لێوە پەیدا دەبێ، کە تا ئەمڕۆش ئوممەتی ئیسلام گرفتاری بووە.

لەبەرئەوە، بڕیماندا لە کۆتایی پەرتوکەکەدا، چەند ڕوونکردنەوەیەك لە شێوەو گوزارشتە ڕۆشنگەرییەکان (١١-١٧) بخەینە بەردەستی خوێنەر بۆ زیاتر ڕۆشنکردنەوە، کە یارمەتیدەرە بۆ شوێنکەوتنی ناوەڕۆکی باسەکە دوور لە درێژەپێدان، بەکورتیی دانانی ڕێڕەوی قەیرانەکەش بخاتەڕوو، لەگەڵ پەیوەندییەکانیو دەرەنجامەکانی، ڕێگای نموونەیی بۆ چارەسەریشی دەستنیشان بکات.

داوای ڕێنموونیو یارمەتی خوای گەورە دەکەین

***




شوێنەوارەکانی تێکچوونی بەرنامەی پەروەردەیی

شێوەی (١١)

چاكسازی بەرنامەیی: گێڕانەوەی یەكێتی زانستی گشتی
ئاینی ڕەوشت‌و زانستی مرۆڤایەتی یاسایی

↓

چاكسازی ڕۆشنبیری
گێڕانەوەی تێڕوانینی یەكتاپەرستیی جێنشینایەتیی گشتیی ئیسلامیی
- باوەڕو یادكردن‌و خەباتكردن
- پوختەكردنی ڕۆشنبیریی لەشتی پڕوپوچ
- لابردنی وتاری ترساندنی فیكریی

↓

چاكسازی پەروەردەیی
داهێنانی گۆڕانكاریی دەروونی ویژدانیی كاریگەر لەقۆناغی منالّیدا
- گەڕانەوەی یەكێتیی لەنێوان زانستیی‌و دەروونی ویژدانیی پەروەردەیی لەپەروەردەی منالّدا.
- گەڕانەوەی وتاری پێغەمبەری پەروەردەیی لەچاندنی ڕەوشتەكانی هێزی باوەڕو جێنشینایەتی‌و خۆگری.
- بەرپرسیارییەتی كە لەسەر شێوازەكانی خۆشەویستی‌و هاندان‌و بەردەوامبوون دابمەزرێت لەگەشەكردنی منالّدا.
- گرنگیدان بەڕۆڵی خێزان‌و باوكایەتی كە پالّنەرە فیترییەكەی كلیلی جولّەی گۆڕان‌و چاكسازیە.
- چاكسازی فێركردن‌و گەڕانەوەی یەكێتیی زانستی‌و ویژدانی تیایدا.

↓

ئومەتێك ئەم سیفەتانەی تیابێ
- ڕەوشتەكان‌و ئازایەتیی مانایی چاك.
- بەهێزو كۆمەڵكارو جوانكاریی لەگەیاندن‌و جێنشینایەتی شارستانیی.
- دەروونی ئازادو لابردنی دەروونیەتی كۆیلەكان، كە خراپو تاكن خۆخۆیی‌و شپرزەیی‌و تەنگەتاویی.

↓

بەرەیەكی تازەپێگەیشتوو بەتوانا لەسەر هەلّگرتنی بەرپرسیارییەتی‌و چاك گەیاندن‌و هەلّگرتنی سپاردەو پەیام

بناغەی سەركەوتنی پرۆژەی چاكسازیی ئوممەت
منالّێكی باوەڕدارو بوونی لە تێڕوانیندا، ڕێك، سەربەست، بەهێز، بەتوانا

شێوەی (١٢)




شوێنەوارە ئیجابییەکانی چاکسازیی فیکریی‌و پەروەدەیی

شێوەی (١٣)



بزووتنەوەی چاکسازییە سنووردارەکان نەیانتوانی داواکان بەدیبهێنن

شێوەی (١٤)




چاکسازیی ئوممەت
بزووتنەوەیەکی چاکسازیی پیشەیی کاریگەر

شێوەی (١٥)




منداڵ: لایەنی ئاسیار لەپرۆژەی
چاکسازیی ئوممەتدا

شێوەی (١٦)




باوكان

كلیلی چاكسازیی‌و گۆڕانی ئاشتیانەی كاریگەر لە كۆمەڵگەدا

شێوەی (١٧)

# پێویستیی بۆ ڕاگەیاندنی ڕێبازەکانی بەرنامەیی‌و فیکریی

ئەم قۆناغەی، کە فیکری ئیسلامیی پێگەیشتووە، لەسەر ئەو بارەی، کە گەلانی ئوممەت‌و دەزگا کۆمەڵایەتیی‌و فێرکارییەکانی تیایە، دەبینم، کاتی ئەوە هاتووە، کە هەڵبژاردەی ئوممەت لە بیریاران‌و زانایان‌و ڕۆشنبیران، لە کۆنگرەیەکی ڕێکخراودا، کۆببنەوە بەیانێك دەربکەن بۆ ئوممەت، کە بەیانی ڕێبازە گشتییەکان بێت‌و باسی بوارە بنەڕەتییەکان بکات لە ژیانی ئوممەتدا، کە تیایدا بنەماکان داڕێژێت، مەبەستەکان لەبەردەمیدا بکرێنەوە، لەگەڵ گشتییەتەکان‌و ڕێبازەکان‌و جێگیرەکان‌و لەپێشەکان (أولويات)و ئاستەنگەکان، هەروەها ئەم بەیانە وەك بەڵگەی کار وابێت، کە ڕێسا بەرنامەییەکان دابنێت، وێنەی چوارچێوەی بکات، ڕێگای گۆڕانکاریی —بە هەموو قایلبوونێکەوە— ڕۆشن بکاتەوە لەگەڵ جوڵەو چاکسازییکردن، لەبواری زانیاریی‌و ڕۆشنبیری‌و پەروەردەو فێرکردندا، ڕێگاش دابخات لەبەردەم خراپ تێگەیشتن‌و سەرگەردانیی‌و سەر لێشێواندن، بیشیپارێزێت لەلادانەکانی فیکری‌و بەیەکداچوونی ئاڕاستەکان، بۆ ئەوەی لە ڕێگە لانەدەن، بەش زاڵ نەبێت بەسەر گشتدا، لق زاڵ نەبێ بەسەر بنەمادا، ململانێ‌و کێشەو بەسووکزانینی ژیریی نەمێنێت، خورافەت‌و چەواشەکاریی بازاڕی نەمێنێ، شەرعییەتی نەبێ، کەلوپەلێکی بەبرەو نەبێ، دەق‌و فیکرەکان پەرتوبڵاوو پارچە پارچە نەبن، بە جۆرێك کەس نەتوانێ ڕیزیان بکات‌و ڕێکیان بخات لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی، کە هەموو پیشەوەرو قەڵەڕەشێکی دەنگناخۆش شتی لێدروست بکات، هەموو خاوەن مەبەستێك، ئەوەی، کە پێیخۆشە لە فیکرو فەتوا دەرکردن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی لێڵبوونی ڕوانین‌و لادان لە ڕێگادا.

بەردەوامبوونی نادیاربوونی لەم جۆرە بەڵگانە، لەڕێڕەوی دواکەوتن‌و سەرلێشێوان‌و وێڵبوون، کە ئوممەت پێوەی دەناڵێنێ، فیکرو جووڵەی ئوممەتیش گرفتاری بووە —تا ئەمڕۆ— ئەوە هەڵەیەکی گەورەو کەموکورتییە، کە لێکخۆشبوونی نییە.

داوادەکەین لە خوای گەورە، کە ژیرەکانی ئوممەتو داناکانی پەلە بکەن بۆ پێکەوەلکانی پارچەکان بە یەکتری، ڕێخۆشکردن بۆ ڕێڕەو، بۆ خزمەتی ئوممەت، خزمەتی مرۆڤ، ئامێرێكو ڕاگەیاندنی پەیامی ئیسلام بێت، خودا خۆی بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

# كۆتایی

## ـ هەتا بزانن‌و کار بکەن

گەیشتینە کۆتایی پەرتووکەکەو باسکەشی بەشێوەیەکی دوورودرێژ خرایە ڕوو —لەو شتانەی، کە خرایە ڕوو— ڕاوبۆچوونەکان‌و تێڕوانینەکان لەم باسەدا جیاوازییان هەیە، کە هەندێکیان زیاتر پێویستی بەلێووردبوونەوەو گفتوگۆو تێگەیشتن هەیە، لەبەرئەوە، بە سوودبەخشی دەزانین لەکۆتاییدا ڕوانینی بنەڕەتیی ئەم پەرتوکە پوختە بکەین، هێڵە گشتییەکانی ئەم پەرتوکە، کە لەبناغەدا ئامانجی ئەوەبوو بیخاتە بەردەم خوێنەر، کە لە ناوەرۆکدا دەرهێنانییەتیی‌و بۆچوونە بۆ ئەم قەیرانەی ئوممەتی ئیسلام، بۆ ئەو هۆکارە کاریگەرانەی، کە کاری لێدەکەن، دەرخستنی ڕەگەزە ونەکان لە پرۆژەکانی چاکسازیی ئیسلامیی ئومێدپێکراودا، ئەوەی کە دەبێ حیسابی بۆ بکرێ، کاتێ هەوڵ دەدەین بۆ خستنەکاری هەوڵە بەردەوامە دڵسۆزەکان، لەپێناوی هەستانەوەی ئوممەت‌و ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوەکەی‌و بزواندنی وزە شاراوەکان لە قەوارەکەیدا.

ئوممەتی ئیسلام، هەڵگری پەیامی ڕێنموونیی‌و ڕووناکییە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، ئەم ئوممەتە هەستا بە ڕۆڵی خۆی لە ڕابوردوودا، بە ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی شارستانیەتی مرۆڤایەتیی، بەرزی کردەوە بۆ ئاسۆ بڵندەکان، ئەو سەرچاوانەی پێبەخشی، کە ئەمڕۆ لەپشت هەموو دەستکەوتەکانی شارستانییەتی مرۆڤایەتیی هاوچەرخەوەیە.

لەگەڵ ئەو وزە باوەڕییە شارستانییە بەرزە گەورەیە، کە ئیسلام تەقاندیەوە، کەچی نیشتووەکانی نەریت‌و ڕۆشنبیریی‌و فەلسەفەکان، هەروەها گۆڕانی بنکەی ڕامیاریی بۆ هۆزایەتیی‌و گەلایەتیی، بووە هۆی ئەوەی، کە تێڕوانینی ئیسلامیی تێکبدات، بەرنامەی فیکرو زانیاریی ئوممەت بروخێنێ، ڕۆشنبیریی ئیسلام پیس بکات، بەمەش ئوممەت لایەنی گشتیی ونکرد، وایکرد، کە عەقڵییەتی چەواشەکارو خورافەت‌و دەمارگیریی زاڵ ببێ بەسەریدا.

ئەم لێڵیە باوەڕیی‌و فیکریی‌و تێکچوونە ڕۆشنبیرییە بووە هۆی وەستان‌و دواکەوتن‌و سەرکردەکانی ئوممەتی تووشی لاوازی‌و بێدەسەلاتی کرد، دەرەنجامەکەشی بریتیی بوو لە دواکەوتن‌و ترساندنی ڕامیاریی‌و ئایینی، ئوممەتیش بوو بە "دەروونی کۆیلەکان" کە تاکایەتیی‌و ترس‌و دەستپێشخەریی بوو بە سیفەت تیایدا، ئوممەتی کردە جەستەیەکی مردووی بێگیان‌و گیانی یەکێتیی‌و هاوکاریی تیا نەما، گیانی ئازایەتیی تیا نەما، بەتاڵ بووەوە لە وزەکانی تواناو داهێنان‌و دەستپێشخەریی، ئوممەت بووە وڵاخ هەموو کەس سواری بوو، دەنگدانەوەیەك بۆ هەموو هاوارێك، نێچیرێك بۆ هەموو دوژمنێك‌و چاوچنۆکێك.

هەوڵەکانی چاکسازە –لەگەڵ دڵسۆزیی‌و قوربانییدانی– بەشێکی ڕامیاریی بوو، لەگەڵ ئەوەی، کە هەمیشە هەوڵ دەدات بۆ هەستاندنی هەوڵەکان، بەرەنگاربوونەوەی دوژمنکارییەکان‌و لادانی لە ئوممەت، بەڵام ئەم هەوڵانە هۆشیارییەکی تەواوی نەبوو، دەربارەی ڕاستیی نەخۆشییەکانی زانستیی‌و ڕۆشنبیریی‌و دەروونیی ویژدانیی ئوممەت، لەبەرئەوە، وتارەکەی لە ناوەرۆکدا، وتاری ڕامیاری بوو، ئاڕاستەکراو بوو بۆ پیاوانی ئوممەت، بە مەبەستی بەسەربازکردنی وزەکانیان لەپێناوی بەخشین لە ڕێگەی ئایین‌و ئوممەت‌و بەرگرییکردن لێی.

سروشتی وتاری ڕامیاریی کار دەکات بۆ لەخۆگرتنی ڕیزەکان‌و زیندووکردنەوەی ئومێد، بەڵام ئەوەی، کە جێی سەرنجە ئەوەیە، ئەگەر وتاری ڕامیاریی زاڵ بێت بەسەر وتاری فیکرییدا، بواریش نەدرێت بۆ وتاری فیکریی ڕەخنەگر، ئەوا ئوممەت ناتوانێت وزەی تازە بکاتەوەو ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان ببێتەوەو گەشە بدات بە ئوممەت، چارەنووسی ئوممەت‌و هەوڵەکانی ئوممەت‌و بزووتنەوە چاکسازییەکانی بۆ تەواوبوون‌و لاوازیی زیاترە، لەبەرئەوە، دەبێ کاری هەستانەوەیی چاکسازی لە هاوسەنگیی لە نێوان ڕامیاریی کۆمەڵایەتیی‌و لە نێوان فیکری ڕۆشنبیریی بکرێت، بۆ چاکسازییکردنی کەلێنەکان، نەك تەنها بۆ بەسەربازکردنی وزە، بەڵکو تازەکردنەوەی وزە، لەهەمانکاتدا تا گەشە بکات‌و بتەقێتەوە، بەوەش وزەی زانستیی‌و پەروەردەیی گەشە دەکات، لەو کاتەی کە

هەموو ئاڕاستەو ڕیزە ڕامیارییەکان یەکدەگرن تیایداو گیانی گەشبینیی‌و هیواو متمانە بەیداهاتوو، دەیداتە پێشخۆی.

هەتاوەکو هەوڵەکانی چاکسازیی سەربکەوێت‌و چالاك بێت، هەتاکو بینینی ئوممەت پێبگات، مەبەستەکانی یەك بگرێ، وزەکانی تازەبێتەوەو گەشە بکات‌و بتەقێتەوە، تاوەکو لە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکاندا بێت، ئەوە دەبێ چاکسازیی لایەنی دەروونیی‌و ویژدانیی بکرێت، هاوکات لەگەڵ چاکسازی لایەنی زانستیی تیایدا.

تێنەگەیشتن لە گرفتە زانستییەکان، هەستنەکردن بە پەیوەندیی زانستیی بە دەروونیی‌و ویژدانیی، ئەوە لە گرنگترین هۆکارەکانە لەدوو لەتبوونی زانستی ئیسلامی بۆ زانستی ئایین‌و زانستی شارستانی ڕووبەڕووی یەکتر نەویستن‌و پشت لە یەکتر بکەن، بەمەش کارەکە کۆتایی هات، کە (تهافت الفلاسفة)و مراندنی (علوم الدين) بوو، واتە وەستانی بەهای گشتیی، لاوازبوونی ڕۆڵی نەزۆکی یاسایی مرۆیی‌و وەستانی ئەوەی، کە پاشکۆیەتیی لە زانیاریی‌و زانستە مرۆییەکان، ئەمەش وایکرد، گرنگی چەندێتی بە زانیارییە نەزۆکەکان بدرێت، هەستنەکردن بە پەیوەندیی کرداریی بە ویژدانیی‌و ئاسەوارە دەروونییەکانی، ئیتر زانیارییە مرۆییەکانمان پشتگوێ خست، منالیی‌و پەروەردەکردنمان پشتگوێخستن، کە بواری گۆڕانکارییە، بواری گەشەپێدانی وزەو وەبەرهێنانی تواناکانە، پێدانی ئوممەتیش بە تانکەری سووتەمەنی‌و وزەی جۆری گەشەی پێویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکارییەکان‌و بەرپەرچ دانەوەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان.

هەتا خلۆکەی ڕاپەڕین‌و پێشکەوتن ببزوێنین، بنیاتی وزەی دەروونیی‌و ویژدانی بزوێنەری ویستی مرۆڤایەتیی بگەڕێننەوە، توانا مرۆییەکان، مەعریفە زانستییەکان‌و هەوڵە خۆییە پێویستەکان بۆ هەستاوەی ئوممەت، بەرەنگاربوونەوەی ئاستەنگەکانیش، لەبەرئەوە، دەبێ بیریاران‌و زانایان‌و مامۆستایانی زانکۆ و ڕۆشنبیران و سەرکردەکانی ئوممەت، هەستن بە چاکسازییکردنی بنەمای کەلێنەکان، ئامادەکردنی ئامێری زانستیی‌و دەروونیی بۆ بە سەربازکردنی ڕۆڵەکانی ئوممەت لە پێناوی بەدەستهێنانی ئاوەدانکاریی‌و چاکسازیی شارستانیی ئیسلامیی.

دەبێ تێڕوانینی ئیسلامیی یەکتاپەرستیی جێنشینایەتیی ئاوەدانیی شارستانیی چاکەخوازیی بگەڕێتەوە، دەبێ چاکسازیی بکرێ لە بەرنامەی زانستداو خستنەیەکی هەردوو باڵی بەهای ئایینیی‌و یاسای مرۆیی، پوختەکردنی ڕۆشنبیری ئیسلامیی، لە هەموو ئەو شتە زیانبەخشانەی تووشی بووە، لە زیانەکانی نەزۆکی‌و پیسبوون، پاش ئەمە ڕۆڵی کارلێکی زانستیی‌و دەروونیی‌و ویژدانیی پەروەردەیی دێت لە پێکهێنانی مرۆیی مسوڵمان، تا بە بەردەوامی باوەڕدارو چاکەخوازو داهێنەرو بەتوانابێت، لەسەر سازکردنی وزەکان‌و شارەزاییە پێویستەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان.

بیریاران‌و ڕۆشنبیران، ئەمانە سەرچاوەی زانستین بۆ چاکسازییکرن، پەروەردەو پەروەردەکاران سەرچاوەن بۆ چاکسازییکردنی دەروونیی‌و ویژدانی، بەمەش مامۆستایانی زانکۆو خوێندنی باڵا، هۆکاری گرنگن لەکردەی چاکسازیی فیکرییدا، پەروەردەو فێرکردنی گشتیی، ئامێری پشتگیرین بۆ خێزان لە بواری چاکسازییکردنی دەروونیی‌و ویژدانیی، لە بواری پەروەدەدا لایەنی زانستیی ڕۆڵی خۆی هەیە لە بنیاتی ویژدانیی‌و گەشەکردنەکەیدا، تا وزەکان‌و تواناکان گەشە بکەن، لە دەرووندا جێگیر ببێت وەك نەخش لەسەر بەرد.

هەتاکو بیریاران‌و چاکسازان هەستن بە ڕۆڵی خۆیان، هەتاکو گۆڕانکاریی ڕوویداتو یەکێتیی‌و کارلێکی زیندوو ڕوو بدات لە نێوان زانستیی‌و ویژدانیی، گرنگە لە ڕووی زانستییەوە، سروشتی کرداری گۆڕانکاریی پەروەردەیی ڕیشەیی لە کۆمەڵگەدا بزانرێت، ئەوەشە، کە بنیاتی ویژدانیی دەگەڕێنێتەوە، وزەی تواناو بەخشینی دەروونیی فراوان دەکات، دەروونی مسوڵمانیش ئازاد دەکات لە نەخۆشییەکانی (دەروونی کۆیلەکان)، هەروەها وزەو تواناو ئازایەتیی‌و داهێنان‌و دەستپێشخەریی دەدات بە دەروون.

دەزگاکان بە هەموو شێوەکانییەوە کاری بەتوانا دەکەن لە پێناوی پارێزگاریکردن لەسەر بارودۆخەکەو مانەوەو بەردەوامیەتی، سووریشە لەسەر ئەوەی، کە هەر گۆڕانکارییەك ڕوویدات، دەبێ لە چوارچێوەی بارودۆخە وەستاوەکەدا بێت، لەبەرئەوە، دەبێ قوتابیانی چاکسازی و گۆڕانکاریی خاوەنی ناسینی کلیلی خستنەگەڕی کرداری گۆڕانکاری و داخوازییەکانی بزواندن بن،

گەرنا ڕوودانی گۆڕان داواکراو نابێت، چاکسازان وەك ئەو کەسانە وان کە هەوڵدەدەن تایەی عەرەبانەی گۆڕانکاریی بجوڵێنن‌و دۆڵابەکان بەدەستیانەوە بێ.

کلیلی خستنەگەڕی گۆڕانکاریی ئاشتیانە لە کۆمەڵگەدا بۆ بەرەو باشتر ئەوە هەر لەخۆوە لە پاڵنەری فیتریدایە، لە دەروونی باوکان‌و سوور بوونیان لەسەر ئەوەی، کە بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانیانی تیایە، ئەوەش پاڵنەرێکی فیترییە خوا لە دەروونەکاندا دایناوەو گەڕانەوەی نییە، تواناو کاریگەریی گەورەشی هەیە لە دروستبوونی ژیرییەتی‌و دەروونی تاك لە قۆناغی منالێی‌و بنیاتی دەروونیی مرۆیی، ئەوەش وەك چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگ وایە لەسەرچاو، چونکە گرنگ ڕەنگی شتەکان نییە، بەڵکو گرنگ ڕەنگی چاویلکەکەیە، لەبەرئەوە گرنگ نییە لە پلەی یەکەمدا ئەوەی، کە منال دەیبینێ یان دەیبیستێ، بەڵام گرنگ –بە پلەی یەکەم– ئەوەیە چۆن لەوە تێدەگات، کە دەیبینێ؟ چۆن تێدەگات لەوەی، کە دەیبیستێ؟ باوکان –ئەگەر بزانن چۆن ڕۆڵی خۆیان دەگەیەنن– گەورەترین کاریگەرییان هەیە لە پێکهێنانی چەمکەکانی منال‌و دروستکردنی دەروون‌و تواناکانی.

لەبەرئەوە، هاوکاریی یەکترکردنی بیریاران لە گەیاندنی ڕۆڵیان لە تێگەیشتنی باوکایەتیی‌و منالێی، هەستانیش بە لێکۆڵینەوەی زانستیی پەروەردەیی لەناو سەرچاوەکان‌و گرفتەکانی فیکرو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی کارێکی پێویستە بۆ هەستان بە ڕۆڵی خۆیان لە پێشکەشکردنی وێژەی زانستیی کارا بۆ باوکانی مسوڵمان، گەیاندنیان بە هۆشیاریی‌و قایلبوون‌و ئازایەتیی‌و دەستپێشخەریش، هەروەها گێڕانەوەی لایەنی گشتیی لە کەسایەتیی ئیسلامیی‌و ئامادەکراوەکان (بەمەبەستی پاراستنی ئوممەت)، چاوکراوەیی ئەو باوکانە، بە شێوازە پەروەردەییە چالاکەکان بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە نایابانە، کارێکی گرنگە، قایلبوون بە تەنها بەس نییە، بەڵکو دەبێ لەگەڵ قایلبووندا باوکان تواناو شارەزایی پەروەردەیی پێویستیان پێبدرێ بۆ سەرکەوتنی کارەکەیان.

لەبەرئەم هۆیە، دەبێ باوکان‌و پەروەردەکردنی خێزانیی‌و ویژدانیی گرنگی گەورەیان پێبدرێ، وێژەی زانستییان بدرێتی، لەگەڵ بنیاتی بەرنامەکانی لە

دروستبوونی تاکی مسوڵماندا، ڕۆشنبیرکردنو فیرکردنی، بۆ ئەم مەبەستە زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا، لە سەرچاوەی بەئیسلامکردنی زانست، سێ بڕیاری خوێندنی بۆ قوتابیان پێشخست، بڕیاریدا دیبلۆماتی خوێندن بکرێ بۆ دەرچوانی مامۆستا پێویست بۆی، ئەم بڕیارانە کە مەبەست لێیان ئەوەبوو، تا ببێتە داواکانی زانکۆیی بۆ هەموو ئەندامەکانی لە قوتابیان، ئەویش: بڕیاری (خێزانو باوکایەتیی) بڕیاری (بیری داهێنەرایەتییو چارەسەری گرفتەکان)و بڕیاردراوی (بەرپابوونی شارستانییەکانو ڕووخاندنیان).

ڕۆڵی زانستی قوتابخانەو مامۆستا، پاشکۆو تەواوکەری ڕۆڵی ویژدانی پەروەردەیی باوکانو دایکانە، ئەگەر هۆشیاریی هەبێت، ئەوا ڕۆڵی مامۆستایان تەواوکاریی یەکتر دەبن لەگەڵ ڕۆڵی باوکاندا، چونکە مامۆستا –بە عادەتی– حەزی چاودێرییکردنی قوتابیی تیایە، توانای هەیە لەسەر بەدیهێنانی سەرکەوتن لە ژیاندا، دۆزینەوەی وزە لای بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکانو زاڵبوون بەسەریدا.

بەمشێوەیە، لەکۆتاییدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە لە گرنگترین هۆکارەکانی کەموکورتیی بزووتنەوە چاکسازییەکان لە مێژووی ئوممەتدا لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی لە چاکسازیی ئوممەتو هەستانەوەیو تەقاندنەوەی وزەکانی – لەگەڵ ئەوەی لەهەوڵو خزمەتەکان پێشکەشکراوە کە بووەتە هۆی سووکردنی قەیرانی لاوازیی ئوممەتو دڕاوییو دواکەوتوویی– ئەوەش هەستنەکردنی ئەم بزووتنەوانە بوو بەگرنگییەتی لایەنی ویژدانیی لە چاکسازییکردنی پەککەوتنی دەروونیی، کە تووشی ئوممەت بووە، لە پێش ئەویشدا، لایەنی زانستیی بەرنامەیی تووشی پەککەوتن بووەوە.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی، ئەو بزووتنەوانە هەست نەکەن، ئەم هەوڵانە گرنگیی ڕۆڵی منداڵ لە گۆڕانکاریی چاکسازیی دەروونییو ویژدانیی، کە دەبێتە هۆی (إنشاء الله) ئازادکردنی ئوممەت لە قەیرانی (دەروونییەتی کۆیلەکان)و هەنگاو هەڵگرتن پێی بۆ ڕۆڵی تواناو داهێنانو دەستپێشخەریی، وەك ئەوەی

گەورەمان (موسا) کردی بە نەوەی ئیسرائیل لە (سیناء) کاتێ کە کرابوونە کۆیلە لە میسر (دەروونییەتی کۆیلەکان)یان پێکهێنابوو.

هەروەها لە کۆتاییدا، بەرپرسیارییەتی بیریاران‌و پەروەردەکاران‌و رۆشنبیران‌و مامۆستایان‌و چاکسازان دەردەخات، کە دەستبگرن بەرەشوەی دەستپێشخەرییەوە.

کلیلی خستنەگەڕی گۆڕانکاریی ئاشتی‌و چاکسازیی ڕیشەیی ببزوێنن، ئەوە هەمان ڕۆڵە، کە شۆفێری ئۆتۆمبێلێك پێیهەڵدەستێت، لە بزواندنی کرداری ڕۆیشتن‌و دەرچوون بەرەو مەبەست، ئەوەش لێرەدا خستنەگەڕی ڕەگەزی منداڵە، کە لێرەدا ڕۆڵی نادیارە، بۆیە گەشەدان بە وزەو تواناکانی، ئەوەش بە وتاری پاڵپێوەنەری فیتری باوکایەتیی پێویستە، ئەوەی کە بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانی تیایە، دەبێ وتارێکی زانستیی قایلکەر بێت‌و بنیاتی مەڵبەندی لێکۆڵینەوەی زانستیی بۆ دابنرێ، ئامێرو هۆکارەکانی پێش بخات لەپێناوی پێشکەشکردنی وێژەو بەرنامەی پەروەردەیی زانستیی، لە هەوڵێکی زانستی زیندوودا، لە وتارێکی کاریگەر کە دڵسۆزان لە رۆشنبیران‌و بە تواناکان، هاوکاریی یەکتر بکەن لە بنیاتی‌و خستنەبازاڕیدا، لە پیاوانی بزووتنەوەکانی چاکسازیی‌و سەرکردەکانی کۆمەڵگەو دەزگاکانی کۆمەڵگەی شارستانیی، ئەوەش تاکە ڕێگایەکە، کە دەبێ مسوڵمان بیگرێتەبەرو دەستی پێوە بگرێت لەدەستپێشخەریی‌و بیناکردن‌و ئازادکردندا، تەنها ئەوکاتەش دەزگا فەرمییەکان وەڵامی ترپەکانی دەدەنەوە، ئاڕاستەکانی جوڵەکەی دەگرن، ئیتر ئەوکاتە —بە پێویست— دەبێتە یارمەتیدەر بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی (ئێوە چۆن بن گەورەتان وا دەبێ) ئەوە ڕێگای کرداری چالاکە، لەپێناو گەشەکردنی بەرەی یەکتاپەرستیی‌و جێنشینایەتیی‌و داهێنان‌و دەستپێشخەریی، بەرەیەك کە توانای هەبێ لەسەر بەدەستهێنانی توانای زانستیی‌و وزەی ویژدانیی، شارەزایی ئاوەدانیی پێویستی هەبێ، بۆ بنیاتنانی تواناکانی ئوممەت‌و دەزگاکانی، بیناکردنی شارستانییەکەی، هەڵگرتنی پەیامەکەی، بەرەنگاربوونەوەی کۆسپەکان‌و ئاستەنگەکانی بەردەمی، پێشکەشکردنی دەستی یارمەتی چاکەکارانە بۆ مرۆڤ، تا خودی چاکییەتی

لەزەویدا بە دەست بهێنێ، بە پێی شەریعەتی حەق‌و چاکەو دادپەروەریی‌و برایەتیی.

- کاتی ئەوە هاتووە، کە هەست بکەین بەگرنگییەتی‌و خاوێنێتیی ڕۆشنبیریی‌و ڕێگوزەرە پەروەردەییەکان.

- کاتی ئەوە هاتووە، کە هەست بکەین بەگرنگییەتی پەروەردەکردن.

- کاتی ئەوە هاتووە، کە هەست بکەین بەگرنگییەتی ویژدان.

- کاتی ئەوە هاتووە، کە هەست بکەین بەگرنگیەتی ڕۆڵی باوکایەتیی.

- کاتی ئەوە هاتووە، کە هەست بکەین بەگرنگیەتیی قۆناغی منالێیی.

- کاتی ئەوە هاتووە، کە هەست بکەین بە گرنگییەتی بیناکردن لە بنەڕەتەوە، پەلەنەکەین، بە لق‌و شتە دەرکەوتووەکان کۆڵ نەدەین.

- ئەوە یاسای خوایە لە دروستکراوەکانیدا، ڕەوشتی گەشەی نەتەوەکانە، هەموو نەتەوەکان.

- کاتی ئەوە هاتوووە، کە مرۆڤی مسوڵمان دەستبگرێ بەچارەنووسی خۆیەوە.

- کاتی ئەوە هاتووە کە بیریاران‌و پەروەردەکاران، زانایان، مامۆستایان، مامۆستایانی زانکۆ، ڕۆشنبیران‌و سەرکردە دامەزراوو دڵسۆزەکانی ئوممەتی ئیسلام، بەرپرسیارییەتی‌و ڕۆڵی خۆیان ببینن –بە کارکردنی چالاکانە– لە هۆشیارکردنەوەی ئوممەتدا، ڕێڕوونیی بۆ ڕێگاکان بکات‌و زانیاریی‌و زانستیی ڕاست‌و دروستی پێبدات، هۆشیارکردنەوەو قایلکردن‌و ڕۆشنبیرکردن‌و فێرکردن، ئوممەت ڕزگار بکات، شێوازی پەروەردەیی دروست بدات بە باوکان‌و مامۆستایان، کە دەبێتە هۆی ئازادکردنی دەروونەکان‌و ویژدان، وزەکان گەشە پێبدات، یارمەتیی بدات‌و پشتگیریی بکات، بە ڕێکخستنەکان‌و بەرنامەی فێرکاریی پێگەیشتوو باڵا.

پێویستە باوکان، کە ئەوان –لەم قۆناغەدا– کلیل‌و بنەڕەتن بۆ ئازادکردنی ئوممەت‌و بیناکردنی وزەکانی، داهاتووی بەرەکانی، بێ هەوڵی ڕاستیی باوکان، هیچ ڕێگایەك نییە بۆ تواناو دڵسۆزیی و سەربەرزیی.

وشەی کۆتایی بۆ بیریارانو ڕۆشنبیرانو چاکسازان، دەربارەی جۆری هەولّو ڕۆلّیان، ئەوەیە کە گرنگ لەسەرکەوتنی هەولّەکانیاندا، کارکردنە بە چالاکانە لە گەیاندنی پێشەنگیی خۆیانو لە بزواندنی کلیلی خستنەگەڕی جوولّەی گۆڕانکاریی ئوممەتدا، ئەوەش بە پێشکەشکردنی تێڕوانینی شارستانییەتی ئیسلامییو پوختەکردنەوەی ڕۆشنبیریی ئوممەت، ڕێپوونی کردن بەنەخۆشییەکانی ئوممەتو ویژدانی ئوممەت، بە ڕێگاکانی چارەسەرو زالّبوون بەسەریدا.

هەروەها لەسەریان پێویستە —بە خۆگرییو هەولّدان— لە پێناوی بەدیهێنانی ئەو مەبەستانە کاربکەن بێ پەلەکردنو بێتاقەتبوون، هەتاوەکو ڕێساکانی گۆڕانکارییو چاکسازییکردنی ئوممەت، دادەمەزرێت، تەواو پێبگات، کاتی دەستپێکردن بە دەرچوونی وزەی گۆڕانکارییو چاکسازیی لە ئوممەتدا، لەماوەی چەند بەرەیەکدا دروست ببێ، بە تەندروستییو زانستو ویژدانەوە، ئیتر ئەوکاتە، ئەوەی، کە تۆ وا دەزانی وەستاوو هێواشە، دەردەچێتو گەورە دەبێت بە وزەو گۆڕانکارییەوە، هەموو کۆسپەکان ڕادەمالّێ، هەموو کەفێك لە کۆمەلّگەو هەلّسوکەوتەکانی لادەبات، وەك دلّۆپی ئاو، کە بە کۆبوونەوەیان لافاو و ڕووبار دروست دەبێ، وەکو فڕۆکە بەسەر زەویدا دەڕوات، پاشان دەردەچێتو بەرزدەبێتەوە بۆ پانایی ئاسمان.

ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، چاکترین نموونەیە بۆ بەروبوومی هەولّدانو خۆگری، خۆیو هاوڕێکانی، لە شاری مەککە ماوەی سیانزدە سالّ دەستیانکرد بەکارکردنو خۆگرییو هەولّدان بۆ داڕشتنی ڕێساکان، بنیاتی بنەڕەتەکان، ئامادەکردنی (ئامێرەکان)، تا لە دواییدا وزەی چاکسازیی لە دەسالّدا بە گۆڕانکارییەکەی، ڕووی زەویو مێژووی گرتەوە، هەموو کەفێکی ڕامالّی، هەموو کۆسپێك لەبەردەم ئوممەتو شارستانییو بەرەبەیانی نوێ لاببات، ئەمەش یاسای هەموو بزووتنەوەیەکی گۆڕانکاریی گەورەیە لە مێژوودا.

دەبێ بیریارانو ڕۆشنبیرانو چاکسازان، بزانن، کە لەسەریانە ڕۆلّی خۆیان بە یەکەمو بناغەیی ببینن، لە بەڕێوەبردنی کلیلەکانی خستنەگەڕی بزووتنەوەی گۆڕانکارییو چاکسازیی لە ئوممەتدا، تا بەهێزی خۆیی دەربچێتو بینای وزەی

خۆی بکات، باری خۆی بگۆڕێ، ئەو کارانە، کە خراپبووە، چاکسازیی تیا بکات، لە گەیاندنی ڕۆڵیاندا وازبهێنن لە نەخۆشییو دەرکەوتنەکان (دەرونییەتی کۆیلەکان)، چونکە کەس نایەت بە جێگرایەتی ئەوان ئوممەتیان بۆ ڕزگار بکات، ئوممەت هیچ چارەسەرێکی ئاسانی پێ نییە، کە بە پەلە بەدیبێت، بێ هەوڵدان لە ڕۆژی دواییدا، هیچ جێگرەوەیەك نییە، کە ئوممەت پشتی پێببەستێ، تەنها خۆیو هەوڵەکانی ئوممەت خۆی نەبێ، دەبێ فێری خۆگرییو هەوڵدان ببین، هەتاوەکو دڵۆپەکانی ببنە لافاو، هەتاوەکو وزەکان کۆببنەوە، تا ڕێگاکردن دەست پێبکات، پێکهاتەی شارستانییو ویژدانییەکەی بفڕێ لە سەرشانی ئەوانەی، کە باوکە هۆشیارەکان پەروەردەیان کردوون، بەرەیەکی ئازادو بەهێزو دەستپاك.

پڕۆژەی چاکسازییو گۆڕان پێویستی بە کارو خۆگرییو دارشتنی ڕێساکانو شینبوونی درەختەکان هەیە، تاوەکو خەونەکان بێنەدی، پەیامەکە بگات، بیناکە بەرز بێتەوە، بەرووبووم بگرێتەوە، بێ پشتبەستن بەخۆو وازهێنان لە هەموو خەونەکانی تری ڕزگارکەرو چارەسەری سووكو بە پەلە، ئەوا ئوممەت چەندین گرێو سەدەیتر بەردەوام دەبێت، لە بێدەسەلاتییو سەرشۆڕییو ستەمو ناتوانین –مەگەر خوا ویستی بێ– دەربارەی داهاتوو هیچ بزانین، هەروەکو لە ڕابووردوو خوانەخواستە دەبێ چاوەڕێی قەیرانو کارەساتی ڕۆژانە بکەین، لە هەموو بەرەیەکدا، هەتا لە قەوارەی ئوممەتدا، وزەو توانا بەرەو لاوازبوون بڕوا، ئێمە زیاتر پێویستمان بە چاکسازییکردنی خۆمان هەیە، تا گەشە بە وزەمان بدەین، ڕزگاربوون نییە بە ئیزنی خوا، مەگەر هۆشیارببینەوە، بیریارانو ڕۆشنبیرانو چاکسازان وریاببنەوە، تا ڕۆڵی خۆیان بگەیەنن، بزووتنەوەی چاکسازییکردنی ئوممەت، بخەنە سەر ڕێگا لە چاکسازیی خود لەڕووی زانستییو ویژدانییەوە، بناغەکان دامەزرێنن بۆ بیناکردنی بەرەکان، ئەوانەی کە ژیرییو ویژدانی ئازادو ڕاستو دروستیان هەبێ، خوای گەورە ڕاست دەفەرموێ (إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ) (الرعد: ١١ ).

(وَالْعَصْرِ* إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ* إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ) (العصر:٢– ٣ ).

# هۆنراوەو ویژدان وشەیان هەیە
# نامەیەك بۆ باوکان لە بەرەکانی داهاتوو

د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان

ئەگەر دەروونت حەزی لێنەبوو ئەی باوکی بەڕێزم
لە بەروبوومی هەنجیری دڕکاوی
ئەگەر دەروونت حەزی لێنەبوو
لە داری هەنجیری دڕکاویی
ئەگەر دەروونت حەزی نەکرد لە تاڵیی هەنجیری دڕکاویی
هاوارت بێسوودە ئەی باوکی بەڕێزم
لای هەنجیری دڕکاویی.

—

گوێت بۆ ناگرێ
درەختی هەنجیری دڕکاویی
بەرناگرێت
درەختی هەنجیری دڕکاویی
مەگەر تاڵیی هەنجیری دڕکاویی

—

ئەگەر دەروونت حەزی لێبوو ئەی باوکی بەڕێزم
بۆ ترێ
یان دەروونت حەزی هەبوو
بۆ هەنجیر
یان دەروونت حەزی هەبوو
بۆ سێو
ئەوا ئەی باوکی بەڕێزم بیچێنە

بەری ترێ

بەری هەنجیر

بەری سێو

ـــــ

ئەیڕنی ئەی باوکی بەڕێزم شیرینی ترێ

ئەیڕنی شیرینی هەنجیر

ئەیڕنی بەری سێو

ـــــ

چەند ناخۆشە داری هەنجیری دڕکاویی

چەند ناخۆشە بەری هەنجیری دڕکاویی

چەند ناخۆشە تاڵیی هەنجیری دڕکاویی

چەند ناخۆشە بەری هەنجیری دڕکاویی

ـــ

دەبا بڕوێنین ئەی باوکی بەڕێزم تۆوی

شیرینی ترێو درەختی هەنجیر

بەری سێو

دەبا بیبڕین

داری دڕکاویی

داری هەنجیری دڕکاویی

دەبا بیبڕین ئەی باوکی بەڕێزم کۆتایی کەین بەری هەنجیری دڕکاویی

نەوەکانی پێویستی سەرشۆڕیی

بەرەی زیان لێکەوتوو دەستەوسانیی

بەرەی لاوازەکان

ـــــ

بیسڕە فرمێسکم ئەی باوکی بەڕێزم

دڵم دەتەقێ

فرمێسکم دەتەقێ

زەویم دەتەقێ

بەرم دەتەقێ

–

ڕزگارم بکە ئەی باوکی بەڕێزم ڕزگارم بکە

ڕزگارم ناکات جگە لە باوکی بەڕێزم

ڕزگارم بکە لە کۆتی بێتاقەتیی

ڕزگارم بکە لە کۆتی دەستەوسانیی

ڕزگارم بکە لە کۆتی لاوازیی

لە کۆتی سەرشۆڕیی

لە کۆتی دوژمنەکان

لە ڕۆچوونی دوژمنەکان

—

ئەی باوکی بەڕێزم

تۆ زەڕەنگەرو پیشەوەری

تۆ لانکەی

تۆ هێلانەی

تۆ ڕابەرو پێشەنگی

تۆ سەرپەنجەکانی

ئاوازی قیساری

—

ئەی باوکی بەڕێزم چاك پەروەردەم بکە

چاك پەروەردەم بکە ئەی باوکی بەڕێزم

تۆ دەرمانو تلیاکی

—

ڕزگارم بکە ئەی باوکی بەڕێزم ڕزگارم بکە

ڕزگارم بکەو فێرببە ئەی باوکی بەڕێزم

چۆن پەروەردەی بکەیت بەرەی بەڕێزەکان

بەرەی زانایان

بەرەی پیشەوەران

بەرەی شەهیدان

بەرەی سەرکردەو ناوداران

—

هەڵم بگرە ئەی باوکی بەڕێزم

لەسەر باڵی بەرزاییەوە

لە مەککەوە

لە زەوی شەوڕەوییەوە

لە مەقدیسەوە

لە زەوی بڵندبوونەوەوە

لە بابل

لە تەیبە

لە هەموو زەوی

—

بەدیبهێنە زەردەخەنەی ڕۆژانم

بەرزی بکەرەوە دیوارەکانی پلەو پایەم

دیوارەکانی سەربەرزیی‌و بڵندیی

—

وازم لێمەهێنە ئەی باوکی بەڕێزم

نوقم ببم لە ئاوی لیخندا

نوقم ببم لە فیکری بۆگەندا

نوقم ببم لە قوڕاودا

نوقم ببم لەبێشەلاندا

—

وازم لێبێنە لەناو پۆلە باڵندەدا

ئەفرم ئەی باوکی بەڕێزم

لە ئاوی پوختە هەڵئەگۆزم
هەڵدەگۆزم لە ڕووباری ڕوون
لە ئاسۆی یەکتاپەرستیی
لە ڕووباری چاکەکردن
لە ڕووباری هێزو باوەڕ
—
وازم لێمەهێنە ئەی باوکی بەڕێزم
لە باری خراپو لاوازییدا
لە ڕووی گەردەلوولدا
ڕام بماڵێ تەوژم
لە بیری نامۆییدا
لە بیری شاڵاوبەراندا
قەلەڕەشەی دارستانو هێلانەکان
—
وازم لێبهێنە ئەی باوکی بەڕێزم
سەرکەوم بەسەر شەپۆلدا
سەرکەوم بەسەر قودسدا
سەرکەوم بەسەر بتدا
تۆ کەناری دەریای ئەی باوکی بەڕێزم
تۆ ئاسۆی
تۆ باری
تۆ کەشتییەوانی
—
بابچین ئەی باوکی بەڕێزم بۆ ئوممەت
لە سیناو
لە حەرەمەین (مەککەو مەدینە)
لە بەیتولموقەدەس

لە خۆرهەڵات

لە خۆرئاوا

بابینا بکەین بۆ ئوممەت ئەی باوکی بەڕێزم

بە دڵو بە ژیریی

بە زانستو بە خۆشەویستیی

بە ئایین، بە بەهاکان، بە ڕەوشتەکان

بەرەی هەردوو بەش

بەرەی هەردوو ماڵ

بەرەی گیان

بەرەی لاشەکان

بەرەی دادپەروەریی

بەرەی ئاوەدانکردنەوە

—

با بنیات بنێین ئەی باوکی بەڕێزم بەرەی داهاتوو

با بنیات بنێی ئەی باوکی بەڕێزم

بەرەی هێزو بەخشین

بەرەی سەربەرزی ئەی باوکی بەڕێزم

بەرەیەك ئەی باوکی بەڕێزم بە توانا بێ

لە گۆڕەپان بە توانا بێ

لە نووسینگە بە توانا بێ

لە کارگە بە توانا بێ

لە کارخانە بە توانا بێ

لە شوێنی بازرگانیی بە توانا بێ

لە لوتکە بە توانا بێ

لە ناو پیادەڕەواندا بە توانا بێ

لەناو پیادەڕەواندا بە توانا بێ

بەرەی جوانکاریی

بەرەی چاکەکردن

—

بەرەیەك ئەی باوکی بەڕێزم
ئازادی بێ لە دڵدا
ئازاد بێ لە بیردا
ئازاد بێ لە ویژداندا
ئازاد بێ لە باوەڕدا
ئازاد بێ لە نیشتمانەکاندا
بەرەیەك ئەی باوکی بەڕێزم
بپارێزێ نیشتمان
گۆرانی بڵێ بۆ نیشتمان
بنیات بنێ نیشمان
بڵندیکات نیشتمان

—

گوێنەداتە بتەکان
کڕنووش نەبا بۆ بتەکان
هەموو مەبەستی خوا بێ
نەپەرستێ جگە لە خوا

—

بەرەی بەتوانا ئەی باوکی بەڕێزم
بەرەی خۆگر ئەی باوکی بەڕێزم
لە ڕووی دوژمنەکان
لە ڕووی بازرگان
لە ڕووی کۆیلەکان
لە ڕووی چاوبەسکاران

—

با دروست بکرێ ئەی باوکی بەڕێزم
ئەی خۆشەویستی فیترەت لە باوکی بەڕێزم
ئەی بەخشەری فیترەت لە باوکی بەڕێزم
بەناوی ڕەحمانەوە
بەناوی قورئانەوە
بەرەی چاکەکاران
بەرەی ئازادیخوازان
—
لە کۆتاییدا لە یادت بێ ئەی باوکی بەڕێزم
بەری نابێت درەختی هەنجیری دڕکاویی
مەگەر تاڵیی هەنجیری دڕکاویی
لە یادت بێ ئەی باوکی بەڕێزم
تۆوی ترێو تۆوی هەنجیر
تۆوی ئازادیخوازان
سڵاوت لەسەر ئەی باوکی بەڕێزم
ئەگەر تۆ بەخشیت وزە ئەی باوکی بەڕێزم
لە سەرت بێ هەزار سڵاو
سڵاو هەزار سڵاو
بۆ جووتیارو ئازادیخوازان
—
وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

# پوختە

ئەم پەرتووکە "قەیرانی ویستو ویژدانی مسوڵمانو لایەنی نادیار لە پڕۆژەی چاکسازیی ئوممەت، چاکسازیکردنی ڕۆشنبیریی‌و پەروەردە لە تێڕوانینی ئیسلامیی هاوچەرخ"، هەوڵدەدات بۆ تێگەیشتن لەو هۆکارانەی، کە تا ئەمڕۆ ڕێگرە لەبەردەم سەرکەوتنی پڕۆژەی چاکسازیکردنی شارستانییەتی ئیسلامیی، ڕوودانی گۆڕانکاریی دەروونیی داواکراویش لە ئوممەتدا، ئەوەش بریتییە لە تێگەیشتن لە لایەنی دەروونیی ویژدانیی لە وتاری پەروەردەیی بۆ منداڵ، ئەوەش لایەنی نادیارە لە پڕۆژەی چاکسازییدا.

ئەم پەرتووکە ئامێرە بەرنامەییەکانو ڕۆشنبیریی پێویست بۆ چاکسازیی پەروەردەیی‌و گرنگترین بنەماکانی دەرچوون، هەروەها ڕۆڵی مەڵبەندی خێزان لە ئاڕاستەکرندا دەخاتە ڕوو، بێئەوەی لە گرنگی هەوڵەکانی پڕۆژەی چاکسازیی ئیسلامیی لە کۆمەڵگاکانی مسوڵمان لە لایەنی ئابووریی‌و ڕامیاریی‌و بانگەوازییەکەی کەم بکاتەوە.

ئەم پەرتووکە ڕوانین‌و وانەیەکی ڕەخنەگرانەو لێکۆڵینەوانە دەخانە ڕوو، تا ئەو هۆکارانە بناسین کە بوونەتە هۆی تووشبوونی نەخۆشیی گیانیی شارستانیی ئیسلامیی بەرزو باڵا، کە ئەمڕۆ دەستی هەیە بەسەر جیهانی شارستانیی بۆ چەندین سەدەو مرۆڤی بڵند کردووە بۆ ئاسۆ بەرزو فراوانەکان، هۆکارەکانی لاوازیی‌و کەموکورتیی ئوممەتیش ڕووندەکاتەوە، کە بووەتە هۆی بێدەسەڵاتیی و دواکەوتوویی.

هەروەها ئەم پەرتووکە لێکۆڵینەوە دەکات لەناوەڕۆکی قەیرانی عەقڵی مسوڵمان، لە گرفتیەتی بەرنامەیی‌و تاکزانستیی، کە بووەتە هۆی پیسبوون لە لایەنی ڕۆشنبیریی‌و هەڵسوکەوتی پەروەردەیی، ئەم پەرتوکە نەفامبوون بە منالّییەتو پشتگوێخستنی منداڵ، ڕوون دەکاتەوە کە ئەوەش ناوەڕۆکی قەیرانی ویستو ڕەشۆکردنی ویژدانی مسوڵمانە، ئەو کۆسپانە دەگرێتەوە لە نەخۆشییە

دەروونییەکان، کە بووەتە هۆی ڕشۆکردنی وزەو بەخشینو داهێنان لە بنەماکانی بنیاتنانی گەشەی مسوڵمانو کۆمەڵگەی مسوڵماندا.

هەروەها ئەم پەرتووکە داوای چالاکییەتی هەڵسوکەوت دەکات، لەگەڵ قەیرانی ژیریی‌و بەرنامەو فیکرو ڕۆشنبیرو ویژدانو پەروەردەکردن، لەسەر بناغەی هاوسەنگیی لە نێوان کەسانی ڕامیاریی‌و فیکریی‌و پەروەردەیی لە هەوڵی بزووتنەوەکانی چاکسازیی، بۆ بەدیهێنانی تواناو ئازادکردنی دەروونی مسوڵمانو خستنەگەڕی ویژدان.

بیریاران و پەروەردەکاران و باوکان و دایکانیش بانگ دەکات، کە هەستن بە بەرپرسیارییەتیی خۆیان، لە بیناکردنی داهاتووی بەرەکانی ئوممەت، لە ڕووی ڕۆشنبیریی و ویژدانییەوە، لەسەر بنەڕەتە زانستییە ئیسلامییە ڕاست و دروستەکان.

# ناوەڕۆك

## د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان



* ساڵی ١٣٥٥ك/١٩٣٦ز لە مەککەی پیرۆز لەدایکبووە.

* قۆناغی سەرەتایی و دواناوەندی لە مەککە تەواوکردووە و لە ١٩٥٥ لە قوتابخانەی ئامادەیی نێردراوان بۆ دەرەوە دەرچووە.

* ساڵی ١٩٥٩ بەکالۆریۆسی لە بازرگانی لە زانکۆی قاهیرە بەدەستهێناوە.

* ساڵی ١٩٦٢ ماستەری لە زانستە سیاسییەکان لە کۆلێژی بازرگانی زانکۆی قاهیرە وەرگرتووە.

* ساڵی ١٩٧٣ دکتۆرای لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان لە زانکۆی پەنسلڤانیا بەدەستهێناوە.

* لە نێوان ساڵانی ١٩٦٤ — ١٩٨٦ سکرتێری کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی پلاندانان و دواتر ئەندامی ئەنجومەنی وانەبێژی کۆلێژی زانستە کارگێڕیەکان (کۆلێژی بازرگانی جاران)ی زانکۆی شا سعوود (زانکۆی ریازی جاران) و سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکان بووە.

* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی خوێندکارانی موسڵمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا و یەکێتیی ئیسلامیی ڕێکخراوە خوێندکارییەکان و کۆمەڵەی زانا کۆمەڵناسە موسڵمانەکانی ویلایە یەکگرتووەکان و کەنەدا و نەدوەی جیهانی لاوانی موسڵمان لە شانشینی عەرەبستانی سعودی و پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی لە ویلایە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

* سکرتێری گشتیی دامەزرێنەری سکرتاریەتی گشتی نەدوەی جیهانیی لاوانی موسڵمان لە ریاز، یەکەمین سەرۆکی پەیمانگای جیهانیی فیکری

ئیسلامیی، بەڕێوەبەری پێشووی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و سەرۆکی وەنجومەنی راوێژکاری قوتابخانەکانی (منارات الریاض) تا ساڵی ١٩٧٤، سەرۆکی دامەزراوەی گەشەپێدانی منداڵان و دامەزرێنەر و سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی زانا کۆمەڵناسە موسڵمانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا.

* بەڕێوەبەر و دامەزرێنەری زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا ١٩٨٨ – ١٩٩٩.

* ژمارەیەك کتێب و باسی زانستی سەبارەت بە تیۆریزەکردنی ئیسلامییانەی ریفۆرم و گۆرانکاری ناو ئوممەت و تازەکردنەوەی هزری ئیسلامیی نووسیوە.

**لە دانراوەکانی:**

١ـ بیردۆزە ئابووریەکانی ئیسلام: فەلسەفە و میکانیزمی هاوچەرخ، ١٩٦٠.

٢ـ بیردۆزە ئیسلامییەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان: ئاراستەگەلێکی نوێ بۆ هزر و میتۆلۆژیای ئیسلامیی، ١٩٧٣.

٣ـ قەیرانی عەقڵی موسڵمان، ١٩٨٦.

٤ـ لێدانی ئافرەت وەك چارەسەرێك بۆ کێشەکانی ژن و مێرد، ٢٠٠٢.

٥ـ منداڵی، رەهەندی ون لە پرۆژەی ریفۆرمی ئوممەت، ٢٠٠٣.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیری سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی ئەویش، لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵو کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکرو مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کارو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش هەیە.